شەرحی

# بُلوغ المَرام
# مِنْ
# أَدِلَّةِ الأَحْكام

لِلحافِظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني رحمه الله تعالى

بە پێنووسی

نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمّد

﴿ بەرگی یەکەم ﴾

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# شەرحی

# (( بُلوغُ المَرَامِ

# مِنْ

# أَدِلَّةِ الأَحْكَام

للحافظ أحمد بن على بن حَجَرِ العَسْقَلاَنِیَ -رَحِمَهُ الله تعالی-))


بە پێنووسی:

**نوری فارس حەمە خان**



سەرپەرشتی چاپ:

**محمود أحمد محمد**

﴿بەرگی یەکەم﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**********************************************

🕮 ناوی کتێب: شەرحی (( بُلوغ المَرام مِنْ أَدِلَّةِ الأَحْكَام )) للعَسْقَلاَنِي

🕮 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

🕮 چاپی: یەکەم

🕮 تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

🕮 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٧٠٥)ی پێدراوە.

🕮 ساڵی چاپ: ٢٠١٣

🕮 کۆمپیوتەرو دیزاین: ( نیان حسین )

🕮 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.

## بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين أَحْمَدُهُ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ محمداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَوَاتُ اللهِ وسَلاَمُهُ عَلَيْهِ وَعَلَى سَائِرِ الْأَنْبِيَاءِ وَالْمُرْسَلِينَ، وَآلِ كُلٍّ، وَسَائِرِ عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّين.

لەپاش سوپاس‌و ستایشی خودای گەورەو ناردنی درووددو سلاوی بێ پایان بۆسەر گیانی پێغەمبەری زێدە خۆشەویست، وە بۆسەر گیانی هاوڕێ نازدارەکانی، عەرزم ئەمەیە:

١- مەبەستی سەرەکی لەم وەرگێڕانە، ئەوەیە کە خوێنەری کوردو مامۆستا بەڕێزەکانی خۆمان، لە ئەصڵی فەرموودەکان‌و ئەحکام‌و بڕیارەکانی حاڵی ببن بەباشی.

٢- ئەم شێوازەی کە مامۆستای عەسقەلانی، پیادەی کردووە، شەرعزان‌و پسپۆڕانی فەرموودەو سوننەت‌و فیقە، بەباشی لێی حاڵی دەبن‌و بەس. بگرە لەزۆر شوێن سەر لەخوێنەری بێ ئەزموون دەشێوێنێ، وەمن بەپشتی خودا هەوڵم داوە، کە ئەو کەلێنە لە وەرگەڕاوە کوردییەکەدا پڕ بکەمەوە، هەروەك ڕاڤەکەران‌و شاریحەکان، دەقە عەرەبییەکانیان لەڕێگەی ڕاڤەو شەرحەوە، روونکردۆتەوەو ئەو کێشەیان چارەسەر کردووە بەشێوەیەکی گشتی.

٣- فەرموودە ڕەمزەکانم، وەك دانەر لەپێشەوە بە ڕەمز وەك خۆی نووسیوە، ئەوسا بەپێی تەخریجەکانیان لەسەرچاوەکاندا، دەقەکەیانم تەرجەمە کردووە، وەبۆ ئەم بەهرەیە سوودم لەهەموو سەرچاوەکانی تاجول ئوصول‌و ریاض‌و صالحین‌و تەجریدی بوخاری‌و پوختەی موسلیم (وەرگێڕانی خۆم) وەرگرتووە، لەگەڵ کۆمەڵێ شەرحی تر کەلەسەر (بلوغ المرام) کراوە، وەك:

(١- سُبُلُ السّلام شَرْحٌ بُلُوغ المَرامَ ٢- البَدْرُ التامَّ شَـرْحُ بُلُـوغ المَـرام ٣- فَتْحُ ذي الجَلالِ والإكرام بِشَرْح بُلُوغ المَرامَ) ٤- بلوغ المـرام مـن أَدِلَّـةِ الأحْكَـامِ نسخةٌ مشكولَةٌ ومُخَرَّجَةُ الأَحَاديث على كُتُبِ كُلٍّ: من:

| | |
|---|---|
| العَلاَّمَةِ | العَلاَّمَةِ |
| محمد ناصرالدين الألباني | مقبل بن هادى الوادعى |
| رحمه الله تعالى | رحمه الله |

((وَمزيَلة))

بِحَاشِيَة العلاّمة عبدالعزيز بن باز على بلوغ المرام وعليها تعليقـات أصـحاب الفضيلة الدكتور/ صالح الفوزان

الشيخ محمد حامد الفَقِي

**٤- ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە، کە دانانی مامۆستای مامۆستایان شێخی ئیبنو حەجـەری عەسـقەلانییە، کـە حـافظو حوجەتـە لەهـەموو زانـستە شـەرعییەکاندا، بەتایبـەتو لەبابـەتو بـواری فـەرموودەو فەرموودەناسـیو فەرموودەزانیو سوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم پـەڕاوە پیرۆزە یەکێکە لەبەرهەمە شاکارەکانی شێخی عەسقەلانی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) جـا دانـەر بەشـێوەیەکی دانایانـەو زانایانـەو لێزانانـە، ئـەم پـەڕاوە پیرۆزەیـەی دارِشـتووە، وە لەڕاسـتیدا بناغـەو بنەمایـەکی کورتو پوختـە بـۆ هەموو بەڵگەو پاساوە یاساییو شەرعییەکان.**

**لەڕاسـتیدا زۆر لەمامۆسـتاو داعیـە ئیـسلامیو خـەمخۆرانی شـەریعەتی ئیسلام، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، بەتایبەتی تر لەبواری فیقەو شەرعا، هانا بـۆ ئـەم پـەڕاوە پیرۆزەیـە دەبـەنو بـەهرەی لێ وەردەگـرن، هـەروەك لـەزۆر کـۆلێجو پەیمانگـەو زانکۆکـان، کەبایـەخ بـە شـەریعەتی ئیـسلام دەدەن، ئـەم کتێبی (بُلُوغ المَرامَ)ە یان کردووە بە پەیڕەوو بەرنامەو مەنهەجو سەرچاوە.**

٥- جا لەم ڕوانگەیەوە، بەندەی هەژاریش لەسەر ڕاوێژو پێشنیاری برای ئازیزو خۆشەویستم، جەنابی مامۆستا (محمود ئەحمەد محمد) دەستم کرد بە وەرگێڕانو بە کوردی کردنو ڕوونکردنەوەی ئەم پەڕاوی (بُلُوغ المَرامَ)ە، لەخودای گەورەو میهرەبان داواکارم کە تەوفیقم بدا لەسەر تەواوکردنیو بە پەخشەوەبوونی بەناو موسوڵمانانا، چاوی دڵو دەروونو سەرمان پێی ڕۆشن ببێتەوە، وەببێ بەمایەی ڕەحمەت بۆ وڵاتمان.

**وەئەمەیش ڕێبازی وەرگێڕانەکەیە:**

١- هەموو فەرموودەیەك لەسەرەتایەوە ژمارەم بۆ داناوە، بەپێی ژمارە دانانی مامۆستا (محمد حامد الفقی من علماء الأزهر – مطبعة مصطفى محمد صاحب المكتبة التجارية الكبرى بمصر – توزيع دارالفكر – فرغ من طبعه في الرابع والعشرين من جمادى الأولى سنة ١٣٥٢هـ) لە ژمارە (١)ەوە دەست پێ دەکا، بەژمارە (١٥٩٦) دێتە کۆتا، وە دەقی فەرموودەکانم لەبەر نوسخەی ئەم چاپە ڕونووسکردووە.

٢- دوای نووسینەوەی دەقی فەرموودەکە، وەك مامۆستای دانەر نووسیویەتی، بەبێ زیادوکەم، ئەوسا بەپێی سەرچاوەکان تەرقیمو تەخریجی هەموو فەرموودەیەکم کردووە.

٣- وەبۆ خزمەتی پتر بۆ کتێبەکە، ئاماژەم کردووە بۆ ژمارەو زنجیرەی هەمان فەرموودە لەتەجریدی بوخاریو پوختەی موسلیمو تاجول ئوصولو ریاض الصالحين. زۆرینەی کات، فەرموودەکە ئەگەر لە صەحیحی موسلیمدا بوو، بەم سێ ژمارەیە تەخریجم کردووە:

١- بەپێی ژمارەکانی (مختصر صحيح مسلم) کە خۆم تەرجەمەمم کردووە بەکوردی).

٢- بەپێی تەخریجی (الشيخ خليل مأمون شيحا) بۆ صەحیحی موسلیم.

٣- بەپێی تەرقیمی مامۆستا (محمد فؤاد عبدالباقی) (رەحمەتی خودای لێ بێ)، کەزۆرتر لەدوا ژمارە دانانی شێخ خلیل شیحا دەینووسم ئاوا: (صحيح مسلم: ٣٢٣ = ٧٣١ تەرقیم الشيخ خليل مأمون شيحا. یا بەپێچەوانەوە ئاوا: ٧٣١ تەرقیم شیحا = صحيح مسلم ٣٢٣).

٤- بەپێی توانا روونکردنەوەیەکی کورتو پوختم بۆ بابەتەکان کردووە. بەدڵنیاییەوە عەرزتان دەکەم: (ئەوەندەی توانیومە خزمەتی کتێبەکەم کردووە، لەخودا داوا دەکەم کە خودا بیکا بەزەخیرەی قیامەتمان. ئامین).

ئەمەیش روونکردنەوەی دانەرە، بۆ رەمزو هێماکان: (فالمُرَادُ بالسَّبْعَةِ: أحمد والبخارِيُّ وَمُسْلِمٌ وَأبوداودَ والترمِذِيُّ والنسائِيُّ وابن ماجة، وبالسِّتَّةِ: مَنْ عَدَا أحمد، وبالخَمْسَةِ: مَنْ عَدَا البخارِيَّ وَمُسْلِماً، وَقَدْ أقول: الأربعة واحمد، وبالأربعة مَنْ عَدَا الثلاثة الأوَل، وبالثلاثةِ: مَنْ عَدَاهُمْ وهذا الأخير، وبالمتفقِ عليه: البخاري ومسلمٌ، وَمَا عَدَا ذلِكَ فَهُوَ مُبَيَّنٌ وَسَمَّيْتهُ).

وەرگێڕ/ نوری فارس حمەخان حەسەن (٢/٦/٢٠١١) خادم الفقراء والعلماء والمشاريع.

# ١- نامەی پاکیو خاوێنی
# كِتَابُ الطَّهَارَةِ
## ١- باسی ئاوەکان
## بَابُ المِيَاهِ

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلْبَحْرِ: {هُوَ اَلطَّهُورُ مَاؤُهُ، وَاَلْحِلُّ مَيْتَتُهُ أَخْرَجَهُ الأَرْبَعَةُ وابن أبي شَيْبَةَ واللفظ لَهُ وَصَحَّحَهُ ابنُ خُزَيْمَةَ والترمذي}.

{رواه أبو داود (٨٣)، والنسائي (١ /٥٠ و ١٧٦ و ٧٠٧)، والترمذي (٦٩)، وابن ماجه (٣٨٦) وابن أبي شيبة (١٣١)، واللفظ له، وصَحَّحَهُ ابن خزيمة والترمذي. راجع ترجمة أبي هريرة: الإصابة (٢٠٢/٤) وطبقات ابن سعد (٣٦٢/٢، ٣٢٥/٤) وتهذيب التهذيب (٢٦٢/١٢) وحلية الأولياء (٣٧٦/١ - ٣٨٥) والبداية والنهاية (١٠٣/٨) وأسد الغابة (٣١٥/٥) والتاريخ الكبير (١٣٢/٦، ١٣٣) وتهذيب الأسماء واللغات (ق١) (٢٧٠/٢) برقم (٤٣٦) وسير أعلام النبلاء (٥٧٨/٢ - ٦٣٢) وصححه الألباني في صحيح الجامع (٦٩٢٥)}:

**ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە:**

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری خۆشەویستو نازداری (دروودو سڵاوو سۆزو میهرەبانی خودای گەورەی لێ بێ) پرسی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە کاتێ سواری کەشتی دەبین، لەدەریادا کەمێ ئاوی شیرین هەڵدەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بگرین، بەشی خواردنەوەمان ناکاو توونیمان دەبێ، جائایا بەئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین یانا؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەڵامی ئەو پیاوە ڕاوچییەدا دەفەرموێ: (بەڵێ دەستنوێژی پێ بگرن، چونکە ئاوی دەریا هەم پاکەو هەم پاکەوەکەریشە، وەدەریا مردارەوەبووشی حەڵاڵەو

گیانلەبەری ئاوی کاتێ دەمرێ هەتا نەگەنێ خواردنی دروستە). (تاج/١ زنجیرە: ٢١ ژمارە: ١٤٦ — باسی ئەحکامی ئاو).

(روونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە کۆمەڵێ لە فەرموودەزانە گەورەکان بە تەندروست (صەحیح)ی دادەنێن، وەك ئیبنو حیببانو ئیبنولمونذیر، تیرمزی فەرموویەتی لە پێشەوا بوخاریشم پرسی، لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە، فەرمووی: (فەرموودەیەکی صەحیحە).

٢- مەبەست لەگیانلەبەری ئاوی، ئەو گیانلەبەرانەیە، کە بەس لەئاوا دەژین، ئەگەر لەئاو دەربێن دەمرن، وەك ماسیو نەهەنگو مارماسی... تاد.

٣- ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەم سپی کۆمەڵەی هەژارەکانی صوففە بوو، صوففە سەکۆیەکی گەورە بوو، لەلای پشتی مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە بوو، لەمەدینە، لەسەرەتاوە جێگەی حەوانەوەی کۆچکار (موهاجیرین)ە هەژارەکان بوو، کەژمارەیان نزیکەی هەشتا کەسێ دەبوون، بەرە بەرە بوو بەمیوانخانەی ئیسلام، کە ئەو کۆچکارانەسەڵتە زەلامو بێ ژنوماڵو منداڵ بوون، جاربەجارێ ژمارەیان دەگەیشتە دووسەد کەس، گەلێ جاریش کەدەچووون بۆ غەزا، یا پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەیناردن بەملاولادا، هەتا موسوڵمانان فێری ئیسلامو قورئانو رۆشنبیری بکەن، ژمارەیان کەمتر دەبووەوە. وابـاوە کە ئەبو هورەیرە نـاوی عەبدولرەحانی کوڕی صەخر بوو.

ئەبو هورەیرە لەساڵی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا، موسوڵمان بوو، لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی ئەم غەزایە بوو، کەساڵی حەوتەمی کۆچی بوو، خۆی دەفەرموێ: (بەهەتیوی پەروەردە بووم، کە کۆچم کرد بۆ مەدینە هەژار بووم، بووم بەرەنجبەرو خزمەتکاری بوسرەی کچی غەزوان، خوای مەزن کارێکی وای کرد کە لەسەردەمی مەرواندا کەبووم بەمیری سەرشاری

مەدینە بووم بەمێردی بوسرە). ئەبو هورەیرە لەپیاوان (ریجال)ی بوخاریو موسلیمو تیرمیزیو نەسائیو ئەبوداوودو بەیهەقیو ئیبنو ماجەیە.

دوو گێڕانەوە هەیە سەبارەت بەناونانی بە ئەبو هورەیرە، خۆی دەفەرموێ: (شوانی ڕانیماڵی خۆمان بووم، پشیلۆکەیەکی بچکۆلەم هەبوو، بەشەو لەناو درەختێکا دام دەناو، بەڕۆژیش هەڵم دەگرتو یاریم پێ دەکرد، ئیتر بەم هۆیەوە ناویان نام ئەبو هورەیرە. بەکوردی واتە: پشیلەوان، یاخود: باوکی پشیلۆکە).

هەندێ دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم ناوەی لێ ناوە.

لەپاش ئیسلام بوونی تەواو تەواو هۆگری پێغەمبەر بوو، هەمیشە لە خزمەتیدا بوو، هەم خزمەتو بەردەستی دەکردو هەم فێری فەرموودەو زانستو وێڵو ئایین دەبوو، هەم پیتو فەڕو بەهرەو پیرۆزی لەکۆڕو دانیشتگاکانی حەزرەت وەردەگرت، خۆی دەگێڕێتەوە کەسکاڵای لە خزمەت حەزرەتدا کرد: کە مەترسی ئەوەی هەیە، کە فەرموودەکانی ئەوی لەبیر بچێ. فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ): (بەرماڵەکەت ڕاخە). منیش وام کرد، وەك لەخەزینەی غەیبەوە مشت دابگرێ، ئاوا بەمشت زانستو فەرموودەی تێکرد، ئەوجا فەرمووی پێم: (ئادەی کۆی بکەرەوە). منیش بەرماڵەکەم پێچایەوەو نووسانم بەسینگمەوە، ئیتر لەپاش ئەوە هیچم لەبیر نەچۆتەوە!

ئەبو هورەیرە یادکار (ذاکر)ێکی گەورە بوو، هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحاتو ویردو ذیکرو یادی خودا بوو، لەگەڵ ژنەکەیو نۆکەرەکەیدا، شەویان دەکرد بەسێ بەشەوە بەنۆرە هەرکەسەیان سێیەکی شەو، شەونوێژی دەکرد.

لەخزمەت پێغەمبەردا، دەچوو بۆ غەزا، بۆ حەج، بۆ سەفەر، لەناو هاوەڵەکانی پێغەمبەردا، کەسی تر، بەقەد ئەو، فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە

(٥٣٧٤) پێنج هەزارو سێ سەدو حەفتاو چوار فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەسەر فەرمایشتی مامۆستای عەینی، هەروا عەینی دەفەرموێ: (لەبوخاری شەریفدا (٤١٨) فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا (٥١٥) فەرموودەی هەیە، (٣٢٥) سێ سەدو بیست‌و پێنجیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاری‌و موسلیمن، واتە: (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ)ین، واتە: هەم بوخاری‌و هەم موسلیم، هەرکەسەیان بەڕشتە (سەنەد)ی خۆی ئەم (٣٢٥) فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، بەڵام مەرج نیە کە دەق (مەتن)و ڕشتەکەیان وەك یەك بێ.

کەواتە: (٤١٨ — ٣٢٥ = ٩٣) نەوەدو سێ فەرموودەیان لە ئەفرادی بوخارین، لەموسلیمدا نین، وە (٥١٥ — ٣٢٥ = ١٩٠) سەدو نەوەد فەرموودەیان لە موسلیمدا هەیە. بەڵام لەبوخاریدا نین.

شێخی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا، لە ئیماندا، لەڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٠، ٤٧٧٧)دا دەفەرموێ:

(کۆی فەرموودە دەرهێنراوەکانی ئەبو هورەیرە لەدەقە سەربەخۆکان، لە صەحیحی بوخاریدا (٤٤٦) فەرموودەن).

ئەبو هورەیرە یەمەنییە، لەخێڵی ئەزدە، کە دەچێتەوە سەر هۆزی دەوس، واتە: لەپێشا یەمەنییە، لەپاشا مەدینەیی، لە ذولحولەیفە، لەنزیك مەدینەوە نیشتەجێ بوو، لەوێ خانوویەکی هەبوو، لەدواییدا بەخێر دای بە ئازادکراوەکانی خۆی، دەیفەرموو: (پڕ بەدوو دەفرم، لە فەرموودەو زانست، لە پێغەمبەر خۆیەوە لەبەر کردووە، یەکێکیان ئەم فەرمایشت‌و فەرموودانەیە کە بەناو موسوڵماناندا پەخشی دەکەمەوە، خۆ ئەگەر ئەوی تریان بڵاو بکەمەوە، لەسەری ئەدەن لەگەردنم!).

زەینی زۆر ڕۆشن بوو، فەرموودەی زۆر زوو دەکردە بەر، حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی دەڵێ: (تۆ فەرموودەی وا دەگێڕیتەوە، کە من شتی وام نەبیستووە!) ئەویش عەرزی دەکا: (دایەگیان! تۆ کلدان‌و ئاوێنە

لەم لایەنەوە خەریکی کردبووی، بەڵام من هیچ شتێ سەبارەت بە فەرموودە خەریکی نەکردووم!).

پێشەوا بوخاری (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (زیاتر لە (٨٠٠) هەشت سەد کەس، لە صەحابیو تابیعی، لەهاوەڵو پەیڕەوان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە).

لەهاوەڵانی پێغەمبەر وەك: ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومەرو جابیرو ئەنەسو واثیلەی کوڕی ئەسقەع، لە پەیڕوان (تابعین)یش وەك: سەعیدی کوڕی موسەییەبو عوروەی کوڕی زوبەیرو ئەعرەجو مقبریو موحەررەری کوڕی ئەبو هورەیرە خۆیو کەسانی تریش.

خۆشی فەرموودەی لەم زاتانەوە گێڕاوەتەوە: لە ئەبو بکری صدیقو عومەرو فەزڵی کوڕی عەبباسو ئوبەییەی کوڕی کەعبو ئوسامەی کوڕی زەیدو عائیشەو کەسانی تریش.

لەتەمەنی حەفتاو هەشت ساڵیدا، لەساڵی پەنجاو هەشتی کۆچیدا، لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە، لەهەمان ساڵدا خاتوو عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر مردووە ئەبو هورەیرە نوێژی لەسەر کردووە. بۆ زێدە سودو بەهرە، لەم لایەنەوە بڕوانە:

١- تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم: ژمارە: ٨٤، ٩٧، ٩٨، ٩٩، ١٢٢، ١٩٥، ٤١٧، ٤١٩، ٥٨٣، لەبەرگی دوویشدا لەهەمان پەڕاو بڕوانە: ئەم ژمارانە: ٧٧٩، ١٠٦٦، ١٠٨٧، ١٢٠٦، ١٧٤٥، ١٨٠٠، ١٨٠٩. هەروا بڕوانە پوختەی صەحیحی موسلیم بەکوردی/ ١ ژمارە: ٢. هەروا بڕوانە تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی/٣ زنجیرە:٦٢ ژمارە: ٣٥٢١ هەتا ژمارە: ٣٥٢٦.

٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَلْمَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ} . {أَخْرَجَهُ الثَّلَاثَةُ، وصَحَّحَهُ أحمد)).

{أَبُـو داود (١/١٨، رقـم:٦٧) والتِرمِـذي (١/٩٥، رقـم: ٦٦ وقـال: حَـسَنْ، والنَّسائِيُّ (١/١٧٦، رقم: ٣٦٢) والـدار قُطِنـيُّ (١/٢٩) والبَيْهَقِـيُّ (١/٢٥٧، رقـم: ١١٤٦) وأحمد وصَحِحهُ (٣/٨٦، رقم: ١١٨٣٣)}؛

**ئەم فەرموودەیە لەتاجدا ئاوایە کە ئەمەی ئێرە پوختەکەیەتی:**

**ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: گـوێم لێ بوو: دەیانگوت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): ئـەو ئـاوەی کـە تـۆ دەیخۆیتەوەو بەکاری دەهێنـی، بـۆ نـانو چێـشتو دەسـتنوێژو شـتی وا، ئـەوە لەبیری بـوضاعـە دەیهێـنن، ئـەو بیرەیـش گـۆشـتی سـەگی تۆپیـوو پـەڕۆی بـێ نوێـژی ژنـانو پیـسایی ئـادەمیزادی تـێ دەکـەوێ، بەتایبـەت لـەکاتی سـێڵاوو لافاودا، جا لـەپاش ئـەم روونکردنەوەیـە، بۆمـان بـەیان بفـەرموو کـە حـوکمو بڕیاری ئەم ئاوە چییە؟**

**پێغەمبـەریش (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەو ئـاوە هـەم پاکـەو هـەم پاکەوەکـەرە، چونکە گەیـشتۆتە ڕادەی قولـەتێنو بـەپێی شـەرع کەبناغەی لەسەر ئاسانکارییە، بەهیچ پیس نابێ).**

**(روونکردنەوە):**

**{بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٤٧}**

**١- ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لێ بـێ) یەکێکـە لەهاوەڵـە مەزنەکانی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـەڕۆژی غـەزای ئوحـوددا، لەبـەر منـداڵی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ڕێگـەی پـێ نـەدا، کـە بەشـداری لـەو غەزایـەدا بکـا، بـەڵام لـەوەدوا، لەخزمـەت حەزرەتـدا، لـەڕیزی سـوپای ئیـسلامدا، ئامـادەی دوازدە غـەزاو جـەنگو نەبـەرد بـوو، بـاوکی – کەناوی مـالیکی کوڕی سینان بـوو – لەغـەزای ئوحوددا شـەهید کـرا، ئـەبو سـەعید – کەناوی سـەعیدی کوڕی مـالیکی کوڕی سـینانە – هـەزارو سـەدو حـەفتا فـەرموودەی هەیـە، لەبوخاریـدا شەسـتو دوو فـەرموودەی هەیـە،**

لەصەحیحی موسلیمدا نەوەدو هەشتی هەیە، چل‌و شەشیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم پیری بوخاری‌و هەم پیری موسلیم هەرکەسەیان بەرشتەی خۆی، ئەو فەرموودانەی دەرهێناوە.

ئەبو سەعید ئەنصارییە، خەزرەجی‌یەبۆیە پێی دەگوترێ خودری، چونکە لەبەرەی خودرییە، کە تیرەیەکن لەتیرەکانی ئەنصار، (أنصار= یاریدەدەران= پشتیوانان). ئەنصار بۆیە پێیان دەگوترێ (ئەنصار) چونکە خەڵکی مەدینەن، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ مەدینە، ئەوان پشتی ئیسلامیان گرت‌و بوون بەیاریدەدەرانی پێغەمبەر.

ئەبو سەعید یەکێکە لەزانایانی هاوەڵان، پیاوێکی هۆشمەندی داناو زانا بوو، فەرموودەی زۆری بەرەوانی لەبەر بوو، ئامادەی پەیمانی درەختەکە (بیعة الشجرة) بووە، ماوەیێ فەتوای دەدا، یەکەم شەڕگا کە ئامادەی بوو غەزای خەندەق بوو. ئەبو سەعید دەفەرموێ: کە پێغەمبەرو سوپاکەی لە شەڕی ئوحوددا گەڕانەوە، چووین بەپیریانەوە، تەماشای منی کردو فەرمووی بەمن: (تۆ سەعیدی کوڕی مالیکیت؟).

گوتم: بەڵێ ئەوم، دایك‌و باوکم بەقوربانت بن، ئەوجا نزیك بوومەوە لێی‌و ئەژنۆیم ماچ کرد، فەرمووی پێم: (باوکت لەم غەزایەدا شەهید بووە، خودا پاداشی باشت بداتەوە). ئەبو سەعید لە خزمەت پێغەمبەردا دوازدە غەزای کردووە، کۆمەڵێ لەهاوەڵان‌و پەیڕەوان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەبو سەعید هەشتاو شەش ساڵ ژیاوە، لەساڵی چل‌و حەوتی کۆچیدا مردووە، لەگۆڕستانی بەقیع نێژراوە، کەوا لەپاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەردا. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ١٩ + تاجول ئوصول/١ زنجیرە: ١٤٧ ژمارە: ١٤٧}.

ئەبو سەعید دەفەرموێ: لەغەزای ئوحوددا، روخساری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زامار بوو، باوکم خوێنەکە دەلێسێتەوەو قووتی

دەدا، وەنايتفێنێتـەوە، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئەگەر کەسێ حەز دەکا تەماشای کەسێ بکا، کەخوێنی مـن تێکـەڵی خـوێنی ئەو بووبێ، با تەماشای مالیکی کوڕی سنان بکا).

٢- بـۆ ژیاننامـەی ئەبوسـەعیدی خـودری بڕوانـە ئـەم سەرچـاوە عەرەبیانـە: الإصابة (٣٥/٢) أسَدُ الغابـة (٢٨٩/٢) حليـة الأوليـاء (٣٦٩/١ - ٣٧١) الأسـتيعاب (٦٠٢/٢) سـير أعـلام النـبلاء (١٦٨/٣ - ١٧٢) تـذكرة الحُفَّـاظ (٤١/١) تهذيب التهذيب (٤٧٩/٣ - ٤٨١).

٣- ئاوی پاك کە گەیشتە ڕادەی قولەتێن، بەتێکەوتن و لێکەوتنی پیسی پیس نابێ، مەگەر بەهۆی ئەوەوە ڕەنگی، یان بۆنی، یان تامی بگۆڕێ،، ئەو کاتە پیس دەبێ، بڕوانە: ژمارە (٣).

٣- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ اَلْبَاهِلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَلْمَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ، إِلَّا مَا غَلَبَ عَلَى رِيحِهِ وَطَعْمِهِ، وَلَوْنِهِ}. {أَخْرَجَهُ إِبْنُ ماجه وَضَعَّفَهُ أَبو حاتم.

{أخرجه ابن ماجه (١/١٧٤، رقم: ٥٢١) الطبراني (٨/١٠٤، رقم: ٧٥٠٣) البيهقي في المعرفة (٢/٨٢، رقم: ١٨٤٦) قالَ النووى في المجموع (١/١١٠) ضعيف لايَصِحُّ الإحتجاجُ بِهِ السلسلة الضعيفة: ٢٦٤٤}:

ئەبو ئومامەی باهیلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (گـشت ئـاوێ پاکـە، هـەرکاتێ ئـاو گەیشتە ئەندازەی قولەتێن، بەپێی شەرع کە بناغەی لەسەر ئاسانکارییە، ئیتر پیسی هەڵناگرێ و بەهیچ شتێ پیس نابێ، مەگەر بەشتێ کە بۆنی، یان تـامی، یان ڕەنگی بگۆڕێ).

٤- وَلِلْبَيْهَقي: (الماءُ طَاهِرٌ إِلاَّ إِنْ تَغَيَّرَ رِيحُهُ، أَو طَعْمُهُ، أَوْ لَونُهُ بِنجاسَةٍ تَحْدُثُ فِيهِ).

واتــه: بەیهــەقی (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) بەڕشــتەی خــۆی ئــەم فەرمووودەیە بەرز دەکاتەوە، بە پەیوەستی هەتا سەر پێغەمبـەر دەفـەرموێ: ئەبو ئومامەی باهیلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەموو ئـاوێ پاکـەو پاکەوەکەریشە، مەگـەر بەهۆی تێکەوتنی پیسییەکەوە، بـۆنی بگـۆڕێ، یـان تـامی بگـۆڕێ، یـان ڕەنگـی بگۆڕێ، ئەوکاتە پیس دەبێ).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبوئومامــەی بــاهیلی، نــاوی صــودەیی کــوڕی عەجلانــە، هــاوەڵی پێغەمبەرە، لەهۆزی ئەل‌باهیلییە، خۆی دەفەرموێ: کاتێ {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} : لـە قورئـانی پـیرۆزدا، لەپەسـنو مـەتحی بەشـدارانی بەیعـەتی ریـضواندا هاتـە خـوارەوە، عـەرزی خۆشەویـستم کـرد: قوربان! منیش یەکێك بووم لەو کۆمەڵەی کە لەژێر ئەم شێخەڵەدا پەیمانم دا بەتۆ، فەرمووی: (تۆ لەمنیو منیش لەتۆم).

هـەروا ئـەبو ئومامـە خـۆی دەفـەرموێ: لەغەزایـەکا چوومە خزمـەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: قوربـان! نـزام بـۆ بکـە کـە خودا لەم غەزایەدا شەهید بوونم پـێ خـەڵات بفـەرمووێ. بـەڵام خۆشەویـست فەرمووی: (اَللّٰهُمَّ سَلِّمْهُمْ وَغَنِّمْهُمْ). واتە: (خودایە! لەم غەزایەدا، هەم بێـوەیو سەلامەتیان بکەو، هەم دەستکەوتو تالانی حەڵاڵیان پێ خەڵات بفەرموو!).

ئەبو ئومامە لەحومس، لەشام دەژیـا، لەپێـشا لەمیـصر نیـشتەجێ بـوو، دەڵـێن: دواهـەمین کـەس بـووە، لـەهاوەڵانی پێغەمبـەری ئـازیز، کـە لەشـام مـــردووە. گێڕانــەوەکانی زۆری لــە خۆشەویــستەوە ئــەنجام داوە، زۆرینــەی گێڕانەوەکانی شامیەکان دەیگێڕنەوە، لە فەتحولباری پێشەوا عەسقەلانیو، لە

عومدەتولقاری عەللامەی عەینیدا، دەفەرموێ: (سێ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە).

لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە: (١٠٢٠) دەفەرموێ: (جارێ ئەبو ئومامە صودەی کوڕی عەجلانی ئەل-باهیلی (ڕەزای خودای لێ بێ) هەوجارو یەرەق‌و شتی تری، لەکەرەسەی جووت‌و فەلایی بینی، فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت، دەیفەرموو: (ئەمە سەربکا بەهەر ماڵێکا، خودا دەیکا بەمایەی ژێردەستی‌و کەساسی بۆیان).

ئەبو ئومامە لەتەمەنی نەوەدو یەك ساڵیدا، لەساڵی هەشتاو یەکی کۆچیدا، لەشام بەمردنی خودا دەمرێ (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ). بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٣ ژمارە: ١٠٢٠ + پوختەی صەحیحی موسلیم: زنجیرە/١٤٧٩ ژمارە:١٩٣٦).

٥- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {إِذَا كَانَ اَلْمَاءَ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلْ اَلْخَبَثَ} وَفِي لَفْظٍ: {لَمْ يَنْجُسْ}. أَخْرَجَهُ الأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ ابنُ خُزَيْمَةَ الحاكِم وابنُ حِبَّانَ}.

{أخرجه أحمد (٢/٣٨، رقم: ٤٩٦١) والشافعي (١/٧) وابن أبي شيبة (١/١٣٣، رقم: ١٥٢٥) وأبوداوود (١/١٧، رقم: ٦٣) والترمذي (١/٩٧، رقم: ٦٧) والنسائي (١/١٧٥، رقم: ٣٢٨) وابن ماجه (١/١٧٢، رقم: ٥١٧). صحيح الجامع: ٧٥٨}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجا ئاوایە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودا لەخۆی‌و باوکی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرریان پرسی (دروودی خوای لەسەر بێ) قوربان! ئاو هەیە لەچۆڵ، ماڵیات‌و ئاژەڵ‌و دڕندە دەچنە سەری‌و لێی دەخۆنەوەو، دەمی تێدەخەن‌و گەڵێ جار مەلەی لێ دەکەن‌و وادەبێ گمیزیشی تێ دەکەن، جا ئایا ئەو ئاوە بەمە پیس دەبێ یا نا؟ فەرمووی: (کاتێ ئاو بوو بەقولەتێن. واتە: بەدوو

جەڕەی گەورە) ئیتر پیسی هەڵناگرێ). لەبێژە (لەفظ)یەکا: (کاتێ ئاو گەیشت بە قولەتێن پیس نابێ!) (تاج/١ زنجیرە:٢١ ژمارە: ١٤٩).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە لەزۆر لاوە لاوازە، واتە: زەعیفە، گەرچی هەندێ لەپێشەوایانی فەرمووده بەساغو تەندروست (صحیح)یان داناوە، بەڵام جەماوەری شەرعزانەکان کاری پێ دەکەن.

٢- ئیبنو عومەر ناوی عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتابە، ساڵی (٣) سێی پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە، هەندێ دەفەرموون: لەپێش هاتنی سرووش (وەحی)دا بۆ پێغەمبەر، بەساڵێ لەدایك بووە، بەمنداڵی موسوڵمان بووە لەگەڵ باوکیدا، هەندێ دەڵێن: لەپێش باوکیدا موسوڵمان بووە. لەگەڵ باوکیدا لەتەمەنی دە ساڵیدا، کۆچی کردووە بۆ مەدینە، یەکێکە لەو شەش هاوڕێیانەی پێغەمبەر، کە فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە، یەکێکە لەو چوار کەسە کەناویان عەبدوڵلایەو، ناسراون بە (عەبادیلەی ئەربەعە). واتە: چوار عەبدوڵلاکە، کە دووەمیان ئیبنو عەبباسە، سێیەمیان عەبدوڵلای کوڕی عەمرە، چوارەمیان عەبدوڵلای کوڕی زوبەیدە، دوو هەزارو شەش سەدو سی (٢٦٣٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەصەحیحی بوخاری پیرۆزدا (٢٥١) فەرموودەی هەیە، لەصەحیحی موسلیمدا (٢٠١) فەرموودەی هەیە (١٧٠) سەدو حەفتایان پەسەندی هەردوو پیری بوخاری‌و پیری مەسلیمە، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا = (١٧٠ + ٨١ + ٥٠ = ٣٠١ فەرموودە). بەگوتەیەکی تر (١٧٠) متفق علیهو (٨١) لەئەفرادی بوخاری‌و (٥٠) لەئەفرادی موسلیم یەکسانە بە: (١٧٠ + ٨١ + ٥٠ = ٣٠١).

لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا، بێجگە لە ئەبو هورەیرە کەسی تر بەقەد ئیبنو عومەر فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە، ئیبنو عومەر خوێنەوار بوو، ڕۆژانە قورئانی بەدەستەوە بوو، قورئانی دەخوێند، پیاوێکی قەویلەی سەوزە بوو،

واته: گەنم ڕەنگ بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مەتحی زۆری کردووە، هەتا مرد لەسەر ئەو شێوە ژیانو جۆرە خوداپەرستیانە بوو، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا، بە ئاگاداری پێغەمبەر لەسەریان بوو، زۆر بەوەرعو بەتەقوا بوو، شەونوێژی زۆری دەکرد، گەڵێ شەو چوار جار، یان پێنج جار، سەرخەوی دەشکاندو هەڵ دەسایەوەو دەستنوێژی دەگرتو دەستی دەکرد بەشەو نوێژ، خێری زۆری دەکرد، زۆر سەخی بوو، لەسەفەردا ڕۆژوی نەدەگرت، بەڵام لەماڵەوە، مەگەر چۆنها، دەنا هەمیشە بەڕۆژو بوو، هەموو ساڵێ حەجی دەکرد، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، شەست ساڵ مەجلیسی گەرم بوو، خەڵك پۆل پۆل دەهاتن بۆ خزمەتی، بۆ فەتواو فێربوونی سوننەتو یاسانامە (شەریعەت).

ئیبنو عومەر ئاگاداری تەواوی هەبوو، لە سوننەتی پێغەمبەرو لەڕاوبۆچوونی هاوەڵانی، موسوڵمانان لەدوورو نزیکەوە، دەستە دەستەو پۆل پۆل، دەهاتنە خزمەتی بۆ فەتواو شەرعکردنو فێربوونی زانستو فەرموودە. دەڵێن: شت نیە لەکاروباری پێغەمبەرو هاوەڵانو یارانی، کە ئیبنو عومەر نەیزانێ!!

جارێ شتێ لە ئیبنو عومەر دەپرسن، لەوەڵاما دەفەرموێ: نازانم. لەپاشا دەفەرموێ: (بۆچی ئێوە دەتانەوێ کە پشتی ئێمە بکەن بە پردی سەر دۆزەخ، خۆتان ڕزگار بکەنو ئێمە پێوە بکەن، چشتی هەڵە بکەنو لەپاساوا بڵێن: ئیبنو عومەر فەتوای ئەوەی بۆمان داوە!)

ئیبنو عومەر هەرچی لە پێغەمبەر دەبیست، زۆر بەباشی لەبەری دەکردو کاری پێ دەکرد، ئەگەر لە کۆڕێکی دانیشتندا خۆی لە خزمەتیدا نەبوایە، لە ئامادەبوانی خزمەتی دەپرسی، کە پێغەمبەر چی فەرمووەو چی کردووە، بە وردی پەیڕەوی ئەو کارانەی دەکرد، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردبوونی، زۆر حەزی لە پەیڕەویو تەتەبوعی شوێنەوارو

ئاثاری پێغەمبەر بوو، دێنی ئەو شوێنانەی دەكرد كە پێغەمبەر چووبوو بۆیان، یا ئەوشتانەی دەكرد كەكردبوویانی، لەو مزگەوتانەدا نوێژی دەكرد كە، پێغەمبەر نوێژی لێ كردبوون، هەموو جارێ كە یادی پێغەمبەری دەكرد دەگریا، خۆی مووفەڕك‌و پیرۆز دەكرد بەشوێنەوارو ئاسەواری پێغەمبەر، گوتەی بەهێزتر ئەوەیە كە لەتەمەنی هەشتاو حەوت ساڵیدا، لە ئەنجامی پیلانێكی حەجاجدا، پشتی پێی بەنێزەكی ژەهراوی، زامارکراو، چەند رۆژێ نەخۆش دەكەوێ‌و دەمرێ، حەجاج نوێژی لەسەر تەرمەكەی دەكات، ساڵی حەفتاو سێی (٧٣)ی كۆچی دەبێ، لە فەخ دەمرێ، كەوا لەنزیك مەككەوە. هەندێ دەفەرموون: لە مەككە، لەساڵی (٧٣)ی كۆچی مردووە، لە ذیتەوا، لەگۆڕستانی (المهاجرین) بەخاك سپێردراوە. {بڕوانە ئەم سەرچاوانە: پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ٨ + پوختەی موسلیم بەكوردی: ژمارە: ٥ + تاج/ ٣ وەرگەڕاوە كوردیەكە. زنجیرە: ٢٧ ژمارە: ٣٣٩٨ هەتا ٣٤٠٠}.

٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَغْتَسِلُ أَحَدُكُمْ فِي اَلْمَاءِ اَلدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ}.

{أَخْرَجَهُ مُسْلِمُ (٢٣٦/١ رقم: ٢٨٣) وابنُ مَاجَهْ (١٩٨/١، رقم: ٦٠٥) ابن الجارود (ص ٢٦، رقم: ٥٦) وابن خزيمه (٤٩/١ رقم: ٩٣) وأبو عَوانة (٢٣١/١، رقم: ٧٧٩) وابن حِبَّان (٦٢/٤، رقم: ١٢٥٢) (مختصر صحيح مسلم: ١١١ = ٦٥٤ ترقيم شيْخ خليل مأمون شيحا). (تاج/١ زنجيره: ٢١ ژماره: ١٥٥)}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر یەكێ لەئێوە لەشی پیس بوو، با لەئاوی كەمی ڕاوەستاودا خۆی نەشۆرێ).

٧- وَلِلْبُخَارِيِّ: {لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي اَلْمَاءِ اَلدَّائِمِ اَلَّذِي لَا يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ}.

{أخرجه البخاري (١/٩٤، رقم: ٢٣٦) مسلم (١/٢٣٥، رقم: ٢٨٢) وأبو داود (١/١٨، رقم: ٦٩) والنسائي (١/٤٩، رقم: ٥٨) وابن خزيمة (١/٥٠، رقم: ٩٤) (تەجریدی بوخاری/ ١ ژمارە:١٧١ = ٢٣٩ فتح الباری) (پوختەی موسلیم: ١١٢ = ٦٥٥ ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا) (تاج/١ زنجیرە: ٢١ ژمارە: ١٥١)}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان میز مەکەنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە، کەلەبەری نەڕوا، لەپاشیشا بچێ خۆی تیا بشۆرێت!).

٨- وَلِمُسْلِمٍ: "مِنْهُ" وَلِأَبِي دَاوُدَ: {وَلَا يَغْتَسِلُ فِيهِ مِنْ اَلْجَنَابَةِ}.

{أخرجه مسلم (١/٢٣٥، رقم: ٢٨٢) وابن أبي شيبة (١/١٣١، رقم: ١٥٠٣) وأبو داود (١/١٨، رقم: ٧٠). (پوختەی موسلیم. وەرگێڕانی نوری فارس، ژمارە: ١١١ = ژمارە: ٦٥٤ شیحا)}:

لەباتی بێژەی (ثم يَفْتَسِلُ فِيهِ) ئاوایە (ثُمَّ يَفْتَسِلُ مَنْهُ) وە. واتە: دوایی خۆی لێ بشۆرێ، یا خۆی پێ بشۆرێت).

ئەم فەرموودەیە لە گێڕانەوەی ئەبو داوودا. لەجیاتی (ثُمَّ يَفْتَسِلُ فِيهِ) ئەمەیە (وَلاَيَفْتَسِلُ فِيهِ)یە، وە لەباتی (وَهُوَ جُنُبٌ) ئەمەیە (مِنَ الجَنابِة)یە. کە ئەنجامی واتای هەموو بێژەو گێڕانەوەکان لەیەکەوە زۆر نزیکن، کە میزکردنە ناو ئاوی ڕاوەستاوە، ئەم ڕوونکردنەوەی دەوێ:

(ڕوونکردنەوە):

١- لەڕاستیدا، ئاو سامانێکی باشە، بەفیڕۆدانی بەخۆڕایی، کارێ ناباشە، مرۆڤ تا دەتوانێ پاکییەکەی بپارێزێ.

٢- ئەگەر دنیا بوو، میزتان کردە ئاوی ڕاوەستاوەوە، چ خۆتان میزی تێ بکەن، چ کەسێ تر، ئیتر نەخۆتانی تێدا بشۆن و نە بە ئاوەکەی لەدەرەوەی ئاوەکەدا، خۆتان بشۆرن، ئیتر خودی خۆشۆردنەکە لەبەر خۆ فێنك کردنەوەو

پاكوخاوێنی بێ، یا لەبەر دەركردنی لەشپیسی بێ، جیاوازی نیە، بەر ئەم نەهیە دەكەوێت.

٣- دانەر مامۆستای عەسقەلانی، فەرموودەكەی موسلیم كە ژمارە (٦) شەشە، دایناوە بە ئەصڵ بۆ ژمارە (٧)و بۆ ژمارە (٨).

٤- بەشێوەی گشتی سەراوكردن لەناو ئاوی پاكا، وەستاوبێ، یا لەبەری بڕوا، كاری ناباش‌و ناپەسەندە.

٩- وَعَنْ رَجُلٍ صَحِبَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَنْ تَغْتَسِلَ اَلْمَرْأَةُ بِفَضْلِ اَلرَّجُلِ، أَوْ اَلرَّجُلُ بِفَضْلِ اَلْمَرْأَةِ، وَلْيَغْتَرِفَا جَمِيعًا}. {أَخْرَجَهُ أَبُو داوُد وَالنَّسَائِي، وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ}.

{أَخْرَجَهُ أبو داود رقم (٨١)، وَالنسائِي (١/ ١٣٠)}:

پیاوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی كردووە لەوە: كە ژن بەپاشماوەی ئاوی خۆشۆردن (غوسڵ)ی پیاو، خۆی بشۆرێ، یان پیاو بە پاشماوەی ئاوی خۆشۆردنی ژن خۆی بشۆرێ، واباشە كە ژن‌و مێرد بەیەكەوە خۆیان بشۆرن‌و، بەمست یان بەجامێ لەدەفرەكە ئاو هەڵبگۆزن‌و خۆیانی پێ بشۆرن).

(ڕوونكردنەوە):

١- خۆشۆردن بەئاوێ لە كەسێكی تر مابێتەوە، ناباشە.

٢- مەبەست لەپیاوو ژن كە بەیەكەوە گەرماو بكەن: ژن‌و مێردن.

٣- یەكێ لەحیكمەت‌و دانایی، ئەم نەهیە ئەوەیە: زۆرجار ژن، یان كچ لە گەرماوا خۆی دەشوا، یان لەحەوزی پیاوان خۆی دەشۆرێ، ئاو (مەن)ی پیاو، لەوێ بەجێماوە، بەبێ ئەوەی كە پێی بزانێت، ئەو مەنیە دەگاتە ناو منداڵدانی‌و، دەبێ بەسك‌و دەبێ بەكێشەو بەرەی گەورە بۆ ژنەكەو بۆ كەس‌وكارەكەی بەتایبەتی ئەگەر ژنەكە شووی نەكردبێ، یان بێوەژن بێ،

وەشتی وا، وەك بیستوومانە زۆر روویداوەو ئافرەتی بێ تاوان باجەکەی داوە.
جا لەم رووەوە، وا باشە بۆ ژنو پیاو لە روودانی شتی وا خۆیان بپارێزن.

١٠- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَغْتَسِلُ بِفَضْلِ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا}.

{أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ فِي صَحِيحِهِ برقم (٣٢٣ = ٧٣١ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا)}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ = (رەزای خودا لەخۆیو باوکی) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) زۆرجار، بەپاشماوەی ئەو ئاوە خۆی دەشۆردو غوسڵی خۆی پێ دەردەکرد، کە مەیموونەی هاوسەری، لەپێش ئەودا، خۆی لێ شۆرد بوو، وەغوسڵی خۆی پێ دەرکردبوو).

(روونکردنەوە):

١- ئیبنو عەبباس ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، باوکیان برا بوو، یەکێکە لەو یازدە مامەی پێغەمبەر کە موسوڵمان بوون، ئەو نۆکەی تریان ئیسلام نەبوون، بۆ ژیاننامەی عەبباسی باوکی، بڕوانە: ژمارە: (٢٥) لەپەڕاوی پوختەی صەحیحی موسلیم، وەرگێڕانی نوری فارس.

ئەم زاتە پایە بەرزە ناسراوە: بەحیبری ئوممەتو مەلای هەرە گەورەی ئیسلامو تەرجومانی قورئان، چونکە بەڕاستی دەریای زانستو دانایيو روونکردنەوەی قورئانە، یەکێکە لەو شەش هاوەڵانەی کە فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە، ئەم فەرموودەیەی ئیبنو عەبباس دانانرێ بەلابردنی پەردە لەسەر نهێنییەکانی خێزانی پێغەمبەر، چونکە مەیموونە پووری ئیبنو عەبباسە، خوشکی دایکیەتی، وە روونکردنەوەیە بۆ بڕیارێکی شەرعی.

ئیبنو عەبباس (١٦٦٠) فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا (٢١٥) فەرموودەی هەیە، لەموسلیمدا (١٤٢) فەرموودەی هەیە، نەوەدو پێنجیان پەسەندی

هەردوو پیری بوخاری‌و موسلیمە. کەواتە کۆی فەرموودەکانی ئیبنو عەبباس لە صەحیحەیندا = (٢١٥ — ٩٥ = ١٢٠ = ئەفرادی بوخار) + (١٤٢ — ٩٥ = ٤٧ = ئەفرادی موسلیم). کەواتە: (٩٥) پەسەندی هەردوولا + ١٢٠ ئەفرادی بوخاری + ٤٧ ئەفرادی موسلیم = ٢٦٢ فەرموودە، کۆی فەرموودەکانی ئیبنو عەبباس لە صەحیحەیندا.

ناوی دایکی ئیبنو عەبباس: لوبابەی کچی حاریثە، لەپێش کۆچدا بە (٣) سێ ساڵ لەدایك بووە، کاتێ پێغەمبەر وەفاتی کرد، ئەو تەمەنی (١٠) دە ساڵ بوو، لەتەمەنی (٧١) ساڵیدا، لە طائیف، لەساڵی (٦٨)ی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە، لەکۆتایی تەمەنیدا کوێر بووە، کە وەفاتی کرد، موحەممەدی کوڕی الحنیفە، نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد. ئیبنو عەبباس پیاوێکی کەڵەگەتی سپی‌و سووری قەویلکە بوو.

١١– وَلِأَصْحَابِ "اَلسُّنَنِ": {اِغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي جَفْنَةٍ، فَجَاءَ لِيَغْتَسِلَ مِنْهَا، فَقَالَتْ لَهُ: إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا، فَقَالَ: "إِنَّ اَلْمَاءَ لَا يُجْنِبُ"} . وَصَحَّحَهُ الترمذيُّ وَابْنُ خُزَيْمَةَ.

{أخرجه ابن خزيمة (٤٨/١، رقم: ٩١) وأبو داود (١٨/١، رقم: ٦٨) والترمذي (٩٤/١، رقم: ٦٥) وقال: حسن صحيح، والنسائي (١٧٣/١) وابن ماجه (٣٧٠، ٣٧١)}؛

لەتاجا (ب/١ زنجیرە: ٢١ ژمارە: ١٥٤) ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودا لەخۆی‌و باوکی بێ) فەرمووی: یەکێ لە ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسوێنەیەکا خۆی شۆرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتەوە، ویستی دەستنوێژی لێ بگرێ، یا خۆی لێ بشۆرێ، ژنەکەی پێی گوت: ئەی پیغەمبەری خودا! خۆ من لەشم پیس بوو، کە خۆم لەو ئاوە شۆرد، ئیتر تۆ

چۆن خـۆتی پـێ دەشـۆری یـان دەسـتنوێژی لێ دەگـری؟ فـەرمووی: (درودی خوای لەسەر بێ) (خۆ ئاوەکەیش لەشی پیس نابێ، شتی وا قەیدی نییە!).

١٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {طَهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذْ وَلَغَ فِيهِ اَلْكَلْـبُ أَنْ يَغْـسِلَهُ سَـبْعَ مَـرَّاتٍ، أُولَـاهُنَّ بِالتُّرَابِ}.

{أخرجـه مـسلم (٢٧٩ = ٦٤٩ شـيحا = ١١٩ پوختـەی موسـليم) (تجريـد البخاری/١ رقم: ١٣٢ = ١٧٢ فتح الباری) وأبو داود (١/١٩، رقم: ٧١) والنسائی (١/٥٢، رقم: ٦٤) وابـن ماجـه (١/١٣٠، رقـم: ٣٦٤) والترمـذی فـی سـننهِ بـرقم (٩١)}:

له تاجا (بەرگی/١ زنجيره: ٢٢ ژماره: ١٦٢) ئاوایه:

ئـەبو هـورەیره (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ سەگ، یا بـەراز دەمـی نایـە نـاو حاجـەتو قاپتانەوە، هەرچی تێدایە بیرێژن، ئەنجا حەوت جار بـە ئـاوی پـاك بیشۆرن، یەکەمجار بە خۆڵاو بێ، ئیتر ئەوە پاکی دەکاتەوە).

لەگێڕانەوەیـەکی تیرمزیـدا فـەرمووی: (دواییـنیـان، یـان فـەرمووی: حەوتەمیان بەخۆڵاو بێت!).

١٣- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ (فِي اَلْهِرَّةِ): {إِنَّهَا لَيْسَتْ بِـنَجَسٍ، إِنَّمَـا هِـيَ مِـنْ اَلطَّـوَّافِينَ عَلَـيْكُمْ} أَخْرَجَـهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ. وَابْنُ خُزَيْمَةَ}.

{أَخْرَجَـهُ أبـو داود (١/١٩، رقـم: ٧٥) والترمـذی (١/١٥٣، رقـم: ٩٢) والنسائی (١/ ٥٥، رقم: ٦٨) وابن ماجـه (١/١٣١، رقـم: ٣٦٧) وابـن خزيمـة (١/ ٥٥، رقم: ١٠٤) والدار قطنی (١/٧٠) والحـاكم (١/٢٦٣، رقـم: ٥٦٧) وصـححه البخاری (سُبُلُ السلام/ ١ص٢٠ رقم:حسب ترقيمة)}:

لە تاجا (بەرگی/ ١ زنجیرە: ٢١ ژمارە: ١٥٦) ئاوایە، دەیکەین بە روونکردنەوە بۆ ئێرە تا بەباشی لە مەبەستی فەرمووودەکە تێ بگەین.

کەبشەی کچی کەعب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو قەتادەی خەزورم هاتەوە، ئاوی دەستنوێژم لە قاپێکا بۆ دانا، پشیلەیەك هات لێی خواردەوە، ئەبو قەتادەیش قاپەکەی لار کردەوە بۆی تا پشیلەکە تێر ئاوی خواردەوە، کەمنی بینی سەرەنجی دەدەم، فەرمووی: ئەی برازام! ئەوە بەلاتەوە سەیرە؟ گوتم: بەڵێ: فەرمووی: بەلاتەوە سەیر نەبێ، چونکە من کاری ناباشم نەکردووە، من خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: (پشیلە پیس نییە، بەڵکوو پاکە، چونکە پشیلە لەڕیزی کارەکەرو نۆکەرو ئەوانەیە، کە بۆ خزمەت بەسەرتانا دەخولێنەوە).

(روونکردنەوە):

١- کەبشەی کچی کەعب کوڕی مالیك یەکێکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر.

٢- ئەبو قەتادە ناوی حاریثە، یا نوعمان، یا عەمری کوڕی ڕەبیعییە، نازناوی (فَارِسُ رَسُولِ اللّٰهِ)یە، واتە: شاسوارەکەی پێغەمبەری خودا. لە خزمەت حەزرەتدا ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەقو غەزاکانی تری پاش خەندەق بوو، بەڵام واقاوە کە ئامادەی غەزای بەدر نەبووە، ئەنصارییە، سەدو حەفتا فەرموودەی لەپەڕاوەکانی فەرموودەدا هەیە، سەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم بوخاریو هەم موسلیم ئەو یازدە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، هەرکەسەیان بەڕشتەی تایبەتی خۆی، بێجگە لەم یازدەیەی کە پەسەندی هەردوو پیرن، بوخاری دوو فەرموودەی تری ئەوی گێڕاوەتەوە، موسلیمیش بێجگە لەو یازدەیە هەشت فەرموودەی تری ئەوی گێڕاوەتەوە. واتە: کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریدا دەکاتە: (١١ + ٢ = ١٣) فەرموودە، وەکۆی فەرموودەکانی لە موسلیمدا دەکاتە:

(١١ + ٨ = ١٩) فـەرمووده. سـەرجەمی فـەرموودەكانی لـە بوخـاریو موسـلیمدا دەكاتە (١١ + ٢ + ٨ = ٢١)فەرمووده.

ڕاجیـایی هەیـە لەشـوێنی مردنیـدا، هەنـدێ دەفـەرموون: لـە مەدینـە مردووە، هەندێ دەڵێن: لە كووفە مردووه، لەساڵی پـەنجاو چواری كۆچیدا، لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا فەرمانی هەقی یەزدانی پاكی بـەجێ هێنـاوە (ڕەزای خودای لێ بێ).

لەزانـستی فـەرموودەدا، زانینـی زێـدو شـوێنی ژیـانو كـاتو جێگـەی مـەرگو چـەندێتیو چـۆنێتی ژیـانو تەمـەنو، سـاڵی مـەرگی فـەرموودەزان (ڕاوی)و جێگەی دانیشتنیو نیشتەجێ بوونیو ناوی ناسیاوی، بایـەخی باشی خۆی هەیە، زۆر جار دەبێ بە سەرچاوە بۆ ڕوونكردنەوەی فەرموودەكە، یا بۆ لـەباریو نالـەباریی ڕشـتەی فەرموودەكـە. بۆنموونـە: بـەپێی مـەرجی پـیری بوخاری. بە یەكگەیشتنی فەقێو مامۆستا، بۆ گێڕانەوەی فەرمووده، لەلایەنی ئـەو فەقێیـەوە، لـەو مامۆسـتایەوە پێویـستو مەرجـە، واتـە: دەبـێ هـەردوولا (فەقێو مامۆستاكەی) هاوچەرخ بن، بەبەڵگەی گونجاو چەسپابێ، كـە بەیـەك گەیشتوونو یەكتریان بینیوه.

نموونەیەكی تر: ئیمامی حەمزەی مامەی پێغەمبەر، لەغەزای ئوحـوددا شــەهید بــووە، كەواتــە گریمــان كەســێ لــەوەوە داســتانی غــەزای خەنــدەق بگێڕێتـەوە، چـۆن شـتی وادەبـێو ڕێـی تـێ دەچـێ؟ چونكە پێـشەوا حـەمزە یەكێك بووە لەپاڵەوانەكانی غەزای بەدر، كە لە سـاڵی دووەمـی كۆچیدا ڕووی داوە، لە غەزای ئوحـوددا شـەهید بـووە، كـە لـە سـاڵی سـێیەمی كۆچیدا ڕووی داوە، دەی چـۆن عـەقڵ دەیگـرێ كـە ئیمـامی حـەمزە داسـتانو دەنگوبـاسو هەواڵی غەزای خەندەق بگێڕێتەوە، كە لە ساڵی چوارەمی كۆچیدا ڕووی داوە.

بێجگـە لـەم ئـەبو قەتادەیـە، لـەناو هـاوەڵانی پێغەمبـەردا، كەسـێكی تـر نییـە، كـە ناسـناوی (لەقـەب)ی ئـەبو قـەتادە بـێ، كەواتـە: ئەگـەر یـەكێ

فەرموودەیێ بداتە پاڵ ئەبو قەتادەیەکی تر، لەهاوەڵانی پێغەمبەر، قسەکەی جێگەی گومانێکی گەورەیە، بگرە درۆیەکی رووتە، چونکە بەپێچەوانەی فەرمایشتو ڕای پسپۆڕانی ئەم زانستەوەیە.

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) لەلایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، لەهەموو جەنگو شەڕگاکانیدا لەگەڵیدا بوو، کاتێ وەفاتی کرد، عەلی خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، حەوت (أَللّٰـهُ أَكْبَـرِ)ی تیادا کرد. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری /١ ژمارە: ١٣١ = ١٥٣ فەتحولباری + پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ١١٤}.

١٤- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي طَائِفَةِ اَلْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ اَلنَّاسُ، فَنَهَاهُمْ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمَّا قَضَى بَوْلَهُ أَمَرَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ" فَأُهْرِيقَ عَلَيْهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{رواه البخاری (٢١٩) ومسلم (٢٨٤ = ٦٥٧، ٦٥٨، ٦٥٩ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا). وأخرجه الترمذی رقم (١٤٨) وابن ماجه رقم (٥٢٨) والنسائی (٤٧/١، ٤٨) تجريد البخاری بالکوردی (١٦١ = ٢٢٠، ٦١٢٨) (پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ١٨٦ = ٦٥٩). (تاج/١ زنجیرە:٢٣ ژمارە: ١٦٤)}:

لە پوختەی موسلیما ئاوایە:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، لەمەدینە، لەخزمەتیدا دانیشتبووین، لەناکاوا عەرەبێکی دەشتەکی هات، هەڵسا لەناو مزگەوتەکەیدا، لەبەرچاوی ئێمە بەپێوە ڕاوەستاو دەستی کرد بە میز کردن! هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تێیان خوڕی، کوڕە! نەکەی، کوڕە! نەکەی. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (میزەکەی پێ مەبڕن، وازی لێ بهێنن، با میزەکەی تەواو بکا). ئەوانیش وازیان لێ هێنا، هەتا میزەکەی تەواو کرد. ئەوجا

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کابرای میزکەری بانگ کرد بۆلای خۆی‌و پێی فەرموو: (مزگەوت خانەی خودایە، جێگەی پاك‌و خاوێنیە، جێگەی میز لێ‌کردن‌و هیچ جۆرە پیسییەکی تر نیە، بەڵکوو جێگەی ذیکرو یادی خودای گەورەو سەروەرە، جێگای نوێژە، جێگای قورئان خوێندن‌و شتی ئاوا پیرۆزە). فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد پیاوێ، سەتڵێ ئاوی هێنا، بەرەبەرە کردی بەسەرجێی میزەکەی کابرادا).

(**ڕوونکردنەوە**):

١- ئەنەسی کوڕی مالیك، نۆکەری پێغەمبەر بووە، دە ساڵ خزمەتی حەزرەتی کردووە، بەهەتیوی گەورە بووە، لەناو یاراندا کەس بەقەد ئەو مندالی نەبووە، دەولەمەند بووە، تەمەنی درێژ بووە، پێغەمبەری خودا لەسەر داخوازی دایکی ئەنەس ئەم نزایەی بۆ کردووە: خودایە! پیت‌و فەڕ بخەرە ماڵ‌و منالی‌و تەمەنی درێژکەو لەگوناهی خۆش بە. (تەجرید/٢/٢٩٤ ژمارە: ٩١٣) ئەنەس ئەنصارییە خەزرەجیە.

ئەنەس دەفەرموێ: (سەد منال — دوو کەمم — لەمنالی خۆم، بەخاك سپاردووە، کەهەموویان لەپشتی خۆم بوون!).

ڕەزێکی هەبوو هەموو ساڵێ دووجار بەری دەگرت، ڕێحانێکی تێدا بوو، بۆنی میسکی لێوە دەهات، دەڵێن: زیاتر لە سەد ساڵ ژیاوە، دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە کە لە (٩٣)ی کۆچیدا، لەسەردەمی حوکمڕانی حەجاجدا لەبەصرە مردووە (٢٢٨٦) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە. (٢٥١) فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە. (٢٥٩) فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە (١٦٨)یان پەسەندی هەردوو لایانن، لەسەر ئەم بنیاتە ئەفرادی بوخاری (٢٥١ — ١٦٨ = ٨٣) فەرموودەن، ئەفرادی موسلیم (٢٥٩ — ١٦٨ = ٩١) کەواتە کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا دەکاتە: ١٦٨ + ٨٣ + ٩١ = ٣٤٢ فەرموودە. (تاج/٣ زنجیرە: ٥٤ ژمارە: ٣٤٨٥ تا ٣٤٩١).

گەلێ جار وادەبێ، بەپێی سەرچاوەکان و سەرژمێریەکان و بۆچوونەکانی پسپۆڕەکان لەبابەتەکەدا، ڕاجیایی و جیاوازی لەژمارەی فەرموودەکان، یان لەساڵی مەرگ، یان لەشوێنی گۆڕ، یان لەهەندێ شتی تر لەم بابەتە دەبێ، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ هۆی هونەری و مێژوویی چونکە گەلێ جار گێڕانەوەکان و دەقەکان و بێژەکان و کەسەکان و ناوەکان لەیەك دەچن، لەبەر ئەوە تێکەڵ و پێکەڵ دەبن. ئیمامی ئەنەس لەبەصرە نیشتەجێ بووە، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا، هەتا خەڵکەکەی فێری ئایین و یاسانامە بکا، زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا دەفەرموێ: دروستتر (٩٩) نەوەدو نۆ ساڵ ژیاوە، لەساڵی (٩١) یان لە (٩٢) یان لە (٩٣)ی کۆچی، لەبەصرە، لەسەردەمی حەجاجدا، دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە کەلەوێ مردووە، ڕاجیایی لەژمارەی منداڵەکانیدا هەیە، هەندێ دەفەرموون: هەشتا منداڵی هەبووە، حەفتاو هەشتیان کوڕ بوون، دووانیان کچ بوون، ناویان حەفصەو ئوم عەمر بووە. فەقێ و شاگردی زۆری بووە، لەهاوەڵان و پەیڕەوان و کەسانی ترو لەمنداڵ و لە منداڵەزای خۆی کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە.

٢- بێژەو گوتەی (متفق علیه) بەدوو واتا هاتووە:

أ- دەقەکە، یان پوختەی دەقەکە، لەبوخاری و موسلیمدا، یان ڕێك وە یەکترن و بەقەد یەکترین بەبێ زیادو کەم، یان زۆر لەیەکەوە نزیکن، بەڵام لەڕێگەی دوو هاوەڵەوەن، نەوەك یەك هاوەڵ، بەم جۆرەیان دەگوترێ موتتەفەقو عەلەیهی لە واتاو لە ناوەڕۆك و مەبەستدا، وە ئەم واتایان زۆرترە.

ب- دەقەکە، یان پوختەی دەقەکە، لەبوخاری و موسلیمدا، لە یەك بابەتن و لەیەکەوە نزیکن، یان دەقاودەق وەك یەکن، وە لەهەمان کاتدا لەڕێگەی یەك هاوەڵەوەن، وەك ئەم فەرموودەیە کە بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە دەیگێڕنەوە.

٣- ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ:

١- هێوری و شێنەیی و ئارام کاری چاکە، بەتایبەتی لەگەڵ نەشارەزادا.

٢- میزی مرۆڤ پیسە، دەبێ بشۆرێ، یان بەپێی شەرع چاری بکرێ.

٣- کردن و ڕێدان بەخراپ تا خراپتر روونەدات!

٤- پاراستنی مزگەوت لەهەرچی ببێ بەهۆی پۆخڵی و بێ ڕێزی بۆی.

١٥- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ: فَالْجَرَادُ وَالْحُوتُ، وَأَمَّا الدَّمَانُ: فَالطِّحَالُ وَالْكَبِدُ}. {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَفِيهِ ضَعْفٌ}.

{أَخْرَجه أحمد (٩٧/٢، رقم: ٥٧٢٣) وَالبَيْهَقِي (٢٥٤/١، رقم: ١١٢٩) وَابنُ ماجه (١١٠٢/٢، رقم: ٣٣١٤)}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دوو مردارو دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراون: مردارەکان بریتین لەکوللەو ماسی، بەهەموو جۆرەکانیانەوە، وەخوێنەکانیش بریتین لەجەرگ و سپڵ، هی ئەو گیانلەبەرانەی کە گۆشتیان حەڵاڵەو دەخورێ) (تاج/٣ زنجیرە: ٢ ژمارە: ٢٥٦٣).

١٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا وَقَعَ اَلذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ، ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَفِي اَلْآخَرِ شِفَاءً}. {أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَأَبُو دَاوُدَ، وَزَادَ: {وَإِنَّهُ يَتَّقِي بِجَنَاحِهِ اَلَّذِي فِيهِ اَلدَّاءُ}.

{بخارى. بدء الخلق: ٣٣٢٠، ٥٧٨٢. أبوداود (٣٧٤٤) تحفة الأشراف ١٤١٢٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر مێش کەوتە ناو حاجەتێکتانەوە، ئاو، یا شتی تری تیابوو، لەپێشا مێشەکە هەمووی نوقم بکەن، ئینجا دەری بێنن و

فرێی بدەن، چونکە باڵێکی دەرمانی پێوەیەو، ئەو باڵەکەی تری دەردە). لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داوودا ئەمەشی پترە: (وە بەو باڵەیانی دەردەکەی پێوەیە خۆی دەپارێزێو پاسی خۆی پێ دەکا، تا نەکەوێ، جا کاتێ دەکەوێ لەپێشا ئەو باڵەی دەکەوێتە ناو قاپەکەوە). (تەجریدی بوخاری/٣ ژمارە: ١٣٣٤ + تاج/١ زنجیرە: ٣ ژمارە: ١٧٧).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەم جۆرە فەرمووده پیرۆزانە ئەوەیە، کە ماڵ کەمو زۆری، بەپێی توانا، بەفیڕۆ نەڕواو ئەگەر دەنکێ برنجیش بێ، یا یەك پیاڵە شیریش بێ، بەخۆڕایی بەزایە نەچێ، بەلام بەهیچ جۆرێ مەبەست ئەوە نییە کە پیاو، گوێ بەپاکیو پیسی نەداو، ئەگەر تیکەکەی کەوتە سەر زەوییەکی پیسو خۆڵاوی بوو، فوییێ، دوانی، لێ بکاو بیخوات، یان چاییەکەی پڕ بوو لەمێش ئەو هەر بیخوات.

ئیسلام دژی پیسو پۆخڵییەو، دۆستی گیانی بەگیانی پاکیو تەمیزییە. مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە.

أ- مێش بەلایەکی گشتگیرە، خۆپاراستن لێی ئەستەمە، لەبەر کار ئاسانی، شەرع بەپیسی دانانێ، با لە ڕووی تەندروستیشەوە قیزەونو نەخوازراو بێ، ئەگەر لەشتێ نیشت یا کەوتە ناو شتێکەوە پیسی ناکات. لەشەرعا دەفەرموێ: (مێش بە زیندووییو بەمردوویی پاکە!) هەروا هەموو مێروویەکی تر کە خوێنی ڕەوان (سائل)ی نەبێ، وەك قالۆنچەو سیسرکو هەنگو زەردەواڵەو دووپشك، ئەم جۆرە شتانە ئەگەر بکەونە ناو ئاوێ یا شلەمەنییەوە پیسی ناکەن، با تام یان ڕەنگ یان بۆنیشی بگۆڕن، بەلام مەرج نییە کە پاکن خواردنیان حەلاڵ بێ.

ب- هەواڵدانە لە نهێنییەکی پزیشکیو زانستی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا، ئەو نهێنییە ئاشکرا نەبووەو نەزانراوە، بەلام ئێستا بەرەبەرە

خەریکە ئاشکرا دەبێو دەبێ بە ئیعجازی عیلمی بۆ ڕاستیو دروستی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

وەکی تریش تۆ کەمێشێ کەوتە ناو خواردنەکەتەوە، ئەگەر دڵت نایباو بێزی لێ دەکەیتەوە، بیڕێژەو مەیخۆ، شەرع زۆرت لێ ناکا کە دەبێ هەر بیخۆیتەوە، واتە: ئەم جۆرە ئەمرو فەرمانانە بۆ إباحەن، نەك بۆ وجوب. (بڕوانە: ریاض صالحين بە کوردی، بەرگی/ یەکەم زنجیرە/ ١٦ ژمارە: ٩/ ١٦٤) + (ب/ ٢ زنجیرە: ١٠٨ ژمارە: ٥/ ٧٥٢ ل — ٢٦٠ — چاپی سێیەم).

١٧ – وَعَنْ أَبِي وَاقِدٍ اَللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَا قُطِعَ مِنْ اَلْبَهِيمَةِ -وَهِيَ حَيَّةٌ- فَهُوَ مَيِّتٌ}. {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَاللَّفْظُ لَهُ.

{أبو داود (٢٨٥٨) تيرمذى (١٤٨٠) الحاكم (٧٥٩٧) وَقالَ: صحيح}:

ئەبو واقیدی لەیثی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەووپێش خەڵکی مەدینە دووگی وشتر، یان دووگی مەڕیان بە زیندوویی شەق دەکردو بەزەکەی ناویان دەبڕیو دەیان برژاندو دەیانخوارد، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو پارچەیەی کە لە ماڵاتی زیندوو دەیبڕن، ئەوە دادەنرێ بەگۆشتی مردار). (تاج/٣ زنجیرە:٣ ژمارە: ٢٥٧٠). ئەبو داوودو تیرمزی گێڕاویانەتەوە، تیرمزی بە فەرموودەیەکی جوان (حەسەن)ی داناوە ئەم دەقەیش دەقەکەی ئەوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەبو واقیدی لەیثی ناوی: حاریثی کوڕی عەوفە، ئامادەی نەبەردی بەدر بووە، هەندێ دەڵێن: لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بووە، گوتەی یەکەم ڕاسترە، دادەنرێ بە خەڵکی مەدینە، بیستو چوار فەرموودەی

لـه پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، لـەپیاوانی صـەحیحەینە، لەبوخاریـدا یـەك فەرموودەی هەیە، کە فەرموودەی ژمارە (٥٩ تەجرید = ٦٦، ٤٧٤ فـتح البـاری).

(بڕوانە: پوختەی موسلیم، ژمارە: ٤٢٩ = ٢٠٥٦ شیحا).

حـەفتاو پێـنج سـاڵ ژیـاوە، لەسـاڵی (٦٨) کۆچیدا، لـە مەککـە مـردووە، گۆڕەکـەی لـە گۆڕسـتانی موهاجرینـە، لەبنەڕەتـدا خـەڵکی مەدینەیـە، لـە موسوڵمانە پێشینەکانە.

## ( پوختەی ئەم باسە )

١- ئـاوی دەریـا پـاكو پاکەرەوەیـە، زینـدەوەرانی نـاوی هـەموو پـاكن‌و گۆشتیان دەخورێ‌و سەربڕینیان ناوێ بەدوو مەرج:

أ- بەمەرجێ بەس لەئاوا بژین، لەسەر هەر شێوەیێ بن

ب- بەمەرجێ ژەهراوی نەبن‌و زیانیان بۆ مرۆڤ نەبێ، وەك ماری ئـاوی ژەهراوی، یان پیس‌و ڤیزەون بێ وەك کیسەڵ‌و بۆق.

٢- ئەسڵ لەئاییندا ئاسانکارییەو بناغەی کار لەسەر نەرمی‌و ئاسانکاری دامەزراوە، لەهەمان کاتا ڕەچاوکردنی دووربینی‌و احتیاط کارێ پەسەندە، ئاو هۆکاری زۆر گرنگە بۆ خاوێنی، کە مەرجی زۆر لە خواپەرستییەکانە، لەبـەر ئەوە مەبەستە زیان لەئاو نەدرێ‌و بەفیڕۆ نەڕواو پاکی ئاو بپارێزرێ‌و نەکرێ بەلانەی دەردو نەخۆشی.

٣- ئاوی ڕەوان پاکە، مەگەر لـەکاتی ڕەوانییەکەیدا، لەشوێنێکا مـەرجی پاکێتی لەدەست دابێ.

٤- جەڕەبابـەدان لەئاییـندا نییـە، هەرشـتێ بـوو بـە بەڵایـەکی گـشتگیر، دەبێ بەر یاسای (ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکا) بکەوێ.

٥- کوللـە لەسـەر هـەر شـێوەیك بـێ، گـەورە بـێ یـان بـچووك حەڵاڵـەو دەخورێ‌و پێویستی بەسەربڕین نییە.

٦- میزی مرۆڤ پیسە، زەوی ئەگەر پیس بوو، ئاوی پیا دەکرێ پاك دەبێتەوە، دەبێ لەپێشدا، پیسییەکە ئەگەر قەبارەی هەبوو، قەبارەکە لابرێ، وەك شیاکەو شتی تری وا.

## ٢- باسی قاپو قاچاخو حاجەت

## بابُ: الآنِيَةُ

١٨- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ والْفِضَّةِ، وَلَا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَكُمْ فِي الْآخِرَةِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{البخاري: ٥٤٢٦. مسلم ٢٠٦٧ = ٥٣٦١ شيَخ خليل مأمون شيحا + تاج الأصول. بەرگی:٣ رقم: ٢٦٨٦}.

حوذەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە حاجەتی زێڕو زیودا شت مەخۆنو مەخۆنەوە، وە ئاوریشمو دێباجیش لەبەر مەکەن، چونکە ئەمانە لەجیهانا بۆ ئەوانەو، لەقیامەتا بۆ خۆمانە). (تاج/٣ زنجیرە: ١٩ ژمارە: ٢٦٨٦) + (پوختەی موسلیم/ ١٣٣٦).

(ڕوونکردنەوە):

١- حوذەیفەی کوڕی یەمانی عەبەسی، خۆیو یەمانی باوکی ئوحودین، واتە: لە غەزای ئوحوددا بەشداریان کردووە، باوکی لە غەزای ئوحوددا، بەهەڵە بەدەستی هەندێ موسوڵمان شەهید کرا، حوذەیفە لە هاوەڕێ هەرە مەزنەکانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) لە غەزای خەندەقا ڕۆڵێکی جوانی هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردی سوسەی هەواڵی سوپای دوژمنی بۆ بکا، موژدەی هێنایەوە کە سوپای دوژمن بە نائومێدی بەرەو دوا، بەرەو مەککە کشاونەتەوە.

فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بیست فەرموودەی لە بوخاریو بیستو نۆی لە موسلیما هەیە، دوازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەینا = ١٢ + ٨ + ١٧ = ٣٧ فەرموودە.

حوذەیفە ناودارە بەڕازگری پێغەمبەر (صاحِبُ سِرّ رسول اللّهِ). کاتێ کەسێ دەمرد، ئیمامی عومەر سەرەنجی دەدا، ئەگەر حوذەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبوایە، ئەویش ئامادەی نەدەبوو، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناوی گشت ناپاکە (منافق)ەکانی پێ گوتبوو، یەك بەیەکیانی دەناسی، لەغەزای نەهاوەندا ئامادە بوو، کە سوپا سالاری موسوڵمانان: نوعمانی کوڕی موقرین شەهید بوو، حوذەیفە ئالآکەی هەلگرتو هەمەدانو رەیو دینەوەر، لەسەر دەستی ئەودا ئازادکران، لە بیستو دووی کۆچیدا، عومەر کردی بەسەرکاری سەر مەدائین، لە (٣٦) سییو شەشی کۆچیدا، لەپاش چل ڕۆژ لە جێنشینی عەلی، لە مەدائین مرد، صەفوانو سەعیدی کوڕی لەلایەنگرانی عەلی بوون، لە صەفین شەهید بوون، لە حوذەیفە پرسیار کرا: چی ئاژاوەیەك زۆر کوشندەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی کە تۆ ببی بەسەرپشك لەنێوانی خێرو شەڕدا، واسەرت لێ بشێوێ کەنەزانی کامەیان هەڵبژێری!).

دەیشی فەرموو: (قیامەت هەڵناسێ هەتا گشت هۆزێ، ناپاکەکانیان دەبن بە ئاغاو سەرۆکیان!).

وە دەیفەرموو: (ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێ، هەتا قیامەت هەڵدەستێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەمووی پێم گوتووە!).

حوذەیفە دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆمی کرد بە سەرپشك لەنێوانی کۆچکردنو یاریدەدانی پێغەمبەردا، یاریدەدانی ئەوم هەڵبژارد، حوذەیفە ئامادەی سەرکەوتنەکانی عێراق بوو، وەگەڵ شوێنەواری

ناوداری لەویٚ هەیە. حوزەیفە خۆی‌و باوکی بەیەکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە. ئەم کۆمەڵەو کەسانی تریش لەهاوەڵان گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجام داوە: عومەرو عەلی‌و ئەبو دەرداء، لەپاش چل ڕۆژ لەکوشتنی عوثمان لەمەدائین مردووە گۆڕەکەی وا لەویٚ. (تەجرید/١ ژمارە: ١٦٣ + تاج/٣ زنجیرە: ٥٥ ژمارە: ٣٤٩٢).

٢- بەکۆی دەنگ ئەم فەرموودەیە صەحیحە.

١٩- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريد البخارى/ ١٨٥٤ = ٥٦٣٤ فتح البارى + رياض/ ٢ زنجيره: ١١٦ ژماره: ٧٧٨} + {مسلم: ٥٣٥٣ شيحا}.

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە ئوم سەلەمە بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (هەرکەسیٚ لە حاجەتی زێڕدا، یان لە حاجەتی زیودا، شت بخوا، یان شت بخواتەوە، قلٚپەقلٚپ ئاگری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناو ورگی خۆیەوە!).

(ڕوونکردنەوە):

ئوم سەلەمە هاوسەری پێغەمبەرە (درودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بیٚ) ناوی هیندی کچی ئەبو ئومەیەیە، ئەبو ئومەیە ناوی سوهەیلی کوڕی موغیرە بوو، دایکی ئوم سەلەمە ناوی عاتیکەی کچی عامیر بوو.

ئوم سەلەمە (٣٧٨) فەرموودەی هەیە، سیازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، دوو کۆچ‌و ڕەوی لەپێناوی ئیسلاما کردووە، دوو شویکردووە، لەپێشا ژنی ئەبو سەلەمە بووە، کە ئامۆزای هەقی بووە، کە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول ئەسەدی کوڕی هیلالی مەخزوومی) بوو، کەیازدەهەمین کەس بووە

که ئیسلام بووه، برای شیری پێغەمبەرو ئیمامی حەمزەی مامی پێغەمبەر بوو، ثوومیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب، لەپێشا شیر ئەدا بە حەمزە، ئەوجا بە پێغەمبەر، لەپاشا بەئەبو سەلەمە، کە پورزای پێغەمبەر بوو، دایکی ناوی بەررەی کچی عەبدول موتتەلیب بوو، لە فەرموودەدا دەفەرموێ: (یەکەم کەس کەنامەی کرداری، بەدەستی راستی وەردەگرێ، ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەدە).

ئوم سەلەمە لەگەڵ ئەبو سەلەمەی مێردی، لەمەدینەوە کۆچ دەکەن بۆ حەبەشە، لە حەبەشەوە گەڕانەوە بۆ مەککە، لە مەککەوە خۆیو مێردەکەی کۆچی دووەمیان کرد بۆ مەدینە، چوار منالّی لە ئەبو سەلەمە هەیە: دوو کوڕو دوو کچ؛ کوڕەکانیان ناویان سەلەمەو عومەر بووە، کچەکانیشی ناویان زەینەبو دوڕە بوو، کە ئەبو سەلەمە لە ساڵی چوارەمی کۆچی مرد، هەر چواریان لەهەتیوی دەرنەچوو بوون.

ئوم سەلەمەو ئەبو سەلەمەی مێردی لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان بوون، ئوم سەلەمە ژنێکی جوانی شۆخی هۆشمەندی داناو زانا بوو، لەپاش مردنی ئەبو سەلەمە، لەمانگی شەشەڵانی ساڵی چواری کۆچیدا شووی کرد بە پێغەمبەر، لەرۆژی حودەیبییەدا، لەپاش گرێبەستی رێکەوتننامەی حودەیبییە، کە موسوڵمانەکان نەیان دەویست ئیحرام بشکێنن هەتا عەمرەکەیان تەواو نەکەن، ئەوەیش بەپێی رێکەوتننامەکە ئەستەم بوو، بۆ چارەی ئەم کێشەیە، ئوم سەلەمە عەرزی پێغەمبەری کرد، کە خۆت لەپێشا ئیحرامی عەمرەکە بشکێنەو سەری خۆت بتاشە بە بەرچاویانەوە، ئیتر ئەوانیش ناچار دەبن ئیحرام دەشکێنن، حەزرەتیش بەگوێی ئوم سەلەمەی کرد، وە کێشەکە چارەسەر کرا.

ئوم سەلەمە بەچاوی خۆی حەزرەتی جوبرائیلی دیوە، لەسەر شێوەی (دحیة الکلبی).

ئوم سەلەمە لەم زاتانەوە گێڕانەوەی هەیە: لە پێغەمبەر خۆیو لە ئەبو سەلەمەی مێردیو لەفاطیمەی زەهراوە. ئەم زاتانەش گێڕانەوەیان لەوەوە هەیە: دوو کوڕەکەی: سەلەمەو عومەر، زینەبی کچیو عامیری برایو موصعەبی برازایو خیرەی دایکی حەسەنی بەصریو زۆر کەسی تریش لە ژنو لەپیاو، لە صەحابەو لە غەیری صەحابە، یەکەمین کەژاوەنشین بووە، لەئافرەتانی موسوڵمانان کە کۆچی کردووە بۆ مەدینە. لە دەوروبەری ساڵی (٦٠) شەستی کۆچیدا، لەتەمەنی (٨٤) هەشتاو چوار ساڵیدا، لە وەرزی بەهارا، لەشاری مەدینە، کۆچی دوایی کردووە، ئەبو هورەیرە نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردرا.

ئوم سەلەمە دواترین کەس بووە لەهاوسەرانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە مردووە. ئوم سەلەمە دەفەرموێ: (ئامادەی جەنگی خەیبەر بووم، ئەوکاتەی کە مەرحەب کوژرا، کە پاڵەوانێکی گەورەی جوولەکەکانی قەڵای خەیبەر بوو، گوێم لەقرچەقرچی ددانەکانی مەرحەب بوو، کە بەشمشێر دەیانشکاندن).

لەساڵی چواری کۆچیدا، لەغەزای ئوحوددا، ئەبو سەلەمەی مێردی زامار دەبێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، زامەکەی دەکولێتەوەو دەتەقێو دەمرێ، لەساڵی دووی کۆچیدا، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو بۆ غەزای (العشیرە) ئەبو سەلەمەی کرد، بەجێگەنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، بۆ ناسینی زیاتری ئەم بنەماڵەیە بڕوانە: تەجریدی بوخاری ئەم ژمارانە: ٩٤، ١٠٥، ٢٠١، ٢١٠، ٢٢٣، ٧٠٥، + ریاض صالحین/ ١ زنجیرە: ٣٨ ژمارە: ٢٩٩ + تاجول ئوصول. بەرگی: ٣ زنجیرە: ٣٩ ژمارە: ٣٤٤٢}.

٢٠ - وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا دُبِغَ الْإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ}. أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم (١/٢٧٧، رقم: ٣٦٦ = ٨١٠ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا. وأبوداود/ ٤١٢٣ بيهقي/ ٦٨. دارقطني/٤٨}.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ کەوڵێ کە خۆشکرا پاك دەبێتەوە!). (تاج/١ زنجیرە: ٢٢ ژمارە: ١٦٠).

٢١- وَعِنْدَ الْأَرْبَعَةِ: { أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ }.

{ترمذي/ ١٧٢٨ نسائي/ ٤٢٤١ ابن ماجه ٣٦٠٩}:

چوار فەرموودەزانە گەورەکان کە مەبەست (ئەبو داوودو تیرمزیو نەسائیو ئیبنو ماجەن) لەم ٠چوار پەڕاوە پیرۆزەیاندا، هەرکەسەیان بەڕشتەی خۆی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هەرکەوڵێ خۆشە بکرێ ئیتر پاك دەبێتەوە).

٢٢- وَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبِّقِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {دِبَاغُ جُلُودِ الْمَيْتَةِ طُهُورُهَا} صَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود رقم: ٤١٢٥. نسائي رقم: ٤٢٤٤. ابن حِبَّان رقم: ٤٥٢٢}.

سەلەمەی کوڕی ئەل- موحەببیق (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆشە کردنی پێستو کەوڵی ئاژەڵی مردارەوە بوو، پاکی دەکاتەوە). (ئەم فەرموودەیە ئیبنو حیببان بە صەحیحی داناوە).

٢٣- وَعَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: { مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِشَاةٍ يَجُرُّونَهَا، فَقَالَ: "لَوْ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا؟" فَقَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ، فَقَالَ: "يُطَهِّرُهَا الْمَاءُ وَالْقَرَظُ"}. أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.

{أبوداود/ ٢١٢٦. نسائي/ ٤٢٤٨}.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ مەڕێکیان بە زەکات دابوو، بە کارەکەرێکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا

له پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە گشت هاوسەرەكانی بێ) كە مەیموونە پوری ئیبنو عەبباسە، خوشكی دایكیەتی، مەڕەكە مردارەوە بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) كە لاكی مەڕەكەی بینی، فڕێ درابوو، فەرمووی: (ئەی ئەوە بۆچی كەڵكتان لە كەوڵەكەی وەرنەگرتووە؟) گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوە بووە، فەرمووی: (شتی مردارەوە بوو، تەنها خواردنی دروست نییە، واتە: دروستە سوودو كەڵك لە پێستەكەو كەوڵی مردارەوە بووەكە وەربگیرێ، چونكە بە ئاوو بەگەڵا سەلەم پاك دەبێتەوە).

(ڕوونكردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیمیش دەریهێناوە {مسلم تخريج شيخ خليل مأمون شيحا رقم: ٨٠٤. تەجریدی كوردی بەرگی/٢ لاپەڕە: ١٤٠ چاپی یەكەم ژمارە: ٧١٧ = ١٤٩٢ فتح الباری شرح صحيح البخاری. تاج/١ زنجیرە: ٢٢ ژمارە: ١٥٩}.

٢- قەرەظ جۆرە درەختێكی دڕكاوییە، لەدرەختی بیابانەكانە، گەڵاكەی وەك جەوتی لای خۆمان كەوڵو پێستەی پێ خۆش ئەكرێ، بە درەختەكە دەگوترێ: سەلەم، مامۆستا مەلا عەبدولكریمی مودەڕیس دەفەرموێ: قورەظ دار شیلانە.

٣- پێستو كەوڵی مردارەوە بوو، بە دەباغ، واتە: بەخۆشكردن، پاك دەبێتەوە، گیاندارەكە گۆشتی بخورێ، وەك مەڕو بزن، یان گۆشتی نەخورێ وەك كەرو هێستر، كەوڵەكەی بەخۆشە كردن پاكو خاوێن دەبێتەوە. پێستە خۆش كردن بەم شتانە دەبێ: بە زاخو گەڵا قەرەظو دڵقو بەتوێكڵە هەنارو بەمازوو بەخوێو بەشتی تری لەم بابەتە، پێستەی مردار بەم جۆرە دەرمانانە، دەرەوەو ناوەوەی پاك دەبێتەوە. ئەوەندە هەیە كە پێستی سەگو

بەرازو بەچکەیان‌و دوو ڕەگیان لەدەباغ نایێ (بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم زنجیرە/٤ پێستی مردار). کەوڵەکە پاش خۆشەکردنەکە بەئاو دەشۆرێ.

٤- سەلەمەی کوڕی موحەببیق (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، ناوی تەواوی (سەلەمەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی موحەببیقە) لەهۆزی هوزەیلە، سەلەمە بە بەصری دائەنرێ، کونیەکەی (أبو سنان)ە، سینانی کوڕیشی صەحابەیە، وشەی (مُحَبق) لەزمانی عەرەبیدا واتە: (مُضَرِط) واتە: تڕێنەر، بۆیە وا ناونراوە گوایە: دوژمن تڕێنەرو دوژمن ئەتڕێنێ. لەگەرمەی شەڕی حونەینا، موژدە دەدەن بە سەلەمە کە سینانی کوڕت لەدایك بووەو کوڕتان بووە، دەفەرموێ: (تیرێ کە بیتەقێنم، بۆ پاراستنی پێغەمبەری خودا، زۆر بەلامەوە باشترە لەم موژدەی کە ئێوە بەمنتان داوە!).

سینانی کوڕی‌و حەسەنی بەصری‌و کەسانی تریش گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجام داوە.

٥- مەیموونەی کچی حاریث، دایکی موسوڵمانان، لەساڵی (٦) کۆچی، لەمانگی ذیلقەعدەدا، لەکاتی عەمرەتولقەضاءدا، یا لە حەوتی کۆچی، لەسەریف پێغەمبەر هێنای، لەهەمان شوێن، لەساڵی (٥١)ی کۆچی، یا (٦٦)ی کۆچی، لەو شوێنە کۆچی دوایی کردووە، ئیبنو عەبباس کە خوشکەزای بوو، نوێژی تەرمی لەسەر کردو، لەگەڵ دوو خوشکەزاکەی تریدا دایانهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، مەیموونە لەپێشا ناوی (بەررە) بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا (مەیموونە) بەکوردی واتە: پیرۆز. واقیدی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (دوایین هاوسەری پێغەمبەر بووە کە مردووە). (بڕوانە: پوختەی صەحیحی موسلیم، ژمارە: ١١٧ + تەجریدی کوردی/ ٢ لاپەڕە: ١٤٠ ژمارە: ١٤٩٢/٧١٧ فتح الباری + تاج/ ١ زنجیرە: ٢٢ ژمارە: ١٥٩ + تەجرید/١ ژمارە: ١٥٤).

٢٤- وَعَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ، أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ فَقَالَ: "لَا تَأْكُلُوا فِيهَا، إِلَّا أَنْ لَا تَجِدُوا غَيْرَهَا، فَاغْسِلُوهَا، وَكُلُوا فِيهَا"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخاری ٥٤٩٦ = تەجریدی بوخاری بەکوردی/٥ ژمارە: ١٨٢٧ + پوختەی موسلیم ١٢٤٠ = ٤٩٦٠ ترقیم خلیل مأمون شیحا، أبو داود، صید: ٢٨٥٥، ترمذی. السیر: ١٥٦٠م. نسائی. صید: ٤٢٧٧}.

ئەبو ئەعلەبەی ئەل-خوشەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەولاتی شامین، دراوسێی خاوەن نامەکانین‌و لەولاتی ئەواندایین، واین لەگەڵ مەسیحی‌و جوولەکەدا، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان لە مەنجەڵەکانیاندا، گۆشتی بەراز دەکوڵێنن، لەقاپ‌و حاجەتەکانیاندا، مەی‌و بادەو ئارەق دەخۆنەوە، لەم بارو دۆخ‌و ڕەوشەدا ئێمە چارمان چییە؟ وە هەروەها ئێمە واین لەولاتێ، کە نەچیری زۆرە، هەم بەتیروکەوان ڕاو دەکەم، هەم بەو سەگەم ڕاودەکەم، کە مەشقی ڕاوی کردووە، هەم بەو سەگەم کە مەشقی ڕاوی نەکردووە، ( کەلبی موعەللەم: سەگی فێرکراو سەگی مەشق دیدە) جا ئەی پێغەمبەری خودا! لەم جۆرە ڕاو کردنە کامیان حەلاڵە بۆم؟ فەرمووی: ( ئەوەی کە گوتت ئێوە وان لەناو ولاتی خاوەن نامەکانا، لەناو قاپ‌و قاجاخی ئەوانا، شت دەخۆن‌و دەخۆنەوە، ئەگەر دەفری ترتان دەستکەوت، لەوەدا بخۆن‌و بخۆنەوەو، لە دەفری ئەوانا، نەبخۆن‌و نەبخۆنەوە، بەلام ئەگەر حاجەتی ترتان دەست نەکەوت، بەئاو پاك بیانشۆرن‌و ئیتر تیایاندا بخۆن‌و بخۆنەوە، بۆ ئەوەیشی کە گوتت واین لەولاتێ کە نەچیری زۆرە، ئەوەی کە بەتیروکەوان ڕاوی دەکەیت، وەناوی خودای لێ دەهێنی لەکاتی تیر پێوەنانا ئەوە بیخۆ، هەروەها ئەوەیشی کە بەسەگی ڕاوی خۆت ڕاوی دەکەیت، ناوی خودای بالادەست‌و شکۆمەندی لێ بهێنەو ئەوجا بیخۆ،

هەروەها ئەوەیشی کە بەسەگی خۆت ڕاوی دەکەیتو سەگی مەشق دیدە نییە، ئەگەر فریای سەربڕینی کەوتیت ئەوا بیخۆ).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی، لەهاوەڵە پێشینەکانی پێغەمبەرە، ناوی جورهومی کوڕی ناشیبە، لەکاتی پەیمانی بەیعەتی شەجەرەدا، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی وەرگرت. {بڕوانە: ژمارە: ١٢١٢ تەجرید = ژمارە: ٢٩٥٨ فتح الباری، بەرگ/٣ لاپەڕە: ٣٣٥ چاپی یەکەم = لاپەڕە: ٣٣٢ چ/٢}.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردی بۆ ناو هۆزەکەی خۆی، لەسەردەستی ئەودا هۆزەکەی قبوڵی ئیسلامیان کرد، لەجەنگی صەفیندا، لەگەڵ کەسیان نەبوو، بەشداری ئەم جەنگەی نەکرد، دەفەرموون: هەموو شەوێ دەچووە دەرەوە تەماشایەکی وردی ئاسمانی دەکرد، ئەوسا دەگەڕایەوەو سەجدەیەکی ئایاتی دەبرد (بڕوانە: التـاج الجـامِعُ لِلأُصُـول. بەرگی:١ ص٣١٢ الـسجدةِ لُمطْلَـقِ الآيـاتِ، بەرگی/١ زنجیرە: ١٧٢ ژمارە: ٩٣٤ وەرگەڕاوە کوردیەکەی).

ئەبو ثەعلەبە دەفەرموێ: (لەخودا دەخوازم کە من لەسەرەمەرگا، وەك ئێوە لەسەرەمەرگا، لەکاتی گیانەڵادا دەکەونە لرخە لرخ، من ئاوا نەکەومە لرخە لرخ).

ئەبو زاهیدیە دەفەرموێ: (جا شەوێ ئەبو ثەعلەبە شەونوێژ دەکا، لەناو جەرگەی شەودا، لەناو سەجدەدا، دەمرێو فەرمانی هەق بەجێ دەهێنێ، لەو کاتەدا کچەکەی دەخەوێ، لەخەویدا دەبینێ کەوا باوکی مردووە، کچەکە لەخەو ڕادەچڵەکێو، هاوار دەکا: کوا باوکم؟ دەڵێن: وا لەنوێژگاکەی خۆی سەرگەرمی شەونوێژە، جا لای خۆیەوە بانگی دەکا:بابە! بابە! بەڵام

وەڵام نابێ، جا ڕادەکا بۆلای، دەڕوانێ بەمردوویی وا لەکوڕنووشدا، کەڕای دەوەشێنێ دەکەوێ بەلادا!!

ئەبو ثەعلەبە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە بوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە (متفق علیە)یە. کۆمەڵێ لەمێژوونوسانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموون: (لەساڵی حەفتاو پێنجی کۆچیدا، لەشام مردووە). (بڕوانە: پوختەی موسلیم/ ١٢٤٠).

٢٥- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا" { أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَصْحَابَهُ تَوَضَّئُوا مِنْ مَزَادَةِ اِمْرَأَةٍ مُشْرِكَةٍ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ.

{بخاری. تَيَمُم: ٣٤٤، ٣٤٨، ٣٥٧١ = تەجریدی بوخاری ژمارە: ٢٢٠. مسلم فی المساجد ومَوَضِعِ الصَّلاَتِ... رقم: ٦٨٢ = ١٥٦١ مسلم تخریج/ شیحا}.

درێژەکەی لە بوخاریدا زۆر زۆرە، لەتاجول ئوصولدا ئاوایە: عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، منی دانا لەناو دەستەسوارەکەی پێش خۆیەوە، ڕۆیشتین هەتا تەواو تینوومان بوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە لەڕێ ژنێکی بتپەرستمان تووش بوو، لەناو کۆڵی دوو کوندەی گاوەسا قاچەکانی شۆڕ کردبۆوە، پێمان گوت: ئاو لەکوێ هەیە؟ گوتی: ئاو لەم نزیکانەوە نییە، گوتمان: لە ئاوەکەوە تا لای کەسوکاری تۆ چەند دەبێ؟ گوتی: شەوڕۆژێك ئەبێ، گوتمان: دەوەرە لەگەڵمان بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: پێغەمبەر کێیە؟ ئیتر بوارمان نەدا، تا بردمان بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەچی قسەیەکی بۆ ئێمە کرد، هەمان قسەشی کردەوە بۆ ئەویش، وەلێ عەرزی پێغەمبەری کرد، کەهەتیوبارم. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووریدا، هەردوو کوندە ئاوەکەیان لەوشترەکە داگرتو، خۆی دەستی پیرۆزی هێنا بەهەر دوو هەنگڵەکانیدا، ئێمە چل پیاوی تینوو بووین، هەمووومان تێر ئاومان خواردەوە، وە هەرچی کوندەو جەوەندەشمان پێ بوون،

پڕمان کردن لەئاو، لەبەر پڕی وا توند بوو بوون خەریکبوون بتەقێن، بەڵام وشترمان ئاو نەدا.

ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (یەکی سەرو شتی پێ بدەن). ئێمەیش نانەلەتو خورمامان بۆ کۆکردەوەو دامان پێی، ژنەکە دەڕواتەوە بۆلای کەس‌وکاری دەڵێ: تووشی جادووبازترین کەس بووم، یان ئەگەر ئەو کەسە جادووباز نەبێ، ئەوە وەك خۆیان دەڵێن: دیارە ئەو پیاوە پێغەمبەرە!

جا پاشان بەهۆی ئەو ئافرەتەوە خودا ئەو خێڵەی ڕێنمایی کردو ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان دان، ژنەکە خۆی ئیسلام بوو، وەهۆزەکەیشی ئیسلام بوون! (تاج/٣ زنجیرە: ١٠٥ ژمارە: ٣١٧٥).

(ڕوونکردنەوە):

عیمرانی کوڕی حوصەین خۆیو باوکی هاوڕێی پێغەمبەر بوون، عیمران ساڵی ئازادکردنی خەیبەر ئیسلام بووە، لە پێغەمبەرەوە (١٨٠) سەدو هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لەپەڕاوە ناودارەکانی فەرموودەدا پیادە کراون، لە بوخاری پیرۆزدا (١٢) دوازدە فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا چەندین فەرموودەی هەیە، عیمران یەکێکە لەهاوەڵە شەرعزانە مەزنەکان، پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ناردی بۆ بەصرە، هەتا شارەزایی ئایینیان بکات، بوو بەقازی بەصرە، گشت جارێ فریشتە دەهاتن بۆلای، بۆ دیدەنی، سڵاویان لێ دەکردو بەگوێی خۆی سڵاوەکەیانی دەبیست، کەنارە گیربوو، لەشەڕو هەرای ئاژاوەکانی سەردەمی عەلیو عائیشەو موعاویە، لە پەنجاو دووی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لەبەصرە کۆچی دوایی کردووە، خۆی لە بەصرە نیشتەجێ بوو، ڕەزاو ڕەحمەتی خوودای لێ بێ (بڕوانە: تاجی کوردی/٣ زنجیرە: ٦٠ ژمارە: ٢٩٧٨).

٢٦- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ قَدَحَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) انْكَسَرَ، فَاتَّخَذَ مَكَانَ الشَّعْبِ سِلْسِلَةً مِنْ فِضَّةٍ.} . أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ.

{تجريد البخارى/٣ رقم: ١٢٦١ = ٣١٠٩، ٥٦٣٨ فتح البارى}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جامەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە ئاوو شتی وای پێ دەخواردەوە شکا، جێگەی قلێشەکەی بەکشتەکێکی زیو پینە کرد.**

## ( پوختەی ئەم باسە )

**١- لەقاپو قاجاخو حاجەتی زێڕو زیودا خواردنو خواردنەوە نادروستە، دەبێ بەهۆی سزای سەختی دوارۆژو قیامەت.**

**٢- بەڵام بەکارهێنانی حاجەتی زێڕ، یان زیو، شتەکە پیس ناکا، لەبەر ئەوە دروستە دەفری زێڕو زیو، بۆ غەیری خواردنو خواردنەوە بەکار بهێنرێ.**

**٣- پێستی سەگو بەرازی لێ دەرچێ، پێستی هەموو گیاندارێکی تر بەخۆشەکردن پاك دەبێتەوە، ئیتر دروستە ئەو چەرمە یان ئەو کەوڵە بۆ هەموو مەبەستێکی ڕەوا بەکاربهێنرێ، وەك: کوندەو مەشکەو هیزەو جەوەندەو فەروەو کەوشو کڵاشو قایشو شتی تری وا. واباشە لەپاش خۆشەکردن بەئاو پاك پاك بشۆرێ.**

**٤- لەقاپو قاجاخو حاجەتی خاوەن نامەکاندا شت خواردنو شت خواردنەوە دروستە، واباشە لەپێشا بیشۆرین.**

**٥- ڕاوو نەچیر حەڵاڵەو دروستە.**

## ٣- لابردنی پیسیو پاكەوە كردنی
## باب: إزالة النَّجاسةِ وبيانُها

٢٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سُئِلَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلًّا؟ قَالَ: "لَا".} حَسَنٌ صحيحٌ.

{مسلم. أشربه: ٥١١١ = ١٢٧٨ پوختەی صەحیحی موسلیم. أبو داود. أشربة: ٣٦٧٥ ترمذی. بيوع: ١٢٩٤}:

**ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیاركرا لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەگەر مەی بكرێ بەسركە، حەڵاڵ دەبێ؟ فەرمووی: (نەء). (تاج/٣ زنجیرە: ٢٧ ژمارە: ٢٧٥٦ چاپی چوارەم).**

٢٨- وَعَنْهُ قَالَ: {لَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ، أَمَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) أَبَا طَلْحَةَ، فَنَادَى: "إِنَّ اَللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ اَلْحُمُرِ اَلْأَهْلِيَّةِ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخاری. مغازی: ٤٢١٩، ٥٥٢٠، ٥٥٢٤، ٥٥٢٨. مسلم ٤٩٩٧ تخريج الشيخ مأمون شيحا. أبو داود. أطعمة: ٣٧٨٨. ترمذی. أطعمة: ١٧٩٣. نسائی. صيدو ذبائح: ٤٣٣٨. تحفة الأشراف: ٢٦٣٩}.

**ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی كرد ئەبو طەلحەی زڕبابم، كەمێردی ئوم سولەیمی دایكم بوو، بەناو عەشاماتەكەدا جاڕی داو بانگەوازی هەڵدا. (خوداو پێغەمبەری خودا، جڵەوگیری دەكەن لەخواردنی گۆشتی كەری ماڵی، چونكە پیسە). واتە: حەرامە.**

**لەپوختەی موسلیمدا (ژمارە: ١٣٢٧) ئەمەی پترە: (وەڕێگەی خواردنی گۆشتی ئەسپو ماینی دا). (تاج/٣ زنجیرە: ١ ژمارە: ٢٥٥٣).**

٢٩- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {خَطَبَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِمِنًى، وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَلُعَابُهَا يَسِيلُ عَلَى كَتِفَيَّ}. {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَه.

{أخرجه أحمد ١٨٦/٤، ١٨٧، ٢٣٨، ٢٣٩. ترمذي: ٢١٢١. نسائي: ٢٤٧/٦}.

عەمری کوڕی خاریجە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاوایی‌دا، لەمینا، لەڕۆژی جەژنی قورباندا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر پشتی وشترەکەی کەناوی قەصواء بوو، وتارێکی خوێندەوە، من وانزیك بووم لەو کاتەدا لە پێغەمبەرەوە، لیکی دەمی وشترەکەی، جۆڕاوگەی بەستبوو بەسەر شانمدا.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە، زاناکان دەفەرموون: لیك‌و ئاوی دەمی گیانداری کە گۆشتی بخورێ پاکەو پیس نییە.

٢- عەمری کوڕی خاریجە، هاوەڵە، ئەنصارییە، بەشامی حلێبە، هاوپەیمانی ئەبو سوفیان بوو، خەزرەجییە، ئامادەی غەزای بەدر بوو.

٣٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَغْسِلُ اَلْمَنِيَّ، ثُمَّ يَخْرُجُ إِلَى اَلصَّلَاةِ فِي ذَلِكَ اَلثَّوْبِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى أَثَرِ اَلْغُسْلِ فِيهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخاری ٢٢٩، ٢٣٠، ٢٣١، ٢٣٢. مسلم ٦٧٠ تخریج شیحا = پوختەی بوخاری/ ١٦٦ + پوختەی موسلیم ١٨٨. ترمژی/ ١١٧. نسائی ١٥٦/١}.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو ئەسەری لەش پیسیم، بەجلەکانی پێغەمبەرەوە دەشۆرد، کەدەچوو بۆ نوێژ بۆ مزگەوت، هێشتا جێگەی شۆراوەکە تەڕبوو، وەك پەڵەیێ لەڕەنگێکی تر، بەجلەکەیەوە دیار بوو. (تاج/١ زنجیرە: ٢٣ ژمارە: ١٧٤).

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست لەشوێنەواری لەش پیسی تۆماوە (مەنی پیاو).

٢- عائیشە کچی ئەبوبکری صدیقە (ڕەزای خودای لێ بێ) خێزانی پێغەمبەرە، بەپێی دەقی ئایەتی {وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ – الأحزاب/٦} کە واتاکەی وایە: (هاوسەرەکانی پێغەمبەر، لەڕێزو قەدرو حورمەتو حەرامی مارەکردنیاندا، وەك دایکی موسوڵمانان وان) بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە، بەهەموو یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر، دەگوترێ: ئومولموئمنین، واتە: دایکی موسوڵمانان، یان دایکی باوەڕداران. عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) کەیەکێکە لەزانا گەورەکانی ئیسلام، شەریعەتزانێکی چاك بووە، فەرموودەی پێغەمبەری زۆر گێڕاوەتەوە، خوێنەوار بووە، دوو هەزارو دووسەدو دە حەدیثی گێڕاوەتەوە، لەبوخاری پیرۆزدا (٢٢٨) فەرموودەی هەیە، لەصەحیحی موسلیمدا (٢٣٢) فەرموودەی هەیە، لەم فەرموودانە سەدو حەفتاو چواریان موتتەفەقو عەلەیهین، واتە: پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم گێڕاویانەتەوە، کەواتە کۆی فەرموودەکانی لە بوخاریو موسلیمدا دەکاتە: {١٧٤ + ٥٤ + ٥٨ = ٢٨٦} فەرموودە. کە ئاوا ڕیزبەندی دەکرێن: (١٧٤) پەسەندی هەردوو پیرن، (٥٤) ئەفرادی بوخاری (٥٨) ئەفرادی موسلیم.

تەمەنی شەستو پێنج ساڵ بووە، بەکچی شوی کردووە بە پێغەمبەر، منالی نەبووە، دەوری نۆساڵ خێزانی پێغەمبەر بووە، ئیتر پێغەمبەر مردووە، دیارە کە لەپاش مەرگی پێغەمبەر شووی نەکردۆتەوە، چونکە هاوسەرەکانی پێغەمبەر بەدەقی ئایەتی قورئان، حەرامە شوو بکەنەوە، دایکی ناوی ئوم ڕۆمانە، عائیشە زانایەکی پایەبەرزو شارەزا بوو، بەتایبەتی لەبابەتی فیقەو حەدیثا، لەماڵەکەی خۆیدا لەشاری مەدینە، ئەڵقەی وانە گوتنەوەو پەخشی زانستی هەبوو، زانایان لەگەڵ عوروەی خوشکەزایدا، بۆ وەرگرتنی زانستو

فێربـوونی شـەرعو حـەدیـثو قورئـان دەچـوونە خزمـەتیو ئـەویش وەك دایكێكی دڵسۆزو مامۆستایەكی داناو زانای دڵسۆز، وانەی پێ دەگوتنو وەڵامی پرسیارەكانی دەدانەوە. هەروا لەبابەتی شیعرو پزیشكیو فەرائیضو زمانـدا شـارەزا بـوو، عائیـشە زۆر سـەخی بـوو، زۆر خێركـەر بـوو، شـەونوێژی زۆری دەكـرد، رۆژووی سـوننەتی زۆری دەگـرت، لەخزمـەت پێغەمبـەرداو، لـەپاش مـەرگی پێغەمبـەر، عائیـشە لـەناو مزگەوتەكـەی پێغەمبـەردا، خـەڵوەی زۆری دەكێشا، خەڵوە واتە: ئیعتیكاف.

حـەزرەتی خـاتوو دایكـە عائیـشە حـەجی زۆری كـردووە، لەحـەجی ماڵاوایـیدا لەگـەڵ پێغەمبـەردا حـەجو عـەمرەی كـرد، حـەجی زۆری كـردووە، خۆیو چەند كەسێكی تر لـەدایكانی موسـوڵمانان، لـەپاش مـەرگی پێغەمبـەر، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا، لەگەڵ كۆمەڵێ ژنی متمانە پێكراودا، لەگـەڵ كاروانی حاجیانی جێگەی باوەڕ، دەچوون بۆ حەج، وەك ئەوە لـەپاش مـەرگی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ حەزرەتی عوسماندا، یـان لەگـەڵ عەبدولڕەحمانی كوڕی عەوفدا، دەچوون بۆ سەفەری حەج.

حەزرەتی عائیـشە گـەلێ جـار بـۆ هەنـدێ كاروبـاری كۆمەڵایـەتی، كـاری بەحیلە شەرع (فێڵە شەرعانە) دەكرد.

لـە پێغەمبـەری داوا كـرد، كـە كونییـەكی بـۆ هەڵبـژێرێ، پێغەمبـەر فـەرمووی پێـی نـاوی (عەبـدوڵڵای كـوڕی زوبـەیر) كـە خوشـكەزاتەو كـوڕی ئەسمائی خوشكتە، بكە بە كەسناو (كونیە) بۆ خۆت، ئیتر پێیان دەگـوت: ئـوم عەبدوڵلا. حەزرەتی عائیـشە شـارەزا لەمێـژووی عەرەبـەكانی پـێش ئیـسلامو شێعری ئـەو سـەرەدەمەی زۆر لەبـەر بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێ) لەماڵی ئەواو، لەباوەشی ئەودا، گیانی سپارد، وەهەر لە هۆدەكـەی ئەویـشا نێـژراوەو بـەخاك سـپێردراوە، وە ئـەو گومـەزە سـەوزەی كـە ئێـستا گـۆڕی پێغەمبەری تیادایە لەپێشدا مـاڵی حـەزرەتی عائیـشە بـوو، لـە فەتحولباریـدا،

لەداستانی شەهید بوونی ئیمامی عومەردا، لە فەرموودەی ژمارە: (٣٧٠٠)دا، دەفەرموێ: لەپاش ناشتنی حەزرەتی عومەر، لەگەڵ پێغەمبەرو ئەبو بکردا، لەهۆدەکەی عائیشەدا، عائیشە دەفەرموێ: (ئەوەتەی عومەر لەهۆدەکەی مندا لەگەڵ باوکم‌و پێغەمبەردا نێژراوە، ئیتر بەبێ خۆداپۆشینی تەواو نەچووم بۆ سەردانیان!).

عائیشە لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجاو پێنجی، یان پەنجاو حەوتی یان پەنجاو هەشتی کۆچیدا، لەمەدینە دەمرێ، تەمەنی لە دەوروبەری شەست‌و پێنجدا دەبێ، ئەبو هورەیرە ئەو سەردەمە خەلیفەی مەڕوان دەبێ لەسەر شاری مەدینە، ئەو نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی دەکا، لەسەر داوای عائیشە خۆی، بەشەو لەپاش نوێژی وەتر، لەگۆڕستانی بەقیع، کەوا لەپاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەرا، لە مەدینە بەخاك دەسپێردرێ، (ڕەزای خودای لێ بێ) پڕگۆڕەکەی لەنوور بێ، شیعەکان لەناو هاوسەرەکانی پێغەمبەردا، زۆر ڕقیان لە حەزرەتی عائیشەیە، هەروا لە حەفصەی کچی ئیمامی عومەرو لە ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان.

٣١- وَلِمُسْلِمٍ: {لَقَدْ كُنْتُ أَفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَرْكًا، فَيُصَلِّي فِيهِ}.

{مسلم. طهارة: ٦٦٧ شيحا. نسائي. فرك المنى: ٢٩٦. أبوداود: ٣٧١}.

دیسان لە عائیشەوە ئیمامی موسلیم دەگێڕێتەوە کە عائیشە دەفەرموێ: خۆم بەدەستی خۆم تۆماو (مەنی)ی وشکەوە بووم، بە جلەکانی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەووڵی‌و لەپاشا دەیم تەکاندا، ئیتر بەبێ شۆردن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی پێوە دەکرد. (تاج/١ زنجیرە: ٢٢ ژمارە: ١٧٥).

٣٢- وَفِي لَفْظٍ لَهُ: {لَقَدْ كُنْتُ أَحُكُّهُ يَابِسًا بِظُفُرِي مِنْ ثَوْبِهِ}.

{مسلم ٢٩٠ = ٦٧٢ شيحا}.

دەقی ئەم گێڕانەوەیە لە پوختەی صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:
عەبدوڵڵای کوڕی شەهابی خەولانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەلای عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) میوان بووم، دوو لۆجلم لەبەردا بوو، لەخەودا شەیتانی بووم، هەردوو جلەکەمم هەڵکێشا لەئاوو شۆردمن، کارەکەرێکی عائیشە ئەم حاڵی جل شۆردنەی من دەبینێ، وەدەچێ هەواڵی ئەمە دەدا بە عائیشە، عائیشە ناردی بەشوێنما، چووم بۆلای، فەرمووی: خێربوو وا جلەکانی خۆتت شۆردووە، هۆی ئەوە چییە؟

منیش گوتم: لە خەودا شەیتانی بووم، عائیشە فەرمووی: ئایا تۆماوت بەو دوو جلەوە بینی کە شۆردنت؟ گوتم: نەء، فەرمووی: گریمان ئەگەر تۆماویشیان پێوە بوایە، باوەڕت وابوو کە ئەو تۆماوە پیسەو لەبەر ئەوە پێویستە جلەکان بشۆریت‌و لەبەرئەوە دەتشۆرین؟ چۆن شتی وا دەکەیت‌و کەی شتی وا پیسە، لەکاتێکا کەمن بەخودی خۆم تۆماوم دەدی بەجلەکانی پێغەمبەرەوە کە وشکەوە بوو بوو، بەنینۆك دەمکرپان‌و ئیتر نەیم دەشۆرد، پێغەمبەریش بەوە ئیکتیفای دەکردو فەرمانی نەدەکرد کە بیشۆرین، کەواتە: تۆماو پاکە. (پوختەی موسلیم ١٨٨).

٣٣- وَعَنْ أَبِي اَلسَّمْحِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ اَلْجَارِيَةِ، وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ اَلْغُلَامِ} . {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِم.

{أبوداود ٣٧٦. نسائی ٣٠٤ حاکم ٥٨٩}.

ئەبو سەمح (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (میزی کچ بەر لەوە کەنانە خۆرە ببێ، ئەگەر بەر شتێ کەوت، دەبێ بشۆرێ، وەمیزی کوڕ بەرلەوە نانەخۆرە ببێ ئاوی لێ دەپرژێندرێ). (تاج/١ زنجیرە:٢٢ ژمارە: ١٦٩).

**(ڕوونکردنەوە):**

ئەبو سەمح ناوی ئییادە، یان ناوی ئەبو زەڕڕە، نۆکەری پێغەمبەر بوو، یەکێکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یەك فەرموودەی هەیە. دەڵێن: ون بووە، کەس نازانێ لەکوێ مردووەو کەی مردووە.

٣٤- وَعَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ -فِي دَمِ اَلْحَيْضِ يُصِيبُ اَلثَّوْبَ-: {"تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{١٦٤ تجريد = ٢٢٧، ٣٠٧ فتح الباری. مسلم ٢٩١ = ٦٧٣ شيحا}.

ئەسمائی کچی ئەبو بکر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەگەر خوێنی بێنوێژی بەر جلەکانمان کەوت، چی لێ بکەین؟ فەرمووی: بیوڵێن و بیکرێنن و ئینجا بەئاو هەڵی گوڵۆفن و سەری پەنجەی تێخەن و لەپاشا پاك بیشۆرن، ئیتر نوێژی پێوە بکەن. (تاج/١ زنجیرە:٢٣ ژمارە: ١٦٣).

**(ڕوونکردنەوە):**

ئەسماء کچی ئەبو بکری صەدیقە، لەباوکەوە خوشکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرە، واتە: دایکیان جیایە، ئەسماء خوشکی دایك و باوکی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بکرە، ژنی حەزرەتی زوبەیرە، (بڕوانە: ژمارە: ٨).

ئەسماء ناودارە بە (ذات النِّطَاقَين) بە بیست و حەوت ساڵ، لەپێش کۆچدا لەدایك بووە، لەعائیشەی خوشکی زۆر گەورەترە، هەژدەهەم کەس بووە کە موسوڵمان بووە، پەنجاو شەش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هەژدە فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، هەژدەیشی لە موسلیمدا هەیە، چواردەیان پەسەندی هەردوو لایە، کەواتە سەرجەمی فەرموودەکانی لە بوخاری و موسلیمدا، دەکاتە: (١٤ + ٤ + ٤ = ٢٢) فەرموودە. لەپاش شەهید

بوونی عەبدوڵڵای کوڕی، لەمەککە، لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا لە تەمەنی (١٠٠) سەد ساڵیدا، بەمردنی خودا، لەشاری مەککە، کۆچی دوایی کردووە، کاتێ مرد هیچ ددانی نەکەوتبوو، ئەقڵیشی ساغو تەواو بوو. (بڕوانە: تەجرید/١ ژمارە: ٧٥ = ١٨٤ فتح الباری. پوختەی موسلیم ١٨٨) + (تاج/ ٥ زنجیرە: ٩٧ ژمارە: ٥٥٣٩) + (تەجرید/٢ ژمارە: ٧٨٤ + پوختەی موسلیم/ ١٦٤٥).

٣٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَتْ خَوْلَةُ: { يَا رَسُولَ اَللَّهِ، فَإِنْ لَمْ يَذْهَبْ اَلدَّمُ؟ قَالَ: "يَكْفِيكِ اَلْمَاءُ، وَلَا يَضُرُّكِ أَثَرُهُ" }. {أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَسَنَدُهُ ضَعِيفٌ.

{لايوجَدُ في سنن الترمذی، وَهُوَ فِي سنن أبی داود برقم: ٣٦٥. بيهقی برقم: ٣٩٢٠. أحمد برقم: ٨٧٥٢}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خەولەی کچی یەسار (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر بەوڵێنو بەکرانو شۆردن ڕەنگی خوێنەکە هەرماو نەڕۆیشت چار چییە؟ فەرمووی: (شۆردنەکەت بەئاوێکی پاك بەسە، با شوێنەواری واتە: ڕەنگی خوێنەکەیش نەڕوا، بەمەرجێ زاتی خوێنەکەی پێوە نەمێنێ).

(ڕوونکردنەوە):

خەولەی کچی یەسار یەکێکە لەو ژنانە کە دائەنرێن بەهاوەڵو صەحابەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنها ئەم فەرموودەیەی هەیە، هۆی ڕوودانی ئەم فەرموودەیە ئاوایە: خەولە دەفەرموێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئافرەتم دەکەومە سەر بێنوێژیو سوڕی مانگانەم بۆدێ، تەنیا یەك لۆجلیشم هەیە، جانازانم کەچی بکەم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (کاتێ لە بێنوێژی پاك بوویتەوە جلەکەت بشۆرەو ئیتر

نوێـژی پێـوه بكـه). گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! مـن دەبیـنم كـه لـەپاش شـۆردنەكەیش ڕەنگـی خوێنەكـەی هـەر پێـوه دەمێنـێ فـەرمووی: (تـۆ پـاك بـەئاوی پـاك بیشۆرە، ئـیتر ئەگـەر ڕەنگەكەیـشی نـەڕوا زیـانی نییـه بـۆ تـۆ). (الإصابه في تميز الصحابة للعسقلانى).

**( پوختەی ئەم باسە )**

**ئەم باسە حەوت فەرموودەی لەخۆگرتووە:**

١- مەی بكرێ بەسركە پاك نابێتەوە، هەم پیسەو هەم حەرامە.

٢- گۆشـتی گـوێ درێـژ، یـان دووڕەگـی گـوێ درێـژ، وەك هێـستر پیـسەو خواردنی حەرامە، مەگەر لەكاتی ناچاری شەرعیدا.

٣- میـز پیـسە، ئەگـەر بـەر لەشـت كـەوت دەبـێ بـشۆرێ، تـەنیا میـزی كوڕێكی ساوا نەبێ، كە هێشتا شیرە خۆرە بێ و نانـەخۆرە نـەبووبێ، ئـەوە بـە ئاولێپرژاندن، پاك دەبێتەوە.

٤- خوێن پیـسە دەبـێ بـشۆرێ، ئەگـەر تـەنها ڕەنگەكـەی لـەپاش شـۆردن بەشتەكەوە ما، قەیدی نییە.

## ٤- باسی دەستنوێژ
## بابُ: الوُضُوءِ

٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ }. {أَخْرَجَهُ مَالِكٌ، وأَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ. وَذكره البخارِيُّ تعليقاً.

{مختصر صحيح البخارى = تجريد البخارى رقـم: ٤٧١ = ٨٨٧، ٧٢٤٠ فـتح البارى. مسلم ٢٥٢ = ٥٨٨ تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا لـصحيح مـسلم بـشرح

النووى. مالك في الموطأ رقم: ١٤٥. أحمد رقم: ٧٨٤٠. نسائى رقم: ٧. ابن ماجه ٢٨٧}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەبادا ئەرك بخەمە سەر شانی گەلی ئیسلامی خۆم، دەنا بۆ گشت نویژێ، یان بۆ گرتنی هەموو دەستنوێژێ، فەرمانم پێ دەکردن کەسیواك بکەن). (تاج/١ زنجیرە:٢٧ ژمارە: ٢٢٣) (ریاض/٣ زنجیرە:٢١٥ ژمارە: ١/ ١١٩٦).

٣٧- وَعَنْ حُمْرَانَ" { أَنَّ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دَعَا بِوَضُوءٍ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ مَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ، وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ اَلْيُمْنَى إِلَى اَلْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ اَلْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ اَلْيُمْنَى إِلَى اَلْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ اَلْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اَللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا. } مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{تجريد البخارى/ ١ رقم: ١٢٦ = ١٥٨، ١٥٩، ١٦٠، ١٦٤، ١٩٣٤، ٦٤٣٣ فتح البارى شرح صحيح البخارى. مسلم. طهارة ٥٣٧}.

حومرانی ئازادکراوی ئیمامی عوسمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوسمان داوای ئاوی کردو لەسەر ئەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: لەپێشا ئاوی کرد بەهەردوو دەستی خۆیدا، هەردوو دەستی هەتا هەردوو مووچەکانی سێ جار شۆرد، ئینجا سێ جار ئاوی لە دەمو لووتی ڕاداو هنگی کرد، ئینجا سێ جار دەموچاوی شۆرد، ئینجا سێ جار دەستی ڕاستی هەتا ئانیشکی شۆرد، ئینجا دەستی چەپیشی سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریداو سەری خۆی مەسح کرد، ئینجا قاچی ڕاستی هەتا هەردوو قاپە ڕەقەڵەی سێ جار شۆرد، ئینجا بەو چەشنە پێی چەپیشی هەتا قاپەڕەقەڵەی سێ جار شۆرد. لەپاشا عوسمان فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی

(دروودی خوای لەسەر بێ) وەك ئەم دەستنوێژەی ئێستا من گرتم دەستوێژی گرت.

لەتاج و لە تەجریدی بوخاریدا ئەمەی پترە:

ئەوجا هەڵسێ دوو ڕکات نوێژی پوختی دوور لەخەیاڵی کاروباری دونیایی بکات، یان زیاتر لەدوو ڕکات بکات، بەهەمان شێوە، ئیتر خودای گەورە لەگوناهەکانی لەوەوپێشی خۆش دەبێ!. (تاج/ ١ زنجیرە:٢٨ ژمارە: ٢٣٣) + (ریاض/٣ زنجیرە: ١٨٥ ژمارە: ١٠٢٧).

٣٨- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي صِفَةِ وُضُوءِ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- قَالَ: {وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَاحِدَةً}. أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد.

{أبوداود رقم: ١١١ ترمزی رقم: ٤٤، ٤٨ نسائی ٦٨/١}.

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی چۆنێتی دەستنوێژی پێغەمبەری کرد فەرمووی: (وە یەکجار بەدەستی تەڕ سەری خۆی مەسح کردو دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەری خۆیدا).

(ڕوونکردنەوە):

أ- جەعفەرو عەلی و عەقیل و طالیب، هەرچواریان برا بوون، هەق ئامۆزای پێغەمبەر بوون، چونکە هەرچواریان کوڕی ئەبو طالیبی مامەی بوون، کە ئەبو طالیب هەق برای باوکی و دایکی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەلیب بوو، کە عەبدوڵلا باوکی پێغەمبەر بوو، واتە: پێغەمبەر لەپشتەوە لەم چوار ئامۆزایەی خزمی نزیکتری نەبووە، جەعفەر دە ساڵ لەعەلی گەورەتر بوو، عەلیش دە ساڵ لە جەعفەر گەورەتر بوو، طالیبیش دە ساڵ لە عەقیل گەورەتر بوو، واتە: طالیب یەکەم بوو، عەقیل دووەم، سێیەم جەعفەر، چوارەم: عەلی. تالیبیان لەغەزای بەدردا بێ سەرو شوێن بوو، موسوڵمان نەبوو، جەعفەریان لە کۆچکارە پێشینەکان بوو، کۆچی کرد بۆ

وڵاتی حەبەشە، لەغەزای خەیبەردا گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) (نازانم بەکام لەم دوو مــوژدە خۆشە، شادمانترم، بەهاتنی جەعفەر، یان بەئازادکردنی خەیبەر!).

ناوداره بە جەعفەری تەییار، واتە: جەعفەری باڵدار، چونکە لەغەزای مۆتەدا، لەوڵاتی شام، لەشەڕ لەگەڵ سوپای ڕۆمدا، کە شەهید کرا، هەردوو دەستی پەڕی، وە تەرمەکەی بەشەهیدی کە دۆزرایەوە، زیاتر لە نەوەد سەره ڕمو دەمە شیرو جێگەی تیری پێوە بوو، لەوەدوا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەعفەرم دی لە بەهەشتا لەگەڵ فریشتەکانا، بەدوو باڵ دەفڕی!).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابوو، کاتێ سڵاوی لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەکرد، دەیفەرموو: (سڵاو لەتۆ، ئەی کوڕی خاوەنی دووباڵ!).

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیمشەو جەعفەرم پێ گەیشت، لەناو پۆلێ فریشتەدا بوو، هەردوو باڵی خەڵتانی خوێن بوو).

جەعفەر برای باوكو دایکی عەلی بوو، دەڵێن: بیستو شەشەم کەس بووە، کە موسوڵمان بووە، پێغەمبەر پێی فەرموو: (هەم شێوەی شیرنتو هەم ڕەفتاری جوانت لەخۆم دەچن!).

جەعفەر هەژارانی زۆر خۆشدەویست، خزمەتی زۆری دەکردن، بەدەستی خۆی نانو ئاوی بۆ دادەنانو لەلایان دادەنیشتو قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، پێغەمبەریش ناوی نابوو (باوکی هەژاران!) لەکاتی موئاخاتدا – واتە: لەکاتی پەیمانی برایەتی بەستندا لە نێوان موسوڵماناندا – پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جەعفەری کرد بەبرای موعازی کوڕی

جەبـەل، نەجاشـی پادشـای حەبەشـەو تاقمەکـەی لەسـەر دەسـتی جەعفـەردا موسوڵمان بوون، کاتێ جەعفەر هاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناوچەوانی ماچ کرد. ئیمامی جەعفەر دەوری چڵ ساڵ ژیاوە، لەساڵی هەشـتی کۆچیدا، لەغەزای مۆتەدا شەهید بوو. (بڕوانە: تاج/٣ زنجیرە: ١٨ ژمـارە: ٣٣٥٢ هەتا ژمارە: ٣٣٥٦ + تاج/٤ زنجیرە: ١٠٠ ژمارە: ٤٦٤٠، ٤٦٤١، ٤٦٤٢. ج/٤).

عەقیل درەنگ موسوڵمان بوو، لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، چـەند فەرموودەیـەکی گێڕاوەتـەوە، لەبوخاریـدا فـەرموودەی نییـە، زانایـەکی ڕەگـەزناس بـوو، لەمزگەوتەکـەی مەدینـەدا، قاڵیـچەیەکی دادەخـستو لـەپاش نوێـژ لەسـەری دادەنیـشتو خـەڵك لـەدەوری کۆمـەڵ دەبـوون، فێـری زانـستی ڕەگەزناسی دەکردن، پیاوێکی وەڵام ئامـادە بـوو، وەڵامـەکانی دەمکوتکـەر بـوو، لەعـەلی بـرای جیـاوە بـوو، لەگـەڵ موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان بـوو، کـە موعاویە نەیاری عەلی بوو، دەڵێن: ڕۆژێ، موعاویە دەڵێ: (عەقیل دەزانـێ مـن بۆ ئـەو لـە عـەلی بـرای باشـترم، بۆیـە لەگـەڵ ئێمەدایـەو وازی لـە عـەلی بـرای هێنـا!). عـەقیل (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: (قـسەی ڕاسـتت دەوێ، براکەم بۆ ئایینم، بۆ من لـەتۆ باشـترە، وەتـۆ بـۆ مـن بـۆ جیهـانم لـەو باشـتری بۆم، وەمن ئێستا دوای دونیا کەوتووم، بـەڵام لـەخودای گـەورە داوا دەکـەم کـە ئاخرم بەخێر بگێڕێ).

عـەقیل (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لەسـەرەتای جێنـشینی یەزیـدی کـوڕی موعاوییـەوە مـردووە. ئیبنـو عەبدولبـەڕ لـە ئیـستیعابا دەفـەرموێ: خـۆم فەرموودەیەکم گێڕاوەتەوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی ئەبو یەزید! من لەبەر ئەم دوو هۆیـە، دووجـار تـۆم خۆشـدەوێ: جـارێ لەبەر ئەوە کە تۆ خزممیو ئامۆزامی، جارێکیش لەبەر ئەوە کـە دەزانم ئـەبو تالیبی مامەم، کە بۆ من زۆر باش بوو، تۆی زۆر خۆشدەویست). (ڕەزای خودا لە ئەبویەزید — واتە: لەعەقیل - بێت).

ئـەمیرولمۆئمنین ئیمـامی عـەلی (رەزای خـودای لێ بـێ) هـەق ئـامۆزای پێغەمبـەر بـوو، هـەم زاوای پێغەمبـەرە، مێـردی فاتیمـەی کـچیەتی، بـاوکی حەسەنو حـسەینە، بـەپێی پـەیمانی گرێـدانی برایـەتی، (المؤاخـاة) عـەلی بـوو بەبرای پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) پێـی فـەرموو: (تـۆ لەدونیاو لە قیامەتا برای منی!) عەلی یەکێ بوو لەو دە کەسەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێدابوون، کە ناسراو بـوون بـە عەشەرەی موبەششەرە، واتە: دە کەسە موژدەی بەهەشت پێ دراوەکـان. عـەلی جێنـشینی چـوارەم بـوو، کاتـێ عوسمـان شـەهید کـرا، عـەلی کـرا بەخەلیفـەی موسوڵمانان. عەلی پیاوێکی زاهیـدی دونیـا نەویـست بـوو، تـەواو خوداپەرسـت بوو، هەتا بڵێی زاناو دانا بوو، زۆر دادپەروەرو بە ویژدانو هەقانی بوو، هـەتا بڵێـی رۆشـنبیرو ڕەوانبێـژبوو، خوێنـەوار بـوو، نووسـەری پەیماننامەکـەی حودەیبییە بوو، دایکی عـەلی نـاوی فـاطیمـەی کچی ئەسـەد بـوو، کاتـێ عـەلی لەدایك بوو، فاطیمـەی دایکی نـاوی نـا (حەیـدەر) (بڕوانـە: تـاج/٤ زنجیرە:٩٠ ژمارە: ٤٦١١).

فاطیمەی دایکی عەلی، موسوڵمان بوو، وەکۆچی کـرد بـۆ مەدینـە، عـەلی زانـاو دانایـەکی بلیمـەت بـوو، کتێبـی نەهجولبەلاغەکـەی، بەڵگـەی ئـەم گوتەیەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەتەقوا بوو، قەت سازشی نەدەکرد لەگەڵ دونیادا، قوڕەیشی هۆزی خۆی، تانـەی ئـەوەیان لێ دەدا: کە عـەلی لەسیاسەت نازانێ!

لەهـەموو جـەنگو نەبەردەکانـدا، لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بـوو، جگـە لەغەزای تەبووك، لەغـەزای خەیبـەردا ئاڵاکـە لای عـەلی بـوو، زۆر بـە منـداڵی موسوڵمان بووە، لەماڵی پێغەمبـەردا پـەروەردە بـووە، لـە پێغەمبـەرەوە (٥٨٦) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، (٢٠) بیستیان پەسەندی شەیخەینە، بوخاریش بـەبێ موسلیم نۆی تریانی لـە صـەحیحی بوخاریـدا گێڕاوەتـەوە، موسـلیمیش بـەبێ

بوخاری پازدەی تریانی گێڕاوەتەوە، کەواتە: (٢٩) فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، وە (٣٥) فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە، سەرجەمی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، دەکاتە: ٢٠ + ٩ + ١٥ = ٤٤ فەرمووده. پێنج ساڵ شتێ کەم جێنشینی (خەلافەتی) کردووه، بەشەهیدی مردووه، خەلیفەی دووەم‌و سێیەم‌و چوارەم بەشەهیدی مردوون، تەمەنی عەلی لەکاتی مەرگیدا شەست‌و سێ ساڵ بوو، لەشەوی یەك شەممە، لە نۆزدەی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچی، لەکووفە بەدەستی عەبدولڕەحمانی کوڕی مولجەمی ئەملورادی شەهید کرا، هەندێ دەڵێن: لەبەیانی رۆژی هەینی، شەوی حەڤدەی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچی لە کووفە ئیبنو مولجەم شەهیدی کرد، حەسەن‌و حوسەینی کوڕی شۆردیان، لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەردا، حەسەنی کوڕی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، عەلی سەوزەیەکی تۆخ بوو، چاوەکانی قەوی بوون، بالای لەکورتەوە نزیکتر بوو، هەتا لەدرێژەوە، ورگی کەمێ هەبوو، مووی چڕو پڕ بوو، ریشی گەورە بوو، کڕانە (ئەصلەع) بوو، سەروریشی پاك سپی بووبوو، چوارشانەیەکی تێکسمڕاو بوو، دەتگوت: مانگی چواردەیە، تەنیا خۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا،ناوی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، بەڵام لەناو فەرمووده گێڕەوەکاندا هەشت کەسی تر بەم ناوەوە هەیە. (تاج/٣ زنجیرە:٩ ژمارە: ٣٢٨٨ هەتا ژمارە: ٣٣١١. چاپی چووارەم) + (تەجریدی بوخاری/ ٢ ژمارە: ٧٦١ + پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ٣٦).

ب- حومرانی کوڕی ئیبان، بەندەی ئازادکراوی ئیمامی عوسمان بوو، لەدیله کۆیلەکانی عەینی تەمر بوو، عوسمان کڕی‌و ئازادی کرد، بەسەردەمی ئەبو بکرو عومەردا گەیشتووه، گێڕانەوەی لە عوسمان‌و موعاوییەوە هەیە، یەکێکە لە پەیڕەوان، لەچینی عوروەی کوڕی زوبەیره، لە تابیعینی مەدینەیە، فەرموودەزانێ بوو، لە فەرموودەزانەکانی مەدینە، ئەبو قەتادە دەڵێ: لەگەڵ عوسمانا جەماعەتی دەکرد، کە عوسمان قورئانەکەی لێ تێك

دەچوو، حومران سەری باسەکەی بۆ دەکردەوە، ئیبنو عەبدولبەرر دەفەرموێ: (حومران زانایایەکی گەورە بوو، خاوەن پایەو شانی کۆمەڵایەتی بوو، ڕاجیایی هەیە، کە ئایا لەساڵی (٧٥) یان (٧١) یان (٧٦) وەفاتی کردووە.

ج- فەرمانڕەوای سێیەمی موسوڵمانان، ئیمام عەسمانی کوڕی عەففان، دایکی ناوی (ئەڕوا)یە دایکی ئەروا ناوی بەیضای کچی عەبدولموطەلیبە، کە لە باوکییەوە پووری پێغەمبەرە، عوسمان بە شەش ساڵ لە پێغەمبەر منالترە، لە موسوڵمانە دێرینەکانە، لەسەر دەستی ئەبو بکری صدیقدا موسوڵمان بووە، ناوداره بە (ذو نورین) واتە: دوو نوور، چونکە دوو کچی پێغەمبەری هێناوە، لەپێشا ڕوقیەی هێناوە، کە ڕوقیە دەمرێ، ئوم کلثوم دەهێنێ، ڕوقیەو ئوم کلثوم کچی پێغەمبەر بوون، دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ، سەدو چلو شەش فەرموودەی لەکتێبە ناودارەکانی سوننەتدا هەیە، پێشەوا بوخاری یازدەیانی لە صەحیحی بوخاریدا گێڕاوەتەوە. لەپاش شەهید بوونی پێشەوا عومەر لە یەکەم ڕۆژی مانگی موحەڕەمی ساڵی بیستو چواری کۆچیدا، کرا بەجێنشین، بووبە خەلیفەی سێیەم، دەوڵەتی ئیسلام لەسەر دەستی ئەودا تەواو تەواو دامەزراو، ڕوبەری فراوان بوو، سامانو ماڵ وا زۆر بوو ئەوقی دایەوە، ماڵو دارایی زۆر زۆر بوو، وای لێهاتبوو خەڵك کەنیزەکیان سەربەسەر دەکڕی بەپارەی ئاڵتون!

ئیمامی عوسمان یەکێکە لە عەشەرەی موبەششەرە. وە خوالێخۆشبوو ئەحمەدی خانی دەفەرموێ:

موبەششەرە بوونە دەه کەس ژ ئەصحابان بە تەعیین
کودێ بچنە بەهەشتێ خودێ مزگێنی دا وان
ژ ئەووەل بوو عوبەیدە، دگەل هەرچار ژ یاران
سەعیدو سەعدو تەلحە زوبەیرو عەبدولڕەحمان

عوسمان یەکەم کەس بوو کە لەگەڵ روقیەی هاوسەریدا، کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، عوسمان زۆر دڵنەرم بوو، هێمن‌و شەرمن‌و لەسەرەخۆ بوو، شێخی ئیبنو سیرین (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (کاتێ گەمارۆو ئابلۆقەی عوسمان درا، ژنەکەی بە گەمارۆدەرەکانی فەرموو: ئەیکوژن یان نایکوژن، ئەوە بەدەست من نییە، بەدەست ئێوەیە، خۆتان لەوە سەرپشك‌و بەرپرسیارن، بەڵام من ئەم شایەتییەم لەلایە: خوا هەقە ئیمامی عوسمان، شەوانە لەیەك رکات شەونوێژدا، هەموو قورئانی دەخوێند!!)

عوسمان تابڵێی خێرخواز بوو، خێرۆمەندێکی گەورە بوو، گرنگترین‌و ناوادارترین کاری ئیمامی عوسمان کۆکردنەوەی قورئان بوو، حەوت دانەی لە قورئان گرتەوە، سەرودانەی نارد بۆ مەککەو کووفەو بەصرەو شام‌و یەمەن‌و بەحرەین، وەدانەیەکیشی لەلای خۆی هێشتەوە بۆخۆی، بەردەوام قورئانی تیا دەخوێندو خەتمەی تیادا دەکرد، عوسمان لەتەمەنی هەشتاو دووساڵیدا، لەفەرتەنەیەکی کوێرانەدا، لەڕۆژی هەینیدا، ڕێکەوتی هەژدەی مانگی قوربان ساڵی (٣٥)ی کۆچی، لەکاتی دەور کردنەوەی قورئاندا، ئەسوەدی تەجیبی، شەهیدی کرد، قورئانەکە لەباوەشیدا بوو، خوێنەکەی پڕژا بەسەر ئەم ئایەتەدا {فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ}. واتە: خودا لەجیاتی تۆ سەرەوکاری‌و چارەسەری ئەو دووبەرەکی‌و ناکۆکییەی ئەوان دەکات، هەزار رەحمەت لەئیمامی جەزەری، کە لە (ذات الشفاء)دا دەفەرموێ:

فَذَبَحُوهُ تَالِيَ القُرْآن
بَيْنَ يَدَيْهِ المُصْحَفُ العُثْمَانِي!

واتە:

وەك بەرخ سەربڕی، سەربڕا عوسمان
کاتی شەهید بوون قورئان لەسەر ڕان!

ئیتر ئەو ڕۆژە تەرمەکەی لەو ناوەدا فڕێدرابوو، هەتا شەو لەو پارچە زەوییەدا، کە خۆی کڕیو خستیە سەر گۆڕستانی بەقیع، گۆڕی ئامادە هەبوو، لەو گۆڕەدا ناشتیان، جوبەیری کوڕی موطعیم نوێژی تەرمی لەسەر کرد، زۆر لەشاعیرانی صەحابە شێعری لاواندنەوەیان بەسەریا هەڵداو، منیش دەڵێم:

مانگی قوربان بوو، کرا بە قوربان

نووری چاوی من، ئیمامی عوسمان

(بڕوانە: تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری بەکوردی. بەرگی/١ لاپەڕە: ١٥٠ ژمارە: ١٣٦ = ١٥٩ فتح الباری للعسقلانی شەرحی صەحیحی بوخاری + پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ٩ = ١٣٥ صحیح مسلم، ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا + تاجول ئوصول بەکوردی/ ٣ زنجیرە: ٧+ زنجیرە: ٨ لەژمارە: ٣٢٧١وە هەتا ژمارە: ٣٢٨٧).

٣٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ عَاصِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) - فِي صِفَةِ اَلْوُضُوءِ - قَالَ: {وَمَسَحَ رسولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِرَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{بخاری رقم: ١٨٦، ١٨٥، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩ = ترقیم فتح الباری = ١٣٩ ترقیم تجرید البخاری. بەرگی/١. مسلم رقم: ٢٣٥ = ٥٥٤، ٥٥٥، ٥٥٦، ٥٥٧، ٥٥٨ ترقیم صحیح مسلم للشیخ خلیل مأمون شیحا = رقم/ ١٢٥ پوختەی صەحیحی موسلیم. ترمذی رقم/ ٤٧. نسائی ١/ ٧٢. أبوداود رقم/ ١١٨. ابن ماجه رقم/ ٤٣٤. أحمد ٤/ ٤٠}.

دەقی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاری (ڕەزای خودایان لێ بێ) کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) پیاوێ پێی وت: ئایا دەتوانی کە پیشانمان بدەی کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر

بێ) چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ باشە، جا داوای ئاوی کردو جامێ ئاویان هێنا بۆی، جامەکەی لارکردەوەو بەلێوی جامەکە ئاوی کرد بەدەستی خۆیداو، سێ جار هەردوو دەستی خۆی لەدەرەوەی جامەکە بەو شێوەیە شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بە جامەکەداو لوێچێ ئاوی هەڵگرتو لەو تاقە لوێچە هەم ئاوی لەدەمی ڕاداو، هەم لە لووتی ڕاداو، هنگی کردو لووتی پاك کردەوە، سێ جار بەسێ لوێچ ئاو، ئاوای کرد، ئەوجا بەسێ مشت ئاو دەموچاوی خۆی شۆرد، ئەوجا دەستی کردەوە بەناو دەفرەکەداو، هەردوو دەستی هەتا هەردوو ئانیشکی دووجار دووجار شۆرد، ئەوجا دەستی کردەوە بەناو ئاوەکەداو دەستی دەرهێنایەوە، دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا، لەپێشا لەپێشی سەریەوە، دەستەکانی بردن بۆ پشتە سەری، لەسەرەتاوە هەردوو دەستی بەتەڕی لەپێشی سەریەوە خشان بەسەر سەریدا هەتا پشتەملی، ئەوجا بەرەو دوا بەسەر سەریدا بەکێشی کردن هەتا ئەو شوێنەی کە لەوێوە دەستی پێ کرد، ئەوجا هەردوو پێی هەتا هەردوو قاپەڕەقەکانی شۆرد. ئەوجا عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەوە شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەر بوو (درودی خوای لەسەر بێ) (پوختەی صەحیحی موسلیم بەکوردی/ نوری فارس ژمارە: ١٢٥ تحقيق الشيخ الألباني).

(ڕوونکردنەوە):

١- گەرچی ژمارەی جارەکانی شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ، لەم فەرموودەیەدا، هەندێکیان دووجارەو هەندێکیان سێ جارە. بەلام نەوەوی دەفەرمووێ: ئەمە کە پێغەمبەر ئەم جارە وای کردووە، بۆ نیشاندانی دروست بوونەو بۆبەیانی جەوازە، دەنا هەموو کردارەکانی دەستنوێژ سێ جار سوننەتەو باشترو خێرترە.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاری هاوەڵە، لەغەزای ئوحوددا بەشداری کردووە، لەڕیزی لەشکری ئیسلاما، لەدژی ناموسوڵمانەکان،

بەم جۆرە هاوەڵە دەگوترێ: ئوحوددی، بەڵام بەدری نەبووەو لەغەزای بەدردا بەشداری نەکردووە، عەبدوڵڵا خۆیو باوکیو دایکی (رەزای خودایان لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەر بوون، چلو هەشت فەرموودەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم، ئەو هەشت فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، یەکێکیان ئەم فەرموودەیەیە کەواین لە خزمەتیدا، کە لە بوخاریدا لە هەشت جێگەدا، بەهەشت بۆنەوە، دووبارە بۆتەوە، ئاوا: (١٨٥، ١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٥، ١٩٧، ١٩٩). عەبدوڵڵا بەشداری لە کوشتنی موسەیلەمەی کەززابا کردووە عەبدوڵڵا و وەحشی بەهەردووکیان موسەیلەمەیان کوشت، ئەم زاتانە شاگردو فەقێی عەبدوڵڵا بوون بۆ گێڕانەوەی فەرموودەکانی: عەببادی کوڕی تەمیم کەبرازای بووە، لەگەڵ یەحیای کوڕی عەمارەو کەسانی تریش. لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمانگی قوربانیدا، لە شەڕەکەی ڕۆژی ئەلحەڕەدا، کە لە ساڵی (٦٣)ی کۆچیدا بوو، عەبدوڵڵا شەهید کرا، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) (بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٢٥ = ٥٥٤ تەرقیمی صەحیحی موسلیم لەلایەن شێخ خلیل مەئموون (شیحا)وە + تەجریدی بوخاری/ ١ ژمارە: ١١١ = ١٣٧، ١٧٧، ٢٠٥٦٠ فتح الباری).

٤٠- وَفِي لَفْظٍ: {بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى اَلْمَكَانِ اَلَّذِي بَدَأَ مِنْهُ } :

واتاو تەخریجی ئەم ژمارەیە لەژمارە (٣٩)دا بەتەواوی رابورد.

٤١- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا -فِي صِفَةِ اَلْوُضُوءِ- قَالَ: {ثُمَّ مَسَحَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِرَأْسِهِ، وَأَدْخَلَ إِصْبَعَيْهِ اَلسَّبَّاحَتَيْنِ فِي أُذُنَيْهِ، وَمَسَحَ بِإِبْهَامَيْهِ ظَاهِرَ أُذُنَيْهِ} . {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أبوداود/ ١٣٥. نسائی ١/ ٨٨. ابن خزيمة/ ١٧٤}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەباسی چۆنێتی دەستنوێژی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی دەستنوێژگرتندا کاتێ سەری مەسح کرد، دەستی تەڕی هێنا، بەسەر سەریداو، پەنجەی شایەتومانی دەستی ڕاستی کرد بەناو گوێی ڕاستیداو، پەنجەی شایەتمانی دەستی چەپی کرد بەناو گوێی چەپیداو، بەو شێوەیە دیوی ناوەوەی هەردوو گوێچکەی پێکەوە مەسح کرد، لەهەمان کاتدا، بە بەری هەردوو پەنجەکەڵەی هەردوو دەستیشی دیوی دەرەوەی هەردوو گوێشی مەسح کرد) (تاج/١ زنجیرە:٢٨ ژمارە: ٢٤٠).

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، یەکێکە لەهاوەڵە ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوڕێ بەڕێزەکانی بێ) یەکێکە لەو چوار کەسە کەناویان عەبدوڵڵایەو بەعەبادیلەی ئەربەعە ناسراون، چوار عەبدوڵڵاکە، کە ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرن، کە هەرچواریان خۆیانو باوکیان ئیسلام بوون، (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) سیازدەساڵ، یان دوازدە ساڵ لەباوکی خۆی منداڵترە، زانایەکی پایەبەرزو زۆر خواناس بوو، زۆر زاناو داناو بلیمەت بووە، زۆر بەدین بووە، لەپێش باوکیدا موسوڵمان بووە، زەینێکی زۆر ڕۆشنی هەبوو، فەرموودەکانی پێغەمبەری دەنووسییەوەو لەبەری دەکردن، بۆ ئەمە پێغەمبەر خۆی مۆڵەتی دا، پەڕاوونامەی خاوەن نامەکانی دەخوێندەوە، (٧٠٠) حەوت سەد فەرموودەی هەیە، کە لەپەڕاوە بایەخدارەکانی فەرموودەدا تۆمار کراون، لە بوخاری نازداردا (٢٥) بیستو پێنج فەرموودەی هەیە، لە صەحیحی موسلیمدا (٣٧) سیو حەوت

فـەرموودەی هەیـە (١٧) حەفـدەیان پەسـەندی هـەردوو پـیری بوخـاریو موسلیمن، واتە: موتتەفەقو عەلەیهین، کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا، سەرجەمی فەرموودەکانی یەکسانە بە: {١٧ + ٨ + ٢٠ = ٤٥ = ١٧ پەسـەندی هـەردوولا (٨) لـە ئـەفرادی بوخـاری، واتـە: ئـەو هەشـتە هـەر بوخـاری دەری هێنـاوە، لـە موسـلیمدا نـین (٢٠) بیـستیان لـە ئەفرادی موسلیمن، واتە: ئەم بیستە لە صەحیحی بوخاریدا نین، کەواتـە: (١٧ + ٨ + ٢٠ = ٤٥ = سـەرجەمی فـەرموودەکانی عەبـدوڵلای کـوڕی عـەمر لـە صەحیحەیندا.

عەبـدوڵلا هـەتا مـرد ڕۆژنـاڕۆژێ بـەڕۆژوو دەبـوو، وەهـەتا مـرد شـەونوێژێکی زۆری دەکـرد. (بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری/ ٢ ژمـارە: ٩١٢ + ریاض/ ١ ژمارە: ١٥٠ + تاج/ ١ زنجیرە: ١٨١ ژمارە: ٩٧٣).

عەبـدوڵلا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕاجیـایی هەیـە لەسـاڵی مـەرگیو لەجێگـەی مەرگیـدا، لـەمانگی قوربـانی سـاڵی شەسـتو پێنجـی کۆچـیدا، لەمەککە، یان لە طائیف، یـان لـە میـصر، یـان لـە فەلەسـتین، لەتەمـەنی (٧٢) حەفتاو دوو ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووە. (بڕوانە: تاجول ئوصول بـەکوردی، بەرگی/٣ زنجیرە: ٣١ لەژمارە: ٣٤١٦ وەهەتا ژمارە: ٣٤١٩).

٤٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { إِذَا اِسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلَاثًـا، فَـإِنَّ اَلـشَّيْطَانَ يَبِيـتُ عَلَـى خَيْشُومِهِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{بخاری/ ٣٢٩٥ = ١٣٢٨ تجريـد البخـاری. مـسلم. طهـارة/ ٢٣٨ = ١٢٧ پوختەی صەحیحی موسلیم = ٥٦٣ صحيح مسلم بشرح النووی، ترقيم الشيخ خليـل مأمون شيحا}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خوای لەسەر بـێ) دەفـەرموێ: (کاتـێ کەسـێکتان لەخـەو خەبـەری دەبێتـەوە،

باسێ جار ئاو لەدەمو لووتی ڕابدات تا لووتتان لەئازار پاك دەبێتەوە، چونكە شەیتان لەناو سەرووی كونە لووتەكانیدا شەو دەكاتەوە، بەنیازی ئەوەی لەپاش خەبەر بوونەوە، لەوێوە بەرەو دڵ بڕواتو خوتوورەی خراپی پێ بكا، بەڵام كە خەوتووەكە ئاوی لەدەمو لووتی ڕادا، لەكاتی دەستو دەموچاو شۆردندا، یان لەكاتی دەستنوێژدا، شەیتان ئەو هەلەی لەكیس دەچێ).

٤٣- وَعَنْهُ: {إِذَا اِسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلَا يَغْمِسُ يَدَهُ فِي اَلْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثًا فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدَهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/ ١ ژمارە: ١٢٧- مكرر = ١٦٢، ١٦١ فتح الباری. مسلم. كراهة غمس المتوضئ/ ٢٧٨ = ٦٤١ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا. تحفة الأشراف/ ١٣٨٢٠}:

دیسان ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ لەخەو هەڵدەستن، دەست مەكەن بەناو حاجەتەكەدا، لەپێشا سێ جار لەدەرەوەی حاجەتەكە، دەستتان بشۆرن، چونكە ئێوە نازانن كە دەستتان بەشەو چی بەسەر هاتووە!).

واتە: دوور نیە كەبەر شتێ پیس كەوتبێ. (تاج/ ١ زنجیرە: ٢٧ ژمارە: ٢٢١).

٤٤- وَعَنْ لَقِيطِ بْنُ صَبْرَةَ، (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَسْبِغْ اَلْوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ اَلْأَصَابِعِ، وَبَالِغْ فِي اَلِاسْتِنْشَاقِ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا}.

{أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ. {أبوداود/ ١٤٢. ترمذی/ ٧٨٨. نسائی/ ١١٤. ابن ماجه/ ٤٤٨. ابن خزيمة/ ١٥٠}.

لەقیطی كوڕی صەبیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەتەواوی دەستنوێژ بشۆرەو دەست بخەرە ناو پەنجەكانتو زۆر باش ئاو لەدەمو لووتت ڕابدە، بەڵام ئەگەر

بەرۆژوو بوویت زیادەڕەوی مەکە، لەئاو لەدەمو لووت ڕاداندا). (تاج/١ زنجیرە: ٢٨ ژمارە: ٢٤٤).

(ڕوونکردنەوە):

لەقیتی کوڕی صەبیرە هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرەوە هەیە، لەویشەوە وەکیعی کوڕی عەدەسو عاصیمی کوڕی گێڕانەوەیان ئەنجام داوە.

٤٥- وَلِأَبِي دَاوُدَ فِي رِوَايَةٍ: {إِذَا تَوَضَّأْتَ فَمَضْمِضْ}.

ئەبوداوود (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەگێڕانەوەیەکی خۆیدا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ دەستنوێژ دەگریت بەباشی ئاو لە دەمو لووتت ڕابدە).

٤٦- وَعَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ فِي اَلْوُضُوءِ}. أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{ترمذی/ ٣١. ابن خزیمة: ١/ ٧٨ - ٧٩}:

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) (کاتێ دەستوێژی دەگرت، دەستی دەخستە ڕیشی). (تاج/١ زنجیرە: ٢٨ ژمارە: ٢٣٨ ).

٤٧- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أُتِيَ بِثُلُثَيْ مُدٍّ، فَجَعَلَ يَدْلُكُ ذِرَاعَيْهِ}. أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أحمد ٤/ ٣٩. ابن خزیمة/ ١١٨}.

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (جارێ دووسێیەکی موودێ ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێغەمبەر بەو ئاوە کەمە دەستنوێژی پێگرت، هەڵی دەسوی لەهەردوو باسکەکانی خۆی).

(ڕوونكردنەوە):

موود ئامێرێکی پێوانەیە، دەکاتە مشتێ، بەمشتی ئاسایی.

٤٨- وَعَنْهُ (رضي الله عنه): {أَنَّهُ رَأَى اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَأْخُذُ لِأُذُنَيْهِ مَاءً غَيْرَ اَلْمَاءِ اَلَّذِي أَخَذَهُ لِرَأْسِهِ.} أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَهُوَ عِنْدَ "مُسْلِمٍ" مِنْ هَذَا اَلْوَجْهِ بِلَفْظِ: وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ بِمَاءٍ غَيْرَ فَضْلِ يَدَيْهِ، وَهُوَ اَلْمَحْفُوظ.

{البَيْهَقي(١/٦٥) وَقالَ: إِسْنَادُهُ صَحيحٌ. مسلم. طهارة/ ٢٣٦ = شيحا: ٥٥٨}.

دیسان عەبدوڵڵای کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی، دەستنوێژی دەگرت، بەئاوێکی تازە هەردوو گوێچکەی خۆی مەسح کرد، جیابوو لەو ئاوەی کەسەری خۆی پێ مەسح کرد (بەیهەقی).

دەقی ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی دەستنوێژی دەگرت، لەسەر ئەم شێوەیە:

ئاوی لەدەمی ڕادا، ئەوجا هنگی کردو ئاوی لە لووتی خۆی ڕادا، ئەوجا سێ جار ڕوخساری خۆی شۆرد، ئەوجا دەستی ڕاستی تا ئەنشکی سێجار شۆرد، ئەوجا دەستی چەپی تا ئانیشکی سێ جار شۆرد، ئەوجا بەئاوێکی تازە سەری خۆی مەسح کرد، جیا لەو ئاوەی کە دەستەکانی پێ شۆرد، ئەوجا هەردوو قاچی هەتا هەردوو قولەپێکانی خۆی شۆرد، هەتا پاك‌و خاوێنی کردنەوە).

٤٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { "إِنَّ أُمَّتِي يَأْتُونَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ، مِنْ أَثَرِ اَلْوُضُوءِ، فَمَنْ اِسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بخاری ١٣٦ = ١١٠ تجریدی بوخاری. مسلم/ ٥٧٩ = ١٢٨ پوختەی موسلیم}.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا، کە ئومەتم دێن بۆلام بۆ سەر حەوزی کەوسەرم، هەموویان ڕوخسار گەش و نوورانین، چونکە ئەو شوێنانەی ئەندامەکانیان، کە ئاوی دەستنوێژ دەیانگرێتەوە، سپی و گەش و جوانن و ئەدرەوشێنەوە، بەهۆی ئەسەرو شوێنەواری دەستنوێژەوە، دەی بۆ بەدەستهێنانی ئەم بەهرە گەورەیە، لەکاتی دەستنوێژگرتندا، چەندەی دەتوانن فەشی و گەشی ئەندامەکانی دەسنوێژتان زۆرتر بکەن). (ریاض/ ٣ زنجیرە/ ١٨٥ ژمارە: ١٠٢٩ + تاج/ ١/ ١٢٧ ژمارە: ١١٧١).

٥٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُعْجِبُهُ اَلتَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهُ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخاری/ ١٦٨، ٤٢٦، ٥٣٨٠، ٥٨٥٤، ٥٩٢٦ = ١٢٩ تەجریدی بوخاری. مسلم/ ٢٦٨ = ٦١٥ ترقیم شیحا = ١٢٤ پوختەی موسلیم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) تا بۆی بکرایە، لەگشت کاروبارێکی خۆیدا حەزی لەوە بوو، کەلای ڕاست پێش بخات، وەك پێلاو لەپێ کردن و سەرداهێنان و مووی سەرو ڕیش شانەکردن و، لەدەستنوێژگرتن و خۆشۆردن و، لەگشت کاروبارێکی تری بایەخداری تری خۆی). (تاج/ ١ زنجیرە: ٣٢ ژمارە: ٢٨٠) + (ریاض الصالحین/ ٣ زنجیرە: ١٨٥ ژمارە: ١٠٢٩)

٥١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { إِذَا تَوَضَّأْتُمْ فابدأوا بِمَيَامِنِكُمْ } أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أحمد/ ٨٦٣٧. أبوداود ٤/٧٠. رقم: ٤١٤١. ابن خزيمة ١/٩١ رقم/ ١٧٨. ابن ماجه ١/١٤١ رقم/ ٤٠٢}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کـە دەسـتنوێژ دەگـرن بـە ئەندامـەکانی لای راستتان دەست پێ بکەن).

٥٢- وَعَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ): {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ، وَعَلَى اَلْعِمَامَةِ وَالْخُفَّيْنِ.} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.
{مسلم/ ٦٣٥ شيحا}:

مـوغیرەی کـوڕی شـوعبە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرتو پێشەسەری مەسح کردو ئینجا لەباتی تەواوی سەری، مێزەرەکەی مەسح کردو دەستی تەڕی هێنا بەسەر مێزەرەکەیداو، لەجیاتی شۆردنی پای، دەستی تەڕی هێنا بەسەر پشتی خوففەکانیدا). (تاج/١ زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٤١).

(ڕوونکردنەوە):

١- بۆ تێگەیشتنی تەواو لەبابەتی سۆڵ – واتە: خوف – بڕوانە: فیقهی ئاسان/ ١ زنجیرە: ١٩ چاپی/ ٢٠٠٧.

٢- موغیرەی کوڕی شوعبە، لەپێش ساڵی عـەمرەی حودەیبیـەدا ئیـسلام بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، کەناوداره بـە (بەیعـەتول ڕیـضوان) لەو پەیمانەدا ڕۆڵێکی جوانی بووە، چاوێکی لەغـەزای یـەرمووکا کوێر بـوو، شـەعبی دەڵێ: (بلیمەتـەکانی عـەرەب ئـەم چـوارەن: موعاویـەی کـوڕی ئـەبو سوفیانو عەمری کوڕی عاصو موغیرەی کوڕی شوعبەو زیادی کوڕی باوکی خۆی) کە ناسراوە بە (زیاد بن أبيه). (بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٣٨ + تەجریدی بوخاری/ ٣ ژمارە: ١٢٧٨ – ڕاڤەو شیکردنەوە، بڕگەی/٣).

٥٣- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا -فِي صِفَةِ حَجِّ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- قَالَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { اِبْدَؤُوا بِمَا بَدَأَ اَللَّهُ بِهِ } أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، هَكَذَا بِلَفْظِ اَلْأَمْرِ. وَهُوَ عِنْدَ مُسْلِمٍ بِلَفْظِ اَلْخَبَر.

{نسائى ٥/٢٣٦. مسلم رقم: ١٢١٨ = ٢٩٤١ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح النووى = ٧٠٧ مختصر صحيح مسلم للحافظ المنذى تحقيق الشيخ محمد ناصرالدين الألبانى. تَرْجَمَةُ نورى فارس}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی چۆنێتی حەجەکەی پێغەمبەری کرد، فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) کەهات بۆ مەککە، لەحەجی ماڵاواییدا، کە گەیشتە بەیت، طەوافول قودومی ئاوا ئەنجام دا: حەوت جار هەڵسوڕا بەدەوری خانەی خودادا، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە {وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى – البقرة/١٢٥}. ئینجا بەپێی خوازەی ئەم ئایەتە، لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەوافی کرد، ئینجا ڕۆیشت بۆلای حەجەرولئەسوەدو دەستی پیادا هێناو ئەم سوننەتەشی جێبەجێ کرد، ئینجا فەرمووی: (ئەنجا تەوافی سەفاو مەڕوە دەکەین‌و، ئەوەیان پێش دەخەین کەخودا لە ئایەتەکەدا پێشی خستووە). ئینجا لە صەفاوە دەستی کرد بە سەعی نێوان صەفاو مەڕوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ – البقرة/ ١٥٨}.

(تاج/٢ زنجيره: ٩٧ ژماره: ١٥٥٦).

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەستی دانەر شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە بەڵگەسازی بەم فەرموودەیە، ئەوەیە، کەبەپێی ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ – المائدة/ ٦}.

واتە: (ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هێناوە بەئاییینی ئیسلام، کاتێ ویستان بچن بەلای نوێژەوە، ڕوخسارو دەمو چاوتان بشۆرن، ئەنجا دەستەکانتان بشۆرن، هەتا ئانیشك، ئەنجا دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتانا، لەپاشا قاچتان بشۆرن هەتا دەگاتە هەردوو قولەپێکانتان). بەپێی ئەم ئایەتە، دەبێ لەکاتی دەستنوێژ گرتندا ئاوا ریز لەشۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ بگیرێ:

١- ڕوخسار.

٢- دەست.

٣- مەسحی سەر.

٤- شۆردنی پێ، چونکە خودا لەم ئایەتەدا لەپێشا فەرمانی کردووە بەشۆردنی دەموچاو، ئەوجا دەستەکان، ئەوجا مەسحی سەر، ئەوجا شۆردنی پێ، پێغەمبەریش لەم فەرموودەدا، فەرمانمان پێ دەکا لەکاتی جێبەجێ کردنی پەرستشو تاعەتدا، خودا لە قورئانا چی پێش خستووە، ئێمەیش ئەوە پێش بخەین.

٢- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەرن، ئەنصارین، جابیریش وەك حەزرەتی عائیشە، یەکێکە لەو شەش هاوەڵانە کە فەرموودەی زۆرتریان گێڕاوەتەوە، هەزارو پێنج سەدو چل فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دووسەدو دەیان هی بوخاریو موسلیمن، پەنجاو هەشتیان پەسەندی هەردوو پیرن، کە پیری بوخاریو پیری موسلیمن، بیستو شەشیان هی بوخارییە، لای موسلیم نییە، سەدو بیستو شەشیان تەنها هی موسلیمە، لە بوخاریدا نین، کاتێ جابیر مرد کوێر بوو بوو، لەڕۆژی غەزای ئوحوددا باوکی شەهید بوو، جابیر دوا هاوەڵی پێغەمبەرە کە لە مەدینە مردووە، لە (٧٤) یان (٧٧) یان (٧٨)ی کۆچیدا، لەتەمەنی نەوەدو چوار ساڵیدا مردووە، ئیبانی کوڕی عوثمان کە میری سەر مەدینە بوو نوێژی تەرمی لەسەر کرد. بوخاری دەفەرموێ: جابیر ئامادەی غەزای بەدر بووە،

ئـاوی دەگواسـتـەوە بـۆ جـەنگاوەرەکان، لـەدوای غـەزای بـەدر لـە خزمـەتی پێغەمبەردا ئامادەی هەژدە غەزای تر بووە، لەگەڵ عەلیدا ئامادەی صەفین بووە، جابیرو عەبدوڵڵای باوکی ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بوون، جابیر ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم نەبووە، عەبدوڵڵای باوکی یەکێ بووە لەدوازدە نەقیبەکانی عەقەبە، ئەم زاتانەو کەسانی زۆری تریش فەقێو شاگردی بوونو فەرموودەکانی ئەویان ڕاگوێز کردووە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانو موحەممەدی کوڕی عەلی ئەلباقیرو عەطای کوڕی ڕەباحو ئەبو زوبەیرو موحەممەدی کوڕی مونکەدیرو عەشاماتێکی تری زۆر. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری/ ١ ژمارە: ٤ - ٤ فتح الباری + پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ٤٠ + تاجول ئوصول، بەرگی سێیەم زنجیرە: ٥٠ و ٥١ ژمارە: ٣٤٧٩ هەتا ژمارە: ٣٤٨٢).

٥٤- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا تَوَضَّأَ أَدَارَ اَلْمَاءَ عَلَى مُرْفَقَيْهِ.} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيف.

{أَخْرَجَهُ الدَّار قُطْنِي فِي سُنَنِهِ ١/ ٨٣ والبيهقي فِي سُنَنِهِ ١/ ٥٦}.

دیسان جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو: کاتێ دەستنوێژی دەگرت، هەردوو ئانیشکیشی لەگەڵ باسکەکانیدا دەشۆرد.

(ڕوونکردنەوە):

ئەم فەرموودەیە لاوازە، بەڵام حوکمەکەی دروستە، موسلیم دەگێڕێتەوە: ئەبو هورەیرە دەستنوێژی گرت، باڵی شۆرد لەگەڵ ئانیشکیداو هەتا کەمێ لەقۆڵیشی شۆرد، وە فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، ئاوا دەستنوێژی گرتووە.

٥٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اِسْمَ اَللَّهِ عَلَيْهِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْـنُ مَاجَهْ، بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{الترمذى في العلل ١/ ٣٣ رقم: ١٧}.

لەتاجدا ئاوایە: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نوێژ بەبێ دەستنوێژ دروست نیە، دەستنوێژیش کەناوی خودای لێ نەبرێ دانامەزرێ!). (تاج/ ١ زنجیرە: ٢٧ ژمارە: ٢٢٢).

(ڕوونکردنەوە):

١- سەبارەت بەپلەی بەهێزی ئەم فەرموودەیە، لە غایەتولەئموولی شەرحی تاجول ئوصولا دەفەرموێ: بوخاری دەفەرموێ: {هُوَ أَحْسَنُ حَدِيثٍ فِي التَّسْمِيَةِ}. واتە: سەبارەت بەناو هێنانی خودا لەدەستنوێژدا، لەم فەرموودەیە بەهێزتر نیە، گەرچی لاوازیشە.

٢- بەهەرحاڵ بیسمیلا کردن لەسەرەتای دەستنوێژەوە سوننەتە، فەرز نیە، ئەگەر کەسێ بیکا خێرێکی گەورەیە، نەیشی کا دەستنوێژەکەی دادەمەزرێ.

٣- لە تاجا لەم شوێنەدا، لە تەخریجەکەی پەراوێزدا هەڵەیەکی چاپ هەیە، ئاوا: {هو أحسن حديث في التَّحِيَةِ} چونکە (تحية) نییە {هو أحسن حديث في التسمية}یە.

٥٦- وَلِلتِّرْمِذِيِّ: عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْد. وَأَبِي سَعِيدٍ نَحْوَهُ، قالَ أَحْمَدُ: لايَثْبُتُ فِيهِ شَيْءٌ.

{حديث أبي سعيد أخرجه أحمد ٣/ ٤١، رقم: ١١٣٨٨}.

واتەو ڕاڤەکەی لە ژمارە (٥٥)دا ڕابورد.

٥٧- وَعَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) قَالَ: {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَفْصِلُ بَيْنَ اَلْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ.} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادِ ضَعِيف.

{أخرجه أبوداود برقم: ١٣٩ والبيهقي فِي سُنَنِهِ ١/ ٥١ وَضَعَّفَهُ}.

طەلحەی کوڕی موصەرریف فەرمووی: باوکم فەرمووی: باپیرەم فەرمووی: پێغەمبەرم بینی دەستنوێژی دەگرت، لەپێشا ئاوی لەدەمی ڕادا، ئەوجا بەئاوێکی تر ئاوی لە لووتی ڕاداو ناو لووتی پاك کردەوە. (ئەبو داوود دەریهێناوە ڕشتەکەی لاوازە).

(ڕوونکردنەوە):

١- طەلحەی کوڕی موصەرریفی کوڕی کەعبی کوڕی عەمری هەمەدانی، کەعبی باپیرەی تەلحە هاوەڵی پێغەمبەرە، طەلحە جێگەی متمانەیە، لەپەیڕەوانە، واتە: تابیعییەو موصەرریفی باوکی نەناسە، واتە: حاڵی مەجهووڵە، ئەمەیش هۆیەکە لە هۆیەکانی لاوازیی ئەم فەرموودەیە.

٢- ئاو لەدەمو لە لووت وەردان سوننەتە، ئیتر هەر یەکێکیان سەربەخۆ بێو جیابێ لەوی تریان، یان پێکەوە بن، وەك ئەوە بەیەك لەوێچ، یان بەدوو لوێچ، یان بەسێ لوێچ، یەکجار، یان دووجار، یان سێ جار، هەم ئاو لەدەمی هەم ئاو لەلووتی وەربدات.

٥٨- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي صِفَةِ اَلْوُضُوءِ- { ثُمَّ تَمَضْمَضَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا، يُمَضْمِضُ وَيَنْثِرُ مِنْ اَلْكَفِّ اَلَّذِي يَأْخُذُ مِنْهُ اَلْمَاءَ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيّ.

{أبوداود/ ١١١. نسائی/ ٦٩/١}:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) لەچۆنێتی دەستنوێژی پێغەمبەردا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سێ جار بەرودوا، بەسێ

لوێچ ئاو، ئاوی له دەمو لووتی وەردا، لەیەك لوێچ ئاو، هەم ئاوی لەدەمو هەم ئاوی لەلووتی ڕادەدا.

٥٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي صِفَةِ اَلْوُضُوءِ- {ثُمَّ أَدْخَلَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَدَهُ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ، يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{تەخریجەکەیو تەرجەمەکەی لەژمارە (٣٩)دا، لەپێشەوە ڕۆیشت}.

٦٠- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { رَأَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) رَجُلًا، وَفِي قَدَمِهِ مِثْلُ اَلظُّفْرِ لَمْ يُصِبْهُ اَلْمَاءُ. فَقَالَ: "اِرْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ" } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيّ.

{أبوداود/ رقم: ١٧٣. نسائی ٣/ ٥٩. مسلم ٥٧٥ = ١٣٥ مختصر صحيح مسلم}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەلای پێغەمبەردا، دەستنوێژی گرت، بەقەد جێگەی نینۆکێکی لەپێی نەشۆرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، پێی فەرمووی: (بچۆرەوە بەجوانی دەستنوێژەکەت بگرە). (تاج/ ١ زنجیرە: ٢٨ ژمارە: ٢٤٣).

لەتاجول ئوصولو پوختەی صەحیحی موسلیمدا ئاوایە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) هەواڵی پێمدا فەرمووی: جارێ پیاوێ لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرت، بەقەد جێگەی نینۆکێك لەپێی ئاو بەری نەکەوتبوو، تەڕ نەبوو بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، بەپیاوەکەی فەرموو: (بچۆرەوە دەستنوێژەکەت بەجوانی بگرەوە).

پیاوەکەیش گەڕایەوە دەستنوێژەکەی بەتەواوی شۆردەوە، ئەوسا نوێژەکەی کرد.

٦١- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{بخاری/٢٠١ = ١٤٨ تجريد البخاری/١، مسلم ٧٣٤، ٧٣٥ = پوختەی موسليم رقم: ١٣٦. تحفة الأشراف/ ٩٦٣}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەڵێ جار وادەبوو كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەمشت (مودد)ێك ئاو دەستنوێژی دەگرت، جاروباریش بەمەن (صاع)ێك ئاو، خۆی دەشۆردو غوسڵی شەرعی دەردەكرد، جارجارەیش بەپێنج مودد ئاو خۆی دەشۆردو غوسڵی خۆی دەردەكرد.

(ڕوونكردنەوە):

صاع وشەیەكی عەرەبییە، ئەیارەیەكە چوار مودد (مست - مشت) دەگرێ، موددیش ئەیارەیەكی شەش گۆشەیە، درێژی لایەكی (٩,٢) نۆ سانتیمو، لەدەدا دووی سانتیمێكە، مودد لەعەرەبیدا بە مستیش دەگوترێ: جا لەحەدیثو شەرعا، مەگەر نیشانەیەكی لابەر (قرينة صارفة) هەبێ، دەنا مەبەست لە مودد مشتی مرۆڤ نییە، بەڵكوو مەبەست ئەو ئەیارە ناوبراوەیە، كە زۆربەی وەرگێڕە كوردەكان تەرجەمەیان كردووە بەمشت، یان بەمست، بەلاّم وەرگێڕانەكە زۆر سەركەوتوو نییە، چونكە خەڵك بەمشتی دەستی تێ دەگەن، مەگەر بڵێین: لەكوردیشا وەك عەرەبی، مشتی زمانی جیایە لەمشتی شەرعی، لە {سُبُلُ السَّلامِ شرح بلوغ المرام} دا، دەفەرموێ: (لە قامووسولموحیط)دا دەڵێ: ئەیارەیەكی پێوانەیە، دوو ڕەتڵ، یان ڕەتڵێكو سێیەكی ڕەتڵێ دەبێ، یان پڕ مشتی مرۆڤێكی ئاسایی دەبێ كە پڕیان بكا لەشتێو، بەرەو پێشەوە درێژیان بكا، وەمن خۆم ئەمەم تاقی كردەوە، ڕوانیم ڕاست دەرچوو... قسەكەی قامووس تەواو بوو). (بڕوانە: تاج/١ زنجیرە: ٢٧ ژمارە: ٢٢٨).

٦٢- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُسْبِغُ اَلْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ اَلْجَنَّةِ" الثمانية يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ. وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَزَادَ: {اَللَّهُمَّ اِجْعَلْنِي مِنْ اَلتَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنْ اَلْمُتَطَهِّرِينَ}.

{مسلم ٢٣٤ = ٥٥٢ تخريج شيحا. ترمذی/٥٥}:

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی صەحیحی موسلیمدا، ژمارە: (١٤٣ = ٥٥٢ شیحا) ئاوایە:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ ماڵ بووین، بەنۆرە، هەر ڕۆژێ ماڵێ وشترەکانی دەبرد بۆ لەوەڕ، وەك نۆرە گایەلی لادێی کوردەواری خۆمان، ڕۆژێ سەرەی ماڵی ئێمە هات، من وشترەکانم برد بۆ لەوەڕ، سەر لەئێوارێ وشترەکانم بردەوە بۆ پەچەکەیانو ئیتر ئەرکم ئەو ڕۆژە لەولایەنەوە تەواو بوو، ئەوجا چووم بۆ کۆڕو دانشینگەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە چووم خەریکبوو گوتاری دەدا، بەم گوتەیەیدا گەیشتم: ( هەر موسوڵمانێ دەستنوێژێکی جوان بگرێ، ئەوجا هەستێ دوو ڕکات نوێژ بکاو، دڵی لەلایان بێو بەدڵو بەکوڵ ئەو دوو ڕکاتە ئەنجام بدا بێگومان بەهەشت مسۆگەر دەبێ بۆی).

عوقبە فەرمووی: منیش گوتم: بەه بەه لەم موژدە خۆشە! کەسێ لەبەردەممەوە بوو، فەرمووی: موژدەکەی پێشی لەمەیش خۆشتربوو، کەتەماشایم کرد عومەری کوڕی خەتتاب بوو، عومەر فەرمووی پێم: من چاوم لێت بوو کە ئێستا هاتی، لەپێش ئەمەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەئێوە ئەی گەلی ئیسلام! دەستنوێژێکی تەواوی تێروتەسەل بگرێ، فەرزو سوننەتەکانی جێبەجێ بکا، ئەوجا بەدوایا بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».

واتە: شایەتی دەدەم بەدەم‌و باوەڕ دەکەم بەدڵ: کە بەس خودا خودای هەقە‌و، موحەممەد بەندەو پێغەمبەرو فروستادەی ئەوە، هەرکەسێ لەئێوە لەم کاتەدا، لەپاش دەستنوێژگرتنێکی ئاوا، ئەم وشە پیرۆزە بڵێ، ئەوا هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە خۆی ئارەزوو بکا دەچێتە ژوورەوە).

لێرەدا لە (بولوغولمەرام)دا دەفەرموێ: تەرمەزی ئەمەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە، لەپاش گوتەی (وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) ئەمەی پترە: «اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ».

واتە: ئەی خودایە! بمکە بەیەکێ لە تەوبەکاران‌و تەوبەم پێ خەلات بفەرموو، وەبمکە بەیەکێ لەوانەی کەپاکی‌و خاوێنی لەش‌و دڵ‌و دەروونت پێ بەخشیوون.

(ڕوونکردنەوە):

١- عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، کۆمەڵێ لەهاوەڵان‌و پەیڕەوان (سەحابە‌و تابعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەبو سەعیدی کوڕی یونس دەڵێ: عوقبە قورئانخوێن‌و فەرائیززان‌و شەرعزانێکی جوان بوو، زمانڕەوان‌و شاعیرو نووسەر بوو، هەموو قورئانی لەبەر بوو، قورئانێکی بۆخۆی نووسیبوو، لەسەر شێوەی تەئلیفی موصحەفی عوسمان نەبوو، لەئاخیرەوە نووسرا بوو (كَتَبَهُ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ بِيَدِهِ = عوقبەی کوڕی عامیر ئەم قورئانەی بەدەستی خۆی نووسیوە) فەرمایشتەکەی ئەبو سەعید تەواو بوو.

عوقبە بەرید بوو، ئەو موژدەی ئازاد کردنی شاری دیمەشقی برد بۆ ئیمامی عومەر، لایەنگیری موعاویە بوو، لەشەڕی صەفیندا لەگەڵ موعاوییە

بــوو، ماوەیــێ موعاوویــە کــردی بەکارمەنــدی ســەر میــصر، لەســەردەمی موعاوییەدا عەمری خودایکرد. (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

٢- عومەری کوڕی خـەتتاب قورەیـشییە، عەدەوییـە، لەپـشتی هەشـتەما، رەچـەڵەك (نـژاد = نەسـەب)ی لەباوکـەوە دەگاتـەوە بـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دایکی ناوی حەنتەمـەی کچی هاشمـە، کەسـناوی (کونیـەی) ئەبو حەفصە، نازنـاوی (لەقـەبی) فاروووقـە، چونکە ئـەو رۆژەی کـە عومـەر ئیسلام بوو، ئیسلام ئاشکرا بوو، وەباوەڕ لەکوفر جیاوە بوو، لەساڵی شەشـەمی پێغەمبەرایەتیدا موسوڵمان بووە، لـەپێش ئـەودا تـەنیا چل پیـاوو، یـازدە ژن ئیسلام بوو بوون، لە عەشـەرەی موبەشـەرەیە، کـە دە کـەس بـوون پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) مـوژدەی بەهەشـتی پێیـان دابـوو، کـەناویان لـە فـەرموودەی ژمـارە (٣٧)دا، لەژیاننامـەی ئیمـامی عوثمانـدا، لەشـێعرەکانی خانیدا ڕابورد.

عومەر جێنشین (خەلیفە)ی دووەمە، لەپێش هـاتنی پێغەمبەرایەتیـدا، بە (٣٠) سیی ساڵ، یان بە (١٣) سیازدە ساڵ لـەدایك بـووە، واتـە: دە سـاڵ، یـان (٢٧) بیستو حەوتساڵ، بەتەمەن لە پێغەمبەر منـاڵترە، لەسەردەمی نەزانیـدا، پایـەی نوێنـەری قـورەیش بـەو سـپێردرا بـوو، کەشـەڕێ، یـان هـەرایێ، یـان کێشەیێ سەری هەڵدەدا، ئەو دەکەوتە نێوانیانەوەو نێوانی ڕێـك دەخـستنەوە، لەسەرەتای ئیـسلامەوە، زۆر توندوتیـژ بـوو لـە دژی موسـوڵمانان، بـەڵام کاتـێ ئیـسلام بـوو، موسـوڵمانێکی زۆر جـوانی لێ دەرچـوو، ئیـسلامبوونی دانـرا بـە سـەرکەوتنێکی گـەورە بـۆ موسـوڵمانان، ئیبنـو مەسـعوود دەیفـەرموو: (هـەتا عومەر ئیسلام نەبوو، نەماندەوێرا بەئاشکرا خودا بپەرستین).

عومـەر یەکێکـە لەکۆچـکارە پێـشینەکان، ئامـادەی بەیعـەتی ریـزوانو غەزای بەدرو هەموو شەڕگەو مەڵبەنـدی جەنگـەکانی تـری پێغەمبـەر بـووە. یەکێ بووە لـەو چـەند کەسانە، کـە پێغەمبـەر وەفـاتی کـرد لێیـان ڕازی بـوو،

لەپاش مەرگی ئەبو بکر، لەساڵی سیازدەی کۆچیدا بوو بە دووەم جێنشین، ئەم وڵاتانەو چەندین شوێنی تری ئازادکردو لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بوون: شامو عێراقو میصر، دیوان ئەو داینا، هەر ئەو مووچەی بۆ پیاوانی سوپا، بەپێی خزمەتیان بۆ ئیسلام بڕییەوە، کارە هەرە گرنگەکانی تری: ئەو نوێژی تەراویحی لەسەر ئەم شێوەی ئێستا، لەشەوانی ڕەمەزاندا، دامەزراند، کە بیستو سێ ڕکات نوێژ دەکرێ، دوو ڕکات دوو ڕکات بەجەماعەت لەمزگەوت، وەلە کۆتایدا یەك ڕکاتی وەتریش بەجەماعەت دەکرێ!!

هەروا عومەر مێژووی کۆچی دانا، کە ڕۆژی کۆچی پێغەمبەرە لە مەککەوە بۆ مەدینە، بکری بەسەرەتای مێژووی ئیسلامی، کە هەتا ئەمڕۆ کە (٢٠١١/٣/١٤) زاینی، بەرامبەر (٨ی ڕەبیعی دووەمی ١٤٣٢) کۆچی بەردەوامە، وە بەپشتی خودا هەتا نزیکی قیامەت هەر بەردەوام دەبێ، عومەر یەکەم کەس بوو، کە ناسناوی (ئەمیرولمۆئمینین: فەرمانڕەوای موسوڵمانان)ی پێ بەخشرا.

سەرەتای صەحیحی بوخاری، لەناوی صەحابەکاندا، بەناوی عومەر دەست پێ دەکا، هەر خۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا ناوی (عومەری کوڕی خەططاب) بووە، بەڵام بیستو چوار عومەر ناوی تریان لەناودا بووە، پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) پیاوێکی باڵابەرزی تەواو کەڵەگەتی تێکسمڕاوی گڕانە (أصلع) بوو، قووچێکی وابوو، کە لەناو خەڵکا دەوەستا، دەتگوت: ئەو سوارەو ئەو خەڵکەی تر لەدەوری پیادەن، لەساڵی گرانیو برسێتییەکەدا، وازی لەخواردنی گۆشتو چەوریو خواردنی شتی خۆش هێنا، لەجیاتی ئەوە بە خواردنی ڕۆن زەیتوون، ئیکتیفای دەکرد، هەتا هەست بەو ئێشو ئازارو سەخڵەتییە بکا، کە خەڵکانی هەژاری ئەو ڕۆژگارە ناهەموارە هەستیان پێ کردووە، ئەوەندە جەڕەبابەی خۆی دابوو، ڕەنگی هەڵبڕسکا بوو. عومەر پیاوێکی توکن بوو، مووی خۆی دەگرتە خەنەو وسمە، عومەر زۆر دادپەروەر

بوو، عەدالەتو دادپەروەری عومەر زۆر ئاشكرایە، هەموو كەس هەستی پێ دەكا، مەگەر كەسێ چاوی دڵی كوێر بێ. عومەر بەهەردوو دەستی وەك یەك كاری دەكرد، واتە: هەم چەپەوانەو هەم ڕاستەوانە بوو، كە لە عەرەبیدا بەم ڕەوشە دەگوترێ (أیسر وأعسر). ڕیشی عومەر زۆر پڕ بوو، لە فەرموودەداو لەسوننەتی زۆر دروستدا، وەسپو مەتحی زۆری عومەر، لەلایەنی پێغەمبەرو یارانی پێغەمبەرەوە كراوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گریمان لەپاش من پێغەمبەری تر ببوایە، عومەر دەبوو بە پێغەمبەر، بەڵام لەدوای من هەتا ڕۆژی قیامەت پێغەمبەری تر نایەتو نایێ).

عومەر خەزووری پێغەمبەر بوو، حەفصەی كچی عومەر، هاوسەری پێغەمبەر بوو، مۆری ئەموستیلەكەی عومەر (كَفَى بالمَوْتِ واعِظا يا عُمَرُ!) بوو، واتە: ئەی عومەر! بەڕاستی مردن ئامۆژگاری چاكە. {بڕوانە: ژمارە: ٢٠٩ كە لەدواوە دێت}.

ئیمامی عومەر یەكەم قازی بوو لە ئیسلاما، ئەبوبكر كردی بەقازی، دە ساڵو نیو جێنشین بوو، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لەشاری مەدینە لەمانگی قوربانی ساڵی بیستو سێی كۆچیدا، لەناو میحرابی مزگەوتەكەی پێغەمبەردا، لەكاتێكا، كە بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ موسوڵمانان دەكرد، ئەبو لوئلوئەی فارسی، كەمەجووسی بوو، هەندێ دەڵێن: گاور بوو، بەكێردێكی دوو دەم كوشتی، وەلەگەڵ عومەردا، سیازدە كەسی تریشی زامار كرد، حەوتیان مردن، هەر لەوێدا ئەبو لوئلوئە، لەپاش ئەم دەست وەشاندنە درندانەیە، پیاوێكی موسوڵمان، كەچاوی بەم حاڵە كەوت، كەڕەكێكی دا بەسەریدداو گرتی، ئەو زرتە بۆزە زەندیقەیش كەدی وا گیراوە چارەی نەما، بەكێردەكەی خۆی، خۆی سەربڕیو خۆی كوشت! بەدۆزەخی ئێجگاری شاد بوو.

ئێستا لەئێران مەرقەدێکیان بۆ ئەبو لوئلوئە دروست کردووە، ناویان ناوە مەرقەدی ئەبو ئیسلام، وەك مەرقەدو مەزاری شێخو مەشایەخو پیاوچاکان سەردانی دەکەن، بەتایبەتی لەساڵیادی شەهیدد بوونی ئیمامی عومەردا!! کورد گوتەنی: (تەیری گول ئاشق بەداری ژەقنەمووتە!!)

عومەر (٣) سێ شەو بەبرینەکەیەوە ژیا، ئەوسا مرد، داوای لە حەزرەتی عائیشە کرد، کە لەهۆدەکەی ئەودا، لەگەڵ پێغەمبەرو ئەبو بکردا بنێژرێ، ئەویش مۆڵەتی ئەوەی دا، صوهەیب نوێژی تەرمی لەسەر کرد، ئەوجا لەپاڵ ئەبو بکردا، لەتەنیشت گۆڕەکەی پێغەمبەرەوە نێژرا، بۆ شارەزابوونی تەواو لەژیانو شانازییەکانی عومەر، {بڕوانە: صەحیحی بوخاری، فضائل الصحابە، لە فەرموودەی ژمارە: ٣٦٨٢ هەتا ٣٦٩٤، هەروا ئەم ژمارانە/ ٣٨٦٣، ٦١٧١، ٧١٥٣، ٦٢٦٤، ٦٦٣٢، ٣٧٠٠. هەروا بڕوانە فضائلی صەحابە لەصەحیحی موسلیمدا، لە فەرموودەی ژمارە: ٦١٣٩وە هەتا ژمارە: ٦١٥٨ هەروا بڕوانە: تاج/٣ زنجیرە: ٤ لەژمارە: ٣٢٤٥وە هەتا/ ٣٢٥٧. + زنجیرە: ٥ لەژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ژمارە: ٣٢٦٩ + زنجیرە: ٦ لەژمارە: ٣٢٧٠وە هەتا ژمارە: ٣٢٧١ لە زنجیرە/٧ + پوختەی صەحیحی موسلیم زنجیرە/ ١٥١ ژمارە: ١٩٩ + تەجریدی بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری/٢ ژمارە: ٧١٦}.

## ٥- دەستی تەڕهێنان بەسەر خوفف (سۆل)دا (مسح الخفين)
## بابُ: المَسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ

٦٣- عَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { كُنْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَتَوَضَّأَ، فَأَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: "دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ" فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{تجريد البخاري/١ رقم: ١٣٧ = ١٨٢، ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٢، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩. مسلم. وضوء/ ٦٢٥، ٩٥١، ٦٣٢ = پوختەی

موسليم/ ١٤٠. أبوداود. مسح على الخفين/ ١٤٩، ١٥١. نسائى. صبّ الماءِ في الوضوء/ ٧٩}.

موغيرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستنوێژی دەگرت، کە گەیشتە سەر قاچی دانەویمەوە کە خوففەکانی لەپێی داکەنم، هەتا بیان شۆرێ، فەرمووی: (وازیان لێ بهێنە بەدەستنوێژەوە لەپێم کردوون. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) قاچی نەشۆردو لەجیاتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر پشتی سۆلەکانیدا). (تاج/١ زنجیرە:٢٩ ژمارە: ٢٤٧، ٢٥٠).

٦٤- وَلِلْأَرْبَعَةِ عَنْهُ إِلَّا النَّسَائِيَّ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَسَحَ أَعْلَى اَلْخُفِّ وَأَسْفَلَهُ} وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{ترمذى/٩٧. أبوداود/١٦٥ ابن ماجه/٥٥٠. دارقطنى ١/١٩٥}:

تەرمەزیو ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو دارە قوطنی دەگێڕنەوە: موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستنوێژی دەگرت، لەباتی شۆردنی قاچەکانی، دەستی تەڕی هێنا بەپشتی سۆلەکانیداو، بەژێر بنیانا). ئەم فەرموودەیە لاوازە، چونکە نووسەرەکەی موغیرە گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەرەوە، نووسەرەکەی پێغەمبەری نەدیوە.

٦٥- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَوْ كَانَ اَلدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ اَلْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلَاهُ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{أبوداود. رقم/ ١٦٢}.

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەگەر ئایین بەڕاو بە قیاس بێ، دەبێ مەسحی ژێر بنی خوفف (سۆل) بکرێ، نەوەك سەر پشتی، بەلام من بەچاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)

مەسحی سەر پشتی خوففەکانی خۆی دەکرد، کەواتە ڕای ئایینی، بڕیاری شەرعی، بەڕای تایبەت نابێ). (تاج/١، زنجیرە: ٢٩ ژمارە: ٢٥٢).

٦٦- وَعَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَأْمُرُنَا إِذَا كُنَّا سَفْرًا أَنْ لَا نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ، إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ وَلَكِنْ مِنْ غَائِطٍ، وَبَوْلٍ، وَنَوْمٍ} أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، وَالتِّرْمِذِيُّ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ وَصَحَّحَاهُ.

{نسائی ١/٨٣. ترمذی. رقم: ٩٦. وقال: هذا حديث حَسَنٌ صحيح. ابن خزيمة برقم: ١٧، ١٩٣، ١٩٦}.

صەفوانی کوڕی عەسسال (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (جاران کە لە سەفەردا بووینایە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێمانی دەگوت: هەتا ماوەی سێ رۆژ مەسحی خوففەکانمان بکەین و لەو سێ رۆژانەدا، لە پێمان دایان ناکەنین، نەبۆ پیسی و نەبۆ میزو نەبۆ خەو، مەگەر بۆ لەشپیسی). (تاج/١ زنجیرە: ٢٩ ژمارە: ٢٥٧/٥).

(ڕوونکردنەوە):

صەفوانی کوڕی عەسسال، هاوەڵە، لەهۆزی مورادە، لەبەر ئەوە پێی دەگوترێ موارادی، لەکووفە نیشتەجێ بوو، چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە ڕاگوێز کردووە، دەڵێن: دوازدە غەزای لەخزمەت پێغەمبەردا ئەنجام داوە، ئەم فەرموودەیەی بەڵگەی ئەوەیە کە دەستنوێژ بەخەو دەشکێ.

٦٧- وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {جَعَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ. يَعْنِي: فِي اَلْمَسْحِ عَلَى اَلْخُفَّيْنِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِم.

{مسلم. مسح على الخفين رقم: ٦٣٧ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ١٣٩ پوختەی موسليم}.

شورەیحی کوڕی هانی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (بۆ دەستی تەڕ هێنان بەسەر خوفدا، لەباتی شۆردنی پێ، لە عائیشەم پرسی، کە چۆنە؟ فەرمووی: بۆ ئەمە بچۆ لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب بپرسە، چونکە ئەو دەچوو بۆ سەفەر لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) جاکاتێ لەومان پرسی، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سێ شەو وسێ ڕۆژی داناوە بۆ ڕێبوار، کە لەو ماوەیەدا دەستنوێژگری ڕێبوار بۆی هەیە کە لەجیاتی شۆردنی قاچەکانی، لەکاتی دەستنوێژگرتندا، دەستی تەڕ بهێنێ، بەسەر سۆلەکانیدا، وە شەوو ڕۆژێکیشی داناوە بۆ دەستنوێژگری نیشتەجێ). (تاج/١ زنجیرە: ٢٩ ژمارە: ٢٥٥).

٦٨- وَعَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {بَعَثَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَرِيَّةً، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَمْسَحُوا عَلَى اَلْعَصَائِبِ - يَعْنِي: اَلْعَمَائِمَ -وَالتَّسَاخِينِ- يَعْنِي: اَلْخِفَافَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أحمد ٥/ ٢٧٧. أبوداود/ ١٤٦. حاكم ١/ ٢٧٥. وَقَالَ: صحيح عَلَى شَرْطِ مسلم. وَصَحَّحَهُ النَّوَوِيُ في المجموع ١/٤٦٥}.

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (جارێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لقێ خەباتگێڕی نارد بۆ غەزا، فەرمانی پێیان کرد: کەلەکاتی دەستنوێژگرتندا، لەکاتی دەست هێنان بەسەر سەردا، دەستی تەڕ بهێنن بەسەر مێزەرەکانیانا وەلەکاتی شۆردنی قاچیشیانا، دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سۆلەکانیاندا، لەجیاتی شۆردنیان).

(ڕوونکردنەوە):

ثەوبانی کوڕی بوجدود، یەکێکە لەهاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بێ) کۆیلە بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کڕیو ئازادی کرد، لەبەر ئەوە ناسراوە بە (ثەوبانی مەولای ڕەسولوڵڵا = ثەوبانی ئازادکراوی پێغەمبەری خودا) هەتا

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەژیاندا مابوو، ئەوبان لە خزمەتیدا بوو، خزمەتی دەکرد، لەپێشا خەڵکی (السَّرَاة) بوو، کەشوێنێکە لەنێوانی مەککەو یەمەندا، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، ئەوبان رۆیشت بۆ شام، لەرەملە جێگیر بوو، لەپاشا چوو بۆ حومص، لەوێ خانوویەکی بۆخۆی دروست کردو لەوێ ژیا هەتا لەساڵی (٥٤)ی کۆچیدا، ئەمری هەقی بەجێ هێناو، بەمەرگی خودا مرد، ئەوبان لەسەفەریشاو لەماڵەوەیش هەتا پێغەمبەر مابوو، هەر لەخزمەتیدا بوو. ئەوبان دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نزای دەکرد بۆ ئەهلوبەیتو کەس‌وکاری خۆی، منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئایا من لە ئەهلوبەیتم یا نا؟ تا سێ جار وەڵامی نەدامەوە، لەسەری جاری سێیەما کە لێم پرسی، فەرمووی: (بەڵێ تۆ لە ئەهلوبەیتی منی، بەمەرجێ نەچیتە بەردەگای دەسەڵاتدارانو داوای شت لەمیروکاربەدەستان نەکەیت).

لەبەر ئەم پەیمانەی حەزرەتە ئەوبان هەتا ما، نەچووە بەردەرگای دەسەڵاتو هەرگیزیش داوای شتی لەکەس نەدەکرد (خودایە! بەمیهرەبانی خۆت لەم بارەیەوە، ئەم ماوەی ژیانەمان کەماوە، نەبچینە بەردەرگای دەسەڵاتو نە ئاتاجی دەستی نامەردمان بکەی – ئامین/٢٠١٢/٦/٤).

ئەوبان زانستو فەرموودەی زۆر جوانی لە پێغەمبەر وەرگرتو رایگەیاند بەچینی پاش خۆی زۆر بەجوانی. (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٦٩– وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) –مَوْقُوفًا– وعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) –مَرْفُوعًا–: {إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ وَلَبِسَ خُفَّيْهِ فَلْيَمْسَحْ عَلَيْهِمَا، وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا، وَلَا يَخْلَعْهُمَا إِنْ شَاءَ إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ"} أَخْرَجَهُ الدَّارَقُطْنِيُّ، وَالْحَاكِمُ وَصَحَّحَه.

{دارقطني ١/٢٠٣. الحاكم في المستدرك ١/ ١٨١. البيهقي في الكبرى ١/ ٢٧٩}.

ئەنەس (ڕەزای خوادای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ دەستنوێژ دەگرن، ئەگەر سۆل (خوف)تان لەپێدابوو، مەرج نییە کە سۆلەکانتان داکەنن و قاچتان بشۆرن، بەڵکوو ئەگەر ئارەزووتان هەبوو، لەباتی شۆردنی پێتان، سۆلەکانتان مەسح بکەن و دەستی تەڕیان پیادا بهێنن، وە نوێژیشیان پێوە بکەن ئەگەر ویستتان، وە بۆ دەستنوێژ دروستە کە سۆلەکانتان دانەکەنن، بەڵام بۆ خۆشۆردنی لەشگرانیو لەشپیسی، مەسحکردنی سۆل بەس نیە، بەڵکوو دەبێ لەپێ دابکەنرێن و هەردوو پێش وەك مەندەی جەستە بەتەواوی بشۆرێن).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە، ئیمامی عومەر گێڕاویەتەوە، بەڵام نەیداوەتە پاڵ پێغەمبەرو نەیگوتووە ئەمە پێغەمبەر فەرموویەتی، بەم جۆرە گێڕانەوە لە زانستی فەرموودەدا دەگوترێ موقووف لەسەر صەحابی.

٢- مەسحی خوف مەرجی چییە، وەخوف خۆی چییە؟ ئەمە باسێکی دوورو درێژە، بۆ تێگەیشتنی دروست لەم بابەتە، بفەرموو تەماشای فیقهی ئاسان بکە: (بەرگی یەکەم. زنجیرە/ ١٩ + ٢٠ + ٢١ + ٢٢ + ٢٣ + ٢٤).

٧٠- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَنَّهُ رَخَّصَ لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمًا وَلَيْلَةً، إِذَا تَطَهَّرَ فَلَبِسَ خُفَّيْهِ: أَنْ يَمْسَحَ عَلَيْهِمَا} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{دارقطني في سننه ١/ ٢٠٣و ٢٠٤ من طريق ابن خزيمة ١٩٢}:

ئەبو بەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدەستنوێژدا، مۆڵەتی داوە بەڕێبوار، کە تاماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژ، سۆلەکانی لەپێی دانەکەنێ، وەدەستی تەڕیان پیادا بهێنێ، لەباتی شۆردنی قاچەکانی، وەبۆ هەمان مەبەستو بەهەمان شێوە، مۆڵەتی داوە بەنیشتەجێش، کەتاماوەی شەوو ڕۆژێ سۆلەکانی لەپێی دانەکەنێ، وەلەباتی

شـۆردنی قاچـی لـەکاتی دەسـتنوێژگرتندا، دەسـتی تـەڕ بەسـەر سـۆڵەکانیدا بهێنـێ). ئەم مۆڵەتەیش بەم مەرجە: (کە لەپێش ئەم دەستنوێژەی دووەمـدا، سۆڵەکانی بەدەستنوێژەوە لەپێ کردبێ!).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو بەکرە ناوی نوفەیعی کوڕی مەسرووحە، هەندێ دەڵێن: نوفـەیعی کوڕی حاریث، کاتـێ پێغەمبـەرو سـوپاکەی ئابڵۆقـەی قـەڵای تائیفیانـدا، ئـەبو بەکرە لەگەڵ کۆمەڵێ لاوی تردا، لەقەڵاکە دابەزین، ئەبو بـەکرە ئیـسلام بـوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئازادی کرد، ئەبو بەکرە لەهاوڕێ هـەرە مەزنە ناودارو ناسراوەکانی پێغەمبەرە، قەت نەیدەگوت کە مـن لەچـی هـۆزو بەرەبابێکم، لەم لایەنەوە لەمە زیاتری نـەدەگوت: کـەمن کۆیلـەی ئـازادکراوی پێغەمبـەری خودام (دروودی خوای لەسەر بێ).

ئەبو بەکرە بەردەوام سەرگەرمی خوداپەرستی جوان بوو، هەتا کۆتـایی ژیانی. برای دایکی زیادی کوڕی باوکی بوو، واتە: (زياد بنُ أبيهِ). سەدو سیو دوو فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، هەشـتیان پەسـەندی هـەردوو پـیرن، پێـنج فـەرموودەی تـری لەئـەفرادی بوخارییـە، واتـە: موسـلیم نەیگێڕاونەتـەوە، یـەك فـەرموودەی تـری لـە ئـەفرادی موسـلیمە، کـۆی فەرموودەکانی لە بووخاریدا = ٨ + ٥ = ١٣ وەکۆی فەرموودەکانی لـە موسـلیمدا = ٨ + ١ = ٩ وەکـۆی فـەرموودەکانی لـە بوخـاریو موسـلیمدا = ٨ + ٥ + ١ = ١٤ فەرموودە. کەواتە: ئەبو بوردە لەریجالی صەحیحەینە.

یـەکێ لەشـاگردو فـەقێکانی کـە فـەرموودەکانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، حەسەنی بەصری بوو، یەکێ تریان ئەحنـەف بـوو، کۆمەڵەکـە فـەرموودەکانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، منـاڵو وەچـەکانی هـەموو خانـەدانو زانـاو دانـا بـوون، لـەناودارانی شـاری بەصـرە بـوون، وەچـەو نەوەیـەکی زۆری هـەبوو، لەسـاڵی پەنجاو دووی کۆچی، یان پەنجاو یەکی کۆچی، یان چلو نۆی کۆچـی، لەشـاری

بەصرە کۆچی دوایی کردووە، لەسەر ڕاسپێری ئەبو بەکرە خۆی، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردو پاشان لەوێ ناشتیان. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی/١ ژمارە: ٢٩ + تەجرید/٥ لاپەڕە: ٣١٩ ژمارە: ٢٠٦٣. ڕوونکردنەوە + بەرگی/١ لاپەڕە: ٥٠ ژمارە: ٢٩ تجرید بڕوانە: ژمارە: ٥٢ کە لەپێشەوە رابورد بۆ زانیاری تەواو، لەبارەی زیادی کوڕی باوکیەوە. هەروا بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی بەرگی سێیەم ژمارە: ٩٣٥).

٧١- وَعَنْ أُبَيِّ بْنِ عِمَارَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ أَمْسَحُ عَلَى اَلْخُفَّيْنِ؟ قَالَ: "نَعَمْ" قَالَ: يَوْمًا؟ قَالَ: "نَعَمْ"، قَالَ: وَيَوْمَيْنِ؟ قَالَ: "نَعَمْ"، قَالَ: وَثَلَاثَةً؟ قَالَ: "نَعَمْ، وَمَا شِئْتَ" أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَقَالَ: لَيْسَ بِالْقَوِيِّ}.

{أبوداود في سننه برقم: ١٥٨. ابن ماجه ٥٥٧. حاكم في المستدرك ١/ ١٧٠. دارقطني في سننه ١/ ١٩٨}:

ئوبەیی کوڕی عیمارە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! بۆم هەیە کاتێ دەستنوێژ دەگرم، سۆلەکانم لەپێم دانەکەنم، وەلەجیاتی شۆردنی قاچەکانم دەستی تەڕ بهێنم بەسەر پشتی سۆلەکانمدا؟

فەرمووی: (درودی خوای لەسەر بێ) (بەڵێ بۆت هەیە کەوا بکەی). عەرزیم کرد: ئایا دەتوانم، ڕۆژێ بەتەواوی هەرکاتێ دەستوێژم گرت وابکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ) عەرزیم کرد: ئەی بۆ ماوەی دوو ڕۆژ مۆڵەتی ئەوەم هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ). عەرزیم کرد: ئەی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتی ئەوەم هەیە کەوا بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ بۆ ماوەی چەند ڕۆژ ئارەزوو دەکەیت وا بکە دروستە).

(ڕوونكردنەوە):

١- وەك لەدەقی عەرەبییەكەدا هەیە، ئەبوداوود دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە هێزدار نییەو بێ تینە.

٢- ئەوەی كە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ ئەمەیە: (كات دیاری نەكراوە بۆ دەستی تەڕ هێنان بەسەر خوف (سۆل)دا، لەكاتی گرتنی دەستنوێژدا، هەروەك بەمەرج نەگیراوە، كە سۆلەكان لەوەوپێش بەدەستنوێژەوە لەپێ كرابن).

زاناكانو ڕاڤەكاران دەفەرموون: بەهەرحاڵ، گریمان ئەم فەرموودەیە ئەگەر بیشچەسپێ، ڕەهایو گشتگیرییەكەی، بە فەرموودەكانی پێش خۆی لەم باسەدا، سنووردار دەكرێ.

٣- ئوبەیی كوڕی عیمارە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، خەڵكی مەدینە بوو، لەبنەڕەتدا، بەڵام لەمیصر نیشتەجێ بوو، هاوەڵی پێغەمبەرە.

٤- فەرموودەكانی ئەم باسە نۆ فەرموودەن، لەژمارە ٦٢وە هەتا ژمارە: ٧١ ئاوا: (٧١ — ٦٢ = ٩).

## ٦- هۆكارەكانی بێ دەستنوێژی
## بابُ: نَوَاقِضِ الوُضُوءِ

٧٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) -عَلَى عَهْدِهِ- يَنْتَظِرُونَ اَلْعِشَاءَ حَتَّى تَخْفِقَ رُؤُوسُهُمْ، ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلَا يَتَوَضَّئُونَ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلدَّارَقُطْنِيّ. وَأَصْلُهُ فِي مُسْلِمٍ.

{أبوداود ٢٠٠ دارقطنی ١/١٣٠. مسلم ٣٧٦ = ٨٣١ تجريد بخاری/١ رقم: ٣٦٦ = ٦٤٢، ٦٤٣، ٦٢٩ فتح الباری}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەر بێ) هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی

خوای لەسەر بێ) چاوەنواڕی نوێژی خەوتنانیان دەکرد، کە بەکۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی جەماعەت بکەن، ئالەو کاتی چاوەڕوانییەدا، هەیان بوو خەو دەیبردەوەو خەوی لێ دەکەوتو سەری لاردەبوویەوە، دوایش کە کاتی نوێژ دەهات نوێژیان دەکرد،، بەبێ ئەوەی بەهۆی ئەو خەولێکەوتنەوە دەستنوێژ تازە بکەنەوە.

٧٣- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي اِمْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلَا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ اَلصَّلَاةَ؟ قَالَ: "لَا. إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَ بِحَيْضٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي اَلصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ اَلدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريد البخارى/١ رقم: ١٦٥ = ٢٢٨، ٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٢١ فتح البارى شرح صحيح البخارى. مسلم. حيض: ٧٥١. راجع مختصر صحيح مسلم رقم/ ١٧٩ = ٧٥٣ مسلم}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصول و پوختەی صەحیحی بوخاریدا ئاوایە: عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی بێ) فەرمووی: فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لێی پرسی، عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! من ئافرەتێکم حاڵم ئاوایە: هەمیشە بێ نوێژم و کە تێکەوتم و سووڕی مانگانەم بۆ هات، ئیتر پاك نابمەوە، جا ئایا هەتا حاڵم وابێ، واز لەننوێژ بهێنم یا نا؟ فەرمووی: (نەء، چونکە ئەوە گشتی بێ نوێژی نییە، بەڵکوو دەمارەو خوێنی بەر بووە، بەڵام لەوەپێش، بەرلەوە تووشی ئەم دۆخە نائاسییە ببیت، چەند ڕۆژ دەکەوتیتە بێ نوێژییەوە، ئێستایش لەم حاڵەدا، بەقەد ئەو ڕۆژانەی بێ نوێژیی جارانت نوێژ مەکە، ئینجا خۆت بشۆرەو لەشپیسی بێ نوێژیی دەربکەو، نوێژی خۆت بە ئاسایی بکە).

(ڕوونكردنەوە):

ئەم بەهرەو كەڵكانە لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێن:

١- پرسیارو وەڵامو گفتوگۆی ڕووبەڕووی پیاوو ژنی بیانی لەبارەی كاروباری ئایینیەوە دروستە.

٢- لەسەردەمی پێغەمبەردا، ژنان سەربەستانە لەخزمەتی پێغەمبەردا هاوبەشییان كردووە، لەپرسیارو پرسەكاندا.

٣- بیستنی دەنگی ژنو گوێ لێ گرتنی، بۆ پێویستیو كاری ڕەوا دروستە.

٤- نوێژی ژنی بێنوێژ دروست نییە.

٥- بەڵگەیە لەسەر پیسی خوێن، ئەمە لەكۆی گێڕانەوەكانی ئەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ، كە بەدەق لەگێڕانەوەی ئێرەدا دەفەرموێ: (فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي. واتە: ئەوجا خوێنەكە لەخۆت بشۆرەو ئەوسا نوێژی خۆت بكە).

٧٤- وَلِلْبُخَارِيِّ: {ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلَاةٍ}. {وَأَشَارَ مُسْلِمٌ إِلَى أَنَّهُ حَذَفَهَا عَمْداً}:

لەگێڕانەوەی بوخاریدا، بۆ ئەم فەرموودەیە، لەكۆتاكەیەوە ئەمەی پترە: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەفاطیمەی كچی ئەبو حوبەیشی فەرمووی: (پاش ئەوە كە بێنوێژییەكەت لەباوەڕی خۆتدا تەواو بوو، وەغوسڵی لەشپیسیت دەركرد، ئیتر بۆ هەموو نوێژێ بەر لەكردنی، دەستنوێژێكی تازە بگرەوە، هەتا دیسانەوە دەچیتەوە كاتی خۆت، ئیتر دووبارە وادابنێ، كەوا تازە تێ دەكەویتو واز لەنوێژكردن بهێنەرەوە، ئیتر هەموو كات بەم دەستووره ڕەفتار بكە، واز دەهێنی لەنوێژ، یاتێهەڵ دەچیتەوەو دەست پێ دەكەیتەوە!).

ئیمامی موسلیم كاتێ ئـەم فەرموودەیـەی گێڕاوەتـەوە، ئاماژە بۆ ئـەوە دەكات كـە ئـەم پتریيـەی بەئەنقەسـت وازلێهێنـاوە، گوایـە: زیادەیـەكی غـەیرە مەحفووظە.

٧٥- وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { كُنْتُ رَجُـلاً مَـذَّاءً، فَأَمَرْتُ اَلْمِقْدَادَ بْنَ اَلْأَسْوَدِ أَنْ يَسْأَلَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم) فَـسَأَلَهُ ؟ فَقَـالَ: "فِيهِ اَلْوُضُوءُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{بخارى ١٣٢، ١٧٨، ٢٦٩ = ١٠٦ تجريـد. مـسلم. طهـارة ٣٠٣ = ٦٩٣، ٦٩٤، ٦٩٥ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لشرح صـحيح مـسلم. نـسائى/ ١٥٧٠. تحفة الأشراف/ ١٠٢٦٤}:

ئیمـامی عــەلی (ڕەزای خــودای لێ بـێ) فــەرمووی: مــەزیم زۆر بــوو شەرمیشم دەكرد كە بۆخۆم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بپرسـم: چونكە فاطیمەی كچی ژنم بوو، جا بەمیقدادی كوڕی ئەسوەدم گوت بۆ ئەمـە لێی بپرسێ، كە لێی پرسی بـوو، فـەرمووبووی: (چـووكی بـشۆرێو دەسـتنوێژ بگرێ، چونكە دەرچوونی وەزی دەستنوێژ دەشكێنێ، بەڵام شتی وا خۆشـۆردن (غوسـڵ) پێویـست ناكـا، چـونكە لـەش پـیس ناكـات). (پوختــەی صـەحیحی موسلیم ژمارە: ١٤٤ = ٦٩٣ حیض + تاج/ ١ زنجیرە: ٢٢ ژمارە: ١٧١).

٧٦- وَعَنْ عَائِشَةَ، (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَبَّلَ بَعْضَ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى اَلصَّلَاةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَضَعَّفَهُ اَلْبُخَارِيّ.

{أحمد ٦/ ٢١٠. ترمذى/٨٦. ابن ماجه ٥٠٢}.

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) جارێ یەكێ لەژنەكانی خۆی ماچ كـردو، ڕۆیـشت نوێژیـشی كـردو دەستنوێژیـشی نەگرتـەوە. عـوروەی خوشـكەزای بەعائیـشەی گـوت: پـووری! دیارە ئەو ژنە هەر خۆت بوویت؟ ئەویش پێكەنی. واتە: عائیشە خـۆی بـووە. (تاج/١ زنجیرە:٢٦ ژمارە: ١١٥).

(ڕوونکردنەوە):

بەرکەوتنی پێستی نێرینەو مێینە، ئەم سێ گوتەی تیادایە:

١- لای مەزهەبی شافیعی، کە مەزهەبی زۆرینەی گەلی کوردە، بەخودی بەرکەوتنەکە، دەستنوێژی دەستلێدەرو دەستلێدراو، بەئارەزوو بووبێ، یان بەبێ ئارەزوو، بەقەستی بووبێ، یان بەبێ قەستو بەڕێکەوت بووبێ، دەستنوێژی هەردوو لا دەشکێ، مەگەر دەستلێدراو وابێ، کەپیاو، یان ژنی ئاسایی، ئارەزووی لێ نەکا، لەفیقهی ئاسان دەفەرموێ: (بەیەك گەیشتنی پێستی نێرو مێی نامەحرەم، بەبێ پەردە دەستنوێژ دەشکێنێ، مەگەر منالەکە تەمەنی لەوادەی ئارەزووی ئادەمیزادی ئاسایی کەمتر بێ).

٢- بەشێوەی ڕەها بەبێ قەیدو مەرج دەستنوێژ ناشکێنێ.

٣- ئەگەر بەشەهوەتەوە بێ دەستنوێژ دەشکێنێ، دەنا نایشکێنێ.

٧٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ: أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ، أَمْ لَا؟ فَلَا يَخْرُجَنَّ مِنْ اَلْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم: ٣٦٢ = ٨٠٣ تخريج شيحا = ١٥٠ پوختەی مسلم. بخاری. وضوء ١٣٧، ١٧٧، ٢٠٥٦ = ١١١ تەجریدی بوخاری بەکوردی = پوختەی صەحیحی بوخاری. أبوداود ١٧٦. نسائی. وضوء من الريح: ١٦٠}:

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جاری وا هەیە کە مرۆڤ واهەست دەکا، کە تەڕاییەك، یان بایەك، یان هەرشتێ تر کە دەستنوێژ بشکێنێ، لەپێشەوە، یان لە پاشیەوە، لەسکی دەردەچێ، بەلام دوو دڵە لەوەو دڵنیا نییە لەڕوودانی، بالەکاتی وادا، وادابنێ کە دەستنوێژەکەی ماوەو نەشکاوە، لەبەر ئەوە پێویست ناکا، ئەگەر لەناو مزگەوتدا بوو، مزگەوتەکە بەجێ بهێڵێ، یان ئەگەر لەناو

نوێژدا بوو، نوێژەکەی ببڕێ‌و خۆی بدزێتەوە، بەبیانووی دەستنوێژ شکانەوە. ئەمە ئەگەر دڵنیا نەبوو لەدەرچوونی شتێ، بەڵام هەرکاتێ سوور دەیزانی کەوا دەستنوێژەکەی شکا، وەك ئەوە بایەکی لێ بووەو، گوێی لەدەنگی بوو، یان بۆنی چوو بەسەریدا، یان هەستی بەدەرچوونی دەستنوێژ شکێنێ لەسکی کرد، وەشتەکەی لەلا روون‌و ئاشکراو بێگومان بوو، ئەوە لەباری وادا دەستنوێژەکەی دەشکێ، جا ئەگەر لەناو نوێژدا بوو، بانوێژەکەی ببڕێ، ئەگەر لەناو مزگەتا بوو چاوەڕوانی نوێژی دەکرد، بادەرچێ‌و بچێ دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە).

لەپوختەی بوخاریدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (دروودی خوای لەسەر بێ) سکاڵای ئەو حاڵەم کرد: کەجاری واهەیە مرۆڤ لەناو نوێژدا، گەرچی لێی روون نییە، بەڵام واهەست دەکا، کەتەڕاییەك، یان بایەك، یان شتێ، لەپێشیەوە، یان لەپاشیەوە دەردەچێ، ئایا حوکم‌و بڕیاری ئەم بارودۆخە چییە؟ دەستنوێژ بەشتی وا دەشکێ یا نا؟ فەرمووی: (با لەکاتی وادا وادانێ کە دەستنوێژەکەی نەشکاوەو ماوە، لەبەرئەوە پێویست ناکا خۆی لەنوێژەکەی بدزێتەوەو نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام هەرکاتێ دەنگی بایەکی بیست، یان بۆنی دەرچوویەکی کرد، یان هەستی بەدەرچوونی تەڕاییەك کرد، کە لەیەکێ لەدوو ڕێگەکەوە دەردەچێ، ئەوە دەستنوێژەکەی دەشکێ). (تاج/١، زنجیرە: ٣٦ ژمارە: ٢٠٨).

٧٨- وَعَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قَالَ رَجُلٌ: مَسَسْتُ ذَكَرِي أَوْ قَالَ اَلرَّجُلُ يَمَسُّ ذَكَرَهُ فِي اَلصَّلَاةِ، أَعَلَيْهِ وُضُوءٌ؟ فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "لَا، إِنَّمَا هُوَ بَضْعَةٌ مِنْكَ} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ. وَقَالَ اِبْنُ اَلْمَدِينِيِّ: هُوَ أَحْسَنُ مِنْ حَدِيثِ بُسْرَةَ.

{أبو داود: ١٨٢، ترمذي: ٨٥، نسائي: ١/١٠١. ابن ماجة: ٤٨٣. أحمد: ٢٢/٤. ابن حبان: ١١٢٠}:

تەلقی کوڕی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ هات وەك دەشتەکی وابوو، گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەگەر پیاو بە دەستنوێژەوە دەستی لە چووکی خۆی بکەوێ، ئایا دەستنوێژەکەی دەشکێ یانا؟

فەرمووی: (نەخەیر! دەستنوێژەکەی ناشکێ، چونکە ئەویش پارچە گۆشتێکە لەخۆی). یا فەرمووی پێی: (پارچەیەکە لەخۆت). {تاج/١، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢١٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- طەلقی کوڕی عەلی کوڕی طەلق (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، خەڵکی یەمامەیە، چەند فەرموودەیێ لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، یەکێ لەو فەرموودانە: (لاَ وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ).

طەلق دەفەرموێ: ڕۆیشتین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانمان بەست لەگەڵیا، عەرزمان کرد، لە وڵاتی ئێمە پەرستگایەکمان هەیە، فەرمووی: (کە ڕۆیشتنەوە بۆ وڵاتی خۆتان ئەو کڵێسایە بڕووخێنن‌و، شوێنەکەی بکەن بە مزگەوت). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجەوەندەیێ دەسنوێژی گرت‌و، ئاوی لەدەمی راداو، ئاوەکەی تفاندەوە ناو جەوەندەکەو، فەرمووی: (ئەم ئاوە بەرن لەگەڵ خۆتان، کاتێ مزگەوتەکەتان لەجێگەی کڵێساکە دروست کرد، ئەم ئاوی دەسنوێژەی منی لێ بپرژێنن!). ئێمەیش کەچووینەوە وامانکرد، کڵێسەکەمان ڕووخان‌و شوێنەکەیمان کرد بە مزگەوت‌و، بەئاوی بەرماوەکەی دەسنوێژەکەی پێغەمبەر، کە لەمەتارەکەدا، لەگەڵ خۆمان هێنابوومان بۆ ئەم مەبەستە، ئاوپەرژێنمان کرد، قەشەکەمان پیاوێ بوو لەهۆزی طەی، کاتێ بانگماندا،

گوێی لێ گـرتو گـوتی: بانگـەوازێکی هـەقو راسـتو دروسـتە. لەپاشـا بـەرەو سەرچـاوەیێ لـە کانیاوەکـانی دەوروبـەرمان رۆیـشت، ئـیتر لـەوەدوا نـەیمان دیبەوەو چاومان پێی نەکەوتەوە.

٢- لـە مەزهـەبی شـافیعیدا، کـە مەزهـەبی پیـادەکراوی نـاو ولاتـی کوردەواری خۆمانە: (گەیشتنو لێکەوتنی بەری دەست لەپێستی پاشو پـێش، چ هی خـۆی بـێ، چ هـی کەسـێکی تربـێ، ئـیتر نێربـێ، یـان مـێ، یـا یـەکێکیان نێربێو ئەوی تریـان مـێ بـێ، گەورەبن یـان بـچکۆلە، لەهـەموو ئـەم بارانـەدا دەسنوێژ دەشکێ – بڕوانـە: فیقهی ئاسـان. بـەرگی/١، زنجـیرە/١٢، لاپـەڕە: ٤٦) بەلگـەی ئەوانـەی دەڵـێن: دەسـنوێژ دەشـکێ، بەلگـە بـەم فـەرموودەی دواوە دەهێننەوە کە ژمارە (٧٩)یە.

٧٩- وَعَنْ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا" {أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: "مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ"} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِـذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ. وَقَالَ اَلْبُخَارِيُّ: هُوَ أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا اَلْبَابِ.

{أبو داود: ١٨٠، ترمذى: ٨٢ وَقَـالَ حَـسَنٌ صـحيح. نـسائى: ٣/١٠٠. ابـن ماجة: ٤٧٩. أحمد: ٦/٤٠٦. ابن حبان/١١١٢. صححه النووى في المجموع ٢/٤٥}:

بوسـرەی کـچی صـەفوان (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ دەستی دا لەچووکی خۆی بانوێژ نەکا، هەتا دەستنوێژ دەگرێ). {تاج/١، زنجیرە:٢٦، ژمارە:٢١٢}.

ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خودای لێ بێ) سەبارەت بەپلەی هێـزی ئـەم فەرموودەیـە دەڵـێ: (سـەبارەت بـەم بابەتـە، کـە ئایـا دەسـتکەوتن لەشـەرمگا دەسنوێژ دەشکێنێ یان نا، ئەم فەرموودەی بوسرەیە، لەهەموو فـەرموودەکانی تری ئەم بابەتە دروستترە).

**(ڕوونکردنەوە):**

(بوسرەی کچی صەفوان یەکێکە لەژنە هاوەڵەکانی پێغەمبەر، قورەیشییە، ئەسەدییە، برازای وەرەقەی کوڕی نەوفەلە، وەرەقەو صەفوان برا بوون، شافیعی دەفەرموێ: بوسرە لە موسوڵمانە پێشینەکانە). لەژنە کۆچکارەکانە، پەیمانی بەستووە لەگەڵ پێغەمبەردا، پووری سەعیدی کوڕی موسییەبە، نەنکی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەمە، چونکە عائیشەی دایکی عەبدولمەلیك کچی بوسرە بوو، لەدایکەوە خوشکی عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیتە.

٨٠- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا):أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ صَلَّى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: {مَنْ أَصَابَهُ قَيْءٌ أَوْ رُعَافٌ، أَوْ قَلَسٌ، أَوْ مَذْيٌ فَلْيَنْصَرِفْ فَلْيَتَوَضَّأْ، ثُمَّ لِيَبْنِ عَلَى صَلَاتِهِ، وَهُوَ فِي ذَلِكَ لَا يَتَكَلَّمُ} أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَه. وَضَعَّفَهُ أَحْمَدُ وَغَيْرُهُ.
{ابن ماجه/١٢٢١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێ لەئێوە نوێژی دەکرد، لەناو نوێژەکەدا ڕشایەوە، یان لووتی پژا، یان هێڵنجی دایەوەو خواردن لەگەدەیەوە هاتەوە ناو دەمی، یان مەزی لەشەرمگای دەرچوو، هەرکەسێ لەئێوە، یەکێ لەم چوار شتەی لێ ڕوبدات، ئەوە دەسنوێژەکەی دەشکێنێ، جا ئەگەر لەو کاتەدا لەناو نوێژدا بوو، ئەوە بانوێژەکەی ببڕێو بچێ دەستنوێژ بگرێتەوەو، بەبێ ئەوەی لەو ماوەیەدا قسەبکا، بچێ لەنوێژەکەی تێ هەڵبچێتەوەو چەندەی ماوە تەواوی بکاو، ئەوەی لەپێشدا کردوویەتی دامەزراوەو جێگەی خۆی گرتووە، پێویست بەوە ناکات کە دووبارە بیکاتەوە).

(ڕوونکردنەوە):

لەمەزهەبی شافیعیدا، بەهیچ کامێ لەم چوار شتە دەسنوێژ ناشکێ، بەڵام دەسنوێژ تازە کردنەوە، بەم بۆنانەوە، کارێ باشە، چونکە دەرباز بوونە لەڕاجیایی، خروجیش لەخیلاف فەزیلەیە.

٨١- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ اَلْغَنَمِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ اَلْإِبِـلِ ؟ قَالَ: نَعَمْ} أَخْرَجَهُ مُسْلِم.

{مسلم. طهارة: ٨٠٠، ٨٠١ = ١٤٦ پوختەی موسلیم = تەجرید البخاری/١ رقم: ١٦٨ = ٢٣٤ فتح الباری}:

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا، کە ژمارە (٨٠٠. حیض. بەپێی تەرقیم و تەخریجی شێخ خلیل مأمون شیحا) ئاوایە:

جابیری کوڕی سەموورە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: قوربان! ئەگەر گۆشتی مەڕ، یا بزنم خوارد، دەسنوێژ بگرمەوە؟ فەرمووی: (ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی دەسنوێژ بگرەوە، حەزیش ناکەی دەسنوێژ مەگرەوە، چونکە خواردنی گۆشتی ئەو دوو جۆرە ئاژەڵە دەسنوێژ ناشکێنێ). پیاوەکە گوتی: ئەی ئەگەر گۆشتی وشترم خوارد دەسنوێژم لەسەرە یا نا؟ فەرمووی: (بەڵێ، کاتێ گۆشتی وشترت خوارد دەسنوێژت دەشکێ، لەبەر ئەوە نابێ نوێژو شتی وابکەی، هەتا دەسنوێژ دەگریتەوە).

پیاوەکە وتی: ئایا لەپەچە ڕانا نوێژبکەم، لە پەچە ڕانا نوێژ دروستە یا نا؟ فەرمووی: (بەڵێ دروستە، بەمەرجێ جێگەی نوێژەکەت پاك بێت). پیاوەکە گوتی: ئەی لەمولگای وشتردا نوێژ بکەین؟ فەرمووی: (بۆ ئەمەیان نەء). {تاج/١/١٢٦ ف - ١١ ژمارە: ٢١٧ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەپێی مەزهەبی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) خواردنی گۆشتی هیچ ئاژەڵێ دەسنوێژ ناشکێنێ، بەڵام ئەگەر لەپاش گۆشت خواردن، دەسنوێژ تازە بکرێتەوە کارێ باشە، بەتایبەتی لەکاتی خواردنی گۆشتی وشتردا.

٢- لەپەچە ڕانا نوێژ دروستە، بەمەرجێ جێگەی نوێژەکە پاك بێت، وەك بەردێکی بەرزی پاك، یا نوێژکار بەرماڵێ ڕابخاتو نوێژی لەسەر بکات، بەڵام نوێژکردن لەپەچەی وشتردا، گەرچی دروستە بەهەمان مەرجی پێشووی پەچە ڕان، بەڵام کارێ باش نییە، چونکە دوورنیە کە وشترێ بووروووژێو زیانێ لەنوێژخوێنەکە بدات.

٣- جابیری کوڕی سەموورە، خۆیو باوکی، هاوەڵی پێغەمبەر بوون، سەدو چلو شەش فەرموودەی هەیە، لەپەڕاوە ناودارەکانی فەرموودەدا، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: شێخی بوخاریو شێخی موسلیم، ئەو دوو فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، بیستو شەش فەرموودەی تری لە موسلیمدا هەیە، کە لە بوخاریدا نین، جابیر خوشکەزای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصە، لە فەرموودەیەکا جابیر دەفەرموێ: (شەوێ مانگە شەو بوو، لە خزمەت پێغەمبەردا بووم، دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، سەرەنجی ئەوو سەررەنجی مانگەکەمدا، لەبەر چاوم پێغەمبەر گەلێ لەمانگەکە جوانتر بوو!). لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (سەدجار زیاتر لەخزمەت پێغەمبەردا، دانیشتووم).

لە فەرموودەی دروستدا هاتووە: (لەدوو هەزار جار زیاتر نوێژم بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە!).

دەڵێن: جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی حوکمی ئەلموختاردا، لەساڵی شەستو شەشی کۆچیدا لە کووفە مردووە.

٨٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَنْ غَسَّلَ مَيْتًا فَلْيَغْتَسِلْ، وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ. وَقَالَ أَحْمَدُ: لَا يَصِحُّ فِي هَذَا اَلْبَابِ شَيْءٌ.

{أحمد ٢/٤٥٤. أبوداود ٣١٦١. ترمذى ٣٩٣، وحسنهُ الحافظ في المتح ١٢٧/٣ بعد ماعزاه لأبي داود}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ تەرمی مردوویەکی شۆرد، با لەپاشا خۆی بشۆرێ، ئەگەر کەسێ تەرمی مردووی هەلگرت، با دەسنوێژێ بگرێ).

تەرمەزی بە فەرموودەیەکی جوانی داناوە، بەلام فەرموودەزانی گەورە ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (سەبارەت بەم بابەتە شتێ نییە لە سوننەتی صەحیحدا). {فیقهی ئاسان/١ لاپەڕە: ٦١ زنجیرە: ١٨}.

(ڕوونکردنەوە):

خۆشۆردن بۆکەسێ تەرمی مردوو بشوات، لەمەزهەبی شافیعیدا سوننەتە. واباشە بۆ کەسێ تەرمی مردوو هەڵ دەگرێ، لەپێشا یا لەپاش دانانی تەرمەکە دەسنوێژی بشۆرێ.

٨٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَحِمَهُ اَللَّهُ): {أَنَّ فِي اَلْكِتَابِ اَلَّذِي كَتَبَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ: أَنْ لَا يَمَسَّ اَلْقُرْآنَ إِلَّا طَاهِرٌ}. رَوَاهُ مَالِكٌ مُرْسَلاً، وَوَصَلَهُ النَّسَائِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَهُوَ مَعْلُولٌ.

{الموطأ (١٩٩/١) نسائى (٥٧/٨) ابن حبان/ ٦٥٥٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبکر (رەزای خودا لەخۆی‌و باوکی) فەرمووی: (لەو نامەیەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نووسی بۆ عومری کوڕی حەزم، ئەمەی تیابوو: موسوڵمانی پاك نەبێ، نابێ کەس دەست لە قورئان بدات) {فیقهی ئاسان/ لاپەڕە: ١١٥ زنجیرە/٤٧}.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئـەم فەرموودەیـە ئیمـامی مالیـك (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) بـە موورسەلی ڕاگوێزی كردووە، لەئیبنو شەهابەوە، واتە: لەزوهرییەوە كەتابیعیـە، زوهری دەفـەرموێ: لەونامـەدا كـە پێغەمبـەر نووسـیبووی بـۆ عـەمری كوڕی حەزم... تاد. بەڵام نەسائیو ئیبنو حیببان بەمەوصوولی گێڕاویانەتەوە، ئـاوا: لەسولەیمانی كوڕی داودەوە، لەزوهرییەوە، لە ئەبوبكری كوڕی موحەمـەدەوە، لەعەمری كوڕی حەزمەوە.

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) بۆیە دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە مەعلوولـە، واتـە: {دەردەدار = دەرداوی = دەغـەزار} چونكە سـولەیمانی كـوڕی داوودی فـەقێی زوهـری، ئەگـەر سـولەیمانی كـوڕی داوودی یـەمانی بـێ، بـەكۆی دەنـگ لاوازو پـشتگوێ خـراوە. بـەڵام ئیمـامی ئەحمـەد دەفـەرموێ: ئومێـد دەكـەم ئـەم فەرموودەیـە تەندروسـت بـێ، چـونكە لـە گێڕانـەوەی سـولەیمانی كـوڕی داوودی خەولانییـە، كـە جێگـەی متمانەیـەو باوەڕپێكراوە. لەسەر قسەی ڕاڤەنووسەكان ئەم عەبدوڵڵایـە كوڕی ئـەبوبكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزم، نەك ئەبوبكری صدیق.

٢- عەمری كوڕی حەزمی كوڕی زەیدی كوڕی لۆزانی ئەنـصاری یەكێكە لەهاوەڵە مەزنـەكانی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بێ) ناسـناوی ئـەبو ضەحاكە، ئامادەی نەبەردی خەنـدەق بووە، بەڵام لەشەڕگای بـەدردا هاوبەشـی نەكردووە، لە خزمەتی پێغەمبەردا ئامـادەی نەبـەردگای تـری پاش خەنـدەق بووە، پێغەمبەر كردی بەكارمەندی خۆی لەسەر وڵاتی نەجران، كەگاوری زۆر بوو، شوێنێكە دەكەوێتە نێوانی حیجازو شامو یەمەنەوە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نامەیەكی بۆ نووسی، كەناسراوە بە (كیتابی عەمری كوڕی حەزم) كەباسی فەرائیزی دینو سوننەتەكانو زەكاتو خوێنـدانو شـتی تـری تیاددا بوو، كاتێ پێغەمبەر كردی بەكارمەندی سەر نەجران، تەمەنی حەڤدە

ساڵ بوو، ساڵی دەی کۆچی بوو، لەپێشدا خەڵکی نەجران لەسەر دەستی خالیدی کوڕی وەلیددا ئیسلام بوو بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەمری نارد بۆیان، هەتا لەئاییندا شارەزایان بکا، وەفێری قورئانیان بکا، وەزەکاتەکەیان کۆ بکاتەوە، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: موحەممەدی کوڕیو ئەبوبکری کوڕی موحەمەدی کوڕی، کەدەکاتە کوڕەزای عەمرو سەودەی کچی حاریثە.

عەمری کوڕی حەزم، ساڵی پەنجاو یەکی کۆچی لەمەدینە مردووە.

٨٤- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُذْكُرُ اَللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ، وَعَلَّقَهُ اَلْبُخَارِيّ.

{مسلم/٣٧٣ = ٨٢٤ شيحا. بخاری. أذان/ ٦٣٤}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: جاران دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەهەموو بارودۆخێکیدا، لەشی پاك بوایە، یان لەشی پیس بوایە، دەسنوێژی ببوایە، یان دەسنوێژی نەبوایە، بەدانیشتنەوە بوایە، یان بەپێوە بوایە، یان بەراکشانەوە بوایە، بەسوارییەوە بوایە، یان پیادە بوایە، یادی خودای دەکرد، وەك تەسبیحاتو تەکبیراتو تەلیلەو شتی تری وا {پوختەی موسلیم زنجیرە: ٥/ ١٢٥ ژمارە: ١٦٩ }.

٨٥- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِحْتَجَمَ وَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَلَيَّنَهُ.

{دارقطني ١/ ١٥١. بيهقى ١/ ١٤١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڵەشاخی لەخۆی گرت، لەپاشا نوێژی کرد، لەنێوانی کەڵەشاخ گرتنو نوێژکردنەکەدا دەستنوێژی نەگرت.

(روونكردنەوە):

مەبەستی دانەر ئەوەیە كە دەرچوونی خوێن لەجەستە، بازۆریش بێ، دەسنوێژ ناشكێنێ، بەمەرجێ لەپێش‌و پاشەوە نەبێ، بەلاّم لەبەر ئەوەی كە ئەم پرسە، ڕاجیایی واتیاداو، دەربازبوون لەڕاجیاییش كارێ پەسەندە، واباشە لەپاش دەرچوونی خوێن لەجەستە، دەسنوێژ تازە بكرێتەوە.

٨٦- وَعَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {الْعَيْنُ وِكَاءُ السَّهِ، فَإِذَا نَامَتْ اَلْعَيْنَانِ اِسْتَطْلَقَ اَلْوِكَاءُ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالطَّبَرَانِيُّ.

{أحمد (٤/٩٦) طبراني (١٩/ ٨٧٥)}:

موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودا لەخۆی‌و باوكی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاو دەمبێنی كۆمە، جا كاتێ چاو دەچێتە خەو، دەمبێنەكە دەكرێتەوە، جا لەبەر ئەمە ئەگەر كەسێ خەوت، كاتێ لەخەو هەڵدەستێ، ئەگەر دەسنوێژیشی بووبێ، دەسنوێژەكەی شكاوە بەخەوەكە، كەواتە با دەسنوێژ بگرێتەوە بۆ نوێژو شتی وا).

ئەم فەرموودەیە ئەبو داوود (رقم: ٢٠٣) لەئیمامی عەلییەوە ئاوا دەیگێڕێتەوە: ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاو دەمبێنی كۆمە، جا لەبەر ئەوە ئەگەر كەسێ خەوت ئەوە بەخەوەكە دەسنوێژەكەی شكاوە، با كەهەڵسا، ئەگەر ئیشی بە دەسنوێژ بوو، با دەسنوێژەكە بگرێتەوە!). {تاج/١ زنجیرە:٢٦ ژمارە: ٢٠٩} + دانەر دەفەرموێ: ڕشتەی هەردوو فەرموودەكە لاوازو بێ هێزن.

(ڕوونكردنەوە):

موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیانی كوڕی حەرب كوڕی ئومەییە، خۆیو باوكی (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، ئەمەوییە، ساڵی ئازادكردنی مەككە موسوڵمان بووە، ژنبرای پێغەمبەرە، چونكە برای ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەرە {بڕوانە: ژمارە: ٦١٤ تەجریدی بوخاری، بەرگی/٢ لاپەڕە: ٤٠ + پوختەی صەحیحی موسلیم، ژمارە: ٣٧٠ بەرگی یەكەم}.

موعاوییە نووسەری سرووش بوو، كاتێ قورئان دەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرجار ئەو دەینووسییەوە، لەپێش هاتنی پێغەمبەرایەتی (بیعثەت)دا، بەپێنج ساڵ لەدایك بووە، واتە: سیو پێنج ساڵ لە پێغەمبەر بەتەمەن مناڵتر بووە، پیاوێكی زۆر سەلارو هێمنو بەحەوسەڵە بوو، پیاوێكی باڵابەرزی قژ ڕووتاوە بوو، خۆی دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەمرەی تەواو كرد، من بەفەرمانی خۆی، بە دەمە تیرێكی پانكۆڵە مووی سەریم كورت كردەوە، بۆ شكاندنی ئیحرامی عەمرەكەی.

صەخری كوڕی حەربی باوكی، كەناسراوە بەئەبو سوفیان، لە موئەللەفە قلوب بوو، لەپێشا دوژمنێكی سەرسەختی ئیسلام بوو، دوایی موسوڵمانێكی جوانی لێ دەرچوو. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٧١١ بەرگی/ ٥}.

موعاوییە لەنەخۆشی سەرەمەرگا، بەكوڕەكەی خۆی گوت: كراسێكی پێغەمبەرم هەیە، كەكاتی خۆی، پێغەمبەر داویەتی پێم، وەهەندێ نینۆكی كرتاوی پێغەمبەریشم هەیە، لەگەڵ هەندێ موویدا، شاردوومنەتەوە بۆ ئەمڕۆ، جاكاتێ مردم، لەژێر كفنەكەوە لەسەر گۆشتەكەوە ئەو كراسەم بكەرە بەر، مووەكەو نینۆكەكانیش هەندێكی بكەرە ناو دەمەو ئەویتریشی بخەرە

سەرچاوم‌و، بیخەرە سەر ئەو جێگایانەی لەشم کە سەجدەم لەسەر بردوون، بەپشی خودا سوودیان دەبێ بۆم!

موعاوییە مووی خۆی تەواو زەرد دەکرد، خۆی دەفەرموێ: هەتا چەند ساڵێ مووە سپییەکانی سەرو ریشمم هەڵ دەکەند، سەدو شەست‌و سێ فەرموودەی هەیە، هەشت فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، پێنجیشی لە موسلیمدا هەیە، چواریان پەسەندی هەردوو پیرە، کەواتە: کۆی فەرموودەکانی لەبوخاری‌و موسلیمدا دەکاتە: ٤ + ٤ + ١ = ٩ فەرموودە. تەمەنی حەفتاو هەشت ساڵ بووە، لەکۆتایی تەمەنیدا، تووشی دەمخواریی بووە، لە رەجەبی ساڵی شەستی کۆچیدا دەمرێ (رەزای خودای لێ بێ). {بڕوانە: تەجرید/١ لاپەڕە: ٨٨ ژمارە: ٦٣ + تاج/٥ لاپەڕە: ١٤٥ = تاج/٣ زنجیرە: ٣٣ ژمارە: ٣٤٢٢، ٣٤٢٣ ج/٤}.

٨٧- وَزَادَ {وَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ}. وَهَذِهِ اَلزِّيَادَةُ فِي هَذَا اَلْحَدِيثِ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ مِنْ حَدِيثِ عَلِيٍّ دُونَ قَوْلِهِ: {اِسْتَطْلَقَ اَلْوِكَاءُ} وَفِي كِلَا الْإِسْنَادَيْنِ ضَعْف.

{تاج/١ زنجیرە: ٢٦ ژمارە: ٢٠٩}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاو دەمبێنی کۆمە، جا لەبەر ئەمە ئەگەر کەسێ خەوت کاتێ کەهەڵدەستێ با دەسنوێژ بگرێ).

٨٨- وَلِأَبِي دَاوُدَ أَيْضًا، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ مَرْفُوعًا: {إِنَّمَا اَلْوُضُوءُ عَلَى مَنْ نَامَ مُضْطَجِعًا} وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ أَيْضاً.

{أبوداود رقم/ ٢٠٢. طبراني رقم/ ١٢٧٤٨. ترمذی/ ١/ ١١١ رقم/ ٧٧}:

لە تاجا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو کڕنووشدا، خەوی لێ کەوتبوو، بەڕەنگێکی وا دەستی کرد بە پرخە پرخ، ئینجا هەڵساو نوێژەکەی تەواو کرد، منیش پێیم گوت:

قوربان! خۆ تۆ خەوتبوويت؟ ئەويش فەرمووی: (دەسنوێژ تازە كردنەوە بەس لەسەر ئەوانە پێويستە، كەپاڵ دەكەونو بەڕاكشانەوە دەخەون، چونكە ئەوانە كەڕادەكشێن جمگەكانيان خاو دەبنەوە، جالەم حاڵەدا دوور نييە، كەشتێ لەدوو ڕێگەكەوە واتە: (لەسەبيلەينەوە) دەربچێو دەسنوێژيان بشكێ). {تاج/١ زنجيرە: ٢٦ ژمارە: ٢١١}.

٨٩- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {يَأْتِي أَحَدَكُمُ الشَّيْطَانُ فِي صَلَاتِهِ، فَيَنْفُخُ فِي مَقْعَدَتِهِ فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ أَحْدَثَ، وَلَمْ يُحْدِثْ، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ فَلَا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا}. أَخْرَجَهُ اَلْبَزَّارُ.

{البزار كما في مجمع الزوائد رقم: ٢٨١ بَيْهَقِي رقم: ٣١٩٣. طبراني رقم: ١١٥٥٦}:

ئيبنو عەبباس (ڕەزای خودايان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەيتان دێت بەلای كەسێكتانەوە، لەناو نوێژەكەيدا، فوو دەكا لەكۆمی، بەخەياڵ واهەست دەكا، كەهەست بەشتێ دەكاو وەك بایێ، يان تەڕاييەكو دوو دڵ دەبێ لەوە كە دەسنوێژەكەی شكاوە يان نا؟ بەشتی وا دەسنوێژەكەی ناشكێ، ئەگەر هەستان بەشتی واكردو بووبەگرێ لەدڵتانا، ئەوە نوێژەكەتان مەبڕن، تا دەنگێ نەبيستن، يان بۆنی نەكەن). {تاج/١ زنجيرە: ٢٦ ژمارە: ٢٠٨}.

٩٠- وَأَصْلُهُ فِي اَلصَّحِيحَيْنِ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْد.

{تجريد البخارى/١ رقم: ١١١ = ١٣٧، ١٧٧، ٢٠٥٦ فتح البارى. مسلم/ ٣٦١ = ٨٠٢ شيحا = ١٥٠ پوختەی موسليم، تحفة الأشراف/٥٢٩٦}:

ئەم فەرموودەيە لەتەجريدی بوخاريدا ئاوايە:

عەبدوڵڵای كوڕی زەيدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) سكاڵای ئەو حاڵانەم كرد،

کەجاری واهەیە کەمرۆڤ لەناو نوێژدا، واهەست دەکا، کەتەڕاییەك، یان بایەك، یان شتێ، لەپێشیەوە، یان لەپاشییەوە، دەردەچێ، ئایا حوکم‌و بڕیاری ئەم حاڵە چییە؟ دەسنوێژ بەشتی وا دەشکێ یا نا؟

فەرمووی: (لەکاتی وادا باوادابنێ کە دەسنوێژەکەی نەشکاوەو ماوە، لەبەر ئەوە پێویست ناکا کەخۆی لەنوێژەکەی بدزێتەوەو نوێژەکەی ببڕێ، بەڵام هەرکاتێ دەنگی بایەکی بیست، یان بۆنی دەرچوویەکی کرد، یان هەستی بەدەرچوونی تەڕاییەك کرد، ئەوە دەسنوێژەکەی دەشکێ).

لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ( جاری وا هەیە، کەمرۆڤ واهەست دەکا، کەتەڕاییەك یان بایەك، یان هەرشتێ کە دەسنوێژ بشکێنێ، لەپێشیەوە یان لەپاشیەوە، لەسکی دەردەچێ، بەڵام دوودڵە لەوەو دڵنیا نییە لەڕوودانی، بالەکاتی وادا، وادابنێ کە دەسنوێژەکەی ماوەو نەشکاوە، لەبەر ئەوە پێویست ناکا، ئەگەر لەناو مزگەتدا بوو، مزگەوتەکە بەجێ بهێڵێ، یان ئەگەر لەناو نوێژدا بوو، نوێژەکەی ببڕێ‌و خۆی بدزێتەوە. بەڵام هەرکاتێ کە سوور دەیزانی کەوا دەسنوێژەکەی شکا، وەك ئەوە بایەکی لێ بۆوەو کوێی لەدەنگی بوو، یان بۆنی چوو بەسەریا، یان هەستی بەدەرچوونی دەسنوێژشکێنێ لەسکی کرد، وەشتەکەی لەلا ڕوون‌و ئاشکراو بێگومان بوو، ئەوە لەباری وادا دەستنوێژەکەی دەشکێ، جا ئەگەر لەناو نوێژدا بوو، بانوێژەکەی ببڕێ، ئەگەر لەناو مزگەوتا بوو، چاوەڕوانی نوێژی دەکرد، بادەرچێ‌و بچێ دەسنوێژەکەی تازە بکاتەوە).

(ڕوونکردنەوە):

دانەر پێشەوا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە دەفەرموێ: بناغەی (ئەصڵ)ی ئەم فەرموودەی ژمارە هەشتاو نۆیە لەصەحیحی

بوخاری‌و، لەصەحیحی موسلیمدا هەیە، مەبەستی ئاماژەیە بۆ ئەم دوو فەرموودەیە، کەلێرەدا ڕاگوێزمان کردن.

٩١- وَلِمُسْلِمٍ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ نَحْوُهُ.

{لەژمارە نەوەددا بەتەواوی رابورد}.

٩٢- وَلِلْحَاكِمِ. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مَرْفُوعًا: { إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: إِنَّكَ أَحْدَثْتَ، فَلْيَقُلْ: كَذَبْتَ}. وَأَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ بِلَفْظِ: {فَلْيَقُلْ فِي نَفْسِهِ}.

{المستدرك (١/٤٧٠)}:

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر دنیا بوو شەیتان چووە بن کلێشەی کەسێکتان‌و پێی گوت: دەسنوێژەکەت شکاوە! بابڕوای پێ نەکاو بەدرۆی بخاتەوەو پێی بڵێ: درۆ دەکەیت!).

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست ئەوەیە کە شەیتان لەرێگەی دڵکرمێ کردن‌و ختەختەو وەسوەسەوە، هەوڵ دەدا، کە سەر لە موسوڵمانان بشێوێنێ، گرنگ ئەوەیە کە موسوڵمان بڕوای پێ نەکاو ترۆی بکات.

٢- فەرموودەکانی ئەم باسی ژمارە (٦)ە، بیست‌و یەك فەرموودەن لەژمارە (٧٢)وەوە، هەتا ژمارە (٩٢) ئاوا: (٩٢ - ٧١ = ٢١).

## ٧- دەستوورەکانی سەراوکردن
## باب: آدابِ قَضاءِ الحاجَةِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان: بەرگی یەکەم لە زنجیرە (١٠)وە، هەتا زنجیرە (١١) لە لاپەڕە/٣٦وە هەتا لاپەڕە/٤٣}.

٩٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا دَخَلَ اَلْخَلَاءَ وَضَعَ خَاتَمَهُ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَهُوَ مَعْلُول.

{أبوداود رقم: ١٩ ترمذى رقم: ١٧٤٦. ابن ماجه رقم: ٣٠٣. نسائى (١٧٨/٨)}:

ئەنەسی نۆکەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەئیمامی ئەنەس بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کەدەڕۆیشتە ناو ئاودەست، ئەموستیلەکەی لەدەستی دادەکەندو لەشوێنێکا دایدەنا، ئەوسا سەراوەکەی دەکرد، چونکە مۆری ئەموستیلەکەی (محمد رسول الله) بوو. {تاج/١ زنجیرە: ٤ ژمارە: ١٨٥}.

٩٤- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا دَخَلَ اَلْخَلَاءَ قَالَ: "اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ اَلْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ"}. أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ١١٥ = ١٤٢، ٦٣٢٢ فتح البارى. پوختەی مسليم/١٠٨ = ٨٢٩ شيحا = صحيح مسلم رقم: ٣٧٥. ترمذى. رقم: ٥. أبو داود (٢/١ رقم: ٦). نسائى رقم: ٩٩٠٣.ك ابن ماجة. رقم: ٢٩٦. حاكم رقم: ٦٦٩. بيهقى. رقم: ٤٥٩}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەیویست بچێتە ناو ئاودەستەوە دەیفەرموو: (اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ اَلْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ). واتە: ئەی خودایە! پەنا دەگرم بە پەنای تۆ، لەشەڕی گۆڵو دێڵی شەیتانی چەپەڵ). {تاج/١، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٨٧}.

٩٥- وَعَنْهُ قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَدْخُلُ اَلْخَلَاءَ، فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلَامٌ نَحْوِي إِدَاوَةً مِنْ مَاءٍ وَعَنَزَةً، فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/١، رقم: ١٢٠ = ١٥٠، ١٥١، ١٥٢، ٢١٧، ٥٠٠ فتح البارى. پوختەی موسليم. رقم: ١١٥ = ٦١٨، شيحا = صحيح مسلم، رقم: ٢٧١}:

ئەنـەس (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە دەچـوو بـۆ سـەراو، مـن‌و کـوڕێکی تـر، لەسـێرەی خۆمـا، جەوەندەیــەك ئاومــان بــۆی دەبــرد، بــەو ئــاوە تــاراتی دەگـــرت، وە نەقیزەیەکیشمان لەگـەڵ خۆمـان دەبـرد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دایدەچەقاندو دەیکرد بـە بەربەسـت (سـوترە) لـەکاتی نوێـژدا). {تـاج/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠١} .

٩٦- وَعَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قَالَ لِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "خُذِ اَلْإِدَاوَةَ". فَانْطَلَقَ حَتَّى تَوَارَى عَنِّي، فَقَضَى حَاجَتَهُ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريـــد البخـــاری/١، رقـــم: ١٣٧ = ١٨٢، ٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٩٨، ٥٧٩٩ فتح الباری + تجريد البخـاری/١، رقـم: ٢٣٠ = ٣٦٣ فـتح البـاری. پوختـەی موسـليم رقـم: ١٣٨ = ٦٣٠ شـيحا = ٢٧٤ صـحيح مسلم} :

له پوختەی بوخاریدا ئاوایە:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەسـەفەرێکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، شەوێ فـەرمووی: (ئـەی مـوغیرە! ئـاوت پێیـە؟) گـوتم بـەڵێ. فـەرمووی: (دە مەتارەکـەت هـەڵگرە). منـیش مـەتارەیێ ئـاوم هـەڵگرت‌و شـوێنی کـەوتم، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەمن دوورکەوتەوە هەتا ون بوو لەبەرچاوم‌و چووە نـەدیوی، لـەوێ دەسـتی بـەئاو گەیانـد، جـا کـە لەسـەراوەکەی لێ بـۆوە، هاتـەوە ویـستی دەسـنوێژ بگـرێ، جبەیـەکی شـامی دەسـتکردیی بێبـاوەڕان (ناموسـوڵمانان)ی لەبـەردابوو، حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ویـستی قـۆڵی هـەڵماڵێ‌و لەسـەر قۆڵەکەیـەوە دەسـتی دەربهێنـێ، بـەڵام قـۆڵی جبەکـە تەسـك بـوو، بـۆی هەڵنـەماڵرا، جا لـەژێر جبەکـەوە دەستەکانی دەرهێنـاو، جبەکەی دا بەسـەر شانیدا، ئەوسا لەچەوەندە (مەتارە)کە ئاوم کرد بەدەستیداو، دەسنوێژی گـرت

بۆ نوێژ، لەجیاتیی شۆرینی پێیەکانی، دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆڵەکانیدا).

١- بڕوانە: ژمارە (٥٢) کە لەپێشەوە رابورد، هەروا ژمارە (١٤٠ پوختەی موسلیم = ٦٣٢ صەحیحی موسلیم تەرقیم شێخ خەلیل مەئموون شیحا.

٢- جلوبەرگو قاپو قاجاخی بێباوەڕان پاکەو دروستە بەهرەو سوودی لێ وەربگیرێ، بەمەرجێ لەخودی خۆیدا پیس نەبێ، وەك لەپێستی بەراز، یا لەکوڵكو مووی سەگو شتی پیس دروستکرابێ، یا دروشمی ئایینەکەیان بێ، وەك کڵاوی داوود کەتایبەتە بە جوولەکەو پشتێنی تایبەت بەمەسیحییەکان کەپێی دەگوترێ زننار، یان وێنەی خاچ (صەلیب)ی پێوەبێ. ئەوەندە هەیە لەکاتی ناچاری ڕەوادا، ئەوانەیش دروستە کەڵکیان لێ وەربگیرێ، وەك ماشینی ئیسعاف کەوێنەی خاچی پێوەبێ، چ لەوڵاتی خۆمان بێ، چ لەوڵاتی خۆیان بێ، کورتو پوخت، بەکوردی پەتی: هەموو شتێکی ناموسوڵمانانو بێ باوەڕان، چ هینی خاوەن نامەکان، چ هینی بێ باوەڕانی تر، حەلاڵەو ڕەوایە، بەمەرجێ لە ئیسلاما، قەدەغە نەکرابێ).

٣- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەلەکاتی سەراودا، خۆپەنادانو خۆحەشاردانو دوورکەوتنەوە، لەخەڵکی تر، کارێ پەسەندە، باشترین شت لەم لایەنەوە بۆ گوندو شارو شارۆچکەکان ئاو دەستە، کەئێستا باوە.

٩٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {اِتَّقُوا اَللَّاعِنِينَ: اَلَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ اَلنَّاسِ، أَوْ فِي ظِلِّهِمْ}. رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم ژمارە: ١٠٦ = ٦١٧ تخريج خليل شيحا = ٢٦٩ صحيح مسلم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان بپارێزن لەو دوو شتە ناشیرینە کەدەبن

بـەهۆی ئـەوە کەخـەڵکی نـەفرەتو لەعنـەتتان لێ بکـەن، ئەگـەر ئـەنجامیان بدەن). گوتیان: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەو دوو شتە چیو چین؟ فـەرمووی: (یەکێکیان سەراوکردنە لەسەرە ڕێگەدا، ئەوی تریان سەراو کردنـە لەسێبەری جێگەی دانیشتنو کۆبوونەوەی خەڵکیدا). {تاج/١ زنجیرە: ٢٤ ژمارە: ١٩٦}.

٩٨- وَزَادَ أَبو دَاوُدَ، عَـنْ مُعَـاذٍ (رضـي الله عنـه): {وَالْمَـوَارِدَ}. وَلفظـه: (إتَّقُوا المَلاَعِنَ الثَّلاَثَةَ: البَـرازَ فِـي الْمَـوَارِدِ، وَقَارِعَـةِ الطَّرِيـقِ، وَالظِّـلِّ). {حَـسَنٌ، صحيح الجامِعِ: ١١٢}.

{أبوداود (٢٦)}:

موعـاذی کـوڕی جەبـەل (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خۆتـان لـەو سـێ شـتە بپـارێزن، کـە ئەنجامدانی هەر یەکێ لەو سێ شتە، دەبن بـەهۆی ئـەوە کەخـەڵکی نـەفرەتو لەعنەتتان لێ بکەن):

یەکـەم: لـە سـەراوکردن لەقـەراخ ئـاوی خواردنـەوەو لـەلای سەرچـاوەو کارێزو کانیەکاندا.

دووەم: لە سەراوکردن لەسەرە ڕێدا.

سێیەم: لە سەراوکردن لەسێبەری خەڵکیدا.

(ڕوونکردنەوە):

موعـاذی کـوڕی جەبـەل (ڕەزای خـودای لێ بـێ) خەزرەجییـە، لـە یاریدەدەرانە، واتە: لە ئەنصارەو ئەنصارییە، یەکێکە لەو حەفتا ئەنصارییەی کەئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون، موعاذ زانایـەکی گـەورە بـوو، پێشەوایەکی گەورەیـە لەزانـستی حـەڵاڵو حەرامـدا، کۆمـەڵێ فـەرموودەی زۆری لـە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، گـەورە پیـاوانی هـاوەڵانو پـەیڕەوان (سـەحابەو تابیعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومـەرو جابیرو ئەنەسی کوڕی مالیـكو کەسانی تـریش فـەرموودەکانی پێغەمبـەریان

لەڕێگـەی ئـەوەوە گێڕاوەتـەوە، ئامـادەی هـەرای بـەدرو هـەموو شـەڕگاو شەهیدگاکانی تری پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیز بووە، منالّی قەت نەبووە.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (موعاذ یەکێکە لەو چەند کەسە کەمانەی کەبەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو قورئانیان لەبەر بووە).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (قورئان لەم چوار کەسەوە فێربن، کەیەکێکیان موعاذی کوڕی جەبەل بوو، کاتێ موعاذ ئامادەی شەڕگای بەدربوو، تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، وە پێغەمبەر کردی بە فەرمانڕەوا لەیەمەن. موعاذ لەباشترین و جوانترین و شێوە شیرینترینی لاوانی یاریدەدەران (ئەنصار) بوو، یاریدەدەران واتە: ئەنصار، هەندێ لە کوردەکانی خۆمان تەرجەمەیان کردووە بە (پشتیوانان).

موعاز لاوێکی جوانی قۆزی سپی و سووری چاوقەوی چاو ڕێژراوی چاو ڕەشی سوورمەیی بەژن و بالایەکی بەرزو جوانی بوو، دوعاو نزای زۆر گیرابوو، هەرچی لەخودا داواکردبێ، بێ دڵی نەدەکردو ئەو شتەی پێی دەبەخشی، کاتی پەیمانی (برایەتی بەستن: معاهدة المؤاخاة) لەناو هاوەڵاندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەبرای ئیبنو مەسعوود، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا، موعاز پێشەوای زاناکانە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موعاذی کرد بەقازی ئەلجەنەد لەیەمەن، خەڵکەکەی فێری قورئان و سوننەت و شەریعەت و یاسانامەی ئیسلام دەکردو، دادگایی لەناوا دەکردن، کە ئەبو عوبەیدە بە تاعوونەکەی عامووس مرد، عومەر موعازی لەجێگەی ئەو کرد بە کارمەندی سەر شام. موعاز لەدەوری تەمەنی (٣٣) سیی و سێ ساڵیدا، لەشام، بە تاعوونەکەی عامووس،

لەساڵی (١٨) هەژدەی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە، عامووس گوندێکە، وا لەنێوانی رەملەو بەیتولەقدیسدا، ئەلجەنەدیش کوورەو رەستاقێکە لە کوورەو رەستاقەکانی یەمەن. (بڕوانە: ١١٧٩ تەجریدی بوخاری + پوختەی موسلیم/١، ژمارە: ١٣ + پوختەی موسلیم ژمارە: ١١١٢ + تاج/١٧٨/٥، زنجیرە: ٤٨ + ریاض/٣٥٠/٢، ژمارە: ٩١٧).

٩٩- وَلِأَحْمَدَ" عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: {أَوْ نَقْعِ مَاءٍ} وَفِيهِمَا ضَعْف.

{المسند (٢٩٩/١ رقم: ٢٧١٥) وضعَّفَهُ الْهَيْثَمِيُّ (٢٠٤/١)}:

ئیمامی ئەحمەد لە (المسند)دا، بەڕشتەی خۆی هەتا سەر ئیبنو عەبباس دەیگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆتان بپارێزن لەو سێ شتە ناشایستەی، کە کردنی هەریەکێ لەو سێ شتە ناشایستەیە، دەبن بەهۆی نەفرەتو لەعنەتو نەفرینی خەڵك لەبکەرەکەیان:

یەکەم: سەراوکردن لەسێبەری خەڵکا.

دووەم: سەراوکردن لەسەرە رێگەدا.

سێیەم: سەرناوکردن لەگۆمو حەوزی ئاودا.

(روونکردنەوە):

ئەم دوو فەرموودەیە لاوازن، فەرموودەی ژمارە (٩٨) کە فەرموودەکەی ئەبوداوودە، بۆیە لاوازە، بۆیە زەعیفە، چونکە ئەبوداوود خۆی لەکۆتایدا دەفەرموێ: (مورسەلە) چونکە ئەبو سەعیدی حیمیەری کە لەموعازی کوڕی جەبەلەوە دەیگێڕێتەوە، بە خزمەتی موعاز نەگەیشتووە، فەرموودەی ژمارە (٩٩)یش کە هینی ئیبنو عەبباسە، راوی لێیەوە نەناسراوە، سەرەڕای ئەوەیش لەڕشتەکەیدا ئیبنو لوهەیعە هەیە، کە زەعیفو لاوازە.

١٠٠- وَأَخْرَجَ اَلطَّبَرَانِيُّ اَلنَّهْيَ عَنْ قَضَاءِ الحاجةِ تَحْتَ اَلْأَشْجَارِ اَلْمُثْمِرَةِ، وَضَفَّةِ اَلنَّهْرِ الْجَارِي. مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{أورده الهيثمي في مجمع الزوائـد (١/٢٠٤) وعـزاه للطبراني في الأوسـط وفيـه فرات بن السائب متروك}:

ئیمامی تەبەڕانی بەڕشتەی خۆی دەیگێڕێتەوە، بەڕشتەیەکی لاواز، کە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیشی کـردووە لەسـەراوکردنو میـزو پیسایی کردن: لەژێر داری بەریداو، لەقەراخ چەمو جۆگەو ئاوی ڕەواندا.

(ڕوونکردنەوە):

کۆی ئەو جێگایانەی کە نـەیی کـراوە لەسـەراوکردن لێیـان بـەپێی ئـەم فەرموودانە: ژمارە (٩٧، ٩٨، ٩٩، ١٠٠) ئەم شەش جێگەیانن:

١- سەرەڕێ.

٢- سێبەری دانیشتنو حەوانەوەی خەڵك.

٣- قەراخ ئاوێك کەخەڵك بەکاری بهێننو بچنە سەری.

٤- لەگۆمو گۆمیلکەو حەوزو ئەستێڵو بیرو شتی وا، کە دەبـن بـەکۆگای کۆکردنەوەی ئاو.

٥- لـەبن دارو درەختـی بەریـدا، کەبەرەکـەی بخـورێ، یـان سـوودی لێ وەربگـیرێ، وەك دار مـازوو، گەرچی مـازوو نـاخورێ، بـەڵام قـازانجی زۆری لێ وەردەگیرێ.

٦- قەراخ چۆمو روبار.

٧- ئەبوداوود لە (مەراسیلیدا) ئەمەی پتر کردووە: قەدەغەیە کە سـەراو لەبەردەم دەرگای مزگەتدا بکرێ.

### کورتو پوخت فیقهی ئەم فەرموودانە، ئەمەیە:

(سەبارەت بـەم بابەتـە هەرچیو هەرشـوێنێ، سـەراو کردنـی بـچوك یـا گەورە لێی، ببێ بەهۆی زیانو ئازارو پیسو پۆخڵیو قێزەونـی بـۆ مـەردووم،

نارەوایەو نادروستە، وەك سەراوكردن لەسەر گۆڕ، یا لەپاڵ كێلی گۆڕا، یا لەجێگەی كۆڕو دانیشتنی خەڵكا، باسێبەریش نەبێ، یا لەیاریگاكانا... تاد).

چونكە مەبەستی نەییكردن لەم كارانە رێگرییە لەئازاردانی خەڵك، نەوەك رێگری لەخودی ئەم كارانە خۆیان، چونكە سەراوكردن لەجێگەو رێگەی خۆیدا، كارێ ناباش نییە، بەڵكوو كارێ باش‌و بەجێیە.

زاناكان دەفەرموون: (كُلُّ مَوْضِعٍ يَتَأَذَى بِهِ الْمُسْلِمُونَ فَإِنَّهُ لاَ يَجُوزُ أَنْ يُتَخَلَّى فِيهِ). واتە:

(هەر شوێنێك سەراوكردن لێی ببێ بەهۆی ئازارو زیان بۆ موسوڵمانان، سەراوكردن لێی نادروستەو نارەوایە).

دیارە كە ناموسوڵمانی بێوەیش، بڕیاری موسوڵمانی بۆ هەیە، لەم لایەنەوە، چونكە پێغەمبەری ئێمە (رَحْمَةً لِلْعَالَمِنَ)ەو ئێمە فەرمانمان پێكراوە، كە بۆ مەردووم مایەی خۆشی‌و سۆزو میهرەبانی بین، نەوەك ببین بەهۆی ئێش‌و ئازار بۆ دروستكراوانی خودا.

١٠١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا تَغَوَّطَ اَلرَّجُلَانِ فَلْيَتَوَارَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَنْ صَاحِبِهِ، وَلَا يَتَحَدَّثَا. فَإِنَّ اَللَّهَ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلسَّكَنِ، وَابْنُ اَلْقَطَّانِ، وَهُوَ مَعْلُول):

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوكی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ دوو پیاو دەیانەوێ سەراوبكەن‌و دەست بەئاو بگەیەنن، با لەبەرچاوی یەكتری سەراونەكەن، وەلەكاتی سەراوكردنەكەدا قسە لەگەڵ یەكتری نەكەن، چونكە خودا ڕقی زۆری لەكاری وانابەجایە!).

(ڕوونكردنەوە):

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر:

١- داپۆشینی شەرمگا لەكاتی سەراوكردندا.

٢- پیشگیریی لەقسەكردن لەكاتی سەراوكردندا.

٣- ئیمامی ئەحمەد لەسەر فەرمایشتی دانەر گێڕاویەتەوە، ئیبنو سەكەنو ئیبنو قەططان بە فەرموودەیەكی تەندروستیان داناوە، بەڵام دانەر، پێشەوا عەسقەلانی دەفەرموێ: مەعلوولە، واتە: زەدەدارە.

١٠٢- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يُمْسِكَنَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَهُوَ يَبُولُ، وَلَا يَتَمَسَّحْ مِنْ اَلْخَلَاءِ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَنَفَّسْ فِي اَلْإِنَاءِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{پوختەی موسلیم/١١٤ = ٦١٢ ترقيم شيخ خليل محمود شيحا = ٢٦٧ صحيح موسلم. پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری ژمارە: ١٢١ = ١٥٣، ٥٦٣٠، ١٥٤ فتح الباری}:

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادە فەرمووی: باوكم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ سەراوی بچووك دەكەن، بەدەستی ڕاستتان چووكتان مەگرن، هەروا تاراتیش بەدەستی ڕاستتان مەگرن، كاتێ شتیش دەخۆنەوە، لەوكاتەدا، لەناو جامەكەدا، هەناسە مەدەن). {تاج/١/١٢٠، ژمارە: ١٣/١٩٥}:

١٠٣- وَعَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَقَدْ نَهَانَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَنْ نَسْتَقْبِلَ اَلْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ عَظْمٍ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/١٠٩ = ٦٠٨ شيحا = ٢٦٢ صحيح مسلم = تەجریدی بوخاری/١/٤١، رقم: ١١٧ = ١٤٤ فتح الباری}:

گوتیان بەسەلمانی فارسی (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم پێغەمبەرەی ئێوە، هەموو شتێکتان فێردەکات، تەنانەت دەستووری پێشاوو سەراوکردنیشتان فێردەکات! سەلمانیش فەرمووی: بەڵێ وایە، ئەوەتانێ یاساخی کردووە لێمان کە لەکاتی پیسایی‌و گمێزکردندا، ڕووبکەینە ڕووگە، یان بەدەستی ڕاست تارات بگرین، یان بەسێ بەرد کەمتر خۆمان پاك بکەینەوە، یا بەتەپاڵەو تەرس‌و ئێسقان‌و شتی تری واپیس‌و چەپەڵ، خۆمان پاك بکەینەوەو تاراتی پێ بکەین!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٣ + صەحیح مسلم/٦٠٥}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو عەبدوڵڵا سەلمانی فارسی (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لەهاوڕێ‌و هاوەڵە نازدارە مەزنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەگشت هاوڕێ‌و هاوەڵە ئازیزەکانی بێت). خەڵکی رامە هورمووزە، لەوڵاتی ئەسپەهان، لەوڵاتی فارس، کەئێستا زۆری بەر ئێران کەوتووە، تەمەنی زۆر زۆر درێژبووە، تەنانەت زۆر لەمێژوو نووسەکان دەڵێن: (٢٥٠ — ٣٥٠ ساڵ ژیاوە).

ئەمەیش لیستێکە بەناوی کۆمەڵێ تەمەن درێژ لەمێژووی کۆن‌و نوێدا، لە ئەنتەرنێت وەرگیراوە (المعمَّرونَ في التأريخ):

١- ئادەم (سڵاوی خودای لێ بێ) (٩٣٠) نۆسەدو سیی ساڵ ژیاوە.

٢- نووح (٩٥٠) نۆسەدو پەنجا ساڵ ژیاوە.

٣- ئیبراهیم (سڵاوی خودای لێ بێ) (٢٧٥) ساڵ ژیاوە.

( **پاش مەسیح** ):

٤- نرسیس سێیەم ئەسقوفی ئورشەلیم (١٦٦) ساڵ ژیاوە.

٥- داوود أسقف انگلترا (١٧٠) ساڵ ژیاوە.

٦- سیفیرین ئوسقوفی طەنغرە (٣٥٧) ساڵ ژیاوە.

٧- لەسەدەی پێنجەما أتیلا (١٢٤) ساڵ ژیاوە.

٨- له انگلترا، کەسێ لەساڵی (١٤٨٣) لەدایك دەبێ، لەساڵی (١٦٥١) دەمرێ واتە: (١٦٩) ساڵ ژیاوە.

٩- توماس (١٥٢) سەدو پەنجاو دوو ساڵ ژیاوە.

١٠- روبرت تایلور ساڵی (١٧٦٤) لەدایك بووە، لەساڵی (١٨٩٨) مردووە، واتە: (١٣٤) ساڵ ژیاوە.

سەلمان (رەزای خودای لێ بێ) مرۆڤێکی هەست ناسکی سرووشت پاك بووە، بەسروشتپاکی خۆی، بێزی لەئایینە پوچەکانی پێش ئیسلام کردۆتەوە، وێڵ بووە لەشوێن ئایینێکی ڕاستو دروستو ڕێکی سرووشتی پاکی، هەتا لەسەرەنجاما بەخزمەتی حەزرەت دەگا، وەئەشقی ئیسلام دەبێ، کاتێ دەنگوباسی هاتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبیستێ، دێ بۆ خزمەتی، بەڵام لەڕێ دیل دەکرێو، لەمەدینە دەفرۆشرێو دەکرێ بەکۆیلە، لەسایەی ئیسلامەوە ئازاد دەبێ، لەغەزای خەندەقا بەشداری کردووە، ئەو ئەندازیاری هەڵکەندنی خەندەقەکە بووە، بەدەوری شاری مەدینەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆری خۆشدەویست دەیفەرموو: (سَلْمَانُ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتِ = سەلمان لەخۆمانە، کەخانەوادەی پێغەمبەرایەتین). هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهەشت ئارەزومەندی دیداری ئەم سێ کەسەیە: عەلیو عەممارو سەلمان!).

سەلمان ئامادەی غەزای خەندەقو هەموو غەزاکانی تری دوای خەندەق بووە، هەروا بەشداریی لەئازادکردنی وڵاتی عێراقدا کردووە، بۆ ماوەیێ بووە بە سەرەکشاری مەدائین، کەئێستا ناوداره بە سەلمانی پاك، لەنزیك بەغدای پایتەختی عێراقەوەیە، تاقی کیسرا والەوێ، هەتا ئێستا گۆڕەکەی زیارەتگایە، سەردانی گۆڕە پیرۆزەکەیم کردووە، سەلمان پیاوێکی داناو زانای بەهرەمەندی خێرخوای خاوەن زوهدی لەخوا ترسی سۆفیلکەی چلەکێش (مُتَقَشِّف) بوو، مووچەو بەراتەکەی پێنج هەزار درەم بوو، هەرکە ئەو مووچەیەی

وەردەگرت، یەکسەر دەیکرد بەخێر، بەدەستی خۆی لەپەلکە خورماو شتی تری وا، چنراوی دەچنیو بەوە دەژیا، دیاریو دەسەنەو خێرو یارمەتی لەکەس وەرنەدەگرت، بەرەنجی شانی خۆی دەژیا، وەك حەزرەتی داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

سەلمان خانووی نەبوو، زۆربەی کات لەبن سێبەری دیوارو درەختا دادەنیشت، هەتا پیاوێ قایلی کرد، کە کولبەیەکی وای بۆ دروست بکا، کە لەباو بارانو خۆرەتاو بیپارێزێ، بەلام بەمەرجێ ئەو کولبەیە ئەوەندە تەنگبەرو تەسكو تروسك بێ، ئەگەر سەلمان لەناویدا ڕابوەستێ، سەری بدا لەبنمیچەکەی، ئەگەر قاچ درێژبکا، قاچی بدا لەدیوارەکەی!! ئەویش بەوە ڕازی بوو.

سەلمان دەربایستی جێگەی خۆشو بەرگی کەشخە نەبوو، عابایەکی هەبوو، لایەکی دەکردە بەریو، ئەولایەکەی تری لەژێریدا، دادەخست.!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ پەیمانی برایەتی (موئاخات)ی بەست، لەنێوانی موسوڵماناندا، سەلمانو ئەبو دەردای کرد بەبرای ئایینی یەکتری. گەلێ لەهاوڕێیانی پێغەمبەرو زۆر لەچینی دووەمی موسوڵمانان (واتە: لەسەحابەو تابیعین) زانستو سوننەتو یاسانامەیان لەسەلمان وەردەگرت. لەهاوڕێو هاوەڵان، وەك ئەم زاتانە: ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیكو کەعبی کوڕی عوجرەو ئیبنو عەبباسو ئەبو سەعیدی خودریو ئیبنو عومەرو ئەبو طوفەیل، لەپەیڕەوانیش (تابیعین: شوێنکەوتوان: پەیڕوان) وەك ئەم زاتانە: ئەبو عوثمانی ئەل-نەهەدیو ئیبنو شهاب (ناسراو بە زوهری)و سەعیدی کوڕی وەهاب. سەلمان لەساڵی سیو پێنجی کۆچیدا لەشاری مەدینە مردووە، لەلای هەندێ، بەلام لە ئیستیعابا ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: شەعبی دەفەرموێ: لەمەدائین مردووە).

وەئێستا واقاوو باوە کە مەرقەدەکەی وا لە سەلمان پاك.

{بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی/١، لاپەڕە: ٤٤٣، ژمارە: ٨٨٣/٤٦٨ + پوختەی صەحیحی موسلیم، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ١١٦ + تاج/٥، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٣٥١٠ هەتا ژمارە: ٣٥١٥ + الإصابة + الأستیعاب + تهذیب التهذیب}.

١٠٤- وَلِلسَّبْعَةِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { فَلَا تَسْتَقْبِلُوا االقبلةَ وَلاَ تَسْتَدْ بِرُوهَا بِغَائِطٍ وَلَا بَوْلٍ، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا}.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ١١٧ = ١٤٤ فتح الباری شرح صحيح البخاری. پوختەی موسلیم/١٠٩ = ٦٠٨ صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٢٦٤ صحيح مسلم. أحمد (٤٢١/٥). أبو داوود (رقم: ٩) ترمذی (رقم: ٨)، نسائی ٢٢/١رقم: ٢١ ابن ماجة ٣١٨. تحفة الأشراف/٣٤٧٨}:

دەقی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە دەچنە سەر پێشاو، نە ڕووبکەنە ڕووگە (قیبلە) وە نەپشتی تێ بکەن، بەڵام ڕووبکەنە ئەم لاو ئەولا).

ئەبو ئەییوب دەیفەرموو: لەوەدوا کە چووینە وڵاتی شام، دەبینین ئاودەست هەیە، ڕووەو ڕووگە دروست کراوە، کە دەچووینە ناو ئەو جۆرە ئاودەستانەوە، بەپێی توانا، ڕووی خۆمان لە ئاستی ڕووگە وەردەچەرخان و لەگەڵ ئەوەشا داوای لێبوردنمان لەخودا دەکرد کە لێمان نەگرێ. {تاج/١/١١٩، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٩٢/١٠، ١٩١}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری ناوی خالیدی کوڕی زەیدە، لەهۆزی بەنی نەجاری خاڵوانی پێغەمبەرە، بەدرییە، لەشەڕی بەدردا بەشداری کردووە، ئامادەی پەیمانی بەیعەتولعەقبەی دووەم بووە، پێغەمبەر (درودی خودای

لەسەر بێ) کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە، نزیکەی مانگێ میوانی ئەوبوو، یەکێکە لە خانەدانو نوجەباکانی صەحابەکان (ڕەزای خودایان لێ بێ) سەدو پەنجا فەرموودەی لەپەڕاوە ناودارەکانی فەرموودەدا هەیە، حەوتیان پەسەندی پیری بوخاریو پیری موسلیمن. کە یەکێ لەو حەوت فەرموودەیە ئەم فەرموودەیەیە، کەواین لەخزمەتیدا. یەك فەرموودەی تریشی لەبوخاریدا بەتەنها هەیە، لە موسلیمدا ئەو فەرموودەیە نییە، کەواتە: کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، دەکاتە: (٧+١=٨) فەرموودە.

ئەبو ئەییوب لایەنگیری ئیمامی عەلی بوو، لەگشت جەنگەکانیدا، لەگەڵیدا بوو، لەگەڵ سوپاکەی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا، لەکاتی جێنشینیی یەزیددا، دەچێ بۆ ئازادکردنی قوستەنتەنییە، جا کاتێ نزیك دەکەونەوە نەخۆش دەکەوێ، بەهاوڕێکانی دەفەرموێ: (کاتێ کەمردم لەگەڵ خۆتان تەرمەکەم هەلگرنو بەرەو شارەکە بمبەن، لەکوێدا بەرابەری دوژمن ریزتان بەست، لەبەردەم پێی خۆتاندا بمنێژن، ئەوانیش وایانکرد). لەساڵی پەنجای کۆچیدا لەوێ دەمرێ، لە حاڵێکا کە سەرگەرمی غەزا دەبێ.

گۆڕەکەی لەنزیك شورا کۆنەکەی قوسطە نطەنییە بوو، کە ئێستا ناونراوە: ئەستەمبووڵ، کە هەندێ پێی دەڵێن: ئیسلامبووڵ، مزگەوتێکی مەزن لەسەر گۆڕەکەی دروست کراوە، موسوڵمانان ڕێزێکی زۆر لە گۆڕە پیرۆزەکەی دەگرن، ئێستا بووە بە زیارەتگایەکی گەورە، لەخزمەتیدا، لەکاتی بێبارانیدا، داوای بارینی باران لە خودای گەورە دەکرێ، وەخودای گەورە نزاکەیان گیرا دەکاو، بارانیان بۆ دەبارێنێ، لەساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

١٠٥- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا):أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { مَنْ أَتَى اَلْغَائِطَ فَلْيَسْتَتِرْ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُد.

{أَخْرَجَهُ أبو داود في سننه برقم ٣٥ وابن ماجة في سننه برقم ٣٣٧، ٣٤٩٨ واحمد في المسند ٣٧١/٢ والبيهقي في السنن ٩٣/١ وابن حبان برقم ١٤١٠ كلهم عن أبي هريرة وَلَيْسَ عن عائيشة. (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)}:

بەپێی سەرچاوەکان ئەم فەرموودەیە لە عائیشەوە نییە، بەڵکوو لە ئەبو هورەیرەوەیە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ چوو بۆسەر پێشاو، بابچێتە پەنا پەردەیێو لەبەرچاوی یەکتری سەراو ئەنجام مەدەن).

١٠٦- وَعَنْهَا" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ اَلْغَائِطِ قَالَ: "غُفْرَانَكَ"} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ. وَصَحَّحَهُ أَبُو حَاتِمٍ، وَالْحَاكِمُ.

{أبو داود رقم ٣٠ ترمذى رقم ٧ نسائى رقم ٧٩ عمل اليوم والليلة وابن ماجة رقم ٣٠٠ حاكم مُسْتَدْرَك ١٥٨/١. ابن حبان رقم ١٤٤٤}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەئاودەست دەهاتە دەرەوە، دەیفەرموو: (غُفْرَانَكَ). ئەی خودایە! داوای لێبوردنت لێ دەکەم، کە ئەم ماوە دوورو درێژە لەیادو زیکری تۆ دوورکەوتمەوە). {تاج/١، زنجيره: ٢٤، ژمارە: ٢٠٠}.

١٠٧- وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَتَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْغَائِطَ، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ، فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ، وَلَمْ أَجِدْ ثَالِثًا. فَأَتَيْتُهُ بِرَوْثَةٍ. فَأَخَذَهُمَا وَأَلْقَى اَلرَّوْثَةَ، وَقَالَ: "هَذَا رِكْسٌ"}. أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ. زَادَ أَحْمَدُ، وَالدَّارَقُطْنِيُّ: {ائْتِنِي بِغَيْرِهَا}.

{پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ١٢٣ = ١٥٦ فتح البارى شرح صحيح البخارى. تحفة الأشراف/٩١٧٠. أحمد ٤٥٠/١. دار قطنى ٥٥/١}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) کە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ سەراو، فەرمانی کردپێم: کەسێ بەردی بۆ بەرم، هەتا لەپاش سەراوەکەی، خۆی پاک

بكاتـەوە پێیـان، گـەڕام تـەنیا دوو بـەردم دۆزییـەوە گـەڕام بـۆ بـەردی سێیەم چنگم نەکەوت، لەباتی ئـەوە تەرسـەقولێکم هـەڵگرتو ئەوسا دوو بەردەکـەو تەرسـەقولەکەم بـۆیبرد، جـا هـەردوو بەردەکـەی وەرگـرتو تەرسـەقولەکەی تـووڕداو فـەرمووی: (ئەمـەیان دەسـت نـادات بـۆ خـۆ پـاك کردنـەوە، چـونکە پیسە) یا فەرمووی: (چونکە چەپەڵە). (بوخاری).

ئیمامی ئەحمـەدو ئیمـامی داره قـوطنی ئەمـەیان زیـاد کـردووه: (شتێ ترم بۆ بهێنە لەباتی ئەم تەرسەقولە).

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ناسـراوە، بـە ئیبنـو مەسـعوود، یەکێکـە لەگـەورە هـاوەڵانی پێغەمبـەری ئـازیزو خۆشەویـست، لـە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، دوو کۆچی کردووە، لـەپێناوی ئیـسلاما، کۆچـێ بـۆ حەبەشـەو کۆچـێ بـۆ مەدینـەی نـازدار، هـۆی ئـەم کۆچانەی سـەحابەکان ئەوەبوو، بێباوەڕانی مەککە ئازاریـان دەدان، لەسـەر قـەبووڵی ئیـسلام، هـەیان بـوو لـەم پێنـاوەددا شـەهید دەبـوو، وەك خـاتوو سومەییەی دایکـی عـەمماری کـوڕی یاسـیر {بڕوانـە: پوختـەی موسـلیم زنجـیرە: ٣٠٤، ژمـارە: ٤١١ — ڕوونکردنەوە}.

ئیبنـو مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ئامـادەی غـەزای بـەدرو شـەڕگاکانی تـری پاشـی بـووە، هەمیشە لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـوو، مەگـەر چۆنەها خزمـەتی ئـەوی چۆڵ بکردایـە، خزمـەتی پێڵاوەکـانی پێغەمبـەری دەکرد، لەکاتی هەستانا پێڵاوەکانی بۆی دادەنا، وەك تر سۆڵەکانی پێغەمبەری دەکـردە قـۆڵی خـۆی، هەشـت سـەدو چـلو هەشـت فـەرموودەی پێغەمبـەری گێڕاوەتەوە، چلو چواریان پەسـەندی هـەردوو پـیرن، واتـە: شـێخی بوخـاریو شێخی موسلیم، کە لەزانستی فـەرموودەدا ناسـراون بـە شـەیخەین، ئـەو چلو چوارەیان گێڕاوەتـەوە، بیـستو یـەك فـەرموودەی تـری، بێجگـە لـەو چلو

چوارەیش، لە بوخاریددا هەیە، لە موسلیمدا نین، سیی‌و پێنج فەرموودەی تریشی بێجگە لەو چل‌و چوارە، لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، لەبوخاریدا نین، کەواتە: ٤٤ + ٢١ = ٦٥ فەرموودە، کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی بوخاریدا، ٤٤ + ٣٥ = ٧٩ فەرموودە = کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحی موسلیمدا، ٦٥ + ٧٩ = ١٤٤ = کۆی فەرموودەکانی ئیبنو مەسعوود لە صەحیحەیندا، ٤٤ + ٢١ + ٣٥ = ١٠٠ فەرموودە لە صەحیحەینا، بەبێ دووبارە.

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست‌و نازدار خۆی، (دروودو سڵاوی خودای لەسەر بێ)، حەفتا سوورەتی قورئانم لەبەرکردووە، ئیبنو مەسعوود یەکەم کەس بوو، کە لەمەککە بە ئاشکرا قورئانی دەخوێند، ئەوەندە بەردەوام لەگەڵ ماڵی پێغەمبەردا تێکەڵ بوو، لە خەڵکی وابوو، کە یەکێکە لەخێزانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

ناوداربوو بە صاحیبی سیواکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـوژدەی بەهەشتی پێ داوە، بکوژی ئەبو جەهل بوو (بڕوانە: بەرگی/٤، تەجریدی بوخاری، ژمارە: ١٥٢٦/٣٩٦٢).

ئیبنو مەسعوود ڕووەو قیبلەتەین نوێژی کردووە، واتە: لەو موسوڵمانانەیە کە لەپێشا، کە نوێژیان دەکرد ڕوویان دەکردە مەسجیدول ئەقصا لە قودس، دوایی خودای گەورە فەرمانی پێیانکرد، کە لەنوێژدا ڕووبکەنە کەعبە، کەوا لە مەسجیدولحەرام لەمەککەی پیرۆز.

ئیبنو مەسعوود مامۆستایەکی مەزنی قورئانزان‌و فەرموودەزان بوو، قوتابی‌و فەقێی زۆری هەیە لەم دوو بوارەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (دوو لاقە لەڕەکانی ئیبنو مەسعوود، لە قیامەتدا، لە تەرازووی کێشانی خێرو شەڕدا، لەکێوی ئوحود قورسترن).

لەساڵی (٣٢) سیی‌و دووی کۆچیدا، لەشاری مەدینە، لە تەمەنی شەست‌و هەنددا، بەمردنی خودا مردووەو کۆچی دوایی کردووە، ئیمامی عوسمان نوێژی تەرمی لەسەر کردووە، لە گۆڕستانی بەقیع، بەخاك سپێرراوە، بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی ئەم هاوڕێ مەزنەی پێغەمبەر بڕوانە: (تەجریدی بوخاری بەکوردی/٤، ژمارە: ١٤٧٣ + پوختەی موسلیم، ژمارە: ٣٥ + تاج/٣، زنجیرە: ٣ لەژمارە: ٣٤٠١وە هەتا ژمارە: ٣٤١٠).

١٠٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَال: { أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى "أَنْ يُسْتَنْجَى بِعَظْمٍ، أَوْ رَوْثٍ" وَقَالَ: "إِنَّهُمَا لَـا يُطَهِّـرَانِ"}. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{اخرجه الدار قطني (١/٥٩) وقال: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکر لەوە: (کە مرۆڤ لەپاش پێشاو و سەراوکردن خۆی بەئێسقان پاك بکاتەوە، یا بەتەپاڵەو تەرس‌و پشقل خۆی پاك بکاتەوە). فەرمووی: (چونکە ئەوانە پاکەوەکەرنین، لەبەر ئەوە تاراتیان پێ ناگیرێ). {بڕوانە: پوختەی موسلیم ١١٦ + تاج/١/١٢٤ ژمارە: ٢٠٤/٣}.

١٠٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِسْتَنْزِهُوا مِنْ اَلْبَوْلِ، فَإِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ اَلْقَبْرِ مِنْهُ}. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيّ.

{الدار قطني (١/١٢٨)ء قال: الصَّوَابُ مرسل}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان لەپیسبوون بەمیز بەتەواوی بپارێزن، چونکە تێکڕاو زۆرینەی سزای ناو گۆڕ بەهۆی پیسبوون بەمیزەوەیە).

١١٠- وَلِلْحَاكِمِ: {أَكْثَرُ عَذَابِ اَلْقَبْرِ مِنْ اَلْبَوْلِ } وَهُوَ صَحِيحُ اَلْإِسْنَادِ.

{المستدرك (١/٢٩٣)ء قال: لا أعرف لَهُ عِلَّةً. رقم/٦٥٣}:

حاكم دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زۆرینەی سزای ناو گۆڕ بۆ موسوڵمان بەهۆی میزەوەیە). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١ ژمارە: ١٩٥ = ٢١٦ فتح الباری}. عەسقەلانی إسنادەکەی بە صەحیح داناوە.

١١١- وَعَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {عَلَّمْنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلْخَلَاءِ: " أَنَّ نَقْعُدَ عَلَى اَلْيُسْرَى، وَنَنْصِبَ اَلْيُمْنَى"}. رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ بِسَنَدٍ ضَعِيف.

{البيهقي (٩٦/١)}:

سوراقەی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی فێرکردین کەکاتێ دادەنیشین بۆ پێشاوکردن هێز بدەینە سەر قاچی چەپمانو قاچی ڕاستمان هەڵپەسێرینو کەمتر هێزی بخەینە سەر).

(ڕوونکردنەوە):

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشووم، مودلیجییە، یەکێکە لەهاوەڵە ناودارەکانی پێغەمبەر، کۆمەڵێ هەواڵی خۆیو موعجیزەی پێغەمبەری لەناو دەقی فەرموودەی ژمارە: ١٥١٧ تەجرید = ٣٩٠٦ فەتحولباریدا، گێڕاوەتەوە بۆمان، هەروا لەتاج/٣ زنجیرە/١٠١ — کۆچکردن ژمارە: ٣١٦١ چاپی چوارەمدا.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەی موعجیزە، موژدەی دا بە سوراقەو پێی فەرموو: (ئای بۆ ئەو ڕۆژە خۆشو پیرۆزەی کە بازیبەندەکانی کیسرا لەقۆڵ دەکەیت).

جا لەسەردەمی پێشەوا عومەردا، کاتێ تاجو پشتێنو بازیبەندەکانی کیسرایان هێنا بۆ عومەر، عومەر سوراقەی بانگ کردو بازیبەندەکانی کیسرای کردە هەردوو باڵی).

سوراقه شاعيرێكی جوان بوو، كۆمەڵێ لەهاوەڵان فەرموودەكانی ئەو دەگێڕنەوە، وەك: ئیبنو عەبباس‌و جابیر لە (٢٤) بیست‌و چواری كۆچیدا كۆچی دوایی كردووە، یەك فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە.

١١٢- وَعَنْ عِيسَى بْنِ يَزْدَادَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلْيَنْثُرْ ذَكَرَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَه بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{ابن ماجه رقم/٣٢٦}:

عیسای كوڕی یەزداد فەرمووی: باوكم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ كەسێكتان میز دەكات، كەلە میزەكەی بۆوە، با سێ جار چووكی لە بنەوە، دادۆشێ‌و دەستی پیادا بهێنێ، تامیزی تیادا نەمێنێ‌و نەبی بەپاشمیز).

بەیهەقی بەڕشتە (سەنەد)ێكی لاواز گێڕاویەتەوە.

(ڕوونكردنەوە):

یەزدادی كوڕی فەسائەی فارسی، بە (ازداد)ی كوڕی فەسائەیش ناودەبرێ، هەندێ بەهاوەڵی دائەنێن، هەندێ بەتابیعی، بەلاواز دائەنرێ، چونكە هەم عیساو هەم یەزدادی باوكی، نەناسراون، بەس عیسای كوڕی گێڕانەوەی لەوەوە هەیە.

١١٣- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَأَلَ أَهْلَ قُبَاءٍ، فَقَال: إنَّ الله يُثْنِي عليكُمْ فَقَالُوا: إِنَّا نُتْبِعُ اَلْحِجَارَةَ اَلْمَاءَ} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ. وَأَصْلُهُ فِي أَبِي دَاوُدَ والترمذى.

{أَوْرَدَهُ الهَيْثَمِيُ فِي مَجْمَعِ الزَّوائِدِ (٢١٢/١) وَعَزَاهُ لِلبَزاز... وَأَصْلُهُ في سُنَنِ أَبـي داودَ برقم: ٤٤ وَالتِّرْمَذِيُّ برَقَم ٣١٠٠}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەڵكی قوبائی پرسی: (خودای گەورە لە قورئانی

پیرۆزدا، بەم ئایەتە وەسپێکی جوانی ئێوە دەکا، هۆی ئەوە چییە؟ خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ – التوبة/١٠٨}.

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: (ئەو مزگەوتەی کەلە سەفەری کۆچتا، پێش ئەوەی کە بگەیتە مەدینە، لەخاکی قوباء دروستت کرد، کە لەسەرەتاوە بناغەی لەسەر تەقواو ترسی خودا دانراوە، ئەوە شایانی ئەوەیە کەتۆ، ئەی محمد! خوداپەرستیو نوێژی تیادا بکەی، ئەم مزگەوتە سەرەڕای ئەوەیش چاکەیەکی تری هەیە: کۆمەڵێ پیاوی مەردی موسوڵمانی ساغی پاكو تەمیزی واتیادا، حەز بەپاکی دڵو دەروونو دەستو جلو بەرگو جێو شوێن دەکەن، لەبێ دەسنوێژیو لەشپیسیو لەشگرانی دوورن، بەسە بۆ سەربەرزی ئەوان کە خودا ئەو کەسانەی خۆشدەوێ، کە حەزیان لەپاکیو خاوێنییەو خۆیان پاكو خاوێن ڕادەگرن!).

ئەوانیش عەرزی حەزرەتیان کرد: (ئەوە لەبەر ئەوەیە، لەپاش سەراوکردن، لەپێشا خۆمان بەبەرد پاك دەکەینەوە، ئەوسا بەئاویش تارەت دەگرین). ئیمامی بەزار (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕشتەیەکی لاواز گێڕاویەتەوە، بنەما (ئەصل)ی ئەم فەرموودەیە لە سونەنی ئەبو داوودا هەیە، بەژمارە (٤٤) هەروا لە سونەنی تەرمەزیدا، بەژمارە (٣١٠٠) هەیە، ئاوا: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ} لەپەسنو مەدحی خەڵکی قوبادا هاتەخوارەوە، لەبەر ئەوە کە تاراتیان بەئاو دەگرت!). {تاج/٤ زنجیرە: ١٠ ژمارە: ٣٩١٠ ج/٤}.

١١٤- وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْـهُ) بِـدُونِ ذِكْرِ اَلْحِجَارَةِ).

{أخرجه ابن خزيمة برقم: ٨٣ وابن ماجه برقم: ٣٧٥}:

ئیبنـو خوزەیمـەیش (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ئـەم فەرموودەیـەی لـە ئەبو هـورەیرەوە گێڕاوەتـەوە، بەصـەحیحی دانـاوە، بـەڵام لەگێڕانـەوەی ئـەبو هورەیرەدا، خـەڵکی قوبـاء لەوەڵامەکەیانـدا، باسـی خۆپاککردنـەوە بەبـەردیان نەکردووە، تەنیا ئەوەیان گوتووە: (کەتارات بەئاو دەگرین!)

(ڕوونکردنەوە):

( پوختەی بڕیارەکانی ئەم باسە )

١- شتی پیرۆز وەك کتێبی ئایینیو شتی وا، نەبرێتە ناو ئاودەست، مەگەر لەبەر ناچاری، بەڵام ئەگەر مەترسی فەوتان یادزینی هەبوو، مۆڵەت دەدرێ، وەك: قوتابی ئەگەر جانتاکەی لەدەرەوە دابنێ، تا سەراوەکەی دەکا، لەوانەیە بدزرێ.

٢- سـوننەتە نـزای تایبـەتی چـوونە نـاو ئاودەسـت لـەکاتی چـوونە ژوورەوەدا، یان لەپێش دانیشتندا، ئەگەر لەئاودەستا نەبوو، بخوێنێ، ئەمەیش بەپێی سەراوی گەورەو بچووك جیاوازی هەیە.

٣- کەسەراوەکەی تەواو کرد نزای تایبەت کە (غُفْرَانَكَ)ەیە بخوێنێ.

٤- سەراوەکە لەشوێنێکی وادا نەبێ، کەببێ بەمایەی ئازار بۆ خەڵك.

٥- داپۆشینی شەرمگا لەکاتی سەراوداو خۆپەنادان لەکاتی سەراودا.

٦- قسە نەکردن لەو کاتەدا.

٧- دەست نەگرێ بە چووکیەوە.

٨- لەسارادا ڕوونەکاتە ڕووگەو پشتیشی تێ نەکا.

٩- بەدەستی ڕاست تارات نەگرێ، مەگەر لەبەر ناچاری.

١٠- دروسته تارات به بەرد بگیرێ، بەلاّم ژمارەی بەردەكان نابێ لەسێ بەرد كەمتربن. بەهەموو شتێكی رەقی پاكەوەكەر دروستە خۆپاككردنەوە، بەلاّم بەئێسكو شتی پیسو بەشتی بەرێز، وەك: نانو خۆراك، خۆپاككردنەوە دروست نییە.

١١- لەكاتی دانیشتندا، بۆ پێشاو، هێزبداتە سەر قاچی چەپی.

١٢- دەست هێنان بەچووكداو، دادۆشینی لەپاش میز، كە لە زاراوی شەرعدا، پێی دەگوترێ: (استبراء) زۆرباشە، هەتا بەتەواوی خۆی لەپاشمیز بپارێزێ.

١٣- كۆی فەرموودەكانی ئەم باسە، بەپێی تەرقیمو ژمارە بۆ دانانی {بُلُوغُ المرام من أَدِلَّةِ الأَحْكَامِ تأليف الحافظ بن حجر العسقلاني عُنِيَ بتصحيحه والتعليق عليه محمد حامد الفقي من علماء الأزهر} بیستو دوو فەرموودەیە، لەژمارە (٩٢)وە هەتا ژمارە (١١٤) ئاوا: (١١٤ — ٩٢ = ٢٢).

## ٨- باسی خۆشۆردن (غوسڵ)و بڕیاری لەشگران
## باب: الغُسْلُ وَحُكْمُ الجُنُبِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان زنجیرە (١٤) + تاج/١ زنجیرە/٣٠و ٣١و ٣٢}

١١٥ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْمَاءُ مِنْ اَلْمَاءِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{مسلم ٣٤٣ = ٧٧٣ شيحا = ١٥١ پوختەی موسلیم. پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ١٣٦ = ١٨٠ فتح الباری بشرح صحيح البخاری}:

عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: باوكم فەرمووی: جارێ رۆژی دووشەممە بوو، لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆ شاری قوباء، هەتا گەیشتینە ناو خێڵی بەنی سەلیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەردەرگای عیتبان ڕاوەستاو

بەدەنگی بەرز بانگی کرد، عیتبان هاتە دەرەوە، لەپەلەپەلیدا، بەرکۆش (إزار)ەکەی بەکێش دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وادەرئەکەوێ ئەم پیاوە لەبەر پەلەپەل فریانەکەوتبێ ئیشەکەی جێبەجێ بکات).

عیتبان گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا خەریکی جوتبوون بووبێ، بەڵام ئاوی نەیەتەوە چی لەسەرە؟ فەرمووی: (ئاو لەئاوەوەیە). واتە: خۆشۆردن بەئاو هاتنەوە پێویست دەبێ).
{تاج/١ لاپەڕە: ١٤٥ چ/١ = لاپەڕە: ١٣٧ ژمارە: ٢٦١ زنجیرە: ٣٠ چ/٤}.

بنەما (ئەصڵ)ی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریدا ئاوایە:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن پیاوێکی ئەنصاریدا، کەهات بۆ خزمەتی، تازە خۆی شۆردبوو، هێشتا سەری ئاوی لێ دەتکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ڕەنگ بێ فریا نەکەوتبی لەبەر پەلەپەل ئیشەکەت تەواو بکەی؟). گوتی: بەڵێ، جوتبوونەکەم بۆ تەواو نەکرا، کەتۆ ناردت بەشوێنما یەکسەر خۆم شۆردو هاتم بۆ خزمەتت، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەرکاتێ جوتبوونت بۆ تەواو نەکراو ئاوت نەهاتەوە، بەس دەسنوێژت لەسەرە، خۆشۆردنی لەشپیسیت لەسەر نییە!).

(ڕوونکردنەوە):

ئەم بڕیارە لەپێشەوە وابووە، لەکاتی وادا خۆشۆردن پێویست نەبووە، بەڵام کاتێ ئیسلامەتی بەتەواوی دامەزرا، ئەم بڕیارە هەڵوەشایەوە، نەوەوی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (کۆی دەنگ (ئیجماع) هەیە لەسەر ئەوە کە خۆشۆردن پێویستە لەسەر مرۆڤ، هەرکاتێ سەری چووك چوو بەناو پێش

یـان بـەناو پاشـدا، هەرچـەندە هـیچ لایەکیـشیان رەحـەت نـەبن و ئاویـان نەیەتەوە).

١١٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللّٰـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا اَلْأَرْبَعِ، ثُمَّ جَهَدَهَا، فَقَدْ وَجَبَ اَلْغُسْلُ} . مُتَّفَـقٌ عَلَيْه.

{تەجریـدی بوخـاری/١ ژمـارە: ١٩٧ = ٢٩١ فـتح البـاری بـشرح صـحیح البخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ١٥٢ = ٧٨٣ شیحا = ٣٤٨ صحیح مـسلم. تحفـة الأشراف ١٤٦٥٩}:

ئەم فەرموودەیە، لەبوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوەیـە، بـەلاّم لەموسـلیمدا لەسەر ئەم شێوەیە، لەئەبو مووسای ئەشعەرییەوە:

ئـەبو مووسـا (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: سـەبارەت بـەم بابەتـە، کۆمەلێ لەکۆچکاران و لەیاریدەدەران (موهـاجرین و ئەنـصار) ڕاجیـایی کەوتـە نێوانیان، یاریدەدەران دەیانگوت: خۆشۆردن پێویست نابێ، لەکاتی جووتبوونا، هـەتا ئـاو نەیەتـەوە، بـەلاّم کۆچـکاران دەیـانگوت: بـەلکوو هـەرکاتێ چـووك ڕۆچوو بەشەرمگادا، ئیتر خۆشـۆردن پێویـست دەبـێ، فـەرمووی: ئـەبو مووسـا پێیانی فەرموو: من چاری ئەم پرسیارەتان بۆ دەکـەم، فـەرمووی: جـا هەلّـسام چووم بـۆ خزمـەتی دایکـە عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لـە پێغەمبەر و رەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) لەدەرگاوە مۆلّەتی چوونە ژوورەوەم خواسـت، کەبـچم بـۆ خزمـەتی، ڕێگـەم پێـدرا، عـەرزیم کـرد: ئـەی دایکە! یا عەرزیم کرد: ئەی دایکی موسـولّمانان! مـن دەمـەوێ پرسـیارێکت لێ بکـەم، بـەلاّم شـەرمت لێ دەکـەم، چـونکە پرسـیارەکە خـۆی شـەرماوییە، فەرمووی: (هەرپرسیارێ کەشەرم ناکەی کـە لـەو دایکـەتی بپرسـیت کـە لێـی بوویت و لەدامەنی کەوتوویتە خوارەوە، شەرم مەکە ئـەو پرسـیارەیش لـە مـن بکە، چونکە منیش بەپێی شەرعی خودا دایکتم. گوتم: خۆشۆردنی لەشپیـسی

بەچی پێویست دەبێ؟ فەرمووی: بەڕاستی لەکەسێکی شارەزات پرسی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ پیاو لەناو چوارپەلی ژندا، دانیشتو لەگەڵیا دروست بوو، بائاویشی نەیەتەوە، ئیتر خۆشۆردن لەسەر هەردوولا پێویست دەبێ).

١١٧- وَزَادَ مُسْلِمٌ: "وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ".

{صەحیحی موسلیم ژمارە: ٧٨١ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا}:

واتاکەی لەژمارە (١١٦)دا، لەپێشەوە ڕابورد.

١١٨- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ" أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ -وَهِيَ اِمْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ- قَالَتْ: { يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ اَللَّهَ لَا يَسْتَحِي مِنْ اَلْحَقِّ، فَهَلْ عَلَى اَلْمَرْأَةِ اَلْغُسْلُ إِذَا اِحْتَلَمَتْ؟ قَالَ: "نَعَمْ. إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ" } اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ١٠٥ = ١٣٠، ٢٨٢، ٣٣٢٨، ٦٠٩١، ٦١٢١ فتح الباری بشرح صحيح البخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ١٥٤ = ٧٠٧ شیحا = ٣١١، ٣١٢ صحیح موسلیم}:

ئیسحاقی کوڕی ئەبو طەلحە فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم سولەیم کە دایکی (ئەنەس بوو، وەنەنکی ئەم ئیسحاقە بوو، کەناوی تەواوی: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای ئەبو طەلحە بوو) ئوم سولەیم هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا عائیشە لەوێ بوو، ئوم سولەیم بە پێغەمبەری فەرموو: ئەی پیغەمبەری خودا! خودا لەگوتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکا، وەقسەی ڕەوای پێ خۆشە، دەی چۆن پیاو لەخەونا شەیتانی دەبێ، ژنیش ڕێك وەك ئەو لەخەونا، شەیتانی دەبێو رەحەت دەبێو ئاوی دێتەوە، جا ئایا لەکاتی ئاوادا، ئەگەر ژنێ شەیتانی بوو، خۆشۆردنی لەسەرە یانا؟ خاتوو عائیشە هاوسەری پێغەمبەر، کەلەوێ ئامادە بوو، بەئوم سولەیمی فەرموو: ئەی ئوم سولەیم! وا وات لێ بێ، ئەم پرسیارە ناشیرینە چی بوو کردت، ئابڕووی ژنانت برد،

ئافرەتانت ریسوا کرد، چونکە نهێنی ئەوانت ئاشکرا کرد، پێغەمبەریش بەعائیشەی فەرموو: بەڵکوو تۆ وا وات لێ بێت، ئەم پرسیارەی ئوم سولەیم جێگەی خۆیەتی، پرسیارێکی ڕەوایە، هیچ نەنگو شوورەیی نییە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئوم سولەیمی فەرموو: (بەڵێ، ئەی ئوم سولەیم! ئەگەر ژن خەونی وای بینیو شەیتانی بوو، وەئاوی هاتەوەو رەحەت بوو، لەو خەونەدا، ئەوە بەپێی شەرع، لەشی پیس دەبێو خۆشۆردنی لەشپیسی لەسەرە، کەواتە باخۆی بشۆرێو لەبارودۆخی ئاوادا، با لەشپیسی خۆی دەربکا). {تاج/١ زنجیرە: ٣٠ ژمارە: ٢٦٢ لاپەڕە: ١٣٧ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەمە دەقی وەرگەڕاوی پوختەی موسلیمە، ژمارە: ١٥٤ = ٧٠٧ ترقیم شێخ خلیل.. شیحا.

٢- ئیسحاق کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحەیە، ئەبو طەلحە مێردی ئوم سولەیمە، کەدایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە، دایکبرای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحەیە، کەواتە ئەنەس مامی دایکی ئیسحاقیشە، ئەبو طەلحە زڕبابی ئەنەسی کوڕی مالیکە، چونکە مێردی ئوم سولەیمە.

١١٩- زَادَ مُسْلِمٌ: فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ. {وَهَلْ يَكُونُ هَذَا؟ قَالَ: "نَعَمْ فَمِنْ أَيْنَ يَكُونُ اَلشَّبَهُ؟} .

ئەمەدەقی ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیما، ژمارە (٧١٠) بەپێی ژمارە دانانی مامۆستا شێخ خەلیل مەئمون شیحا، دەفەرموێ:

زینەبی کچی ئەبو سەلەمە، فەرمووی: ئوم سەلەمەی دایکم فەرمووی: ئوم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! خودا لەگوتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکا، کەوابوو: ئایا ئەگەر ژن شەیتانی بوو، خۆشتنی

لەسەرە یا نا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر ئاوی بێتەوەو هەستی پێ بکا).

ئوم سەلەمەیش، کەدایکی زەینەبەو هاوسەری پێغەمبەرە، لەوێ بوو، فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! بۆچی ئافرەتیش شەیتانی دەبێ؟! فەرمووی: (هەژارۆکە! ئەی چۆن؟ بەڵێ شەیتانی دەبێ، ئەی ئەگەر شەیتانی نابێت و ئاوی نایەتەوە، ئەی بەچی شێوەی منالەکەی دەچێتەوە سەریو منال لەزۆر ڕووەوە، شێوەو شکلی لەخالۆانی دەکا) {تاج/١ زنجیرە/٣٠ ژمارە: ٢٦٤}.

(ڕوونکردنەوە):

زەینەب کچی ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەدی هیلالی مەخزوومییە، دایکی ناوی (هیندی کچی ئەبو ئومەییە)یە ناسراوە بە ئوم سەلەمە، بڕوانە ژمارە (١٩ - ڕوونکردنەوە) بۆ ژیاننامەی ئوم سەلەمە کە لە پێشەوە رابورد. زەینەب لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، لەوکاتەدا کەدایكو باوکی لەتاو ستەمی بێباوەڕەکان کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە. لەپێشا زەینەب ناوی (بەررە) بوو، پێغەمبەر گۆڕی بەزەینەب، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو لەدایکیو لەعائیشەو لەزەینەبی کچی جەحشو ئوم حەبیبەوە هەیە، کە ئەم چوارە هەرچواریان هاوسەری پێغەمبەرنو دایکی باوەڕدارانن، کۆمەڵێکیش فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ساڵی حەفتاو سێی کۆچی مردووە، لەناو ژنانی مەدینەدا، شەرعزانی وەك ئەم زەینەبەیان تیادا نەبووە.

١٢٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَغْتَسِلُ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ اَلْجَنَابَةِ، وَيَوْمَ اَلْجُمُعَةِ، وَمِنْ اَلْحِجَامَةِ، وَمِنْ غُسْلِ اَلْمَيِّتِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أبوداود/٣٤٨. إبن خزيمة ٢٥٦. أحمد/٦/١٥٢}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم چوار شتە خۆی دەشۆرد:

یەکەم: بۆ لەشپیسیو لەشگرانی.

دووەم: بۆ رۆژی هەینی.

سێیەم: بۆ کەڵەشاخگرتنو خوێن بەردان.

چوارەم: بۆ شۆردنی مردوو.

١٢١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { -فِي قِصَّةِ ثُمَامَةَ بْنِ أُثَالٍ، عِنْدَمَا أَسْلَمَ- وَأَمَرَهُ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يَغْتَسِلَ} رَوَاهُ عَبْدُ الرَّزَّاق. وَأَصْلُهُ مُتَّفَقٌ عَلَيْه .

{عبدوالرزاق ٩٨٣٤. تەجرید/٤، لاپەڕە: ٣٥٩، ژمارە: ١٦٠٧ = بوخاری ٤٦٢، ٢٤٢٢، ٢٤٢٣، ٤٣٧٢، ٤٦٢٠، ٤٦٩٠ فتح الباری. موسلیم ١٧٦٤ = ٤٥٦٤ تەرقیمی شیحا، تحفة الأشراف/١٣٠٠٧، پوختەی صەحیحی موسلیم ١١٥٢}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی صەحیحی بوخاریدا، ژمارە: ١٦٠٧ بەرگی چوارەم، لاپەڕە/٣٥٩ چاپی یەکەم، ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) برِکەیێ سواری بەرەو نەجد نارد، کە هاتنەوە پیاوێکی بەنی حەنیفەییان دیل کردبوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ناوی سومامەی کوڕی ئوثال بوو، سەر گەورەی خەڵکی یەمامە بوو، جا لەبەر ئەوەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا، بەندیخانەیان نەبوو، چونکە حوکمیان تابلێی سادە بوو، پڕدادو عەدالەت بوو، پێویستیان بەپۆلیسو کەلەپچەو زیندان نەبوو، لەبەر ئەوە پیاوە دیلەکەیان بەستەوە بەیەکێ لەکۆڵەکەکانی مزگەوتەوە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلایو پێی فەرموو: (ئەی ثومامە! پێت وایە چیت لێ دەکەم؟ ئەویش گوتی: ئەی محمد! ئومێدی خێرت لێ دەکەم، چونکە تۆ پیاوێکی حەقانیت، لەبەر ئەوە، ئەوەی کە تۆ بیکوژیت، شایانی کوشتنە، وە ئەوەی کە تۆ پیاوەتی لەگەڵدا بکەی، مایەی سوپاسو

شانازییه بۆی، خۆ ئەگەر پارەو ماڵیشت دەوێ، چەندە حەز دەکەی داوا بکە پێتی دەدەم).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وازی لێ هێناو بۆ دووسبەی، فەرموویەوە پێی (ئەی ثومامە! پێت وایە چیت لێ دەکەم؟) ئەویش گوتی: هەر ئەوەیە کەپێم گوتیت!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو رۆژەیش وازی لێ هێنایەوەو بۆ سبەینێ، فەرموویەوە (ئەی ثومامە! لات وایە چیت لێ دەکەم؟) گوتی: هەر ئەوەیە کە ئەو رۆژە پیم گووتیت: ئومێدی خێرت لێ دەکەم، چونکە ئەوەی کە تۆ دەیکوژی شایانی کوشتنە، وە ئەوەی کە تۆ پیاوەتی لەگەڵ بکەی مایەی سوپاسکردنە، کەواتە بۆ منیش چی بمکوژیت‌و چی پیاوەتیم لەگەڵ بکەیت جێگەی خۆیەتی، خۆ ئەگەر دەتەوێ بەپارەو سامانیش بەرم بدەیت چەندەت دەوێ داوا بکە دەیدەم پێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ثومامە بەردەن).

ثومامە ڕۆیشت لەناو باخە خورمایەکا، کە لەنزیکی مزگەوتەوە بوو، خۆی شۆردو لەپاشان هاتەوە بۆ مزگەوت‌و فەرمووی: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».

ئەی محمد! بەزاتی خودا، لەمەوپێش کەس نەبوو لەسەر رووی زەوی، کە بەقەد تۆ ڕقم لێی بێ، بەڵام ئێستاکە، کەس نییە کە بەقەد تۆ خۆشم بوێ، هەروا ئایینەکەت‌و وڵاتەکەیشت، بەزاتێ کەزاتی خودایە، وڵات نەبووە کە بەقەد وڵاتەکەی تۆ ڕقم لێی بێ، بەڵام ئێستا وڵاتەکەی تۆ، خۆشەویستترین وڵاتە بەلامەوە، من لەو کاتەدا کە سوارەکانی تۆ منیان گرت، من دەمویست بچم عەمرە بکەم، بۆ ئەمە چی دەفەرمووی؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) مزگێنی داپێی‌و فەرمانی پێی کرد کەبچێ عەمرەکەی بکا.

جا کەدەچێ بۆ مەککە، یەکێ پێی دەڵێ: ئەوە لەئایینی خۆت وەرگەڕاویت‌و بوویت بەصابیئی (واتە: موسوڵمان).

ثومامە پێی دەفەرموێ: نەخێر، نەبووم بەصابیئی، بەڵام موسوڵمان بووم‌و ئایینی ڕاست‌و دروستی خودام وەرگرتووە، کە دینی موحەممەدە، دەسا بەزاتی خودا، تا ئێوە لەسەر ئەم بارودۆخە ناحەزانە بن لەگەڵ ئیسلامدا، یەك دەنگ گەنم چییە، لەوڵاتی یەمامەوە نایێ بۆتان، مەگەر ڕەزامەندیی پێغەمبەری لەسەر بێ! {تاج/٤ زنجیرە: ٧٠ ژمارە: ٤٥٣٨ ج/٤}.

١٢٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {غُسْلُ يَوْمِ اَلْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ} أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَة.

{بخاری ٨٥٨، ٨٧٩، ٨٨٠، ٨٩٥، ٢٦٦٥ = ٤٦٢ پوختەی بوخاری/١. مسلم ٨٤٦ = پوختەی موسلیم/١ ژمارە: ٤٠٥ = ١٩٧٥، ١٩٥٤ صحیح مسلم بشرح النووی ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا. أحمد ٣/٦٠. أبوداود ٣٤١. نسائی ٣/٨٩. ابن ماجه ١٠٨٩. تحفة الأشراف ٤١٦١. ترمذی ٤٩٧}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ڕەسیدە). ئەمە دەقی پوختەی بوخاری ژمارە: ٤٦٢ بوو، لەپوختەی موسلیمیشدا ئاوایە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ڕەسیدە، هەروا سیواك، هەروا بۆنی خۆش لەخۆدان، بەپێی توانا). {تاج/١ زنجیرە: ١٤٣ ژمارە: ٨٣٦}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەوشەی پێویست (واجب) لەم فەرموودەیەدا، واجبی بەواتا فەرزی بەرابەر سوننەت نییە، بەڵکوو مەبەست لێی جەخت کردنە لەسەر ئەوە کە ئەم شتانە لەرۆژی هەینیدا، زۆر زۆر سوننەتێکی دامەزراوی گەورەن.

١٢٣- وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنْ اِغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ}. رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{أحمد ٥/١٨. أبوداود/٣٥٤. ترمذی ٤٩٧. ابن ماجه ١٠٩١. نسائی ١٣٨٠. بیهقی ٥٤٥٩}:

سەمووورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کە لەرۆژی هەینیدا، بۆ نوێژی هەینی تەنیا دەسنوێژ دەگرێ، ئەوە بەپیی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەفتار دەکا، ئەمەیش ئیشێکی گەلێ جوانو شیرینە، ئەوەیشی خۆی دەشوا، دیارە کەخۆشۆردن خێرترە). {تاج/١ زنجیرە/١٤٣ ژمارە: ٨٣٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- سەمووورەی کوڕی جوندوب هاوەڵی پێغەمبەرە، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: فەرموودەی لە بوخاریو موسلیمدا هەیە، سەدو بیستو سێ (١٢٣) فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، کەسناوی: ئەبو سەعیدو ئەبو عەبدوڵلاو ئەبو سولەیمانو ئەبو موحەممەدو ئەبو عەبدولڕحمان بوو، سوێندخوار (حەلیف)ی ئەنصار بوو، لەکووفە نیشتەجێ بوو، ماوەیە کارمەندی سەر بەصرە بوو، زۆر توندوتیژ بوو بەرامبەر بە (الحَرُورِيَّه)کان، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان ڕاگوێز کردووە: سەلمانی

کوڕی عیمرانی کوڕی حوصەینو حەسەنی بەصریو شەعبیو عەلی کوڕی ڕەبیعە، لەکۆتایی ساڵی (٥٩) پەنجاو نۆی کۆچی لەبەصرە مردووە، بەمردنی خودا (بڕوانە: پوختەی موسلیم/١ ژمارە: ٤٧٤).

٢- ئەم فەرموودەیە لەلای تەرمەزی لە پلەی (حەسەن)دایە.

١٢٤- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُقْرِئُنَا اَلْقُرْآنَ مَا لَمْ يَكُنْ جُنُبًا} . رَوَاهُ أحمدُ وَاَلْخَمْسَةُ، وَهَذَا لَفْظُ اَلتِّرْمِذِيِّ وَحَسَّنَهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود ٢٢٩. نسائى ١/١٤٤. ترمذى رقم ١٤٦. ابن ماجه رقم: ٥٩٤. أحمد ١/٨٣، ٨٤، ١٠٧، ١٢٤. بيهقى ١/٨٨. ابن حبان رقم ٧٩٩، ٨٠٠. ابن خزيمة رقم: ٢٠٨، دارقطنى ١/١١٩}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، بەلەشی گرانەوە نەبێ، لەهەموو بارودۆخێکی تردا دەرسی قورئانی پێ دەگوتین. واتە: کە لەشی پیس بوایە دەرسی قورئانی پێ نەدەگوتین. (تاج/١ زنجیرە/٣٢ ژمارە: ٢٨٩).

١٢٥- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُمَا وُضُوءًا} رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم، ژمارە: ١٦٤ بەرگی/١ = ٧٠٥ شیحا. أبوداود. (١/٥٦ رقم: ٢٢٠) + الوضوء لمن أراد العود ٣٢٠. صحيح مسلم ٣٠٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێکتان ڕۆیشتە لای حەلاڵو هاوسەری خۆیو، لەپاشا ویستی دووبارەی بکاتەوە، با لەنێوانی هەردوو جارێکا، دەستنوێژێ تەواو بگرێ، وەك دەسنوێژی نوێژ) {تاج/١ زنجیرە/٣٢ ژمارە: ٢٨٧}.

١٢٦- وَزَادَ اَلْحَاكِمُ: {فَإِنَّهُ أَنْشَطُ لِلْعَوْدِ}. {الحاكم ١/٢٥٤ رقم ٥٤٢. وَقَالَ: صحيح عَلَى شَرْطِ الشيخين وَ وَافقَهُ الذَّهبيُّ}:

**حاكم (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەمەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە: (چونکە دەسنوێژەکە چالاکتری دەکا بۆ دووبارە کردنەوە!)**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- ئەمە بۆ ژنەکەیش و پیاوەکەیش سوننەتە، کە لەنێوانی دووبارە کردنەوەی سەرجێییدا دەستنوێژێ بگرن.**

**٢- ژن ئەگەر لە بێ نوێژیدا بێ، ئەگەر چی نادروستە پیاوەکەی بچێتە لای، بەڵام ئەگەر شتی وا ڕوویدا، بۆ هەردوو لایان دیسان ئەم دەسنوێژە، لەم نێوانەدا، سوننەتە. تەنانەت پیاو ئەگەر دوو ژنی هەبوو، ویستی لەگەڵ ژنەکەی تریشیدا، دووبارەی بکاتەوە، دیسان سوننەتە بۆی دەسنوێژ بگرێ، بگرە لەکاتی وادا دەسنوێژ سوننەتترە.**

١٢٧- وَلِلْأَرْبَعَةِ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَنَامُ وَهُوَ جُنُبٌ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَمَسَّ مَاءً}. وَهُوَ مَعْلُولٌ.

{أبوداود/٢٢٨. ترمذی/١١٨. نسائی (١/١٣٩) ابن ماجه رقم/٥٨١}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) دەفەرموێ:**

**(جاری وادەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلەشی پیسەوە دەخەوت، وە ئەوەی کەپێی بڵێیت ئاو، نەبۆ دەسنوێژ، نەبۆ خۆشۆردنی دەرکردنی لەشپیسی بەکاری نەدەهێنا، لەپێش خەوتنەکەدا).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بێ ملامەت نییەو زۆر جێگەی متمانە نییە. واتە: مەعلوولە... تاد.**

جا لەبەر ئەوە، مرۆڤ واباشە کار بەم فەرموودەیەی ئیمامی موسلیم بکات: (پوختەی موسلیم ژمارە: ١٦٢ = ٦٩٨ مسلم. حیض):

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەشی گران بوایە، واتە: جەنابەتی لەسەر بوایە، کە دەیویست شت بخوات، یا بخەوێ، دەسنوێژێکی دەگرت، ڕێك وەك دەسنوێژی نوێژ). (تاج/١ زنجیرە/٣٢ ژمارە: ٢٨٤).

١٢٨- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا اِغْتَسَلَ مِنْ اَلْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَأْخُذُ اَلْمَاءَ، فَيُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي أُصُولِ اَلشَّعْرِ، ثُمَّ حَفَنَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِم.

{پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ١٧٩ = ٢٤٨، ٢٦٣، ٢٧٢ فتح الباری. پوختەی موسلیم ١٥٥ = ٧٢٠، ٧١٦ موسلیم. طهارة}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کەبۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، لەپێشا هەردوو دەستی دەشۆرد، تا مووچەکانی، ئەوجا بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بەدەستی چەپیاو، ناوگەڵی خۆی دەشۆرد، ئەوجا دەسنوێژێکی دەگرت و پەنجەی دەخستە بن مووەکانی سەری، تا دەیزانی کەوا تەواو تەڕ بوون، ئەوجا سێ مشت ئاوی دەکرد بەسەر سەریا، لەپاشا سەراپا باقی مەندەی لەشی خۆی دەشۆرد، لەپاشا هەردوو قاچیشی دەشۆرد). {تاج/١ زنجیرە/٣٢ ژمارە: ٢٧٨}.

١٢٩- وَلَهُمَا فِي حَدِيثِ مَيْمُونَةَ: {ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى فَرْجِهِ، فَغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِهَا اَلْأَرْضَ}.

{بخاری/ ٢٤٩. پوختەی موسلیم/ ١٥٥ = ٧٢٠ شیحا = موسلیم/ ٣١٧ = تەجریدی بوخاری/١ ژمارە: ١٨٠ = ٢٤٩، ٢٥٧، ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٧٤، ٢٧٦، ٢٨١}:

**ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لەپوختەی موسلیمدا (ژمارە: ١٥٥):**

**مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاوی خۆشۆردنی لەشپیسیم، بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانا، لەپێشا دووجار، یاسێ جار، هەردوو دەستی خۆی لەدەرەوەی دەفرەکەدا شۆرد، ئەوجا دەستی کرد بەناو دەفرەکەداو ئاوی کرد بەدەستی چەپیداو، ناوگەڵی خۆی بەدەستی چەپی شۆرد، لەپاشا بەزەوییەکە دەستی خۆی زۆرباش سڕیو، شوێنەواری چەپڵییەکەی لێ کردەوە، هەتا بەتەواوی شوێنەواری تارات گرتنەکە بەدەستیەوە نەما، ئەوجا دەسنوێژێکی گرت، وەك دەسنوێژی نوێژ، ئەوجا دەستی کرد بەخۆشۆردنو، لەپێشا سێ مستی کرد بەسەر سەری خۆیدا، کە هەرمستێ پڕ هەردوو لوێچە، کەبنرێن بەیەکەوە، ئەوجا گشت لەشی خۆی شۆرد، ئەوجا شوێنەکەی خۆی گۆڕیو لەجێگە تازەکەیدا هەردوو قاچی خۆی شۆرد، ئەوجا منیش خاولییەکم هێنا بۆی، کەخۆی پێ وشك بکاتەوە، بەڵام خاولییەکەی نەویست!). {تاج/١ زنجیرە: ٣٢ ژمارە: ٢٧٧}.**

**١٣٠- وَفِي رِوَايَةٍ: {فَمَسَحَهَا بِالتُّرَابِ}. وَفِي آخِرِهِ: {ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِالْمِنْدِيلِ} فَرَدَّهُ، وَفِيهِ: {وَجَعَلَ يَنْفُضُ الْمَاءَ بِيَدِهِ}.**

{بوخاری. لاپەڕە: ٢٦٠، مسلم ٧٢٠، ٧٦٥ شیحا}:

**لەکۆتایی ئەم گێڕانەوەیەدا، مەیموونە دەفەرموێ: جا منیش پەڕۆیەکم بۆی هێنا، کەخۆی پێ وشك بکاتەوە، بەڵام پەڕۆکەی نەویست، وە ئاوەکەی بەدەستی لە لەشی خۆی داتەکاند). {تاج/١ زنجیرە: ٣٢ ژمارە: ٢٧٧}.**

١٣١- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ إِنِّي اِمْرَأَةٌ أَشُدُّ شَعْرَ رَأْسِي، أَفَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ اَلْجَنَابَةِ؟ وَفِي رِوَايَةٍ: وَالْحَيْضَةِ؟ فَقَالَ: "لَا، إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ"}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم. غوسل ٧٤٢ ترقيم شيحا = ٣٠٣ صحيح مسلم}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئافرەتم، پەلکەکانم توند شەتەك دەدەم، جا ئایا بۆ خۆشۆردنی لەشپیسی، چی هی دروستبوونو جووتبوون، وەچی هی پاش پاکبوونەوە لەبێ نوێژی، پەلکەکانم هەڵوەشێنمەوە یانا؟ فەرمووی: (نەء، پێویست بەوە ناکا، تەنیا ئەوەندەت بەسە کەسێ مشت ئاو بکە بەسەر سەرتاو باش قژو کەزییەکانت هەڵگلۆفەو ئینجا سەراپا ئاو بکە بەسەر خۆتا، ئیتر پاك دەبیتەوە). {تاج/١ زنجیرە: ٣٢ ژمارە: ٢٧٩}.

١٣٢- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنِّي لَا أُحِلُّ اَلْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلَا جُنُبٌ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أبوداود في سننه برقم ٢٣٢. وابن خزيمة برقم ١٣٢٧}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەرگای ماڵەکانتان لەسەر ناوماڵی مزگەوت لابەرن، چونکە من، بەفەرمانی خودا، چوونە ناو مزگەوتو هاموشۆی ناو مزگەوت، ڕەوانابینم، نەبۆ ژنی بێنوژو نەبۆ مرۆڤی لەشپیس!) {تاج/١ زنجیرە/٣٥ ژمارە: ٣٠٣}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەسەردەمی پێغەمبەردا، زۆر ماڵ، دەرگایان لەناو ماڵی مزگەوتا بوون وەك هۆدەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر، وەك ئەبوبکر، کە دەرگایەکی

لەسەر ماڵی مزگەوتەکە بوو، وەك زۆر کەسی تر، وەك لە فەرموودەیەکی بوخاری‌و موسلیمدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (... هەردەرگایەك لەسەر مزگەوتە دەبێ بگیرێ، تەنیا دەرگاکەی ئەبوبکر نەبێ...) {بڕوانە: تاج/١ زنجیرە/٣٣ ژمارە: ٢٩١ + تاج/٣ زنجیرە: ٣ ژمارە: ٣٢٣٤ چاپی چوارەم}.

٢- هەبوونی دەرگا لەسەر حەوشەی مزگەوت زیانی نییە.

٣- ئەم فەرموودەیە ئیبنو خوزەیمە بە تەندروستی داناوە.

١٣٣- وَعَنْهَا (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: {كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا فيه مِنَ الجنانة)). {متفق عليه. وَزَادَ ابن حِبَّان: ((وَتَلْتَقِي أيْدِينا))}.

{پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ١٨٦ = ٢٦١ فتح الباری. مسلم ٣١٩ = ٧٢٩ مسلم تخريج شيحا}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی بێ) فەرمووی: جاران من‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرجار، کە لەشمان گران بوایە، بەیەکەوە لەیەك دەفر خۆمان دەشۆرد، جاری وادەبوو ڕێدەکەوت، لەناو دەفرەکەدا دەستمان بەرەنگاری یەکتری دەبوون، یەکێکمان ئاوی لەدەستتا بوو لەدەفرەکە دەری دەهێناو ئەوی ترمان دەستی خاڵی بوو دەستی دەبرد کە ئاو دەربهێنێ). ئیبنو حەببان لەگێڕانەوەی خۆیدا (ئیبنو حبان/١١١١) ئەمەی پترە: (دەستمان لەناو دەفرەکەدا دەیدا لەیەکتری). {تاج/١ زنجیرە: ٢١ ژمارە: ١٥٢، ١٥٣ ج/٤}.

١٣٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ تَحْتَ كُلِّ شَعْرَةٍ جَنَابَةً، فَاغْسِلُوا اَلشَّعْرَ، وَأَنْقُوا اَلْبَشَرَ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَضَعَّفَاه.

{أبوداود/ ٢٤٨. ترمذی ١٠٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەژێر هەموو موویەکا لەشپیسی هەیە، کەواتە موو باش بشۆرن‌و پێست تەواو خاوێن بکەنەوە لەکاتی غوسڵ کردندا). لەگێڕانەوەیەکدا: هەرکەسێ شوێنی تاقە یەك موو بهێڵێتەوەو نەیشۆرێ، لەکاتی خۆشۆردنی لەشپیسیدا ئەوە بەئاگری دۆزەخ واوای لێ دەکرێ!

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) سێ جار گوتی: دەسا من لەبەر ئەمەیە، کەوا شەڕم، بەستۆتە سەری خۆم، عەلی دەستووری وا بوو مووی خۆی هەڵ دەپاچی). {تاج/١ زنجیرە: ٣٢ ژمارە: ٢٨١ چ/٤}.

١٣٥- وَلِأَحْمَدَ عَنْ عَائِشَةَ نَحْوُهُ، وَفِيهِ رَاوٍ مَجْهُولٌ.

{المسند (٦/١١٠، ٢٥٤)}:

فەرموودەی ژمارە (١٣٤) کە ئەبو داوودو تەرمەزی گێڕاویانەتەوە خۆیان بەلاوازیان داناوە، فەرموودەی ژمارە (١٣٥)یش مەجهوولێکی وا تیادایە، واتە: هیچ.

ئەم باسی خۆشۆردنە (٢١) فەرموودەی لەخۆ گرتووە، بەپێی ئەو ژمارانەی کەبۆیان دانراوە، گەرچی زۆر لەژمارەکان دووبارەن. (١٣٥ – ١١٤ = ٢١) بیست‌و یەك فەرموودە.

## ( پوختەی بڕیارەکانی ئەم باسە )

١- هۆی سەرەکی لەشپیسبوون، رەحەتبوون‌و ئاوهاتنەوەیە، چی بۆ پیاو، چی بۆ ژن، هەروا تێچوونی ئەندامی نێرینە، بۆناو پێش، یان پاشی مرۆڤ، یان ئاژەڵ، ئاوی بێتەوە یانا.

٢- ژنیش وەك پیاو شەیتانی دەبێ‌و خۆشۆردنی دەکەوێتە سەر، ئەگەر هەستی بەڕەحەتبوون کرد.

٣- چەند جۆری لەخۆشۆردنی سوننەت (ژمارە: ١٢٠).

٤- كاتێ كەسێ ئیسلام دەبێ واباشە خۆشۆردن ئەنجام بدا.

٥- بەلەشی پیسەوە، ذیكرو یادی خوداو صەلاواتو شایەتمان دروستە، بەلام قورئانخوێندنو نوێژكردن دروست نییە. هەروا تەوافی بەیتو قورئانخوێندن.

٦- لەنێوانی دووجار جووتبوونی بەرودوادا دەسنوێژ سوننەتە.

٧- كەسێ لەشی گران بوو، ئەگەر ویستی بخەوێ، یان نان بخوات، با دەسنوێژ بگرێ.

٨- مانەوەی لەشپیس لەناو مزگەوتا نادروستە.

٩- واباشە دەرگای ماڵ لەسەر ماڵی مزگەوت نەبێ.

١٠- ژنو مێرد خۆیان بەیەكەوە بشۆرن دروستە.

## ٩- باسی تەیەممومی
## بَابُ: اَلتَّيَمُّمِ

١٣٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي اَلْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٍ أَدْرَكَتْهُ اَلصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ}. وَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ.

{متفق عليه. تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری/١ ژمارە: ٢١٧ = ٣٣٥، ٤٣٨، ٣١٢٢ فتح الباری. موسلیم. مەسجید: ١١٦٣، ١١٦٤ شیحا = مسلم ٥٢١ = ٢٥٧ پوختەی موسلیم}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجدا {تاج/١ زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٦، ج: ٤، لاپەڕە: ٢٩}.

ئەمە دەقەكەیەتی:

لــەجابیری كــوڕی عەبــدوڵڵاوە (ڕەزای خودایــان لێ بــێ) پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە ئەم پێنج بەهرەیەی بەمن داوە، لەپێش مندا، ئەم پێنجەی بەكەسی تر نەداوە:

یەكەم: تا ماوەی مانگە ڕێیەك دوژمن لەسامو شكۆی خۆمو لەشكرم زەندەقیان دەچێو ورە بەردەدەن، ئەمە بووە بەهۆی سەركەوتن بۆ ئێمە.

دووەم: سەر ڕووی زەوی هەموو بۆ ئێمە كراوە بە مزگەوتو خۆڵەكەی پاكەوەكەرە، كە ئاو نەبوو تەیەمومی پێ دەكەین، جا لەبەر ئەمە هەركەسێ لە ئۆمەتم لەهەرلا نوێژی لێ بوو، بانوێژی خۆی بكا، ئیتر مزگەوتو ئاو بوون، یان نەبوون قەیناكا، بەخۆڵ تەیەمموم بكاو لەسەر زەوییەكە بانوێژی خۆی بكا.

سێیەم:ماڵی تاڵانی كافرانیش بۆ من حەڵاڵ كراوە، لەپێش مندا بۆ كەسی تر حەڵاڵ نەبووە.

چوارەم: تكاو شەفاعەتم پێ خەڵاتكراوە، لەرۆژی قیامەتدا تكا دەكەم بۆ ئومەتم، بۆ خاسو خراپیان.

پێنجەم: جاران پێغەمبەرەكان، هەركەسەیان لەسەردەمی خۆیا، ڕەوانە دەكرا بۆ سەر هۆزەكەی خۆی بەتایبەتی، بەڵام من خودا ڕەوانەی كردووم بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد بەگشتی. {تاج/١ زنجیرە: ١١٤ ژمارە: ٦٧٨ ج/٤ = چاپی چوارەم} . لەژمارە: ٦٧٨دا لەدواوە ئەمەی پترە:

شەشەم: خودا كردوومی بەدوا پێغەمبەرو لەدوا من پێغەمبەری تر نابێ. (ش/ت/ن = بوخاریو موسلیمو تەرمەزیو نەسائی).

١٣٧- وَفِي حَدِيثِ حُذَيْفَةَ عِنْدَ مُسْلِمٍ: {وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُورًا، إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ} .

{مسلم ٥٢٢ = ١١٦٥ ترقيم شيحا}:

له حوذەیفەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێمەی گەلی ئیسلام بەم سێ خەڵاتە باودراوین بەسەر خەڵکانی تردا):

یەکەم: لەکاتی ڕیزبوون لەنوێژو لەبەرەی جەنگا، ڕیزەکانمان لەجۆری ڕیزی فریشتەکانە.

دووەم: سەر ڕووی زەوی گشتی بۆ ئێمە... لە فەرموودەکەی پێشەوە ڕابورد.

سێیەم: ڕاوی ئاماژەی بۆ دەکا، بەڵام نەیگوتووە، کەچی‌یە، ئەمەیە کە ئیبنو خوزەیمەو نەسائی گێڕاویانەتەوە، کە دەفەرموێ:

(ئەم سێ شتەم پێ خەڵاتکراوە کە لەم ئایەتانەی کۆتایی سوورەتی بەقەرەدا دیاریکراون، کەلە گەنجینەکەی ژێر تەختو بارەگا (عەرش)ی خوداوە!). پێم خەڵات کراون، کە مەبەست، ئەم سێ شتەیە، کە لەم ئایەتەدا خەڵات کراوە بەنەتەوەی ئیسلام:

١- خودا لەگوناهی هەڵەو لەبیرچوون خۆش بووە.

٢- خودا کاری نەکردنی، کە لەوزەی بەندەدا نەبێ، لەکەس داوا ناکا.

٣- کاری قورس‌و ئەرکی گران، ناخاتە سەر موسوڵمانان.

١٣٨- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عِنْدَ أَحْمَدَ: {وَجُعِلَ اَلتُّرَابُ لِي طَهُورًا}.

{أحمد ١/١٥٨}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم چوار بەهرەیەم پێ خەڵاتکراوە کە لەپێش مندا، بەهیچ پێغەمبەرێکی تر خەڵات نەکراوە):

یەکەم: کلیلەکانی زەویم پێ بەخشراون.

دووەم: نـاونـراوم ئەحمـەد، واتـە: پەسـەندو خـاوەنی ستایـشی جـوانو رەفتاری شیرین.

سێیەم: نەتەوەکەشم، بەدەقی ئایەتی {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّـةٍ أُخْرِجَـتْ لِلنَّـاسِ} باشترین نەتەوەن.

چوارەم: خـۆڵیش کـراوە بەپاکەوەکـەر بۆمـان، کـە ئـاو نـەبوو، لـەباتی دەسـنوێژ، تەیـەممومی پـێ دەکـەین، یـا لەشـگرانی خۆمـانی پـێ لادەبـەینو تەیەممومی پێ دەکەین، بەپێی بارودۆخ.

١٣٩- وَعَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: { بَعَثَنِي اَلنَّبِيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ اَلْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي اَلصَّعِيدِ كَمَـا تَمَـرَّغُ اَلدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَـالَ: "إِنَّمَـا كَـانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا" ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ اَلْـأَرْضَ ضَـرْبَةً وَاحِـدَةً، ثُـمَّ مَـسَحَ اَلشِّمَالَ عَلَى اَلْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخـاری/١ ژمـارە: ٢١٩ = ٣٣٨، ٣٣٩، ٣٤٠، ٣٤١، ٣٤٢، ٣٤٣، ٣٤٥، ٣٤٦، ٣٤٧ فـتح البـاری پوختـەی موسـلیم/١٦٦ = ٨١٦، ١١٨/ صەحیحی موسلیم تەخریجی شێخ خەلیل مەئموون شیحا = ٣٦٨ مسلم}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما، لەحەیضدا ئاوایە:

شـەقیق (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەت عەبـدوڵڵای کوڕی مەسعوودو ئەبو مووسای ئەشعەریدا دانیشتبووم، ئەبو مووسا بە ئیبنو مەسعوودی فەرموو: ئەی باوکی ئـەورەحمان! تـۆ ڕات چۆنەو چییە، بۆ ئـەم پرسیارە: گریمان پیاوێ، لەشی پیس بوو، لەشپیسی لەسەر بوو، وە ئاو نەبوو، تەنانەت ئەگەر هەتا مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ، کە دەسـنوێژ بگـرێ بـۆ نوێژ، چۆن نوێژ بکا؟

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: نابێ تەیەمموم بکا، ئەگەر مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێ، کەواتە: لەسەر رای ئیبنو مەسعوود، هەتا خۆی نەشۆرێ، نابێ بە تەیەمموم نوێژ بکا، لای حەنەفییەکانیش هەروایە.

ئەبو مووسا فەرمووی: ئەی ئەم ئایەتە چۆن کاری پێ دەکرێ، کە لە سورەتی مائیدەدایە، کە دەفەرموێ: {فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا} = (ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بەخۆڵێکی پاك تەیەمموم بکەنو نوێژی خۆتان بکەن!).

ئیبنو مەسعوود لەوەڵامی ئەم پرسیارەی ئەبو مووسادا فەرمووی: ئەگەر ئەو خەڵکە بەپێی ئەم ئایەتە مۆڵەت بدرێن، بۆ خۆشۆردنی لەشگرانیش، وەك بۆ دەسنوێژ مۆڵەت دەدرێن، دوور نییە هەرکە ئاو سارد بوو، بچن بەخۆڵ تەیەمموم بکەن، ئەبو مووسایش بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودی فەرموو: باشە ئەم فەرموودەیەی عەمماری کوڕی یاسرت نەبیستووە کە دەفەرموێ:

جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) منی نارد بۆ کارێ، لەرێ لەشم پیس بوو، خۆشۆردنی لەشپیسیم کەوتە سەر، وە ئاوم دەست نەکەوت بۆ خۆشۆردن، چووم خۆم لە خۆڵەپەتانیدا گەوزان، وەك چۆن وڵاخ لەخۆڵا خۆی دەگەوزێنێ ئاوا، لەپاشا هاتمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەمەم بۆ باسکرد، فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) تەنها ئاوەهات بەس بوو، کە بەدەست ئاوابکەی. ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی مالی بەزەوییەکەدا یەکجارو فووی لێ کردن، تاتۆزێ تۆزەکەیان سووك بێ، ئەوسا بەهەردوو ناولەپی مەسحی دەموچاوی هەردوو دەستی خۆی کرد}.

بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود فەرمووی: با ئاگام لەم داستانە هەیە، بەڵام ئەوە بوو ئیمامی عومەر، قەناعەتی بەم قسەیەی عەممار نەبوو).
{تاج/١ زنجیرە: ٤١ ژمارە: ٣١٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.
(ڕوونکردنەوە):

١- کاتێ ئاو نەبوو، یان ئاو لەحوکمی نەبوودا بوو، ئەوە دروستە بۆ لەشپیس، ژن بێ یان پیاو بێ، بەهەر هۆیێ لەشی پیس بووبێ، لەباتی دەسنوێژ تەیەمموم بکا، وەلەجیاتی خۆشۆردن تەیەمموم بکا، هەتا بەئاو خۆی دەشۆرێ.

٢- دروستە بۆ حەڵاڵو هاوسەر، لەگەڵ یەکتری دروست ببن، با سووریش بزانن کە ئاو نییە بۆ خۆشۆردن، لەکاتی وادا دەتوانن تەیەمموم بکەنو نوێژبکەن.

١٤٠ – وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: وَضَرَبَ بِكَفَّيْهِ اَلْأَرْضَ، وَنَفَخَ فِيهِمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ.

{تەخریجەکەیو واتاکەی لەژمارە: ١٣٩دا رابورد}. {تاج/١ زنجیرە: ٤١ ژمارە: ٣١٧ ج/٤}.

١٤١ – وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {التَّيَمُّمُ ضَرْبَتَانِ ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ، وَضَرْبَةٌ لِلْيَدَيْنِ إِلَى اَلْمِرْفَقَيْنِ}. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَ اَلْأَئِمَّةُ وَقْفَهُ.

{دارقطنی ١/١٠٨}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تەیەمموم دوو پیاکێشانە، یەکەمیان روخساری پێ مەسح دەکرێ، دووەمیان هەردوو دەستی پێ مەسح دەکرێ، هەتا هەردوو ئانیشك). دانەر حافیظی عەسقەلانی دەفەرموێ:

پێشەوایانی فەرمووده دەفەرموون: راستتر ئەوەیە، کە ئەمە قسەی ئیبنو عومەر خۆی بێ، فەرموودەی پێغەمبەر نەبێ). کە شتی وا لەزاراوی پسپۆرانی فەرموودەدا، پێی دەگوترێ: (وەقف لەسەر صەحابی).

١٤٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {اَلصَّعِيدُ وُضُوءُ اَلْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ اَلْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ اَلْمَاءَ فَلْيَتَّقِ اَللَّهَ، وَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ}. رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْقَطَّانِ، ولَكِنْ صَوَّبَ اَلدَّارَقُطْنِيُّ إِرْسَالَهُ.

{البزار في المسند (٢٦١/١)}:

ئەم گێڕانەوەیە لە ئەبو هورەیرەوەیە، گێڕانەوەی ژمارە (١٤٣) ئاوایە:

ئەبو ذەڕ (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆڵی پاك ئاوی دەسنوێژی موسوڵمانە، با دە ساڵیش لەسەر یەك ئاوی دەسنوێژی دەست نەکەوێ بۆ دەسنوێژ بەڵام هەرکاتێ ئاوی دەستکەوت، با لەخودا بترسێ، ئیتر واز لەتەیەمموم بهێنێو بەپێی فەرمانی خودا بەو ئاوە دەسنوێژی ئاسایی بگرێ). {تاج/١ زنجیرە: ٤٠ ژمارە: ٣١٤ ج/٤}.

١٤٣- وَلِلتِّرْمِذِيِّ: عَنْ أَبِي ذَرٍّ نَحْوُهُ، وَصَحَّحَه.

{ترمذی رقم: ١٢٤}:

واتاکەی لەژمارە (١٤٢)دا ڕابورد.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەبو ذەڕی غەفاری (رەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لەناودارانی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخۆی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من چوارەمین کەس بووم کە ئیسلام بووم، لەبەر زوهدو بێ هەوایی، ئەهلی حەدیث دەیشوبهێنن بە حەزرەتی عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوا جەنگی خەندەق لەمەدینە لە خزمەت حەزرەتدا مایەوە، هەتا حەزرەت وەفاتی کرد، بەپێی ڕێبازو بۆچوونی ئەبو ژەڕ: (نارەوایە بۆ

مـرۆڤ كـەپتر لەپێداويـستى خـۆى، مـاڵو سـامان پاشـەكەوت بكـاتو كەڵەكـەى بكات).

بۆيە لەم سەردەمەدا، لەناو هەواخوازانى ئيشتراكييەتدا پێى دەڵێن: (أَبو الإِشْتِراكِيَّةِ فِي الإِسْلاَمِ).

لەڕاســتيدا مــاڵو ســامان بەهرەيەكــە لەبــەهرە گــەورەكانى خــوداى ميهرەبان، ماڵى ڕەحمەت هەتا زۆر بێ كەمەو دەسمايەى دينو دونيايـە، هـەتا هەوڵى زياترى بۆ بـدەى جێگـەى خۆيـەتى، بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا، دەوڵـەتى ئيسلام مافى هەيە سيستەمى ماڵداريىو بوارى ئابوورى چاودێرى بكا، لەكاتى پێويستدا جڵەوى چڵێسى سەرمايەدارى بگرێو لەسنوورى خۆى ڕايبوەستێنێ.

ئەبو ذەڕ دووسـەدو هەشـتاو يـەك فـەرموودەى هەيـە، لەبوخاريـدا (١٤) چوارده فـەرموودەى هەيـە، لەموسـليمدا (٢٩) بيـستو نـۆ فـەرموودەى هەيـە، دوازدەيــان هــەردوولا لەســەرى كــۆكنو پەســەندى هــەردوو پــيرن، كــەپيرى بوخارىو موسليمن.

ئەبو ذەڕ ناوى جوندوبى كوڕى جونادەيە، لەهۆزى غيفارە كـە هـۆزێكى ناسراوى عەرەبە، يەكەم كەس بووە، كە بەسڵاوى ئيسلام سـڵاوو ڕۆژباشـى لـە پێغەمبەر كردووە. لە ڕەبـەزە نيـشتەجێ بـوو، بـەڵكوو لـەوێ دوورخـرا بـۆوە، چـونكە لـەپاش مـەرگى ئـەبوبكرى صـديق ڕۆيـشت بـۆ شـام، لـەوێ مايـەوە، تاكێـشەيێ دروسـت بـوو لـەنێوانى موعاوييـەى كـوڕى ئـەبو سـوفيان، كەلـەوێ كارمەنـدى ئيمـامى عوثمـان بـوو، وە لـەنێوانى ئـەبو ذەڕدا، موعاوييــە لاى عوثمـان، كەجێنـشين بـوو لەمەدينـە، سـكاڵاى لەدەسـتى ئـەبو زەڕ كـرد، كـە مەردوم هان دەدا، لـەدژى گەنـدەڵى دارايـى، عوثمـان نـاردى بەدوايـدا، هاتـەوە، لەدواييدا لە رەبەزە كەجێگەيەكى زۆر چۆڵ بـوو، كـە گونـدێ بـوو لـە نزيكـى مەدينەوە، لەوێ نيـشتەجێ بـوو، هـەتا سـاڵى (٣٢) سـيىو دووى كۆچـى لـەوێ

ئـەمری هـەقی بـەجێ هێنـا، کەسـی لـەدەور نـەبوو بێجگـە لـە ژنەکـەی‌و منالـەکانی، ئـەوانیش دامـابوون بەدەسـتی تەرمەکەیـەوە، نەیانـدەتوانی کـە بیسپێرن بەخاك، خواوڕاسان لەوکاتەدا عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو کۆمـەڵێ لـەهاوڕێیانی عەبـدوڵلا لەعێراقـەوە هـاتن، ئـیتر شـۆردیان‌و کفنیـان کـردو عەبـدوڵلا نوێـژی لەسـەری کـرد، کاتـێ ئیمـامی عوثمـان بەمـەی زانـی، نـاردی بـەدوای خێزانەکـەی ئـەبو ذەڕداو لـەماڵی خۆیـدا، وەك منالـەکانی خـۆی، سەرپەرشتی گوزەرانی دەکردن، دەڵێن: ئیبنـو مەسـعوودیش، بـە دە رۆژ پـاش ئـەو دەمـرێ. {بڕوانـە: تـاج/٣ زنجـیرە/٥٩ لاپـەڕە: ٧٢٢ ژمـارە: ٣٥٠٧ چـاپی چـوارەم + تەجریـد/٩٢/٤ ژمـارە: ١٤٠٣ داسـتانی موسـوڵمانبوونی ئـەبو ذەڕ + تەجریـد/١ لاپـەڕە: ٤٨ ج/١ ژمـارە: ٢٨ = ٣٠، ٢٥٤٥ فـەتحولباری + پوختـەی موسلیم/١ ژمارە: ١٦ = ٢٤٦ تەخریج‌و تەرقیم شێخ خەلیل مەئموون شیحا}.

٢- فـەرموودەی ژمـارە (١٤٢) بـەززار گێڕاویەتـەوە، ئیبنـو قـەططان بـە تەندروستی دادەنێ، بەڵام دارقطنی دەفەرموێ: قسەی ڕاست ئەوەیـە کـە ئـەم فەرموودەیـە مورسـەلە، فـەرموودەی ژمـارە (١٤٣) ئیمـامی تەرمـەزی گێڕاویەتەوەو بەصەحیحی دادەنێ، کەواتە: دەبـێ بـە بەڵگـەی بـەهێز بـوونی ژمارە (١٤٢)یش.

٣- مورسەل بەدوو واتا هاتووە:

أ- تابیعی، یاصەحابی، فەرموودەیێ بەرزەوە بکا بـۆ پێغەمبـەرو بیداتـە پـاڵ ئـەو، بـەڵام خـۆی لـە پێغەمبـەری نەبیـستبێ، وەك موحەممـەدی کـوڕی ئـەبوبکر، بفـەرموێ: پێغەمبـەر وا وای فـەرموو. چـونکە موحەممـەد سـاڵی حەجی ماڵاوایی لەدایك بووە.

ب- تابیعی بڵێ: پێغەمبەر واوای فەرموو، وەك قەتادە وابڵێ.

١٤٤- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { خَرَجَ رَجُلَانِ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتْ اَلصَّلَاةَ -وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ- فَتَيَمَّمَا صَعِيدًا طَيِّبًا، فَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا اَلْمَاءَ فِي اَلْوَقْتِ. فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا اَلصَّلَاةَ وَالْوُضُوءَ، وَلَمْ يُعِدِ اَلْآخَرُ، ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لِلَّذِي لَمْ يُعِدْ: "أَصَبْتَ اَلسُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلَاتُكَ" وَقَالَ لِلْآخَرِ: "لَكَ اَلْأَجْرُ مَرَّتَيْنِ"}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.

{أبوداود. لەسونەندا ژمارە: ٣٣٨. نسائی ٢١٣/١. حاکم لە (المستدرك)دا دەڵێ: صەحیحە، زەهەبیش بۆی مۆر کردووە}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو پیاو دەچن بۆ سەفەرێ، کەنوێژ دەبێ ئاویان پێ نابێ، جا لەبەر بێ ئاوی، بەخۆڵێکی پاك تەیەممومو دەکەن، لە پاشان هێشتا کاتی ئەو نوێژە دەمێنێ، کەتووشی ئاو دەبن، جا یەکێکیان دەسنوێژ دەگرێو نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی تریان نە دەسنوێژ دەگرێو نە نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە. جا کەدێنەوە بۆ خزمەتی حەزرەتو ئەمە باس دەکەن بۆی، بەوەیان کەنوێژەکەی دووبارە نەکرد بوویەوە دەفەرموێ: (تۆ یاسای ڕاستت پێکاوەو نوێژکەت جێگەی خۆی گرتووە) وە بەوەشیان کە دەسنوێژی گرتبوو، وەنوێژەکەی دووبارە کردبۆوە، دەفەرموێ: (بۆ تۆ دوو پاداشت هەیە!) {أبو داوودو نەسائی}.

١٤٥- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) فِي قَوْلِهِ تعالى: {وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ}، قَالَ: "إِذَا كَانَتْ بِالرَّجُلِ اَلْجِرَاحَةُ فِي سَبِيلِ اَللَّهِ وَالْقُرُوحُ، فَيُجْنِبُ، فَيَخَافُ أَنْ يَمُوتَ إِنْ اِغْتَسَلَ: تَيَمَّمَ". رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ مَوْقُوفًا، وَرَفَعَهُ اَلْبَزَّارُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَالْحَاكِمُ.

{دارە قطنی لە سونەندا (١٧٧/١). ئیبنو خوزیمە ژمارە: ٢٧٢. حاکم/١/٢٧٠. بەیهەقی لە سونەنەی کوبرادا (٢٢٤/١)}:

ئیبنـــو عـــەبباس (رەزای خـــودا لـــە خـــۆی‌و بـــاوكی) لـــەبارەی ئـــەم فەرمایشتەی خودای گەورەو سەروەرەوە، كە دەفەرموێ: {وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَـاء فَتَيَمَّمُـواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ – النساء/٤٣}. واتە:

خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ لە قورئانی پیرۆزدا: ئەگەر نـەخۆش بوون‌و نەتان دەتوانی ئاو بەكاربهێنن، یاخود لەسەفەردا بوون‌و ئاوتان دەست نەدەكەوت، خواه لەم دوو نموونەیەدا لەشتان پیس بێ، یابێ دەسنوێژ بن، وەیاخود یەكێ لەئێوە سەراوی كرد، وە بێ دەسنوێژ بوو، یاخود پێستان دای لەپێستی ژنان‌و بێ دەسنوێژ بوون، وەیاخود لەگەڵیان دروست بوون‌و ئیشی سەرجێیتان ئەنجامدا، وە ئاوتان دەست نەكەوت، كە بەكاری بهێنن بۆ گرتنی دەسنوێژو لابردنی بێ دەسنوێژی، یا لەشپیسی، ئەوە لەم هەموو نموونانەدا، قەستی هەڵگرتنی گڵێكی پاك بكەن‌و لەتۆزی ئەو گڵە پاكە، دەست بهێنن بەسەر روخسارتاناو بەهەردوو دەستاندا).

راوی فەرمووی: سەبارەت بە مەبەست لەراڤەو واتای ئەم ئایەتە، ئیبنـو عەبباس فـەرمووی: (هـەركاتێ پیاوێ لـەكاتی خـەبات‌و غـەزادا، كـە خـەبات‌و غەزاكە، لەپێناوی ئایینی خودادا بێ، هەركاتێ كەسێ لـەكاتی وادا زامـار بـوو، یـا زام‌و دوومـەڵ‌و زیپكـەو ئاوڵـەو شـتی وا لـە لەشـی پەیـدا بـوو، وە تووشـی لەشپیسی‌و لەشگرانی شەرعی بـوو، وە مەترسـی ئـەوەی هـەبوو، ئەگـەر خـۆی بشۆرێ‌و غوسڵی لەشپیسی دەربكا، یا مەترسی ئەوەی هەبوو ئەگـەر برینەكـە بشۆرێ‌و تەڕی بكا تەشەنە بكا، ئەگەر لەم دووبارەدا، بەهۆی ئەم دوو ئەگەری مەترسییەوە، ترسی ئەوەی هەبوو كەبمرێ‌و شۆردنەكە بیكوژێ، ئـەوا بـاخۆی نەشۆرێ‌و تەیەمووم بكات).

داره قطنی بەمەوقووفی لەسەر ئیبنو عەبباس داناوە، بەززار بە مەرفووعی داناوە، کە ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: پێغەمبەر وای فەرمووەو ئەمە تەفسیرو ڕاڤەی پێغەمبەرە بۆ ئایەتەکە، ئیبنو خوزیمەو حاکم بە صەحیحیان داناوە.

١٤٦- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِنْكَسَرَتْ إِحْدَى زَنْدَيَّ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَمَرَنِي أَنْ أَمْسَحَ عَلَى اَلْجَبَائِرِ}. رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَه بِسَنَدٍ وَاهٍ جِدّاً).

{ئیبنو ماجە لە سونەندا ژمارە: ٦٥٧}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مووچی دەستم شکا، موشەممام تێ گرت، بۆ ئەمە پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەویش فەرمانی پێ کردم، کە لەکاتی دەسنوێژ گرتندا، ئەندامەکانی دەسنوێژم بەریز بشۆرم هەتا دەگەمە سەر ئەندامە پێچراوەکە، کە موشەمماکەم تێ گرتبوو، لەباتی شۆردنی جێگەی موشەمماکە، دەستی تەڕ بهێنم بەسەر موشاماکەدا، یا بەسەر ئەو پەڕۆیەدا کە برین یان شکستەکەی پێ پێچراوە).

گەرچی ئیبنو ماجە بەڕشتە (سەنەد)ێکی زۆر لاواز گێڕاویەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی فەرموودەی ژمارە (١٤٧) دەبێ بەشاهیدو پشتگیربووی کاری پێ کراوە، لەلایەنی ئیمامی شافیعیو زانایانی ترەوە، وەك لەپەڕاوی فیقهدا ڕوونکراوەتەوە.

١٤٧- {وَعَنْ جَابِرِ بْنُ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) فِي اَلرَّجُلِ اَلَّذِي شُجَّ، فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ -: "إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ، وَيَعْصِبَ عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَةً، ثُمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ"}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِسَنَدٍ فِيهِ ضَعْفٌ، وَفِيهِ اِخْتِلَافٌ عَلَى رُوَاتِهِ.

{أبوداود ژمارە (٣٣٦، ٣٣٧) ابن ماجه ژمارە: ٥٧٢}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا بەردێ دای لەپیاوێکمان، سەری شکاند، لەپاشا شەیتانی بوو، لەهاوڕێکانی خۆی پرسی، گوتی: ئایا ڕێگەی تەیەمووممم پێ دەدەن؟ دەڵێن: نەء، ڕێگەت پێ نادەین، چونکە تۆ دەتوانیت ئاو بەکاربهێنیت، ئەویش خۆی شۆردو مرد!

کەهاتینەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم باسەیان گێڕایەوە بۆی، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (کوشتوویانە خودا بیانکوژێ، کەخۆیان نەیانزانیوە بۆ نەیانپرسیوە لەزانایان، چونکە چاری نادانی تەنها پرسینەو فێربوون، ئەم پیاوە تەنها ئەوەندەی بەس بووکە لەجیاتی شۆردنی شوێنە زامارەکەی بەخۆڵ تەیەممومی بکردایەو بەپەڕۆیە برینەکەی بپێچایەو، ئەنجا لەجیاتی شۆردنی جێگەی ژێر پەڕۆکە، دەستی تەڕی بەسەر ئەو پەڕۆیەدا بهێنابایە، وەباقی مەندەی لەشی بشۆردبایە!).
{ئەبو داوود/ سەنەدەکەی لاوازە} . ئەم فەرموودەیە ئیختیلاف لەڕاوییەکانیدا هەیە، کە ئایا لە ئیبنو عەبباسەوەیە، یا لە جابیرەوەیە.

١٤٨- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {مِنْ اَلسُّنَّةِ أَنْ لَا يُصَلِّيَ اَلرَّجُلُ بِالتَّيَمُّمِ إِلَّا صَلَاةً وَاحِدَةً، ثُمَّ يَتَيَمَّمُ لِلصَّلَاةِ اَلْأُخْرَى} . رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ جِدًّا.

{دار قطني لە سونەندا (١/١٥٨) بيهقي (١/٢٢٢)} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وایە: کە مرۆڤ بەتەیەمموم یەك نوێژ بکات، کاتێ ویستی نوێژی تر بکات، تەیەممومی تر بکات). {دارە قوطنی بەڕشتەیەکی لاواز گێڕاویەتەوە} .

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (١٣) سیازدە فەرموودەی لەخۆ گرتووە.

٢- بڕیارەکانی تەیەمموم لەم باسەدا ڕوونکراونەتەوە.

## ١٠- باسی بێنوێژی (سووڕی مانگانەی ژن)
## بابُ: الحَيْضِ.
**(فیقهی ئاسان/١ زنجیره/٤٢ - ٤٤).**

**١٤٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { إِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "إِنَّ دَمَ اَلْحَيْضِ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي مِنَ اَلصَّلَاةِ، فَإِذَا كَانَ اَلْآخَرُ فَتَوَضَّئِي، وَصَلِّي" } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ، وَاسْتَنْكَرَهُ أَبُو حَاتِمٍ.**

{أبوداود رقم: ٢٨٦. نسائي ١/١٢٣. ابن حبان رقم ١٣٤٨. حاكم ١/١٧٤. پوختەی بوخاری/١/١٦٥ = ٢٢٨، ٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٣١. موسلیم. حەیض ٧٥٠ شیحا. پوختەی موسلیم ژمارە: ١٧٩ = ٧٥٣}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: فاتیمی کچی ئەبو حوبەیش لە پێغەمبەری پرسی (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: من کە دەکەومە بێنوێژییەوە، ئیتر هەر پاك نابمەوە، جا ئایا هەتا حاڵم ئاوا بێ واز لەنوێژ بهێنم یانا؟**

**فەرمووی: (نەء، واز لەنوێژ مەهێنە، چونکە ئەوە گشتی خوێنی بێنوێژی نییە، ئەوە دەمارێکە خوێنی بەربووە، خوێنی بێنوێژی بەم نیشانە دەناسرێ: خوێنێکی ڕەشی تۆخە بۆنێکی تایبەتی هەیە، بەپێچەوانەی خوێنی هەمیشە بێنوێژی، کەخوێنێکی سووری ڕوونە، وەك خوێنی ئاسایی بێ بۆنە، جا تەماشاکە هەرکاتێ خوێنەکە ڕەشێکی تۆخی بۆگەن بوو، ئەوە خوێنی بێنوێژییە، لەوماوەیەدا نوێژ مەکە، بەڵام هەرکاتێ خوێنەکەی تر بوو، کە سوورێکی بێ بۆنی ڕوونە، ئەوە خوێنی ئەو دەمارەیە بەربووە، جا بەنیازی خۆشۆردنی بێنوێژی خۆت بشۆرەو ئەوجا دەسنوێژی ئاسایی بگرەو نوێژی خۆت بکە). {تاج/١ زنجیره/٣٦ ژمارە: ٣٠٦ + ژمارە: ٣٠٤ + ژمارە: ٣٠٧ +**

ژماره: ٣١٠ + فیقهی ئاسان/١ زنجیره/٤٢ لاپەڕە: ١٠٢ چاپی/ مەهارەت – ژمارە: ٣٠٦ تاران}. ئەم فەرموودەیە ئەبو داوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە، ئیبنو حیببانو حاکم بە صەحیحیان داناوە، بەڵام ئەبو حاتەم بە مونکەری داناوە.

١٥٠– وَفِي حَدِيثِ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ: { لِتَجْلِسْ فِي مِرْكَنٍ، فَإِذَا رَأَتْ صُفْرَةً فَوْقَ اَلْمَاءِ، فَلْتَغْتَسِلْ لِلظُّهْرِ وَالْعَصْرِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَتَغْتَسِلْ لِلْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَتَغْتَسِلْ لِلْفَجْرِ غُسْلاً، وَتَتَوَضَّأُ فِيمَا بَيْنَ ذَلِكَ}.
{أبوداود رقم: ٢٩٦}:

ئەسمائی کچی عومەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەماوەیەکی زۆرە فاطیمەی کچی حوبەیش هەمیشە بێنوێژەو پاك نابێتەوەو سووڕی مانگانەی بەردەوامە، وەلەم ماوەیەدا، لەبەر ئەوەی بێنوێژە نوێژ ناکا، جا ئایا چی بکاو فەرمانی شەرع چییە لەم بارەیەوە؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵلا! شتێ سەیرە، ئەوە لەقەی شەیتانە، با لە سوێنەیەکی گەورەدا دابنیشێ، کەبینی زەردایی خوێن سەر ئاوەکە دەکەوێ، ئەوە هەمیشە بێنوێژییە، جا با لەسەر ئەم شێوەیە نوێژ بکا):

یەکەم: بۆ کردنی نوێژی نیوەڕۆو عەصر، لەپێش کردنی نوێژی نیوەڕۆدا جارێ خۆی بشواتو غوسڵێ بکا، ئەوجا نوێژی نیوەڕۆ بکا، دوائەویش نوێژی عەصر بکا.

دووەم: بەهەمان چەشنو دەستوور بۆ نوێژی شێوانو خەوتنانیش غوسڵێ بکا.

سێیەم: وەبۆ نوێژی بەیانیش یەك جار خۆی بشۆرێ.

چوارەم: لەدوا خۆشۆردنەکان، بۆهەموو نوێژێ دەسنوێژێ بگرێ.

(ڕوونکردنەوە):

ئەسمائی کچی عومەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی مەزنی پێغەمبەرە، بەر لەکۆبوونەوەکانی داری ئەرقەم ئیسلام بووە، لەگەڵ مێردەکەیدا کە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بوو، دوو کۆچی کردووە، گۆچێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، لەپاش شەهید بوونی جەعفەری مێردی لەغەزای مۆتەدا، شووی کرد بەئەبوبکری صەدیق، لەپاش مەرگی ئەبو بکری صەدیقیش عەلی کوڕی ئەبو طالیب مارەی کرد، ئیمامی عومەر لەبارەی خەوپەرژێنی خەوەوە، پرسیاری لە ئەسماء دەکرد، چونکە لەزانستی خەوپەرژێندا دەستێکی بالآی هەبوو.

ئەسماء لەمێردی یەکەمی، واتە لە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب، لەخاکی حەبەشە، موحەممەدو عەبدوڵڵا و عەونی لێ بوو، لەمێردی دووەمی لە ئەبوبکر موحەممەدی بوو، لەمێردی سێیەمی یەحیای بوو، ئەسماء لەدایکەوە خوشکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەرە. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٤ ژمارە: ١٥٧٦) + (پوختەی موسلیم ژمارە: ١٤٤٠ بەرگی چوارەم)

١٥١- وَعَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ قَالَتْ: { كُنْتُ أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَبِيرَةً شَدِيدَةً، فَأَتَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَسْتَفْتِيهِ، فَقَالَ: "إِنَّمَا هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ اَلشَّيْطَانِ، فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ، أَوْ سَبْعَةً، ثُمَّ اِغْتَسِلِي، فَإِذَا اسْتَنْقَأْتِ فَصَلِّي أَرْبَعَةً وَعِشْرِينَ، أَوْ ثَلَاثَةً وَعِشْرِينَ، وَصُومِي وَصَلِّي، فَإِنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُكَ، وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي كُلَّ شَهْرٍ كَمَا تَحِيضُ اَلنِّسَاءُ، فَإِنْ قَوِيتِ عَلَى أَنْ تُؤَخِّرِي اَلظُّهْرَ وَتُعَجِّلِي اَلْعَصْرَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِي حِينَ تَطْهُرِينَ وَتُصَلِّينَ اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ تُؤَخِّرِينَ اَلْمَغْرِبَ وَتُعَجِّلِينَ اَلْعِشَاءِ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ اَلصَّلَاتَيْنِ، فَافْعَلِي. وَتَغْتَسِلِينَ مَعَ اَلصُّبْحِ وَتُصَلِّينَ. قَالَ: وَهُوَ أَعْجَبُ اَلْأَمْرَيْنِ إِلَيَّ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَحَسَّنَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{أبوداود رقم: ٢٨٧. ترمذی رقم: ١٢٨ وقال: حسن صحيح. ابن ماجه ٦٢٢، ٦٢٧. أحمد ٤٣٩/٦}:

ئـەم فەرموودەيـە لـەتاجول ئوصـولدا، ئاوايـە: دەيكـەين بەرافـەو روونكردنەوە بۆ ئەم گێڕانەوەی ئێرە:

حەمنەی كچی جەحش (رەزای خودای لێ بێ) كە ژنخوشكی پێغەمبەر بـوو، گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بێنوێژییـەكی ئێجگـار زۆرو یـەكجار سـەخت پـەرەی لێ سـەندووم، بـە ڕەنگێكـی وا كەڕێگـەی نوێـژو ڕۆژووی لێ گرتـووم، جا تـۆ بـۆ ئەمـە دەفـەرمووی چـی؟ حـەزرەتیش (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لۆكەت نیشان دەدەم بـەڕۆن زەیت چـەوری بكـەو لـەو جێگەیەدا هەڵی بگرە، ئیتر خوێنەكە دەوەستێ، گوتی: گوتم: ئەوە چاری ناكا، زۆر زۆرە، فەرمووی: (پەڕۆیێ بۆخۆت دروست بكەو خۆتی پێ شـەتەك بـدە) گوتم: زۆر زۆرە، ئەوەیش چاری ناكا، چونكە من بەخوڕەم هاژەی خـوێنم دێ، فەرمووی: (دوو شتت پێ بڵێم هەركامێكیان بكەی ئـەوەیانت بەسـە، وەئەگـەر توانـای هەردووكیانیـشت هـەبوو، وە ویـستت یـەكێكیان بكـەی ئـەوە خـۆت سەرپشكیت، چونكە ئەم حاڵەتەی تۆیە تەنیا لەقەی شەیتانەو بەر ئەو ڕەگـە كەوتووەو پـچڕاندوویەتی بـۆ مەبەسـتی پیـسی خـۆی، جا دەسـتووری یەكـەم ئاوایە: شەش ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ خۆت دابنێ بەبێ نوێژ، وەباش ورد بـەرەوە لەحاڵی ژنـی بێنوێـژ (لەكـەس‌وكاری خـۆت‌و لەهاوتەمـەنی خـۆت) سابەشـكوو پەی بەریت بـەماوەی بێنوێـژی ڕاسـتەقینەی خـۆت بـەپێوەر (قیـاس) لەسـەر هینی ئەوان‌و ئەوان بكەیت بەپێوەر بۆخۆت، كە ئەو ماوەیەیـە كـە لەزانـستی خودادا، دانـراوە بـۆ كـاتی بێنوێـژی تـۆ، یـادو نـاوی خـودا هەتاهەتایـە بـەرزو پایەدار بێ، ئینجا خۆت پاك پاك بـشۆرەو بیـست‌و سـێ شـەو بەرۆژەكانیـەوە، وەیاخود بیست‌و چوار شەو بەرۆژەكانیەوە، نوێژی خۆت بكەو ڕۆژووی خـۆت بگرە، ئیتر ئەمەت بەسـە، وەهـەموو مانگـێ بـەم چەشـنە بكـە، شـەش ڕۆژ، یا

حەوت رۆژ دابنێ بەماوەی بێنوێژیت‌و باقی مەندەی مانگ دابنێ بەماوەی پاکیت، لەچەشنی ئەو ژنانەی کە بەرێك‌وپێکی کاتی بێنوێژی‌و کاتی پاکی خۆیان دەزانن، ئەمە دەستووری یەکەم بوو).

دەستووری دووەمیش ئاوایە:

وەئەگەر دەشتوانیت ئەوا هەموو رۆژێ سێ جار خۆت بشۆرە، لەسەر ئەم رێسایە:

یەکەم: نوێژی نیوەڕۆ دوابخەو نوێژی عەصر زوو بکە، بەم شێوەیە: لەپێشا خۆت بشۆرەو غوسڵی خۆت دەرکەو ئەمجا ئەم دوو نوێژە بەم چەشنە کۆبکەرەوە: لەدوا کاتی نوێژی نیوەڕۆدا، نوێژی نیوەڕۆ بکە، ئینجا لەسەرەتای نوێژی عەصریشەوە، نوێژی عەصر بکە.

دووەم: وەبۆ نوێژی شێوان‌و خەوتنانیش، غوسڵ بکەو، نوێژی شێوان‌و خەوتنانیش بەدەستووری نوێژی نیوەڕۆو عەصر بکە.

سێیەم: لەگەڵ شەبەقیشدا خۆت بشۆرەو خۆت ئامادە بکە بۆ کردنی نوێژی بەیانی.

وە هەروەها رۆژوویش بگرە، هەرکات ئارەزووت بوو، وەکاتی پاکیت بوو، جا ئەگەر توانای خۆشۆردنی ئەم سێ جارەت هەیە ئەوابیکە، زۆرشتی چاکە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من ئەم دەستوورەی دووەمم بەدڵترە، کەرۆژی سێ جار خۆت بشۆری...) {تاج/١ زنجیرە: ٣٧ ژمارە: ٣٠٧}.

(روونکردنەوە):

١- لەچاپی چوارەمی تاجول ئوسولدا، کەمێ برگەی یەکەمی خۆشۆردنەکان شێواوە، وەهەروەها زۆر لەجێگەی ژمارە دووبارەکان، لەخودا داوا دەکەم کە لە ئاییندەدا، لیژنەیەکی پسپۆڕی دڵسۆز سەرپەرشتی

چاپکردنەوەی ئەم بەرهەمە قەڵەمیانەی من بکاتو ئەو هەڵە چاپیانەی کە تیایاندا، روویان داوە، لەبەر نوسخە تەندروستەکان ڕاست بکەنەوە.

٢- حەمنەی کچی جەحش، خوشکی دایکی باوەڕداران (زەینەبی کچی جەحشی هاوسەری پێغەمبەرە) ژنی طەلحەی کوڕی عەبدوڵڵا بوو، لەپێشا هاوسەری موصعەبی کوڕی عومەیر بوو، کە لەغەزای ئوحوددا موصعەب شەهید بوو، شووی کرد بەطەلحە، یەکێ بوو لەو ژنانە کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

حەمنە لەگەڵ چەند ژنێکی تردا، ئامادەی جەنگی ئوحود بووە، ئاوی دەگێڕا بەسەر تینوانداو زامارەکانی دەگواستەوەو تیماری دەکردن، حەمنە لەطەلحەی مێردی دوو کوڕی بوو، ناویان موحەممەدو عومران بوو، خوشکی هەقێ زەینەبی کچی جەحش بوو، دایکیان ناوی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەلیب بوو، کەواتە: حەمنە پورزای پێغەمبەرو ژنخوشکیەتی، حەمنە یەکێ بوو لەوانەی کە لەسەر بوختیان بۆ عائیشە، داری حەدیان لێ درا.

١٥٢- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ شَكَتْ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلدَّمَ، فَقَالَ: "اُمْكُثِي قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ، ثُمَّ اِغْتَسِلِي" فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ كُلَّ صَلَاةٍ} . رَوَاهُ مُسْلِم.

{مسلم رقم: ٣٣٤ = پوختەی موسلیم ١٧٩ = ٧٥٣ مسلم تەخریج شێخ خليل مأمون شيحا}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم حەبیبەی کچی جەحش کە ژنخوشکی پێغەمبەر بوو، لەوەختو ناوەختا دەکەوتە سەر خوێنی، بێنوێژی، هات داوای فەتوای لە پێغەمبەر کرد، عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! من هەمیشە بێنوێژم چارم چییە؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە بێنوێژی نییە، بەڵکوو هەمیشە بێنوێژییە، حەیز نییە، ئیستیحاضەیە، چونکە ئەوە ڕەگێکی تایبەتە، خوێنی بەر بووە، کەواتە: هەرکاتێ بەپێی ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە بۆماوەی بێنوێژی ژنی هەمیشە بێنوێژ دانراون، کاتی بێنوێژییەکەت تەواو بوو، ئیتر خۆت بشۆرەو لەشگرانی خۆت دەرکەو، ئیتر نوێژەکانت بەئەدا بەرێکوپێکی بکە).

ئیتر ئوم حەبیبە بۆ هەموو نوێژێکی فەرز، لەکاتی کردنی ئەو نوێژەدا، خۆی دەشۆردو غوسلێکی دەکرد.

١٥٣- وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {وَتَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلَاةٍ} وَهِيَ لِأَبِي دَاوُدَ وَغَيْرِهِ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ.

{تەجریدی بوخاری/١٦٥ = ٢٢٨، ٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٣١، مسلم. حیض/٣٣٣ = ٧٥١ شیحا أبوداود رقم: ٢٧٩}:

ئەم گێڕانەوەیە لەژمارە (١٤٩)دا رابورد.

١٥٤- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كُنَّا لَا نَعُدُّ اَلْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ اَلطُّهْرِ شَيْئًا}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ.

{تەجریدی بوخاری/١ لاپەڕە: ٢٢٠ چ/١ ژمارە: ٢١٢ = ٣٢٦ بخاری بشرح فتح الباری. أبوداود ژمارە: ٣٠٧. نسائی/١/١٨٦. ابن ماجە/٦٤٧}:

ئوم عەتێ (ڕەزای خودای لێ بێ) کە یەکێك بوو لەو ژنانە کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەستوورمان وابوو، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، ئێمەی ژنان لەپاش پاکەوە بوون لەبێنوێژیی ژنانە، ئیتر لێلاو زەرداومان بە هیچ دانە دەنا، کە جاروبار ژنان لێلاوێ یازەرداووێ لەپاش تەواوبوونی خوێنی بێنوێژی دەبینن. {تاج/١ زنجیرە: ٣٣ ژمارە: ٢٩٢}.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئوم عەطییە، بەكوردی واتە: دایكی عەتیۆ، ناوی نوسەیبەی كچی حاریثە، لەهاوەڵە ناودارو گەورەكانی پێغەمبەرە، لەراوییاتی صەحیحەینە، واتە: لەو ژنە صەحابییانەیە، كە لە بوخاریو موسلیمدا، گێڕانەوەیان لێوە ئەنجام دراوە، زۆر ئازاو دلێر بووە، ئەنصارییە، لەزۆر غەزادا لەگەڵ پێغەمبەردا چووە بۆ غەزا، دەستی پزیشكی هەبوو، زامارو نەخۆشیانی دەرمانو تیمار دەكرد، كۆمەڵێ فەرموودەی لە صەحیحدا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی، لەلای ئیمامی بوخاری بڕیاری فەرموودەی بەرزەوە كراو بۆ پێغەمبەری هەیە. نۆ فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، كۆمەڵێ لەهاوەڵانو زانایان، لەبەصرە، دەستووری شۆردنی مردوویان لە ئوم عەتیۆ وەردەگرت، لە شۆردنی تەرمی زەینەبی كچی پێغەمبەردا، كە مرد، ئوم عەتیۆ بەشداری كردووە. {بڕوانە: تاج/١ زنجیرە/٢٣ ژمارە: ١٠٦٩و ١٠٧٠}.

چەند فەرموودەیەكی هەیە، لەبابەت شۆردنی مردووەوە، دادەنرێن بەسەرچاوەو بنەمای شۆردنی مردوو، لەمەدینە كچانی سوننەت دەكرد. {بڕوانە: تجرید/١ ژمارە/٢٠٥ + تاج/١ زنجیرە: ٣٣ ژمارە: ٢٩٢ + تاج/٣ ژمارە: ٢٨٦١ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٣١}.

٢- ئەمەی نووسرا لەفظی گێڕانەوەی ئەبوداوود بوو، گوتەی بوخاری وایە: {كُنَّا لَا نَعُدُّ اَلْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ اَلطُّهْرِ شَيْئًا}.

١٥٥- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): { أَنَّ اَلْيَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتْ اَلْمَرْأَةُ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "اِصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا اَلنِّكَاحَ"}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/١٧١ = ٦٩٢ صحیح مسلم ترقیم شیحا = مسلم/٣٠٢}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: دەستووری جوولەکە وابوو: کاتێ ژنیان دەکەوتە بێنوێژییەوە، ئیتر پارێزیان لێ دەکردنو، نە لەگەڵیان نانو ئاویان دەخواردو نەلەماڵیشەوە لەگەڵیانا دادەنیشتن، بەڵکوو جێگەیان لێ جیادەکردنەوە!

یارانو هاوەڵانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە لێیان پرسی، جاخودا بۆ وەڵامی پرسیارەکەیان ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ – البقرة/٢٢٢}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! لەبارەی بێنوێژیی ژنانەوە پرسیارت لێ دەکەن، لەبڕیاری بێنوێژیی، کەچۆنەو چی لێ پەیدا دەبێ؟ تۆ بفەرموو پێیان: خوێنی بێنوێژیی، قیزاوییەو مایەی ڕەنجو ئێشو ئازارە، هەم بۆ ژنەکە خۆی هەم بۆ مێردەکەی، دەی کەناربگرن لەژنەکان لەکاتی بێنوێژیدا، وەنزیکیان مەبنەوە، هەتا پاك دەبنەوەو خۆیان دەشۆرن، جاکاتێ کەخۆیان پاك کردەوەو، لەشگرانی خۆیان دەرکرد، بڕۆنە لایان بەس لەوشوێنەوە کەخودا ڕێی پێتان داوەو ڕەوای دیوە بۆتان، کەڕێگەی زاوزێیە).

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەگەڵ ژنەکانتانا لەکاتی بێنوێژیدا، هەموو شتێ بکەن لەگەڵیانا، تەنیا چوونەلا نەبێ).

کاتێ جوولەکەکان ئەمەیان بیست، گوتیان: ئەم پیاوە – واتە: پێغەمبەر – دەیەوێ لەهەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ!.

جا ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بەشیر، هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتو ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ڕێگەمان پێ نادەی، هەتا لەکاتی بێنوێژیشدا بچینە لای حەڵاڵی خۆمانو دروست ببین لەگەڵیانا؟!

حا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی گرژ کردو ڕەنگی گۆڕا، لێیان زویر بووە، جا هەردووکیان هەڵسانو رۆیشتن، لەپاشا هەندێ شیریان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە حەزرەت هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیانو خواردیانەوەو تێگەیشتن کە حەزرەت دڵی لێیان نەڕەنجاوە، بەهۆی پرسیارەکەیانەوە، یا بەهۆی پێشنیارەکەیانەوە! {تاج/١ زنجیرە/٣٣ ژمارە: ٢٩٠}.

ئەمە دەقی گێڕانەوەی ژمارە (١٧١)ی پوختەی موسلیمە،

١٥٦- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری/٢٠٢ = ٣٠٢، ٣٠٠، ٢٠٣٠ بوخاری. پوختەی موسلیم/١٧٧ = ٦٧٨شیحا}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵانی) فەرمووی: ئەگەر یەکێ لەئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر، بێنوێژ بوایە، تەنانەت ئەگەر لەگەرمەی بێنوێژیشدا بوایە، ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیویستایە، لەوکاتی بێنوێژییەدا، دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکاو لەگەڵی ڕابوێرێ، فەرمانی پێ دەدا، بەرکۆشێکی دەدا بەنێوانی ناوکیو ئەژنۆیدا، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی بۆی دەبردو لەگەڵیدا خۆی تێکەڵ دەکردو خۆشی لێ وەردەگرت، هەتا ڕادەی ڕەحەت بوون، بەڵام بەبێ دروست بوونو جووتبوون.

عائیشە فەرمووی: بەڵام کێ لەئێوە دەتوانێ، لەکاتی وا ناسکا، یارۆی خۆی بۆ زەوت بکرێ، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یارۆی خۆی بۆ زەوت دەکرا، لەجێگەی حەرام لەکاتی بێنوێژیدا، کە دامەون شەرمگایە دەیپاراست.

لەگێڕانەوەی ئێرەی (بلوغ المرام)دا ئاوایە:

هەندێ جار کەمن بێنوێژ دەبووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم دەکرد، بەرکۆشم دەپۆشی، ئەوجا لەسەر ئەو بەرکۆشەوە دەستی لەگەڵما تێکەڵ دەکردو خۆشیو لەزەتی لێ وەردەگرتم.

١٥٧– وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) -فِي اَلَّذِي يَأْتِي اِمْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ- قَالَ: {يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ}. رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ وَابْنُ اَلْقَطَّانِ، وَرَجَّحَ غَيْرَهُمَا وَقْفَهُ.

{أبوداود رقم/٦٤. ترمذى رقم/١٣٦. نسائى (١/١٥٣). ابن ماجه رقم/٦٤٠. حاكم. مستدرك (١/١٧١) صححه وأقَرَّهُ الذَهَبِيُّ}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی ئەو کەسەوە کە لە بێنوێژیدا بڕواتە لای ژنی خۆی، فەرمووی: (دیناری، یان نیو دینار بکا بەخێر لەکەفارەتی ئەو گوناهەدا).

(ڕوونکردنەوە):

١- دیناری ئیسلامی بریتیە لەیەك مسقاڵ زێڕ، واتە: بەپێی ئەم فەرموودەیە بێ، دەبێ ئەو پیاوەی لەکاتی بێنوێژیدا جووت دەبێ لەگەڵ ژنی خۆی، نیو مسقاڵ زێڕ، یان یەك مسقاڵ زێڕ بدا بەکەفارەتی ئەو گوناهەیدا. بەڵام هەندی لەزانا گەورەکان دەڵێن: لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودەیە، کەمو کوڕی زۆری واتیادا، لەبەر ئەوە بەس تەوبە بکا، لەوبێ شەرعییەی کردوویەتی بەسە.

٢- حاکمو ئیبنو قەطتان ئەم فەرموودەیان بەصەحیح داناوە، بەڵام کەسانی تر بە موقوفیان لەسەر ئیبنو عەبباس داناوە.

١٥٨– وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ المرأَةُ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ؟}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری/١ ژمارە: ٢٠٣ = ٣٠٤، ٩٥٦، ١٤٦٢، ١٩٥١، ٢٦٥٨. موسلیم ٢٣٨، ٢٣٩ ترقیم شیحا = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا}:

**ئەم فەرموودەیە لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە (ژمارە: ٢٠٣): ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جەژنی قوربان بوو، یان ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووە دەرەوە ڕۆیشت بۆ نوێژگاکە، بۆ ئەو دەشتە، لەدەرەوەی شار، سەری لەژنان داو، وتارێکی بۆیان داو، فەرمووی: (ئەی کۆمەڵێ ژنان! خێرو خێرات زۆر بکەنو، زۆریش بپاڕێنەوەو، لەخودا داوای لێبووردن بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا، خودا نیشانی دام کەئێوە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ بوون).**

**ژنەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە لەبەر چی ئێمەی ژنان زۆربەی خەڵکی ناو دۆزەخین؟ فەرمووی: (چونکە زۆر نەفرەت لەخەڵك دەکەنو، سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو، چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە، کە وەك ئێوە کە ئاوا کەم هۆشو کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا ئاوا زاڵ بێو، پیاو بەو هەموو زیرەکیو زرنگییەیەوە، تەفرەی دەداو، هۆشی لەکەللەدا ناهێڵێ!).**

**گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کەم ئایینیو کەم هۆشییەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: (کەم هۆشییەکەتان بریتییە لەوە کەشایەتی دووژن بەشایەتی تاقە پیاوێ حسێبە، ئەمە کەم هۆشییەکەتان، ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژیدا چەند شەوێ دەمێنێتەوەو نەنوێژ دەکاو، نەڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، ئەمەیش کەم ئایینییەکەتانە). {تاج/١ زنجیرە: ٣ ژمارە: ١٨}.**

**١٥٩- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {لَمَّا جِئْنَا سَرِفَ حِضْتُ، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "اِفْعَلِي مَا يَفْعَلُ اَلْحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي"}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ.**

{تجريـدى بوخـارى/١ ژمـارە: ١٩٨ = ٢٩٤، ٣٠٥، ٣١٦، ٣١٧، ٣١٩، ٣٢٨ بوخارى. پوختەى موسليم ژمـارە: ٧٤٥ = ٢٩٢٦ موسـليم شـيحا = ١٢١١ صحيح مسلم}:

**ئەم فەرموودەيە لەتەجريدى بوخاريدا ئاوايە:**

**عائيـشە (رەزاى خـوداى لىٰ بـىٰ) فـەرمووى: لـە خزمـەتى حەزرەتـدا (دروودى خـوداى لەسـەر بـىٰ) لەسـالّى حـەجى مالّاواييـدا، لەمەدينـەوە دەرچووين بۆ حەج، وەبەتەماى عەمرە نەبووين، چونكە گومانمان وابـوو، كـە لەمانگەكانى حەجدا عەمرە ناكرىٰ، كە گەيشتينە سەريف، كەناوى شوێنێكە، دەكەوێتە سەر رێگەى مەدينە – مەككە، لـەوىٰ مـن بێنوێـژ كـەوتمو خـوێنى سوورى مانگانەى ژنانم بۆ هاتو دەستم كـرد بـەگريان، وە لـە چـياى عەرەفـە پـاك بوومـەوە، جـا پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـىٰ) هـات بەسـەرما دەگريام، فەرمووى: (ئەوە چيتە بۆچى دەگرى؟) گوتم: بەخودا حـەزم دەكـرد كە ئەمسالّ نەهاتمايە بۆ حەج، فەرمووى: (رەنگبىٰ بێنوێـژ بيـت لەبـەر ئـەوە وادەلّێيت؟) گوتم: بـەلّىٰ. فـەرمووى: (ئـەوە سووچـى تـۆى تيـادا نييـە، شـتێكە خودا نووسيويەتى لەسەر كچانى ئادەم، جا هەرچى حاجى دەيكا تۆيش بيكە، بەلّام تەوافى بەيت مەكە، هـەتا لـە بێنوێژييەكـەت پـاك دەبيتـەوە).** {تـاج/٢ زنجيره: ٩٦ ژمارە: ١٥٥٠ زنجيرە: ٩٢ ژمارە: ١٥٣٨}.

١٦٠– وَعَنْ مُعَاذٍ بنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ): {أَنَّـهُ سَـأَلَ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنِ اِمْرَأَتِهِ، وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: "مَا فَوْقَ اَلْإِزَارِ"}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَضَعَّفَهُ.

{أبوداود رقم/٢١٣}:

**موعاذى كوڕى جەبەل (رەزاى خوداى لىٰ بىٰ) فـەرمووى: لـە پێغەمبـەرم پرسى: ئەى پيغەمبەرى خودا! ئەگەر پياوىٰ ژنەكەى لە بێنوێژيـدا بـوو، چـى حەلّاڵە كە لەگەلّيا بيكا؟**

فەرمووی: (ئەوەی ئیزار دەیگرێتەوە، کە نێوانی ئەژنۆو ناوکیەتی، لەزەت لێ وەرگرتنی حەرامەو قەدەغەیە، ئیتر لەوە بترازێ خۆشیو لەزەت لێ وەرگرتنی ڕەوایەو دروستە).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە ئەبوداوود گێڕاویەتەوەو بەلاوازو بێ هێزی داناوە.

٢- بەپێی ئەم فەرموودەیە بێ، دەبێ هەموو جۆرە خۆشی وەرگرتنێك، لەنێوانی ئەژنۆو ناوکی ژن، لەکاتی بێنوێژیدا، لەلایەن مێردیەوە، لەسەر جلیشەوە نادروست بێ، بەڵام گوتەی ڕاستتر ئەوەیە کە لە ژمارە: ١٥٦و ١٥٥دا، لەپێشەوە ڕابورد.

١٦١- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {كَانَتِ اَلنُّفَسَاءُ تَقْعُدُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يوماً}. رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَاللَّفْظُ لِأَبِي دَاوُد.

{أحمد (٦/ ٣٠٠) أبوداود رقم/٣١١. ترمذی رقم/١٣٩. ابن ماجه رقم/٦٤٨}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولدا ئاوایە:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنی زەیستان، چل ڕۆژ دادەنیشتو دەستی هەڵدەگرت لەنوێژو ڕۆژوو وپەرستشو دروستبوونو جووتبوون لەگەڵ مێرددا، هەتاوامان لێ دەهات لەبەر زیپکەو قنچکەو ناخاوێنی، ڕووی خۆمان دەگرتە وەرسو زەعفەران!). {تاج/٢ زنجیرە: ٣٥ ژمارە: ٣٠٠}. وەرس گیایەکی زەردە شتی پێ زەرد دەکرێ، هەروا زافەران.

١٦٢- وَفِي لَفْظٍ لَهُ: {وَلَمْ يَأْمُرْهَا اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِقَضَاءِ صَلَاةِ اَلنِّفَاسِ}. وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أبــوداود رقــم/٣١٢} الحــاكم في المــستدرك (١/١٧٥) وَصَــحَّحَهُ وَأَقَــرَّرَهُ الذَّهَبِيُّ}.

دیسان ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: جاران لەسەردەمی پێغەمبـەردا، ژنـی زەیـستان، لەکەسـوکاری پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) چل شـەو لـەپاش منـاڵبوون لێ دەکـەوتو وازی لـە نوێـژو ڕۆژوو پەرستش دەهێناو، جووت نەدەبوو لەگەڵ شووەکەیدا، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) لەوەدوا، پێی نەدەگوت کە نوێژی ئەو ماوەی زەیستانییەی بگێڕێتەوە). {تاج/١ زنجیرە: ٣٥ ژمارە: ٣٠١}. ئەم باسە (١٤) فەرموودەی لەخۆ گرتووە (١٦٢ — ١٤٨ = ١٤ فەرموودە).

## ٢- نامەی نوێژ
## كتاب الصَّلَاةِ
### ١١- باسی کاتە دیاریکراوەکانی نوێژە فەرزەکان
### باب: المَوَقيت

١٦٣- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ نَبِيَّ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { وَقْتُ اَلظُّهْرِ إِذَا زَالَتْ اَلشَّمْسُ، وَكَانَ ظِلُّ اَلرَّجُلِ كَطُولِهِ مَا لَمْ يَحْضُرْ اَلْعَصْرُ، وَوَقْتُ اَلْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ اَلشَّمْسُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ اَلْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبْ اَلشَّفَقُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ اَلْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اَللَّيْلِ اَلْأَوْسَطِ، وَوَقْتُ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ اَلْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعْ اَلشَّمْسُ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ .

{پوختەی موسلیم ٢٠٥ = ١٣٨٧ ترقيم شيحا = ٦١٣ صحيح مسلم}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتی نوێژی نیوەڕۆ لەوکاتەوە دەست پێ دەکا، کە بەدیمەن خۆر لادەدا لەناوەڕاستی ئاسمان‌و سێبەری هەموو کەسێك ڕێك بەقەد درێژی خۆی بێت، وە دەمێنێ هەتا نوێژی عەصر دادێت، وەکاتی نوێژی عەصر دەست پێ دەکات، لەو کاتەوە کەسێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، زیاد لەسێبەری کاتی زەوالی، وە دەمێنێ هەتا گۆی خۆر زەرد هەڵ دەگەڕێ، هەتا کاتی زەردەپەڕ، وەکاتی نوێژی شێوان، کەخۆرئاوا بوو، دەست پێ دەکا، وە دەمێنێ هەتا سووری کەناری ئاسمان ون دەبێ، ئیتر کاتی نوێژی خەوتنان دەست پێ دەکا، وەهەتا نیوەشەو دەمێنێ، بەڵکوو هەتا بانگی بەیانی دەمێنێ، کاتی نوێژی بەیانیش لەشەبەقی بەیانەکییەوە دەست پێ دەکا هەتا خۆر دەکەوێ، جا کاتێ خۆر کەوت ئیتر واز لەنوێژ کردن بهێنن، چونکە خۆر کەهەڵدێ لەنێوانی دووشاخەی شەیتانەوە هەڵدێ‌و، ناموسوڵمانەکان لەودەمەدا کوڕنووشی بۆ دەبەن). {تاج/١ زنجیرە: ٤٧ ژمارە: ٣٥٠ هەتا ژمارە: ٣٧٧}.

(ڕوونكردنەوە):

ئەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (باشتر ئەوەیە كە مەبەست لە دووشاخەی شەیتان ئەوەیە: كە شەیتان لەوكاتەدا سەری لەئاستی گۆی خۆر نزیك دەكاتەوە، هەتا بەدیمەن خۆرپەرستەكان كە لەو كاتەدا كوڕنووش بۆ خۆر دەبەن، وەك كوڕنووش بۆ شەیتان بەرن وایە!).

١٦٤- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ فِي الْعَصْرِ: {وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ}.

{موسلیم ٦١٣ تجریدی بوخاری/١ ژمارە: ٣٣٠ = ٥٦٠، ٥٦٥ = فتح الباری. صحیح مسلم ترقیم شیحا/ ١٣٩٠}:

لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە، دەیكەین بەڕاڤەو ڕوونكردنەوە بۆ ئێرە:

لەجابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسیاركرا: لەچی كاتێكا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژە فەرزەكانی دەكرد؟ فەرمووی: (لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا نوێژی نیوەڕۆی دەكرد، كە نوێژی عەصریشی دەكرد خۆر هێشتا بەگوڕ بوو، تینی تەواو مابوو، زەرد هەڵنەگەڕا بوو، كە خۆریش ئاوا دەبوو نوێژی شێوانی دەكرد، نوێژی خەوتنانیشی، جاروبار پێش دەخستو، جاروباریش دوای دەخست، لەسەر ئەم شێوەیە، ئەگەر نوێژخوێنەكان زوو كۆبوونایەتەوە، زووبەزوو جەماعەتی خەوتنانی بۆ دەكردین، بەڵام ئەگەر نوێژكەرەكان درەنگ بهاتنایە، ئەویش خەوتنانی دوادەخست، بەتاریك‌ولێڵەكیش نوێژی بەیانی بۆمان دەكرد). {تاج/١ زنجیرە: ٤٧ ژمارە: ٣٥١}.

١٦٥- وَمِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى: {وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ}.

{مسلم ٦١٤ = پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٠٦ = ١٣٩٢ صحیح مسلم بشرح النووی ترقیم شیحا}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا:

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) پرسـیارکەرێ پرسـیاری کـاتی نوێـژە فەرزەکانی لێ کرد، کە کەی و کەین؟

پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بێ) هـیچ وەڵامێکی نەدایـەوە، گوتی: جا فـەرمانی کـرد بەبیلال بـانگی بـەیانی دا، ئەوکاتـە نوێـژی بـەیانی بۆمان کرد، کە شەبەق دەدا، کەهێشتا لەبـەر تـاریکی نوێژخوێنـەکان بەباشـی یەکتریان نەدەناسییەوە، پاشان فەرمانی پێ کـرد، ئەوکاتـە بـانگی نیوەڕۆیـدا، کـەخۆر بەدیمـەن لەناوەڕاسـتی ئاسمـان لادەدا، کـە لـە زاراوی شـەرعی پیرۆزدا ناسراوە بەکاتی زەوال، یاکاتی لادانی گۆی خۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمـان، کەهەموو کـەس دەیگوت: ڕۆژ نیـوە بـووە، بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) خۆی لەم بارەیەوە، لەوان باشتر ئەوکاتەی دەزانی، چونکە بـەنیگا (بەوەحیی) کاتی نوێژەکانی بۆ دیاری کرابوو، ئەوکاتەیش فەرمانی بە بـیلال کرد، کەنوێژی عەصر ڕابگەیەنێ، کەخۆر هێشتا زۆر بـەرز بـوو، پاشـان کاتـێ خۆر تەواو ئاوابوو، فەرمانی بەبیلال کرد کەنوێژی شێوان ڕابگەیەنێ، ئـەوجا ئەوکاتە فەرمانی پێکرد کەنوێـژی خـەوتنان ڕابگەیـەنێ، کەسوورایی کـەناری ئاسمان ون دەبێ و نامێنێ.

بـۆ سـبەینێیش کردنـی نوێـژی بـەیانی وا دواخـست تەنانـەت کـە لـە نوێژەکە بۆوە، هەبوو دەیگوت: خۆ ئەوە خۆر کەوتووە، یان خەریکە کە خـۆر دەکـەوێ، وەنوێـژی نیوەڕۆیـشی ئەونـدە دواخـست، هـەتا نزیکـی کـاتی بـوونی نوێژی عەصری دوێنێ، وەنوێژی عەصریـشی وا دواخـست، کاتـێ کـە لـە نوێـژ بۆوە، هەبوو دەیگوت: خۆ خۆر زەرد هەڵگـەڕاوەو کـاتی زەردەپـەڕە، وەنوێـژی شێوانیشی دواخست، هـەتا کـاتی نـەمانی سوورایی کـەناری ئاسمـان، وەنوێـژی خەوتنانیشی دواخست هەتا سێیەکی یەکەمی شەو ڕۆیشت، ئەوجا بـۆ بـەیانی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن پرسیارکەرەکەداو کەهات پێی فەرموو:

(وەکاتی سەرەتاو کۆتایی هەموو نوێژێ لەپێنج نوێژە فەرزەکان وا لەناوەندی ئەم دوو کاتەدایە، کەدوێنێو ئەمڕۆ نیشانی ئێوەمدا، ڕۆژی یەکەم نوێژەکەم لەسەرەتای کاتەکەیەوە کرد، وە لەڕۆژی دووەما لەکۆتای کاتەکەیەوە کردم).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەپیاوەکە پرسیارەکەی لێ کرد، پێی فەرموو: (ئەم دوو ڕۆژە نوێژەکانت بەکۆمەڵ (جەماعەت) لەگەڵ ئێمە بکە). {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٤٩}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی عەبدوڵلای کوڕی قەیسە، یەکێکە لەهاوەڵە مەزنە ناودارەکانی پێغەمبەر.

(٣٦٠) سێ سەدو شەست فەرموودەی لەکتێبە ناودارەکانی فەرموودەدا هەیە، لەبوخاری پیرۆزدا (٥٤) فەرموودەی هەیە، لەموسلیما (٦٥) فەرموودەی هەیە، پەنجایان پەسەندی هەردوو لایانە، کەواتە: چوار فەرموودەی لەئەفرادی بوخارییە، یازدە فەرموودەی لەئەفرادی موسلیمە، کۆی فەرموودەکانی لە صەحەیندا، یەکسانە بە: {٥٠ + ٤ + ١٥ = ٦٩ فەرموودە}.

زانایەکی گەورە بوو، کۆچی کردووە بۆ حەبەشە، لەپاشا بۆ مەدینە، پێغەمبەر کردی بەسەرکاری سەربەشێ لە یەمەن، والیو کارمەندی عومەر بوو لەسەر بەصرە، ئەهوازو ئەسپەهان لەسەر دەستی ئەودا ئازادکران، یەکێ بوو لەدوو ناوبژیوانەکەی جەنگی صەفین، نوێنەری ئیمامی عەلی بوو، ئەبو مووسا دەنگی زۆر خۆش بوو، بەدەنگێکی خۆشو زۆر بەسۆز قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خودا دەنگو ئاوازێکی خۆشی داوەپێت...).

هـەموو جـارێ عومـەر پێـی دەفـەرموو: (ئـادەی ئـەی ئـەبو مووسـا! خودامان یاد بخەرەوە بەخوێندنی عەشەریێ ئەویش بۆی دەخوێندن!).

لەتەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵیدا، لەمەککە، یـان لـە کووفـە مـردووە {بڕوانە: پوختەی موسـلیم/١، ژمـارە: ٢١ ڕوونکردنـەوە + تەجریـدی بوخـاری بەکوردی/١، ژمارە: ١١ + تاج/٣، زنجیرە/٦٣، ژمـارە: ٣٥٢٧ هـەتا ٣٥٣٢ + بـەرگی/٤ تاج ژمارە: ١٥٥٥و ١٥٧٨و ١٧٣٨}.

١٦٦- وَعَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: {كَـانَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) يُصَلِّيَ اَلْعَصْرَ، ثُمَّ يَرْجِعُ أَحَدُنَا إِلَى رَحْلِهِ فِي أَقْصَى اَلْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّـةٌ، وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ مِنْ اَلْعِشَاءِ، وَكَانَ يَكْـرَهُ اَلنَّـوْمَ قَبْلَهَـا وَالْحَـدِيثَ بَعْـدَهَا، وَكَانَ يَنْفَتِلُ مِنْ صَلَاةِ اَلْغَدَاةِ حِينَ يَعْرِفُ اَلرَّجُلُ جَلِيسَهُ، وَيَقْرَأُ بِالسِّتِّينَ إِلَى اَلْمِائَـةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٢٠ = ٥٤٧، ٥٤١ فتح الباری. مسلم ٦٤٧ = ١٤٦٠ شیحا}:

ئەمە دەقی گێڕانەوەی پوختەی بوخارییە:

سـەیياری کـوڕی سـەلامە دەفـەرموێ: لەخزمـەتی باوکمـدا چـووین بـۆ خزمەتی ئەبو بەرزەی ئەسـلەمی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) بـاوکم عـەرزی کـرد: پێغەمبـەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژە فەرزەکانی چۆن دەکردو لەکەیا دەی کردن؟ فەرمووی: نوێژی قرچەی نیوەڕۆی ئەوکاتە دەکرد کەخۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کەئێوە پێی دەڵێن: نوێـژی یەکـەم. کاتـێ نوێژی عەصریشی دەکرد، کـەخۆر هێـشتا زیـتو زینـدوو بـوو، واتـە: بـەگوڕو بـەتین بـوو، زەرد هەڵنەگـەڕابوو، جـاری وادەبـوو هـەمان بـوو لەپـشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عەصری بەکۆمـەڵی دەکـرد، ئـەوجا نوێژخوێنەکـە دەگەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەی کـە لەوپـەڕی مەدینـە بـوو، وەلحاڵ هێشتا خۆر هەر بەرز بوو، زیتو بەگوڕ بوو.

سەییار فەرمووی: لەیادم نەماوە: کەئەبو بەرزە بۆکاتی نوێژی شێوان چی فەرموو، بەڵام لەبارەی کردنی نوێژی خەوتنانەوە، ئەبو بەرزە فەرمووی: دەستووری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: حەزی لەوە بوو کە کەمێ کردنی نوێژی خەوتنان دوابخات، وەدەستووریشی وابوو: لەپێش کردنی نوێژی خەوتناندا حەزی لەنووستن نەبوو، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانیش حەزی لەقسە کردن نەبوو، کاتێکیش کە لە نوێژی سبەینێ دەبۆوە، پیاوهاونشینی خۆی لەریزەکەدا دەناسییەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەوری شەست ئایەت، تا سەد ئایەتی لەنوێژی بەیانیدا دەخوێند). {ریاضی صالحین/٤، ژمارە: ١٧٤٦، زنجیرە/٣٣٤} {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٢}.

**(ڕوونکردنەوە):**

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی نەضلەی کوڕی عبید، یان کوڕی عەبدوڵڵایە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، لەگەڵ سوپای ئیسلاما، ئامادەی ڕزگار کردنی شاری مەککە بوو، کە لە مێژوودا ئەم ڕزگار کردنە ناسراوە بە (فەتحی مەککە). (ئازاد کردنی مەککە = ڕزگار کردنی مەککە) لەوەودوایش هەتا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیهان دەردەچێ هەر لە خزمەتیدا خەبات دەگێڕێو غەزا دەکا، چوار فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی پەسەندی بوخاریو موسلیمە، واتە: شەیخەین کۆکن لەسەری، ئەبو بەرزە عەبدوڵڵای کوڕی ئەخطەلی کوشت لەگەڵ سەعیدی کوڕی حورەیثدا کوشتیان، ئەم ئیبنوو ئەخطەلە هەستیار بوو، بە شیعر زەموڕەق بە پێغەمبەر دەکرد لە (٦٤) شەستو چواری کۆچیدا، لە مەروو، یا لە بەصرە، یا لە بیابانی سەجستان بە مردنی خودا دەمرێت. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٧٥٠ + پوختەی بوخاری ژمارە: ٣٢٠ بەرگی/١} {تاج/٢ زنجیرە ١٢١ ژمارە: ١٧٠٨}.

١٦٧- وَعِنْدَهُمَا مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ: {وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا يُقَدِّمُهَا وَأَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا: إِذَا رَآهُمْ اِجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ: كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ}:

ئەم فەرموودەیە لە ژمارە(١٦٤)دا، بە تەواوی ڕابوورد.

١٦٨- وَلِمُسْلِمٍ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى: {فَأَقَامَ اَلْفَجْرَ حِينَ اِنْشَقَّ اَلْفَجْرُ، وَالنَّاسُ لَا يَكَادُ يَعْرِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا}:

دەقی ئەم فەرموودەیەیش لەژمارە (١٦٥)دا، لەپێشەوە بەتەواوی رابورد.

١٦٩- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: {كُنَّا نُصَلِّي اَلْمَغْرِبَ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری/١ ژمارە: ٣٢٩ = ٥٥٩ فتح الباری. مسلم/٦٣٧ = ١٤٣٩ شیحا}:

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوسا کە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی شێوانمان دەکرد، کە دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان، هێشتا دونیا ئەوەندە ڕووناك بوو، شوێنی دەمە تیرمان دەبینی کەدەیدا لەزەوی، کە دەمان تەقاند. {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٩}.

(ڕوونکردنەوە):

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) مەدینەییە، لەیاریدەدەرانە، لەهۆزی ئەوسە، لەرۆژی جەنگی بەدردا، لەبەر ئەوەی کە مێردمناڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدا پێی کە بەشداری لەو غەزایەدا بکا، بەڵام لەرۆژی جەنگی ئوحوددا پەسەندی کرد بەجەنگاوەرو، ڕێگەی پێدا کە بەشداریی تیادا بکات، لەم جەنگەدا تیرێ بەریکەوت، شوێنی ئەو تیرە، لەپاش دەوری حەفتا ساڵێ، هەڵی دایەوەو بووبە

تێراوێ‌و، لەحەفتاو چواری کۆچیدا، لەتەمەنی هەشتاو شەشساڵیدا، ئەو تیراوێیە کوشتی، لەمەدینە مرد، ئیبنو عومەر نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردو، تەرمەکەی بەڕێکرد، کۆمەڵێ ژن، بەقیژەو هاوار، شوێنی تەرمەکەی دەکەون، بۆ سەر گۆڕستان، ئیبنو عومەر پێیان دەفەرموێ: (وس بن، ئەم پیرە مێردە گوناهبار مەکەن، خۆی پیرەمێردێکی ئیختیارە، بەرگەی سزای خودای گەورە ناگرێ!). {بڕوانە: تەجرید/١، ژمارە: ١٠٢٥ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٥١٣}.

١٧٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { أَعْتَمَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَاتَ لَيْلَةٍ بِالْعَشَاءِ، حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اَللَّيْلِ، ثُمَّ خَرَجَ، فَصَلَّى، وَقَالَ: "إِنَّهُ لَوَقْتُهَا لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي"} . رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٢٢٤ = ١٤٤٣ شیحا. پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٣٤ = ٥٦٩، ٥٦٦ فتح الباری بشرح صحیح البخاری}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵ‌و هاوسەرانی بێت) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی تەواو دواخست، هەتا شەو زرنگایەوەو زۆربەی شەو ڕۆیشت، تەنانەت هەندی کەس لەدانیشتوانی ناو مزگەوت، کە چاوەڕوانی نوێژی خەوتنانیان دەکرد، خەویان لێ کەوت، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ تەشریفی دەرچوو، هات بۆ مزگەوت‌و بەرنوێژی نوێژی خەوتنانی بۆمان کردو، فەرمووی: (بەڕاستی ئەمە کاتی پەسەندی ئەم نوێژەیە، بەلام مەبادا ببێ بەباروزەحمەت‌و ئەرک بۆ نەتەوەی ئیسلامی من، کەواتە بادوای نەخەین بۆ ئەم کاتە، هەتا نەبێ بە ئەرک بۆیان!) {تاج/١، زنجیرە/٤٧، ژمارە: ٣٦٠}.

١٧١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا اِشْتَدَّ اَلْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ اَلْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣١٥ = ٥٣٧، ٣٢٦٠ فتح الباری بشرح صحيح البخاری. مسلم ١٤٠٠ شيحا = ٦١٥ مسلم = ٢١٢ پوختەی مسلم = ١٣٩٩ شيحا = تجريد/١، ٣١٦ = ٥٣٩، ٥٣٥ فتح الباری}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی بوخاریدا، ئەمە دەقەکەیەتی:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گەرما دادێ، بەفێنکی نوێژی نیوەڕۆ بکەن‌و، ماوەیی دوای بخەن، لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا مەیکەن، چونکە قرچەی گەرما لەهاڵاوی ئاگری دۆزەخە، ئاگر لەلای خودا سکاڵا لەحاڵی خۆی دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ناوسکی خۆمم خواردۆتەوەو پیشاوم بەسەر یەکا، لەناو خۆما وا پەنگم خواردۆتەوە، پشوویەکم پێ بدە، جاخودای گەورە ڕێگەی بەئاگردا کەدوو هەناسە بدات، هەناسەیێ لەزستاناو هەناسەیێ لەهاوینا، دەی قرچەی گەرمای هاوین‌و تەشقی سەرمای زستان، کەئێوە هەستیان پێ دەکەن، بریتین لەو دوو هەناسەی دۆزەخ، کە لەهاوین‌و لەزستانا دەیان دات!). {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٥}.

١٧٢- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَصْبِحُوا بِالصُّبْحِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِأُجُورِكُمْ}. رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود رقم/٤٢٤. ترمذی رقم/١٥٤. نسائی رقم/٢٧٢ء ٥٤٨. ابن ماجه رقم: ٦٧٢. ابن حبان رقم/١٤٨٩. أحمد رقم/١٧٢٩٦. طبرانی رقم/٤٢٨٥}:

ڕافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کە بەری دونیا ڕۆشن بۆوە، ئەوسا

نوێژی بەیانی بکەن، چونکە ئەوە پاداشی گەورەترە بۆتان). {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٥٤ – رَوَاهُ أصحابُ السُّنَنِ بِسَنَدٍ صحيحٍ - شرحه}.

١٧٣– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ أَدْرَكَ مِنْ اَلصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلِ أَنْ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ اَلصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ اَلْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ اَلشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ اَلْعَصْرَ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بخاری = تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٢٧ = ٥٥٦، ٥٧٩، ٥٨٠. مسلم: ٦٠٨ = ٢٢٨ پوختەی موسلیم: ١٣٧٠، ١٣٧٣ شیحا}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ فریای یەك ڕکاتی نوێژی بەیانی بکەوێ لەپێش خۆرکەوتنا، ئەوە فریای ئەو نوێژی بەیانییە کەوتووە، بەتەواوی، واتە: بەحازری دەیکا، نەوەك بەقەزا، وەر هەرکەسێ فریای ڕکاتێکی نوێژی عەصر بکەوێ، لەپێش خۆرئاوا بوونا، ئەوە فریای نوێژی عەصر بەتەواوی دەکەوێ). {تاج/١، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٣٦٤}.

لە فەرموودەی ژمارە (١٣٧٠ شیحا = ٢٢٨ پوختەی موسلیم) ئاوایە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەهەر نوێژێ، فریای یەك ڕکاتی بکەوێ، لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا، ئەوە بەتەواوی فریاری ئەو نوێژە کەوتووەو، بەحازری کردوویەتی، نەوەك بەقەزا).

١٧٤– وَلِمُسْلِمٍ عَنْ عَائِشَةَ نَحْوَهُ، وَقَالَ: "سَجْدَةً" بَدَلَ "رَكْعَةً". ثُمَّ قَالَ: وَالسَّجْدَةُ إِنَّمَا هِيَ اَلرَّكْعَةُ.

{مسلم: ٦٠٩ = ١٣٧٥ ترقيم شيحا}:

لە ژمارە (١٣٧٥ شیحادا) ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

{مَنْ أَدْرَكَ مِنَ العَصْرِ سَجْدَةً، أَوْ مِنَ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا، والسَّجْدَةُ إِنَّمَا هِيَ الرَّكْعَةُ}.

واتاكەی بەتەواوی لەژمارە (١٧٣)دا رابورد، چونکە وەك پێغەمبەر خۆی دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (مەبەست لەسەجدە لەم جێگەیەدا رکاتێکە بەتەواوی، نەوەك کورنووشی ئاسایی).

(روونکردنەوە):

مەبەست ئەوەیە: کەهەر نوێژێ کاتی دیاری کراوی هەبێ، وەك پێنج فەرزەو نوێژی هەینیو نوێژی جەژنەکانو نوێژی وەتر، ئیتر فەرز بێ یان سوننەت بێ، هەرکاتێ ئەو نوێژە ئەگەر لەکۆتایی کاتا بکرێو نوێژخوێنەکە فریای یەك رکاتی بکەوێ، لەکاتی خۆیداو رکاتەکانی تری لەدوا تەواوبوونی کاتی دیاری کراوی بکا، ئەوە فریای ئەو نوێژە کەوتووە. {تاج/١، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٣ چاپی چوارەم}.

١٧٥- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ اَلصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ اَلْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ اَلشَّمْسُ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلَفْظُ مُسْلِمٍ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلْفَجْرِ}.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٣٨ هەتا ژمارە: ٣٤٣. پوختەی موسلیم ٢١٨ = ٨٢٧ مسلم = ١٩١٧ شیحا}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش کردنی نوێژی بەیانی، نوێژی سوننەت ناکرێ، هەتا خۆر هەڵدێ، لەپاش کردنی نوێژی عەصریش نوێژی سوننەت ناکرێ، هەتا خۆرئاوا دەبێ). گوتەی موسلیم لەژمارە (١٩٢٠)دا ئاوایە: لەجیاتی (لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ) ئەمەیە (لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ اَلْفَجْرِ) کە (فەجر) بەواتا (صبح)ە، کەواتە: واتاکە یەك شتە.

١٧٦- وَلَهُ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: {ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّي فِيهِنَّ، وَأَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ اَلشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ اَلظَّهِيرَةِ حَتَّى تَزُولَ اَلشَّمْسُ، وَحِينَ تَتَضَيَّفُ اَلشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ}.

{مسلم ٨٣١ = ١٩٢٦ شيحا}:

ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، لەعوقبەی کوڕی عامیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم سێ کاتەدا، نەیی لێ دەکردین، کەنوێژی سوننەتیان تیا بکەین، یامردوومانیان تیادا بنێژین.

یەکەم: ئەوکاتەی کەخۆر هەڵدێ‌و گزنگ دەدا هەتا بەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە.

دووەم: ئەوکاتەی کەقرچەی نیوەڕۆ هەڵدەستێ‌و ڕاوەستاو لەبەرخۆر، سێبەری نامێنێ، هەتا خۆر لاردەبێتەوەو بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدات.

سێیەم: ئەوکاتەیش کەخۆر شۆڕدەبێتەوە، بەرەو ئاوابوون، هەتا تەواو ئاوا دەبێ. {تاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣٧}.

١٧٧- وَالْحُكْمُ اَلثَّانِي عِنْدَ "اَلشَّافِعِيِّ" مِنْ: حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ. وَزَادَ: {إِلَّا يَوْمَ اَلْجُمْعَةِ}.

{مسند الشافعي: ص٦٣. الأمّ ١/١٤٧}:

ئەم فەرموودەیە، قسە لەبڕیارو حوکمی بڕگەی دووەمی فەرموودەی پێش خۆی دەکا، کە لەو بڕگەیەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوە دەکا، کە موسوڵمان لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا نوێژ بکا، بەلاّم مۆڵەتدان بەکردنی نوێژ لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، لە فەرموودەیەکا هاتووە، کە ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕشتەیەکی لاواز لە

ئەبو هورەیرەوە دەیگێڕێتەوە، بەیهەقی لە (المعرفة)دا، لە ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرەوە ئاوا دەیگێڕێتەوە:

ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: جاران دەستووری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) وابوو، نەیی دەکرد لەنوێژکردن لەکاتی قرچەی نیوەڕۆدا، بێجگە لەرۆژی هەینی.

١٧٨- وَكَذَا لِأَبِي دَاوُدَ: عَنْ أَبِي قَتَادَةَ نَحْوُهُ.

{أبوداود في سننة رقم: ١٠٨٣. البيهقي في سننهِ (٢/٤٦٤)}:

ئەبو داوود لە ئەبو قەتادەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، بەڕشتەیەکی لاواز:

دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نوێژکردنی لەناوەڕاستی ڕۆژدا پێ ناخۆش بوو، بێجگە لە رۆژی هەینی، چونکە هەموو رۆژێ لەناوەڕاستی رۆژدا دۆزەخ دادەخرێو جۆش دەسەنێ، تەنیا رۆژی هەینی نەبێ. {تاج/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٧٥}.

(ڕوونکردنەوە):

١- گەرچی فەرمووودەی ژمارە (١٧٧)و (١٧٨) لاوازن، بەڵام بەکارو رەفتی هاوەڵانی پێغەمبەر بەهێز دەبن، چونکە بەشێوەی گشتی یارانی پێغەمبەر لەڕۆژی هەینیدا، لەکاتی نیوەڕۆدا نوێژی سوننەتیان دەکرد، هەتا ئەو دەمەی ئیمام دەهات.

٢- ناباشی نوێژ لەکاتی ناباشدا، تایبەت نییە بەمزگەوتەوە، مۆڵەتدانیش بەکردنی نوێژ لەکاتی نیوەڕۆدا، لەڕۆژی هەینیدا، دیسان تایبەت نییە بەمزگەوتەوە، لەماڵیشەوە، لەدەشتیش هەروایە، بێجگە لەڕۆژی هەینی نوێژ لەوکاتەدا ناباشە، بەڵام لەڕۆژی هەینی‌دا دروستە.

١٧٩- وَعَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا اَلْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ} . رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود رقم: ١٨٩٤. ترمذى رقم: ٨٦٨. نسائى رقم: ٥٨٥. ابن ماجه رقم: ١٢٥٤. أحمد ٤/٢٨٤. ابن حِبَّان رقم: ١٥٥٣. دارقطنى ١/٤٢٤}:

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی نەوەی عەبدومەناف! هەرکەسێ لەهەر کاتێکا، چی بەشەو، چی بەرۆژ، دەیەوێ تەوافی ئەم ماڵی خودایە بکا، یان نوێژی تیادا بکا، ڕێگەی لێ مەگرن، چونکە تەوافی کابەو نوێژی ناو مەسجدولحەرام، فەرزبێ یاسوننەت، حازربێ یاقەزا، لەهەموو کاتێکا دروستە). {تاج/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٧٦}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم داوایەی ئاراستەی نەوەی عەبدومەناف کردووە، چونکە ئەوان سەرپەرشتی مەسجدولحەرا دەکەن، مەناف باپیرەی سێیەمی پێغەمبەرە چونکە پێغەمبەر ناوی (١- محمدی کوڕی ٢- عەبدوڵلای کوڕی ٣- عەبدولموطەلیب کوڕی ٤- هاشم کوڕی ٥- عەبدومەناف.)

٢- شافیعی کار بەم فەرموودەیە دەکاو دەفەرموێ:

(کاتی ناباشیو کەراهەت نیە بۆ نوێژ، چ فەرزی، چ سوننەتی، لەناو مەسجیدولحەراما، ڕۆژ بیستو چوار سەعاتە، نوێژخوێن دەتوانێ لەناو مەسجیدولحەراما، بەبێ کەراهەت، نوێژ بکا، چی فەرز بێ، چی سوننەت، چی حازر بێ، چی قەزا).

٣- جوبەیری کوڕی موطعیم، لەپیاوماقوڵانی قوڕەیش بوو، نوێنەری قوڕەیش بوو، کەهاتە خزمەتی حەزرەت بۆ بەردانی دیلەکانی غەزای بەدر،

لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، زانایەکی ڕەگەزناس بوو، لە ئەبوبکری صەدیقەوە فێری زانستو هونەری بنەچەناسیو ڕەگەزناسی بوو بوو، شەست فەرموودەی هەیە، نۆیان لە بوخاریدا هەیە، لە موسلیمدا کۆمەڵێ فەرموودەی هەیە، دوو کوڕەکەی نافیعو موحەممەدو کەسانی تریش گێڕانەوەیان لێیەوە ئەنجام داوە. لەمەدینە لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا، بەمردنی خودا مردووە، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا.

١٨٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلشَّفَقُ اَلْحُمْرَةُ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَصَحَّحَ اِبْنُ خُزَيْمَةَ وَغَيْرُهُ وَقْفَهُ عَلَى ابـنِ عُمَر (رضي الله عنهما).

{دار قطنی ١/٢٦٩. بیهقی رقم: ١٦٢١}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتی نوێژی شێوان بەئاوابوونی خۆر دەست پێ دەکات، وەکاتەکەی دەمێنێ هەتا (شەفەق) نامێنێو دەڕوا).

وە فەرمووی: (شەفەق سوورایی کەناری ئاسمانە، لەپاش خۆر ئاوابوون). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە/٤٧، ژمارە: ٣٤٩، ٣٥٠}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بەکاتی تایبەتی پێنج نوێژەکانەوە هەیە، هەق وابوو لەوێ دابنرایە.

٢- ئەم فەرموودەیە دارە قوطنی گێڕاویەتەوە، ئیبنو خوزەیمەیش لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوەو بە مەرفووعو صەحیحی داناوە، بەڵام کەسانی تر بە مەوقووفیان لەسەر ئیبنو عومەر داناوە.

٣- لەڕاستیدا دانەر مامۆستای عەسقەلانی، بەشێوەی هێماو کورتەکارییەکی زۆر ئاڵۆز، هەندی لەدەقی فەرموودەکانی پیادەکردووە، لەبەر ئەوەی کەهێشتا لەسەرەتای پەڕاوەکەین، جێگەی خۆیەتی کە ئەم لایەنە

بەپێی توانای سنوورداری خۆمان روون بکەینەوە. بۆ نموونە ئەم فەرموودەی ئێرە گێڕانەوەکەی دارە قوطنیو ئیبنو خوزەیمە دەنووسین:

١- (فَإِذَا غَابَ الشَّفَقُ وَجَبَتِ الصَّلاَةُ، وَالشَّفَقُ الحُمْرَةُ رَوَاهُ الدَّارَ قطني عن ابن عمر عن النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَرْفُوعاً).

٢- (وَوَقْتُ صَلاَةِ المَغْرِبِ إِلَى أَنْ تَذْهَبَ حُمْرَةُ الشَّفَقِ) أَخْرَجَهُ ابن خُزَيْمَةَ فِي صَحِيحِهِ من حديثِ ابنِ عُمَرَ مَرْفُوعاً وَصَحَّحَهُ.

جا بێگومان تێگەیشتن لەم جۆرە پیادەکردنەو دۆزینەوەی لەفظو دەقەکانیان لەسەرچاوەکاندا، کارێ هەروا ئاسان نییە، بەڵکوو پێویستی بەهەوڵێکی بێوچانی پسپۆڕانە هەیە.

١٨١- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْفَجْرُ فَجْرَانِ: فَجْرٌ يُحَرِّمُ اَلطَّعَامَ وَتَحِلُّ فِيهِ اَلصَّلَاةُ، وَفَجْرٌ تَحْرُمُ فِيهِ اَلصَّلَاةُ - أَيْ: صَلَاةُ اَلصُّبْحِ - وَيَحِلُّ فِيهِ اَلطَّعَامُ}. رَوَاهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَالْحَاكِمُ، وَصَحَّحَاهُ.

{ابن خزيمة رقم: ١٩٢٧. حاكم رقم: ١٥٤٩. بيهقى ٧٧٩٣}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەیان دوو بەیانە):

یەکەمیان: بەیانی تەواوە (فەجری صادیقە) کە ئەوەیە خۆراك لە رۆژووەوان قەدەغەو نادروست دەکا، وە سەرەتایە بۆ کاتی نوێژی بەیانیو نوێژی بەیانی پی دەکرێ.

دووەمیان: فەجری کاذیب، کەهێشتا هەر شەوە لەبەر ئەوە نەنوێژی بەیانی پێ دەکرێو، نەخۆراك لە رۆژووەوان قەدەغەو نادروست دەکا.

ئیبنو خوزەیمەو حاکم گێڕاویانەتەوەو، بە فەرموودەیەکی تەندروست (صحیح)یان داناوە.

بڕوانە ژمارە (١٨٢) کە یەکسەر وا لەدوا ئەم فەرموودەیەوە، کەدانەر کردوویەتی بەڕاڤەو ڕوونکردنەوە، بۆ ئەم فەرموودەی ژمارە (١٨١)ە.

١٨٢- وَلِلْحَاكِمِ فِي حَدِيثِ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) نَحْوُهُ، وَزَادَ فِي اَلَّذِي يُحَرِّمُ اَلطَّعَامَ: {إِنَّهُ يَذْهَبُ مُسْتَطِيلاً فِي اَلْأُفُقِ} وَفِي اَلْآخَرِ: {إِنَّهُ كَذَنَبِ اَلسِّرْحَانِ}.

{حاكم رقم: ٦٨٨. بيهقي رقم: ١٦٤٢، ١٦٤٣}:

ئەم فەرموودەیەی کەدانەر ماموّستای عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی بۆ دەکاو کردوویەتی بەدوو بەشەوە، بەشی یەکەمی نیشانەی بەیانی ڕاستەقینەیەو بەشەکەی تری نیشانەی بەیانی درۆزنەیە، کە لە شێوەی فەرموودەکەی ئیبنو عەبباسەو بەهەمان واتایە، لەگەڵ دوو زیادەدا، کە حاکم لەجابیرەوە دەیگێڕێتەوە، ئەمە بێژە (لەفظ)ەکەیەتی لە (المستدرك)ی حاکمدا:

عن جابر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: «الْفَجْرُ فَجْرَانِ فَأَمَّا الْفَجْرُ الَّذِي يَكُونُ كَذَنَبِ السِّرْحَانِ فَلاَ يُحِلُّ الصَّلاَةَ وَلاَ يُحَرِّمُ الطَّعَامَ وَأَمَّا الَّذِي يَذْهَبُ مُسْتَطِيلاً فِي الأُفُقِ فَإِنَّهُ يُحِلُّ الصَّلاَةَ وَيُحَرِّمُ الطَّعَامَ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەیان دوو بەیانە):

یەکەمیان: ئەوەیە کە ڕووناکی لە خۆرهەڵاتەوە، بەرەو خۆرئاوا، وەك کلکی گورگ‌و کۆڵەکە بەرز دەبێتەوەو، لەپاشان نامێنێ‌و تاریکی دیسانەوە دەست پێ دەکاتەوە، بەمەیان دەگوترێ: بەیانییە درۆزنە (فەجری کاذیب) ئەمەیان نەنوێژی بەیانی پێ دەکرێ‌و، نەڕێگەی خواردن‌و خواردنەوە لە ڕۆژووەوان دەگرێ.

دووەمیان: ئەوەیە کە لە پاش نیو سەعاتێ لەبەیانی یەکەم، لەدەم ئاسۆوە، بەرە بەرە روونـاکی سەرهەڵدەداتو بەکەناری ئاسمانا تەواو بڵاودەبێتەوەو دەبێ بەرۆژی رووناك، بەمەیان دەگوترێ: بەیانی تەواو (فەجری صادیق) جا بەمەیان نوێژی بەیانی پێ دەکرێو خۆراك لە رۆژووەوان قەدەغەو نادروست دەبێ.

(روونکردنەوە):

مەبەستی دانەر ئەمەیە: حاکم فەرموودەی ژمارە (١٨١)و (١٨٢)ی لەدوو کەسەوە گێڕاوەتەوە، ژمارە (١٨١) لە ئیبنو عەبباسەوە، بەو دەقو بێژەو لەفظە کە لەژمارە (١٨١)دا رابورد. وەژمارە (١٨٢)ی لە جابیرەوە گێڕاوەتەوە، بەو دەقەی کە لە (سبل السلام شرح بلوغ المرام)ەوە ڕاگوێزمان کرد، کە لە نیشانەی بەیانی تەواو، ئەمەی زیادە (إِنَّهُ يَذْهَبُ مُسْتَطِيلاً فِي الأُفُقِ) وە لەنیشانەی بەیانییە درۆزنەیش ئەمەی زیادە (إِنَّهُ كَذَنَبِ السِّرْحَانِ).

١٨٣- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَفْضَلُ اَلْأَعْمَالِ اَلصَّلَاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا} . رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ. وَصَحَّحَاهُ. وَأَصْلُهُ فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ".

{ترمذي رقم: ١٧٠، حاكم رقم: ٦٨٠. پوختەی بوخاری/٣١٢ = ٥٢٧، ٢٧٨٢، ٥٩٧٠، ٧٥٣٤. پوختەی موسلیم ٢٢٧ = ٢٤٨ ترقيم شيحا = ٨٥ مسلم}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کام کردەوەیێ زۆر خێرترە؟ فەرمووی: (باشترین کردەوەی باش کردنی نوێژ لەسەرەتای کاتی خۆیەوە).

گوتم: پاش ئەوە چیتر خێرترە؟ فەرمووی: (چاکەکردنو باشبوون لەگەڵ باوكو دایكدا).

گوتم: پاش ئەوە چیتر؟ فەرمووی: (خەباتو تێكۆشان لەرێگەی خودادا). ئیتر پرسیاری ترم لێ نەكرد، مەبادا بێزارو سەخلەتی بكەم. {تاج/١، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٣٣١}.

١٨٤- وَعَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَوَّلُ اَلْوَقْتِ رِضْوَانُ اَللَّهُ، وَأَوْسَطُهُ رَحْمَةُ اَللَّهِ" وَآخِرُهُ عَفْوُ اَللَّهِ}. أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ جِدًّا.

{دار قطنی (١/٢٤٩). بيهقی رقم: ١٨٩٢. ابن عدی ١/٢٥٦ - ترجمة ٨٦}:

ئەبو مەحزوورە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كردنی نوێژ لەسەرەتای كاتی خۆیدا، هۆی رەزامەندیی خودایە، كردنی نوێژ لەناوەڕاستی كاتی خۆیدا مایەی سۆزو میهرەبانیو رەحمەتی خودایە، وە لە دوا كاتیا هۆی لێبووردنی خودایە). بۆ ژیاننامەی ئەبو مەحزوورە بڕوانە ژمارە (١٨٥).

١٨٥- وَلِلتِّرْمِذِيِّ مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ نَحْوُهُ، دُونَ اَلْأَوْسَطِ، وَهُوَ ضَعِيفٌ أَيْضًا.

{ترمذی رقم: ١٧٢}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كردنی نوێژ لەسەرەتای كاتی خۆیا هۆی رەززامەندیی خودایە، وە لە دوا كاتیا هۆی لێبووردنی خودایە). {تاج/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٦٢ - ترمذی سند غريب}.

(ڕوونكردنەوە):

ناوی ئەبو مەحزوورە (رەزای خودای لێ بێ) سەموورەی كوڕی میعیەنە، هەندێ دەڵێن: ناوی ئەوسی كوڕی معیرە، یان: سەلمانی كوڕی سەموورەیە، یان: سەلەمەی كوڕی معیرە.

ئـەبو مـەحزووره قورەیـشییە، لـەپاش غـەزای حونـەین ئیـسلام بـووە، دەنگـی زۆر خـۆش‌و بـەرز بـووە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە جەعرانە فێری بانگی کرد، جیعرانە جێگەیەکە لەنزیك مەککەوە، لەخاکی حیللە (أرض الحِلّ = خاکی نابەست).

جیعرانـە میقـاتی ئیحـرام دابەسـتنە، کۆچـی نـەکرد بـۆ مەدینـە هـەر لەشـاری مەککـە ماوەتـەوە، کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەغەزای حونەین گەڕایەوە، کـردی بـە بانگـدەری خـۆی لەمەککە، ئـیتر هـەتا مـرد بانگبێـژی مەککـە بـوو، ئـەبو مـەحزووره خـۆی ئـاوا چـیرۆکی ئـەم داستانەمان بۆ دەگێڕێتـەوە: دە کەسـێ دەبـووین، کاتـێ پێغەمبـەرو سـوپاکەی لەغـەزای حونـەین گەڕانـەوە، لەڕێگـە پێیـان گەیـشتین، ئێمـە خۆمـان دوور گرتبوو، بانگبێژی پێغەمبەر بانگی فەرموو، ئێمەیش بەدەنگی بەرز لاسکایی بانگەکەمان کردەوەو قەشمەریمان پێ کرد، پێغەمبەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گـوێی لەدەنگەکـەی ئێمـە دەبـێ، نـاردی بەشـوێنمانا، چـووین بـۆ خزمـەتی، فـەرمووی: ئـەوە دەنگـی کامتـان بـوو، کـە لـە دەنگـی هـەمووتان بـەرزتربوو، هاوڕێکـانم هـەموو ئاماژەیـان بـۆ مـن کـردو گوتیـان: ئەمـە بـوو، راستیشیان دەکرد من بووم، جا ئـەوانی بـەرەڵاکردو منـی گل دایـەوە، ئـەوجا فەرمووی: (ئادەی هەڵسە بـانگ بـدە بـۆ نوێـژ) منـیش لـەو کاتـەدا، لەهـەموو کەسێ زیاتر ڕقم لـە پێغەمبـەر بـوو، وە لـە هـەموو شـتێ زیـاتر ڕقـم لـەبانگ بـوو، جاهەڵسام لەبـەردەم پێغەمبـەردا ڕاوەسـتام، پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) وشە بەوشە، وشەکانی بانگی پێم دەگوت، تامنیش لەشوێن ئەوەوە بەدەنگی بەرز بیانڵێم‌و بانگیان پێ بڵێم، جا فەرمووی: بڵێ: (الله أکبر، الله أکبر...) تا بانگ تەواو دەبێ. ئەوجا کەبانگەکـەم تـەواو کـرد، بـانگی کـردم بۆلای خۆی‌و پریاسکەیەکی داپێم، هـەنێ پـارەی زیـوینی تیـادا بـوو، ئـەوجا دەسـتی لەسـەر تـەوێڵم دانـا، ئـەوجا دەسـتی شـۆڕ کـردەوەو دەسـتی هێنـا

بەسینگو بەرۆکما، هەتا دەستی گەیشتە سەرناوکم، ئەوجا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ):

(خودا پیتو فەڕت تێبخاو خودا پیرۆزو فەڕدارت بکات).

عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! بفەرموو بمکە بە بانگوێژ لە مەسجیدولحەرام لەمەککە؟ فەرمووی: (ئەوا فەرمانم پی کردیت بەوە).

ئیتر ئەو کینەو دەغەزو رقەی کە لەوەوبەر لەدڵما بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر هیچی نەما، بەڵکوو هەمووی بوو بە خۆشەویستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

دوایی گەڕامەوە بۆ مەککەو چووم بۆلای عتابی کوڕی أسید، کە کاربەدەستی پێغەمبەر بوو لەسەر شاری مەککە، وە فەرمانەکەی پێغەمبەرم پێ ڕاگەیاند، ئیتر بە حوزووری ئەو دەستم کرد بە بانگدان هەتا ئەبو مەحزووره خۆی مابوو، خۆی بانگدەری مەککە بوو، لەپاش خۆشی وەچەو نەوەکانی بەرپرسی بانگدان بوون!

طەبەری دەفەرموێ: ئەبو مەحزووره لەمەککە مردوووە، ساڵی پەنجاو نۆی کۆچی بەمردنی خودا مردووە (رەزای خودای لێ بێ).

١٨٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ اَلْفَجْرِ إِلَّا سَجْدَتَيْنِ}. أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ، إِلَّا النَّسَائِيُّ. وَفِي رِوَايَةِ عَبْدِ اَلرَّزَّاقِ: {لَا صَلَاةَ بَعْدَ طُلُوعِ اَلْفَجْرِ إِلَّا رَكْعَتَيْ اَلْفَجْرِ}.

{أبوداود رقم: ١٢٧٨. ترمذى رقم: ٤١٩. ابن ماجه رقم: ٢٣٥. أحمد ١٠٤/٢. عبدالرزاق فى المصنف رقم: ٤٧٦٠}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەپاش شەبەقی بەیانی، لەپێش کردنی نوێژی بەیانییەوە، تەنیا دوو رکات نوێژی سوننەت هەیەو بەس).

١٨٧- وَمِثْلُهُ لِلدَّارَقُطْنِيِّ عَنْ اِبْنِ عَمْرِو بْنِ اَلْعَاصِ.

{دار قطني في سننهِ (١٢٤٦، ٩١٩)}:

گێڕانەوەکەی عەبدوڕەزاق کە لە ئیبنو عومەرەوەیە، کە لەژمارە (١٨٦)دا نووسراوە، گێڕانەوەکەی دارە قطنی کە لە عەمری کوڕی عاصەوەیە، پوختەی واتاکەیان یەکە، کە ئەمەیە:

(لەپاش شەبەقی بەیانی، هەتا خۆر هەڵدێ، تەنیا دوو رکات نوێژی سونەت هەیە، کەناسراوە بە سوننەتی دامەزراوی نوێژی بەیانی، کە بەر لەکردنی نوێژی بەیانی دەکرێ، کە فەرزی بەیانیش کرا ئیتر نابێ نوێژی سوونەت بکرێ هەتا خۆر هەڵدێ).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیەیش وەك فەرموودەی ژمارە (١٨٠) پەیوەندی بەجێگەیەکی ترەوە هەیە، نەك بەم شوێنەوە، جێگەی خۆی ناو ئەو فەرموودانەیە، کەقسە لەو کاتانە دەکەن کە نوێژیان تێدا ناباش‌و ناپەسەندە، وەك فەرموودەی ژمارە (١٧٥ - ١٧٩).

٢- بەپێی گێڕانەوەکانی ژمارە (١٨٦)و (١٨٧) بێ، ئەو کاتانەی کە نوێژی سوننەتیان تیادا ناباش‌و ناپەسەندە دەبن بە شەش، کە ئەم کاتانەن:

١- کاتی گزنگدانی خۆر هەتا بەقەدەر ڕمێ بەرز دەبێتەوە.

٢- کاتی گەیشتنی خۆر بەناوەڕاستی ئاسمان هەتا کەمێ لائەدا.

٣- کاتی زەردەپەڕ، هەتا خۆر بەتەواوی ئاوا دەبێ.

٤- هەرکاتێ نوێژی عەصر کرا، هەتا خۆر ئاوا دەبێ.

٥- لەپاش کردنی نوێژی بەیانی هەتا خۆر دەکەوێ.

ئەم پێنج کاتانە بەپێی فەرموودەکانی ژمارە (١٧٥)و (١٧٦) ناوبراون‌و دیاری کراون.

٦- لەپاش شەبەقی بەیانی هەتا خۆر دەکەوێ، ئەم کاتی شەشەمە بەپێی ژمارە (١٨٦)و (١٨٧). {بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، زنجیرە/٧٠ لاپەڕە/٢١٩و ٢٢٠ — نەشری ئیحسان — تاران چاپی یەکەم - ٢٠٠٧}.

٣- عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێش ئازاد کردنی مەککە موسوڵمان بووە، پیاوێکی بلیمەت بووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێزی تایبەتی ئەوی دەگرت، چونکە داناو زاناو ئازاو بلیمەت بوو، ئەو قنسرینی ئازاد کرد، عومەر کردی بەحوکمداری فەلەستین، لەئاژاوەکەی نێوانی عەلیو موعاوییەدا، عەمر لایەنگیری موعاوییە بوون لەپاشا موعاوییە کردی بە فەرماندەی سوپایەکی گەورەو ناردی بۆ سەر میصر، لەساڵی (٣٨) سییو هەشتی کۆچییەوە هەتا ساڵی (٤٣) چلو سێ، والیو حوکمداری موعاوییە بوو لەسەر وڵاتی میصر، هەتا لەرۆژی جەژنی ڕەمەزانا لەوێ مرد، لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا، لە (المقطم) نێژرا، عەبدوڵڵای کوڕی، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، ئەوجا گەڕایەوە نوێژی جەژنی بۆ خەڵکەکە کرد، وە لەشوێنی باوکی بوو بە حوکمداری سەر میصر، عەمر شاعیرێکی جوان بوو. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ٦٤ = ٣١٧ شیحا}.

١٨٨- وَعَنْ أُمْ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {صَلَّى رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْعَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ بَيْتِي، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: "شُغِلْتُ عَنْ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلظُّهْرِ، فَصَلَّيْتُهُمَا اَلْآنَ"، قُلْتُ: أَفَنَقْضِيهِمَا إِذَا فَاتَتْنَا؟ قَالَ: "لَا"}. أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ.

{أحمد في المسند (٢٩٣/٦، ٣٠٤، ٣٠٦، ٣١٥) نسائي في سننه (٢٨١/١) بيهقي (٤٥٧/٢) طبراني رقم: ٥٣٤، ٥٨٤، ٩٧٨. ابن خزيمة رقم: ١٢٧٦. پوختەی موسلیم ٢٢٠ = ١٩٣١ ترقيم شيخ خليل مأمون شيحا = ٨٣٤ مسلم}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر

(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژی عەصـری بەکۆمـەڵ لـە مزگـەوت بـۆ هاوەڵانی کردو، ئەوسا تەشـریفی هات بـۆ مـاڵی مـن، لـەوێ دوو رکـات نوێـژی کرد، منیش لێم پرسی هۆی کردنی ئەم دوو رکاتە نوێژە لەم کاتەدا چی بوو؟ خۆتۆ جڵەوگیری دەکەیت لەکردنی نوێژ لەپاش کردنی نوێژی عەصر؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (چەند کەسێ لەهۆزی عەبـدول قەیس، ئەم نیوەڕۆیە لەلام بوون، بەهۆی ئەوشاندەی ئەوانەوە نەمپـەرژا، کە دوو رکاتە سوننەتەکەی پاش نیـوەڕۆ بکـەم، جا ئـەم دوو رکاتەیـە کـە ئێـستا کردیانم، ئەو دووە بوون، قەزام کردنەوە).

جا عەرزیمکرد: ئایا بۆ ئێمەیش هەر وایـە؟ هـەرکاتێ ئـەو دوو رکاتـەی پاش نیوەڕۆمان فەوتا، لەپاش کردنی نوێژی عەصر، قـەزایان بکەینـەوە یانـا؟ فەرمووی: (نەء، ئێوە ئەو دوو رکاتـە لـەم کاتـەدا، بەقـەزا مەکەنـەوە، بـەڵکوو لـەکاتێکا قـەزایان بکەنـەوە کـەکاتی کەراهـەتو ناباشـی نـەبێ، وەك دوایـی شێوانو دوای خەوتنان).

١٨٩- وَلِأَبِي دَاوُدَ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) بِمَعْنَاهُ.

{أبوداود رقم: ١٢٧٣ وَأَصْلُهُ في مسلم رقم: ٨٣٤ = پوختەی موسـلیم ٢٢٠ = ١٩٣١ شیحا}:

مەبەسـتی دانـەر شـێخی عەسقەلانی، ئـەو فەرموودەیـە کـە ئـەبوداوود لەعائیشەوە ئاوا دەیگێڕێتەوە: (قَالَتْ عَائِشة: (أَنَّهُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، كَـانَ يُصَلِّي بَعْدَ العَصْرِ وَيَنْهَى عَنْهَا وَيُوَاصِلُ وَيَنْهَى عَنِ الوِصَالِ).

عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەپاش نوێژی عەصر خۆی نوێژی سوننەتی دەکرد، بەڵام مۆڵـەتی نـەدەدا بەکەسـانی تـر کـە لـەپاش نوێـژی عەصـر نوێـژی سـوننەت بکـەن، وە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبـار یـەك دوو رۆژ، رۆژووی سوننەتی دەدایە دەم یەكو نە بەشەوو نە بەرۆژ نەیدەشکاند، بـەڵام مۆڵـەتی

بەکەسی تـر نـەدەدا شـتی وابکـاو بـە شـەوو بـەڕۆژ چـەند ڕۆژێ لەسـەر یـەك بـەڕۆژووو بـێو لەوماوەیـەدا نەیـشکێنێ. {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجـیرە: ٤١، ژمـارە: ١٣٥٩}.

ئەصڵی ئەم گێڕانەوەی عائیشەیش لەموسلیمدا ئاوایە:

ئەبو سەلەمە دەفەرموێ: سەبارەت بەو دوو ڕکاتە نوێژە سوننەتەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردبوونی بەیاساو دەستوورو عادەت لـەپاش کردنـی نوێـژی عەصـر دەیکـردن، سـەبارەت بـەم دوو ڕکاتـە نوێـژە، لەدایکە عائیشەی هاوسەری حەزرەتم پرسی: هۆی کردنی ئەم دوو ڕکاتـە لـەم کاتەدا چی بوو؟

عائیشە فەرمووی: ئەمە ئـەو دوو ڕکاتـە سوننەتە بـوون، کە لـە پـێش نوێژی عەصردا دەیکردن، هەتا جارێ نـەی پـەرژا کە لـەکاتی خۆیانـا بیانکـا، لـەپاش عەصـر کردیـانی، ئـیتر لـەوەدوا تـەرکی نـەکردن، چـونکە دەسـتووری وابـوو کەنوێــژێکی ســوننەتی لــەکاتێکا دەکــرد، ئــیتر لــەوەدوا لەوکاتــەدا دەیکردەوەو تەرکی نەدەکرد.

ئیـسماعیلی کـوڕی جەعفــەر، کـە یەکێکـە لـەپیاوانی ڕشـتەی ئــەم فەرموودەیە، دەفەرموێ: مەبەستی عائیشە ئەوەبووە، کە لەوە پاش بـەردەوام لەهەمان کاتدا دەیکردەوە. {پوختەی موسلیم ٢٢٠}.

**(ڕوونکردنەوە):**

١- ئــەم باســی ژمــارە (١١) یازدەیــە (١٨٩ — ١٦٢ = ٢٧) بیــستو حــەوت فەرموودەیە، ئەمەیش لەدواوە پوختەیەکی کورتی ناوەڕۆکەکەیەتی.

١- کاتە دیاریکراوەکانی پێنج فەرزە.

٢- هەرنوێژێ فەرز بێ، یان سوننەت، فریای یەك ڕکاتی بکـەوی لـەکاتی خۆیدا، دادەنرێ بەحازر، بەمەرجێ ڕکاتەکانی تری لەگەڵ ئەو ڕکاتەدا بکرێ.

٣- ئەو کاتانەی کەنوێـژی سـوننەتیان تیـا نـاکرێ، شـەش کـاتن، بڕوانـە: ژمارە (١٨٦) بۆ زانینی ئەم شەش کاتە.

٤- نوێژی سوننـەت کەهۆیەکی تایبەتی نەبێ لـەو شـەش کاتـەدا، کردنـی لەو شەش کاتەدا ناباشەو کەراهەتی هەیە.

٥- بەقەستی نوێژی فەرز دوابخرێ بۆ ئەم شەش کاتی ناباشییە، کارێکی فـرە نابـاش‌و ناپەسـەندە، گەرچـی نوێژەکـە دائەمـەزرێ‌و فەرزەکـە لـەکۆڵ دەخات.

٦- وا باش‌و پەسەندو سوننەتە، کە لە نزیکترین هەلی ڕەخساودا، نوێژی فەوتاو قـەزا بکرێتـەوە، وەکاتی دیـاری کـراو نییـە بـۆ ئـەو نوێـژەی کـە قـەزا دەکرێتەوە.

٧- هەرنوێژێ کە هۆی تایبەتی هەبێ، کردنی لەم شەش کاتـەدا نابـاش‌و مەکروە نییە، بـەڵکوو سوننەتە، وەك سـوننەتی دەسـنوێژو سوننەتی دیـاری مزگەوت‌و نوێژی تەرم‌و نوێژگێڕانەوە.

## ١٢- باسی بانگ
## بابُ: الأذانِ

{بڕوانە: ریاض/٣، زنجیرە/١٨٦}.

١٩٠- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {طَـافَ بِـي -وَأَنَا نَائِمٌ- رَجُلٌ فَقَالَ: تَقُولُ: "اَللَّهُ أَكْبَرَ اَللَّهِ أَكْبَرُ، فَذَكَرَ اَلْآذَانَ - بِتَرْبِيع اَلتَّكْبِيرِ بِغَيْرِ تَرْجِيعٍ، وَالْإِقَامَةَ فُرَادَى، إِلَّا قَدْ قَامَـتِ اَلـصَّلَاةُ - قَـالَ: فَلَمَّـا أَصْـبَحْتُ أَتَيْـتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقّ..." } اَلْحَـدِيثَ. أَخْرَجَـهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ.

{أحمد ٤٣/٤ رقم: ١٦٥٢٥. ترمذی رقم: ١٨٩. أبـوداود رقـم: ٤٩٩. ابـن خزيمة ٣٧٠. ابن حِبان ١٦٧٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدورەببیهی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ خەوتبووم لەخەوما پیاوێ هاتە خەوم، بۆڵ (ناقووس)ێکی بەدەستەوە بوو، پێیم گوت: ئەی بەندەی باشی خودا! ئەم ناقووسە نافرۆشیت؟

گوتی: بۆچیتە؟ گوتم: خەڵکەکەی پێ کۆدەکەینەوە بۆکاتی نوێژ، گوتی: ئەی بۆچی شتێکت پێ نیشان نەدەم کە گەلێ لەم ناقووسە باشتر بێ بۆ بانگەواز بۆ کاتی نوێژ؟ گوتم: بفەرموو ئەوە چییە؟ فەرمووی: کاتێ بانگ دەڵێی بڵێ: ألله أكبر ألله أكبر، تاکۆتایی بانگ، لەسەرەتاوە چوار جار (الله أكبر)ی کرد، بەلام بەبێ تەرجیع، وە قامەتیشی فێرکردم، وشەکانو گوتەکانی قامەتیشی پێم گوت، هەموویان یەك جار یەکجار بوون، دووبارەیان تیادا نەبوو، ڕستەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێ، کە دووبارە بوو ئاوا: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ).

عەبدوڵڵای کوڕی زەید فەرمووی: جا بۆ بەیانی چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئەم خەوەم گێڕایەوە بۆی، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەم خەونەی کەتۆ دیوتە لەم بارەیەوە، خەونێکی ڕاستو دروستە...تاکۆتایی فەرموودەکە).

(ئەحمەدو ئەبوداوود دەریانهێناوە، تەرمەزیو ئیبنو خوزەیمە بە صەحیحیان داناوە).

(ڕوونکردنەوە):

١- عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدورەببیهی کوڕی ثەعلەبە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، هاوەڵی پێغەمبەرە، ئامادەی پەیمانی عەقەبەو بەدرو هەموو نەبەردگاکانی تر بووە، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا، ناسراوە بە خەوبینینی بانگ، کە ئەم خەونەی دی، کە لەم فەرموودەیەدا خۆی

گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کرد، کەبچێ بۆ لای بیلال‌و وشەکانی بانگی فێر بکا، هەتا بیلال بانگەکە بڵێ، چونکە بیلال دەنگی زوڵاڵترە.

ئەم خەونەی لەساڵی یەکی کۆچیدا بوو، لەپاش دروستکردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو، کەڕاوێژیان بەیەکتری دەکرد: کە چۆن چۆنی نوێژخوێنەکان کۆبکەینەوە بۆ کردنی نوێژە فەرزەکان، یەکێ دەیگوت: با زەنگێ دابنێین وەك هی نەصرانییەکان، وەك ئەوان لەکاتی کۆبوونەوە بۆ نوێژ، ناقووس لێ بدەین، هەندێ دەیانگوت: باوەك جوولەکەکان کەڕەنایەك دروست بکەین‌و لەکاتی نوێژدا فووی پیابکەین، تا نوێژخوێنەکان کۆببنەوە، جا ئەم عەبدوڵڵایە ئەم خەونەی بینی‌و پێغەمبەر پەسەندی کرد.

لەمەدینە مردووە، لەساڵی (٣٢) سیی‌و دووی کۆچیدا، لە تەمەنی (٦٤) شەست‌و چوار ساڵیدا، پێشەوا عوثمان نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد.

ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: سەعیدی کوڕی موسەییەب‌و عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاو کوڕەکەی خۆی کەناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەید بوو.

٢- بۆ ئەوەی کە بەباشی لەم وشانە حاڵی ببین، واتای (تەربیع)و (تەرجیع)و (تەثویب) دەکەین.

١- تەربیع رستەکە چوارجار بگوترێ، وەك رستەی (الله أكبر) لەسەرەتای بانگەوە چوارجار دەگوترێ.

٢- تەرجیع سوننەتە، ئەوەیە کەبانگبێژ لەپێش ئەوەدا کە بەدەنگی بەرز دوو وشەی شەهادەت بڵێ، لەژێر لێوەوە بە پەنامەکی ئەم دوو وشەیە بڵێ ئاوا: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله».

ئەوجا بەدەنگی بەرز بیانڵێتەوە، ئاوا: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله».

٣- تەثویبیش سوننەتە، ئەوەیە کە لەبانگی بەیانیدا، بانگدەر لەپاش (حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ) دووجار بڵێ (الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ). واتە: نوێژ باشترە لەخەو، بۆیە تەثویب بەس لەبانگی بەیانید دەگوترێ، چونکە زۆرینەی نوێژکاران لەوکاتەدا نووستوون.

٤- تەرجیع واتە: دووبارەکردنەوەو تێهەڵچوونەوە.

٥- تەثویب لەوەوە هاتووە کە پیاو لەدوورەوە بەهاوار هاوارەوە بێت، بە (ثَوْبَ)ەکەی، واتە: بەجلەکانی ئاماژە بکا، هەتا خەڵك ببیینن و لێی حاڵی ببن، جا بانگبێژیش وەك چاو لەو هاوارکەرە بکا وایە. هەندێ تر دەفەرموون: (تَثْوِيب مِنْ ثَابَ يَثُوبُ إِذَا رَجَعَ).

واتە: تەثویب بەواتا تێهەڵچوونەوەیە، چونکە بانگبێژ لەپێشدا بە (حَيَّ عَلَى الصلاةِ)و بە (حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ) هانی خەڵکەکەی داوە، کە بەزوویی بێن بۆ نوێژ، کە دەڵێ (الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ) دیسان تێهەڵدەچێتەوە لەهاندانی خەڵك کەبێن بۆ نوێژ، یان بەزوویی نوێژەکەیان بکەن.

١٩١- وَزَادَ أَحْمَدُ فِي آخِرِهِ قِصَّةَ قَوْلِ بِلَالٍ فِي آذَانِ اَلْفَجْرِ: {اَلصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ اَلنَّوْمِ}.

{أخرجهُ أحمد فی المسند (٤/٤٢)}:

واتە: ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ڕاگوێز کردووە، کە لە ژمارە (١٩٠)دا رابورد، ئەوجا فەرموودەکەی بیلالی لکاندووە بەکۆتاکەیەوە، کە ئەمەیە:

بـيلال (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی بـیلال! کـەبانگی یەکـەمی بـەیانی دەدەیـت، بڵـێ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ).

(ڕوونکردنەوە):

١- بـیلالی کـوڕی ڕەبـاحی حەبەشـی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) نـاودارەو ناسـراوە بـە (مُـؤَذِنُ الرَّسـولِ: بانگبێـژی پێغەمبـەری خـودا) یەکێکـە لـە موسـوڵمانە هەرەپێـشینەکان، دەڵێن: حەوتـەم کـەس بـووە کـە ئیـسلام بـووە، دایکی نـاوی حەمامـە بـووە، برایـەکی هـەبووە نـاوی خالیـد بـوو، خوشـکێکی هەبوو ناوی غەفرە یا غوفەیرە بوو، حەمامە لەپێناوی ئیسلاما ئێش‌و ئازارو ئەشـکەنجەی زۆری چەشـت، هـەتا ئـەبوبکری صـدیق کـڕی‌و ئـازادی کـرد، لـە ئیستیعابا دەفەرموێ: خالیدی کوڕی ڕەباحی ئەلحەبەشی بـرای بـیلالی کـوڕی ڕەباحە، کە بیلال بانگدەری پێغەمبەر بوو، خالید لەهاوەڵانی پێغەمبەرە.

لـە (إصـابة)دا دەفـەرموێ: غوفـەیرەی کـچی ڕەبـاح خوشـکی بـیلالی بانگدەری پێغەمبەرە. بیلال پیاوێکی کەڵەگەتی لاواز بوو، ڕەنگی سەوزە بـوو، زۆر دڵپـاك‌و دڵـساف بـوو، زۆر موسـوڵمانێکی جـوان‌و ڕاسـت‌و دروسـت بـوو، بتپەرستەکان لەسەر ئیسلامەتی ئازارو ئەشـکەنجەیەکی زۆریانـدا، ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف لەقرچـەی گـەرمای نیـوەڕۆدا، لەسـەر زیـخ‌و لم‌و چـەوی زیخەلانەکـەی مەککـە، لەسـەر گـازەری پـشت، تـەخت ڕای دەکێـشاو تـاوێری گەرمی گەورەی دەخستە سەر سکی‌و پێی دەگوت: یاکافر دەبی بە موحەممەد، یا ئەمە حاڵتە تادەمری!

بیلالیش لەسەر ئەوحاڵە، هەر دەیگوت: (ئەحەد، ئەحـەد: خـودا یەکـە، خودا یەکە) لەسەر ئەم حاڵە ئەبوبکر لەم کاتەدا بینی، کـڕی‌و ڕزگـاری کـردو ئازادی کرد.

بـــيلال لەهـــەموو شـــەڕگاو نەبـــەردو مەڵبەنـــدەكانی جەنگەكانـــدا، لەخزمـــەتی پێغەمبـــەردا ئامـــادەی جەنگـــەكان بـــووە، هەمیـــشە لەخزمـــەت پێغەمبـــەردا بـــووە، لێـــی جیانـــەدەبۆوە مەگـــەر لـــەكاتی تایبەتـــدا، لـــەكاتی پەیمانبەستنی برایەتیدا، لەنێوانی موسوڵماناندا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بـیلالی كـرد بـەبرای ئـەبو عوبەیـدەی جـەرراح، لـەپاش وەفـاتی پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بـیلال دەچـوو بـۆ غـەزا كـردن، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بـیلالی زۆر خۆشدەویـست، ئەوانـەی كـەبۆ یەكـەمجار ئیـسلامبوونیان ئاشـكرا كـرد ئـەم حـەوت كەسـە بـوون: پێغەمبـەرو ئـەبوبكرو عـەممارو سـومەییەی دایكـی عـەممارو صـوهەیبو بـیلالو میقـداد بـوون. بـیلال لەسـەردەمی پێغەمبـەر خـۆیو لەسـەر دەمـی جێنـشینی ئـەبوبكردا، بـانگی دەدا، ئـیتر بـانگی نـەدا، بـەڵام كاتـێ پێـشەوا عومەری كوڕی خەتاب، داخڵی شام بوو بانگی دا، عومەرو هـەموو خەڵكەكـەی كردە گریان. بیلال فەرموودەی لە كوتوبی سیتتە (شـەش پەڕاوەكـە)دا هەیـە، لەژمارە (٦٣٦و ژمارە ٣٢١٧)ەی صەحیحی موسلیمدا، تەخریجو تەرقیمی شـێخ خلیـل مـەئموون شـیحادا، ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەكـا كـە ئیمـامی بـیلال، سـەرەڕای موسـلیم، بوخـاریو ئـــەبوداوودو تەرمـــەزیو نەسـائیو ئیبنـــو ماجـــەیش گێڕانـەوەیان لەبیلالـەوە ئـەنجام داوە، ئـەم زاتانـە گێڕانـەوەیان لـە بیلالـەوە كردوووە:

ئـــەبوبكری صـــەدیقو ئیمـــامی عومـــەرو ئوســـامەو عەبـــدوڵڵای كـــوڕی عـــەمری كـــوڕی عـــاصو كەســـانی تـــریش. بـــیلال خـــودا بـــۆی دەڕەخـــسێنێ ئومەییـــەی كـــوڕی خەلـــەف، كـــەزۆر ئـــازاری بـــیلال دەدا دەكـــوژێ، ئـــەبوبكری صەدیق بەم هۆنراوەیە پیرۆزباییو دەستخۆشی لێ دەكا (وافر):

هَنِيئـــــاً، زَادَكَ الـــــرَّحْمنُ خَيْـــــراً

فَقَـــدْ أَدْرَكْـــتَ، ثَـــأْرَكَ يَـــا بِـــلاَلُ!

واته:

بیلال! دەستت خۆش پیرۆز بێ یاخوا

تۆڵەی خۆتت سەند لەدوشمنی خوا

بیلال لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لەشام، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا گیانی پاکی سپارد {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٤١ = ٦٣٦ ترقیم شیحا} + {تەجریدی بوخاری/٣ ژمارە: ١٠١٧} + {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥ لاپەڕە: ٦٤٨ ج/٤، ژمارە: ٣٣٩٤ - ٣٣٩٦}.

٢- ئایا بڕیاری شەرعی لەخەون وەردەگیرێ؟

وەڵام: زاناکان دەفەرموون: دروستە خەون بکرێ بەسەرە داوێ، وە لەو رووەوە کاری پێ بکرێ، بەڵام بەخەونی رووت بڕیاری شەرعی پێ دروست نابێ، ئەم خەونە بۆیە کراوە بە سەرچاوەی بانگ چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەسەندی کردووە.

له (فتح ذی الجلال والإكرام بشرح بلوغ المرام)دا، دەفەرموێ: (جارێ شێخ عەبدولقادری گەیلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەخەوندا، نوورێکی گەورەی بێ وێنە دەبینێ، لەناو ئەو نوورەوە بانگدەرێ بانگی دەکا: ئەی عەبدولقادر! فەرزی نوێژ لەسەر تۆ هەلگیراوە، ئیتر پێویست ناکا کە نوێژ بکەیت؟!!

شێخ عەبدولقادر پێی دەڵێ: درۆدەکەی، تۆ شەیتانیت، دەنا چۆن نوێژ لەسەر موسوڵمان لادەبرێ، ئیتر نوورەکە نامێنێ).

کەواتە: هەرخەونێ بەپێچەوانەی یاسانامەی خوداوە بێ پووچەو درۆیەو، لەشەیتانەوەیە، لەخودای میهرەبانەوە نییە. لەکتێبو پەڕاوە بایەخدارەکانی ئاییندا، بایەخی باش بەخەون دراوە، وەزۆر جار بووە، بەرێخۆشکەرو نیشانەو بەڵگە بۆ زۆر شتی باش.

**( خەونێکی دروست ):**

جارێ، دووجار، لەگەڵ برادەرانا، ناوی (مامۆستا شێخ کەمالی شێخ نوری شێخ باباعەلی تەکییەیی)مان بەخراپە هێنا، کەشێخ کەمال خەتیبی مزگەوتی گەورە بوو.

شەوێ لەخەوما مامۆستا شێخ نوریم بینی، وەك سەردەمی ژیانی ڕیشێکی جوانی هەبوو، مێزەری بەسەروە بوو، جبەکەی دابوو بەسەر شانەکانیداو لەهەیوانی مزگەوتەکەی خۆیان، بەهێمنی چوامەشقی دانیشتبوو، منیش وەك جاران چووم دەستی ماچ بکەم بەڵام دەستی نەدا پێم‌و دەستی خستە پشت خۆیەوەو فەرمووی: (لاچۆ ئێمە سەیدین، نەوەی پێغەمبەرین، بۆچی دەچی غەیبەتمان دەکەی؟!).

لەنزیکترین هەلی رەخساودا، چووم بۆ خزمەتی مامۆستا شێخ کەمال، لەهۆدەکەی خۆی، لەمزگەوتی گەورەی شاری سلێمانی، دەستم ماچ کردو خەونەکەم گێڕایەوە بۆی‌و تکام لێ کرد کە گەردنم ئازاد بکا، دەستی کردە ملم‌و دەستی کرد بەگریان‌و فەرمووی:

(نوری! وام دەزانی تۆ پیاوێکی خراپی، بەڵام بەپێچەوانەوە پیاوی باشی). منیش دڵم گەرم بوو لەگەڵیا دەستم کرد بەگریان!!

١٩٢- وَلِابْنِ خُزَيْمَةَ: عَنْ أَنَسٍ قَالَ: {مِنْ اَلسُّنَّةِ إِذَا قَالَ اَلْمُؤَذِّنُ فِي اَلْفَجْرِ: حَيٌّ عَلَى اَلْفَلَاحِ، قَالَ: اَلصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ اَلنَّوْمِ}.

{أخرجه ابن خزيمة فى صحيحه برقم: ٣٨٦ والبيهقى فى السنن ٤٢٣/١ وقال: إسناد صحيح}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەدەستووری ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، کاتێ بانگبێژ بانگی بەیانی دەبێژێ، لەپاش گوتنی (حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ) دووجاریش بلێ: (الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ).

(ڕوونكردنەوە):

گوتەی ڕاستو دروست ئەوەیە کە گوتەی (الصَّلَاةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ) لەبانگی دووەمی بەیانیدا دەگوترێ، کە لەپاش شەبەق دەدرێ، نەك لەبانگی یەکەما دەگوترێ کە لە شەودا دەگوترێ. ئەم بانگی دووەمە پێشی دەگوترێ بانگی یەکەم، بەو واتایە کە بانگی دووەم بۆ نوێژقامەتە.

کەواتە بۆ نوێژی بەیانی سێ بانگ دەدرێ:

یەکەم: کاتەکەی کۆتایی شەوە، بۆ ئاگادارکردنەوەیە، وە ئێستا باوە لەهەندێ شوێن، بەرلەبانگ سەلا دەکرێ.

دووەم: کاتەکەی پاش شەبەقی بەیانە، نوێژی پێ دەکرێو خواردنو خواردنەوە لە ڕۆژووەوان نادروست دەبێ.

سێیەم: قامەتە، کە یەکسەر والەپێش دابەستنی نوێژەوە.

١٩٣- عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَّمَهُ اَلْآذَانَ، فَذَكَرَ فِيهِ اَلتَّرْجِيعَ}. أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ. وَلَكِنْ ذَكَرَ اَلتَّكْبِيرَ فِي أَوَّلِهِ مَرَّتَيْنِ فَقَطْ. وَرَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ فَذَكَرُوهُ مُرَبَّعًا.

{پوختەی موسلیم ١٩١ = ٨٤٠ شیحا = ٣٧٩ مسلم. أبوداود رقم/٥٠٢. ترمذی رقم ١٩١. نسائی رقم ٤٠٢. ابن ماجە رقم ٧٠٨. أحمد ٤٠٩/٣}:

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا ئاوایە: لە تاجا دەڵێ: ئەبو مەحزورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی فێرکردم، نۆزدە وشە بوو، قامەتیشی فێرکردم حەڤدە وشە بوو، بانگ ئەمەیە: بە دەنگی بەرز لەسەرەتاوە بڵێ: (الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر) تەواو دەنگی خۆتیان لێ هەڵبڕە، ئەنجا بەدەنگی نزم دەڵێیت:

(أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ).

ئینجا دوابەدوای ئەم شایەتمانە، بەدەنگی بەرز بڵێ:

(حَيَّ عَلَى الصلاةِ، حَيَّ عَلَى الصلاةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ).

ئەگەر بۆ نوێژی بەیانی بانگت دەدا، لەپاش ئەمە بڵێ:

(الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ).

کۆتایی بانگەکەیش هەمیشە بەم وشە پیرۆزە بهێنە:

(الله اكبر، الله اكبر، لاإله إلاالله).

قامەتیش ئەمەیە:

(الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ، حَيَّ عَلَى الصلاةِ، حَيَّ عَلَى الصلاةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، الله اكبر، الله اكبر، لاإله إلاالله).

لەگێڕانەوەیەکا: قامەت بەم جۆرەیە:

(الله اكبر، الله اكبر، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ، حَيَّ عَلَى الصلاةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، الله اكبر، الله اكبر، لاإله إلاالله).

{تاج/١ لاپەڕە: ٢٢٤، زنجیرە — ٦٠ ج/١ = تاج/١، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٤٢٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

ئەمەیش واتای دانەرە لەم فەرموودەیە:

ئەبو مەحزوورە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی فێرکردم، ئەبو مەخزوورە تەرجیع لە شەهادەتەیندا باس دەکا، موسلیم ئەم فەرموودەی ئەبو مەحزووە

دەگێڕێتەوە، بەڵام لەسەرەتای بانگەوە (الله اکبر)ی دووجار گوتووە، هەروا پێنج پێشەواکانی فەرموودەیش، کە ئەحمەدو ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەن، ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، بەڵام چوارجار (الله اکبر)یان لەسەرەتای بانگەوە گوتووە.

ئەمەیش وەرگەڕاوی گێڕانەوەکەی موسلیمە: (ژمارە: ١٩١ پوختەی موسلیم = ٨٤٠ شیحا):

ئەبو مەحزوورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (بەدەنگی بەرز لەسەرەتاوە بڵێ: «اللّٰهُ أَكْبَرُ، اللّٰهُ أَكْبَرُ» ئینجا بەدەنگی نزم لەژێرلێوەوە بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّٰ اللّٰهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّٰ اللّٰهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ» ئەوجا دووجار بڵێ: «حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ» ئەوجا دووجار بڵێ: «حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ».

پێشەوا موسلیم، ئەم فەرموودەیە لەچەند مامۆستایەکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە یەکێ لەو مامۆستایانەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە، بۆیە لێرەدا موسلیم دەفەرموێ: ئیسحاق ئەمەی لەم فەرموودەیە، پتر کردووە: ئەوجا بڵێ:

«اللّٰهُ أَكْبَرُ، اللّٰهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاّٰ اللّٰهُ».

١٩٤- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ اَلْآذَانَ، وَيُوتِرَ اَلْإِقَامَةَ، إِلَّا اَلْإِقَامَةَ، يَعْنِي قَوْلَهُ: إِلاّ قَدْ قَامَتِ اَلصَّلَاةُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ مُسْلِمٌ اَلِاسْتِثْنَاءَ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٥١ = ٦٠٥، ٦٠٣، ٦٠٦، ٦٠٧، ٣٤٥٧. موسلیم ٣٧٨ = ٨٣٦ شیحا. أبوداود: ٥٠٨، ٥٠٩. ترمذی ١٩٣، نسائی ٦٢٦}:

ئەنەس (رەزای خوودای لێ بێ) فەرمووی: فەرمانکرا بە بیلال (رەزای خودای لێ بێ) کە وتەکانی بانگ جووتە بڵێ، وە وتەکانی قامەت بەتاك بڵێ، وتەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێ، بەلاّم ئەو وتەیە لەقامەتدا جووتێ جار بڵێ ئاوا (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ).

دانەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە لەفظی موسلیم ئاوایە (أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ) ئیتر کۆتایی بە فەرموودەکە دێو گوتەی (إلاّ الإِقَامَةَ) کە بەواتای رستەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ)ووە، لەدوای فەرموودەکەوە نییە. بەلاّم ئەمەی دانەر دەفەرموێ: دەقی ژمارە (٨٣٩)ی صەحیحی موسلیمە، بەپێی ژمارە دانانی شێخ خەلیل مەئموون شیحا، بەلاّم لەژمارە (٨٣٦)ی صەحیحی موسلیما وشەی (إلاّ الإِقَامَةَ) هەیە، کەزیادەی طەریقی یەحیایە.

١٩٥- وَلِلنَّسَائِيِّ: {أَمَرَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِلَالاً}.

{النسائی فی سننه ٢/٣. ابن ماجه رقم: ٧٢٩. أبوداود رقم: ٥٠٨}:

نەسائی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەئیمامی ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: ئەنەس لەم گێڕانەوەی نەسائیدا، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە بیلال کرد کە وشەکانی بانگ ... تادوایی فەرموودەکە.

(روونکردنەوە):

مەبەستی دانەر لەم ژمارە (١٩٥)ە ئەوەیە، کە فەرموودەکەی پێش ئەم ژمارەیە، کەژمارە (١٩٤)ە، کە مُتَّفَقٌ عَلَيـهِ یە، ئەویش گەرچی بەسیغەی (أُمِرَ بِلاَلُ) هاتووە، کەسیغەی بینا مەجهوولە، بەلاّم بەپێی ئەم فەرموودەیەی نەسائی کە فەرمانکەرەکە بە بیلال پێغەمبەرە، کەواتە ئەویش مەرفووعەو موقوف یامرسل نییە.

١٩٦- وَعَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {رَأَيْتُ بِلَالاً يُؤَذِّنُ وَأَتَتَبَّعُ فَاهُ، هَاهُنَا وَهَاهُنَا، وَإِصْبَعَاهُ فِي أُذُنَيْهِ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{أحمد ٤/٣٠٤. ترمذی رقم: ١٩٧}:

١٩٧- وَلِابْنِ مَاجَهْ: وَجَعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ).

{ابن ماجة/ ٧١١}:

١٩٨- وَلِأَبِي دَاوُدَ: {لَوَى عُنُقَهُ، لَمَّا بَلَغَ "حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ " يَمِينًا وَشِمَالاً وَلَمْ يَسْتَدِرْ } وَأَصْلِهِ فِي الصَّحِيحَيْنِ.

{أبوداود رقم: ٥٢٠، تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ١٤٠ = ١٨٧، ٣٧٦، ٤٩٥، ٤٩٩، ٥٠١، ٦٣٣، ٦٣٤، ٣٥٥٣، ٣٥٦٦، ٥٧٨٦، ٥٨٥٩، مسلم ٥٠٢ = ١١٢٢٠ ترقيم شيحا}:

**لەتاجدا ئەم (٣) سێ ژمارەیە ئاوایە:**

**ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیلالم بینی، بانگی دەدا، بەدەم بانگدانەکەوە دەخولایەوەو، ئەملاو ئەولای دەکردو دەمی خۆی بەڕاستو چەپا دەسووڕاند، وەدوو پەنجەی خۆشی نابوونە ناو هەردوو کونە گوێی خۆی، تا دەنگی تەواو بەهێز بێو بەهەر چوارلادا بگا، لەوکاتەدا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو چادرێکی سووری چەرمینا بوو، کەهی خۆی بوو، ئینجا بیلال لەبەردەمیەوە ڕۆیشت، نێزەیەکی پێ بوو، لەزیخەلانەکەی بەطحادا دای چەقاند، کردی بە بەربەست (سوترە) بۆ نوێژەکە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دابەست، ئیتر لەودیو نێزەکەوە، سەگو کەرو ئاژەڵو ماڵاتو خەڵك بە بەرنوێژەکەیدا، ئاموشۆیان دەکردو قەدەغە نەدەکرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، زۆرباش لەیادمە، دەڵێی ئێستایە، بریقەی لاقەکانیم هەر لەبەرچاوە!!**

لەگێڕانەوەیەکا: کاتێ بیلال لەبانگەکە گەیشتە سەر «حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ» ئەستۆی خۆی بەلای ڕاستیا بادا، وەکاتێ گەیشتە سەر «حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ» ئەستۆی خۆی بەلای چەپیا بادا، بەڵام سینگی نەدەسووڕانەوە لەگەڵیا. {تاج/١، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٤٢٥ – ت/ش/د/ن} بۆ ژیاننامەی ئەبو جوحەیفە بڕوانە: ژمارە: ١٩٩.

١٩٩– وَعَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَعْجَبَهُ صَوْتُهُ، فَعَلَّمَهُ اَلْآذَانَ}. رَوَاهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{ابن خزيمة رقم: ٣٧٧، ٣٨٧، ٣٧٩، ٣٥٨. نسائي ٢/٥، ١٣، ١٤. أبوداود رقم: ٥٠٠. ترمذي رقم: ١٩. ابن حبان رقم: ١٦٨٠ – الاحسان}:

ئەبو مەحزوورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەنگی منی بەدڵ بوو، دەنگی پەسەند کردم، لەبەر ئەوە فێری بانگی کردم. مەبەست ئەوەیە: کەواتە سوننەتە بانگدەر دەنگی خۆش بێ.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی وەهبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی سوائییە، خەڵکی کووفەیە، لەکۆتای تەمەنی حەزرەتدا بە خزمەتی گەیشتووە، ئەوکاتە مێردمناڵ بووە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرو ئیمامی عەلیو بەرای کوڕی عازیبەوە هەیە، عەونی کوڕیو شەعبیو ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیو کەسانی تریش گێڕانەوەیان لەوەوە هەیە، چلو پێنج فەرموودەی هەیە، لەو چلو پێنجە، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرن، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی تری بەجیا هەیە (واتە: لەموسلیما نین) لەصەحیحی موسلیما (٣) سێ فەرموودەی تری بەجیا هەیە، سەرجەمی فەرموودەکانی لەبوخاریدا چوارن، لە موسلیمدا پێنجن، لە صەحیحەینا = ٢ + ٢ + ٣ = ٧ فەرموودە.

پێشەوا عەلی زۆری خۆشدەویستو زۆر ڕێزی لێ دەگرتو زۆر جێگەی متمانەی ئەو بوو، کردی بەلێپرسراوی سەر بەیتولمال، لەکووفە، لەهەموو شەڕو شەڕگاکانی عەلیدا لەگەڵیا بوو، لەکووفە نیشتەجێ بوو، کۆمەڵەکە (الجماعة) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە لەهاوەڵە منالەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەژمێردرێ، دەشڵێن: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مردووە، ئەوهێشتا ڕەسیدە نەبووە، لەسەر فەرمایشتی عومدەتول قاری شەرحی صەحیحی بوخاری، لەحەفتاو دووی کۆچیدا مردووە، لە (الإصابة فِي تَمْيِيز الصَّحَابة)دا، دەفەرموێ: (واقیدی دەفەرموێ: لەو سەردەمەدا کە بیشر والی عێراق بووە مردووە). {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٤٤ + پوختەی بوخاری = تەجرید بوخاری/١، ژمارە: ١٤٠}.

٢٠٠- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: { صَلَّيْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْعِيدَيْنِ، غَيْرَ مَرَّةٍ وَلَا مَرَّتَيْنِ، بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٤٢٧ = ٢٠٤٨، ٢٠٤٤ شیحا = ٨٨٧ مسلم}:

جابیری کوڕی سەمووره (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەك جارو دووجار، بەڵكوو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەکانم کردووە بەکۆمەڵی لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ بانگو بەبێ قامەت. {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩٠٥ — ش/د/ت = بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزی}.

٢٠١- وَنَحْوُهُ فِي اَلْمُتَّفَقِ عليه، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، وَغَيْرُهُ.

{بوخاری ٩٦٠ = ٥٠٣ تجریدی بوخاری. مسلیم ٨٨٦ = ٢٠٤٦ مسلیم شیحا}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەروا جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: نە لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزاناو،

نەلەرۆژی جەژنی قوربانا، بۆنوێژی جەژن بانگ نەدەدرا. {تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٠٣}.

٢٠٢- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ فِي اَلْحَدِيثِ اَلطَّوِيلِ، { فِي نَوْمِهِمْ عَنْ اَلصَّلَاةِ - ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ، فَصَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَمَا كَانَ يَصْنَعُ كُلَّ يَوْمٍ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٢٢٩ = ١٥٦٠ = شیحا = مسلم ٦٨٠، ٦٨١. پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٤٤ = ٥٩٥، ٧٤٧١ فتح الباری}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: ئێوە ئەم پاش نیوەڕۆیەتانو ئەم شەوتان بەتەواوی بەڕێوە دەبن، بۆ سبەینێ خوا حەزکا دەگەنە سەر ئاو.

ئیتر خەڵکەکە بەرەو مەبەست کەوتنە ڕێ، کەس ئاوڕی لەکەس نەدەدایەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ ملی ڕێگەیان گرتبوو دەڕۆیشتن، ئەبو قەتادە فەرمووی: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو شەوە بەڕێوە بوو، هەتا شەو دوو کوت بوو، منیش لەتەنیشتیەوە دەڕۆیشتم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەم وەنەوزەوە، بەسەر وڵاخەکەی ژێریەوە لاربۆوە، منیش پەلاماریم داو، ڕاستم کردەوە، هەتا وەك جاران ڕێك ڕاوەستا لەسەر پشتی وڵاخەکە.

ئیتر ڕۆیشتین هەتا شەو بەرەو بەیان شۆڕ بۆوە، دووبارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەم وەنەوزەوە، بەسەر پشتی وڵاخەکەیەوە، جارێ تر لاربۆوە، منیش دیسان بەهێواشی ڕاستم کردەوەو، لەسەر پشتی وڵاخەکەی ڕێك بۆوە، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ، هەتا دواکاتی بەرە بەیان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەر وڵاخەکەیەوە لارەوە بوو، گەلێ لەدوو جارەکەی پێشوو زیاتر، تەنانەت خەریك بوو بەرەوە بێ، دیسان

چوومەوە ڕاستیم کردەوە، سەری بەرزەوە کردو، فەرمووی: (ئەوە کێ بوو؟) گوتم: من بووم، ئەبو قەتادەم. فەرمووی: لەکەیەوە لەگەڵ مندا وای بەڕێگەوە؟. عەرزیمکرد: لەسەرەتای شەوەوە من لەخزمەتتا وام بەڕێگەوە. فەرمووی: (خودای گەورە بتپارێزێ، وەك چۆن تۆ ئەم شەو پێغەمبەرەکەی ئەوت پاراست). ئەوجا فەرمووی: (بەزەینت ئایا ئێمە لە خەڵکەکە دیارینو گومیان نەکردووین؟). ئەوجا فەرمووی: (ئایا کەسیان دەبینی؟). گوتم: بەڵێ، ئەوە سوارێکە، ئائەوە سوارێکی تریشە، هەتا کۆمەڵ بووین بووین بەحەوت سوار، جا پێغەمبەر خۆی لایدا بۆ لاڕێکەو ئێمەیش لەگەڵیدا لاماندا، بۆ وچانو سەرخەو شکاندن، جا ڕاکشاو سەری نایەوە کە بخەوێو فەرمووی: (ئاگاتان لەنوێژی بەیانیمان بێ، بەهۆی خەولێکەوتنەوە، نەفەوتێ).

بەڵام لەبەر شەکەتیو ماندوویی ڕێگە، هەمووومان خەوێکی قووڵمان لێ کەوتو، کەسمان خەبەرمان نەبۆوە هەتا خۆر دەکەوێو تینەکەی دەدا لەپشتی پێغەمبەرو ئەو یەکەم کەسمان بوو کە خەبەری دەبێتەوە.

فەرمووی: جا بەشەڵەژاوی لەخەو ڕاپەڕین، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سواربن با بکەوینە ڕێ) ئەوجا سواربووینو دەستمانکردەوە بەڕۆیشتن، هەتا خۆر بەرزەوە بوو، لەشوێنێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەزیو ئێمەیش دابەزین، من جەوەندەیەکم پێ بوو، کەمێ ئاوی تیادا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای جەوەندەکەی منی کردو دەسنوێژێکی سووکەڵەی لێ گرت، لەپاش دەسنوێژەکەی کەمێ ئاو لە جەوەندەکەدا مابوو، بەمنی فەرموو: ئەبوقەتادە! ئاگات لەم جۆرە ئاوە بێ کەوا لەم جەوەندەی تۆیەدا، زایەی نەکەی، پاش کەمێ دەبێ بەهۆی موعجیزەیەکی وەها لەدونیادا دەنگ بداتەوە!

ئەوجا بیلال بانگی بۆ نوێژی بەیانی دا، لەپاش بانگەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی وەك

جـاران كـرد، ئێمـەیش هـەروا ئـەو دوو ركاتـە سـوننەتەمان كـرد، ئـەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی دا بـە بـیلال قامـەتی كـرد، ئەوجا بەجەماعەت نوێژی بەیانی دەق وەك ڕۆژانـی تـری، بۆمـانكرد، ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـوار بـوو كەوتـە ڕێ، ئێمـەیش سـواربووین‌و لەخزمەتیـدا كەوتینـە ڕێ. جـا لـەناو خۆمانـا بەچپەو سـرتە كەوتینە مقۆ مقۆ: دەبێ كەفارەت‌و تاوانپۆشی ئەم كارەمان چی بێ، كـە لـەم نوێژەمانـــدا، كەمتەرخـــەمی‌و درێغیمـــان كـــرد، تانوێژەكـــەمان چـــوو؟ پێغەمبـــەریش (دروودی خـــودای لەســـەر بـــێ) فـــەرمووی: (ئایـــا مـــن خـــۆم سەرمەشق نیم بۆ ئێوە؟ كەوابوو ئێوەیش وەك من هـەر ئەوەنـدەتان لەسـەرە كە ئەو نوێژە بگێڕنەوەو بەس!).

ئەنجا فەرمووی: (لەڕاستیدا، نوێژ چوون بەهۆی خەووەوە قەیـدی نییـە، بـەلام ئـەوەی كـە قەیـدی هەیـە: نوێـژ چـوونی كـاتی بەخەبـەر بوونـە، كەنوێژخوێن، بەقەستی، بەبێ مەهانـەی ڕەوا، نوێژەكـە نـەكا لـەكاتی خۆیـدا، هەتا كاتی نوێژەكەی دوای ئەو دادێت، جا ئەگەر كەسێ شتی وای كرد، بەهۆی خەووەوە، یان بەهۆی لەبیرچوونەوە، یابەقەسـتی، نوێـژێكی چواندو نـەیكرد، هەركەسێ وای كرد، باهەركاتێ بیری كەوتەوە، یاویستی، بانوێـژە فەوتاوەكـەی بگێڕێتەوە، بەلام لەوەدوا، باهەموو كاتێ ئەو نوێـژە فـەوتاوە، لـەكاتی ئاسـایی ڕۆژانیدا بیكا، نەوەك لەوكاتەدا كە نوێژەكەی تیا گێڕاوەتەوە!).

ئـەوجا فـەرمووی: (ئـەو خەڵكـەی لەگـەڵمان بـوون، كەئێـستا لێمـان دابڕاون، بەڕای ئێوە، سەبارەت بەدابڕانی ئێمە لێیان، دەبێ چییان گوتبێ؟).

جـا كەسـێ لـەو شـەش حـەوت كەسـەی كـە لەگـەڵیا بـوون، وەلامیـان نەدایـەوە، پێغەمبـەر خـۆی فـەرمووی: (كاتـێ ڕۆژیـان لێ دەبێتـەوە، دەبیـنن پێغەمبەرەكـەیان دیـار نییـەو لێیـان ون بـووە، دەسـت دەكـەن بەڕاوێـژو دەربڕینـی بۆچـوونی خۆیـان، لـەبارەی جێگـەو ڕێگـەی ئێمـەوە، ئـەبوبكرو

عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) بەخەڵکەکـە دەڵـێن: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا لەدوامانەوە، دڵی نایێ لێمان پێش بکەوێ، کەواتە با چاوەڕوانی بکەین، هەتا تەشریفی دەهێنێو پێمان دەگاتەوە، بەڵام خەڵکەکە دەڵـێن: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پـێش کـەوتووەو لەپێشمانەوەیە، کەواتە: زووکەن باپێی بگەین، جا ئەگەر بەگوێی ئەبوبکرو عومەر بکەن، پەی بەڕاستی دەبەن، چونکە قسەی ئەوان ڕاستە).

ئەبوقـەتادە فـەرمووی: جـا ئەوکاتـە گەیـشتینەوە بەخەڵکەکـە، کـەرۆژ درەنگ دەبێو تینی خۆر هەموو شتێ گەرم دەکا.

جا خەڵکەکە هاواریان لێ هەڵسا: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەگەر فریامان نەکەوی، فەوتاوین، تینومانە!!

فـەرمووی: (موژدەبـێ نافـەوتێن!!) ئـەوجا فـەرمووی: (جامۆڵکەکـەی خۆمم بۆ بهێنن).

ئەنجا داوای جەوەندەکەی ئەبو قەتادەی کرد، کەچۆڕێ ئاوی تیا مـابوو، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خـۆش خـۆش جامۆڵکەکـەی لـە جەوەندەکـە پـڕ دەکـردو دەیـدا بـە ئـەبو قـەتادەو ئـەویش دەرخـواردی یـەکێکیانی دەدا، جـا کاتـێ مەردومەکـە، ئـاوی نـاو جەوەندەکـەیان بینـی پەلاماریان داو، دابـارین بەسـەریدا، پێغەمبـەریش پێی فـەرموون: (بـێ وێڵی مەکـەن، ڕەفتارتـان جـوان بـێ، مەترسـی ئـەوەتان نـەبی کـە ئاوەکـە کەمـەو بەشـتان ناکـا، دڵنیـابن کـە خـوای گـەورە پیـتو فـەڕێکی وای تـێ دەخـات، کەبەزیادەوە بەشی هەمووتان دەکاو هەمووتان تێراوو پاراو دەبن!!).

فەرمووی: ئـیتر ئـەوانیش هێـور بوونـەوەو وایـان کـرد، ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) خـۆش خـۆش ئـاوی لـە جەوەندەکـە ڕۆ دەکـردە جامۆڵکەکەوەو دەیدا بەمنو منیش دەمـدا بـە یـەکێکیان دەیخواردەوەو هـەتا هەموویان تێراو بوونوماینەوە منو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ)

فـەرمووی: (ئـەوجا پێغەمبـەر جامۆڵکەکـەی پڕکـردو دای بـەمنو فـەرمووی پـێم: (بخـۆرەوە). عـەرزیم کـرد: هـەتا تـۆ نەخۆیتـەوە، مـن ناخۆمـەوە ئـەی پیغەمبەری خودا!.

فەرمووی: (ئاخر کەسێ خواردنەوە بـدا بـە کۆمـەڵێ دەبـێ خـۆی لـەدوا هەموویان ببخواتەوە!).

قەتادە فەرمووی: (جا منـیش خواردمـەوەو پێغەمبـەریش خواردیـەوە. فەرمووی: جا کاتێ گەیشتینە سەرکانیو ئاو، خەڵکەکە، حەوابوونـەوەو پـاراو بوونو بەتێراوی گەیشتینە سەری!!).

ثابیتی بەنانی فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی رەباح فەرمووی: ئەوا جارێ لەمزگـەوتی گـەورەی بەصـرە، کـە جومعـەو جەماعـەتی تیـا دەکـرێ، ئـەم فەرموودەیـەم بـۆ دانیـشتوان دەگێڕایـەوە، لـەناکاو عیمرانـی کوڕی حوصـەین پێی فەرمووم: ئـەی نەوجـەوان! وردبـەرەوە کەچۆن فـەرموودە دەگێڕیتـەوە، وریابە بەهەڵە نەیگێڕیتەوە، دەی بزانە کەئـەو شـەوە، مـن سـوارێ بـووم لـەو کۆمەڵە سوارانە.

منیش عەرزیم کرد: دەی تۆ زاناتری بـەم فەرموودەیـە. جـا فـەرمووی: تۆ چ کەسەی؟ گوتم: لـە یاریـدەدەرانم، سـەر بـە ئەنـصارم، فـەرمووی: کەواتـە خۆت فەرموودەکە بگێڕەوە، ئێوەی ئەنصار خۆتان لـە فـەرموودەکانتان باشـتر دەزانن!.

جا منیش دەستم کرد بەگێڕانەوەی فەرموودەکە بـۆ کۆمەڵەکـە جـا بـۆ پشتیوانی من، عیمران فـەرمووی: مـن خـۆم ئامـادەی ئـەو شـەوە بـووم، لـەمن وابوو کە کەسی تر وەك من ئـەم فەرموودەیـەی لەبـەر نـەکردووە، بـەڵام بـۆم دەرکەوت کەتۆش زۆر بەباشی ئەم رووداوو داستانو چیرۆکەت لەبەرە).

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیەو فەرموودەی ژمارە (١٥٥٨)و (١٥٥٩)ی صەحیحی موسلیم تەرقیمی شێخ خلیل مەئموون شیحا، بۆ نوێژی فەوتاو، لەکاتی گێڕانەوەیدا، لەپێشا بانگی بۆ دەدرێ، ئەوسا سوننەتی پێش ئەو نوێژە فەوتاوە دەکرێ، ئەوجا قامەتی بۆ دەکرێ، ئەوجا نوێژەکە وەك بەئەدا بکرێ، ئاوا بەقەزا ئەنجام دەدرێ. (نوێژی فەوتاو بەمەرجێ بانگی بۆ دەدرێ کە بەجەماعەت بکرێ).

٢٠٣- وَلَهُ عَنْ جَابِرٍ" (رضي الله عنه): { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَتَى اَلْمُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بِهَا اَلْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ}.

{موسلیم ١٢١٨ = ٧٠٧ پوختەی موسلیم = ٢٩٤١ موسلیم تەرقیمی شیحا}:

ئەم فەرموودەیە دوووردرێژە، لەدواوە لە ژمارە (٧٥٩)دا لەسەر باسی (بابُ صِفَةِ الحَجِّ وَ دُخُولِ مَكَّةَ)دا دێت، لەوێ وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی دێ.

٢٠٤- وَلَهُ عَنْ اِبْنِ عُمَرَ: { جَمَعَ بَيْنَ اَلْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ }. زَادَ أَبُو دَاوُدَ: {لِكُلِّ صَلَاةٍ}. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {وَلَمْ يُنَادِ فِي وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا}.

{مسلم ١٢٨٨ = ٣١٠٠، ٣١٠٢ أبوداود رقم: ١٩٢٩. ترمذی رقم: ٨٨٧. نسائی ٥/٢٦٠. أحمد ٣٣/٢، ٣٤}:

ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لە خۆیو لەباوکی) فەرمووی: لەحەجی مالاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە موزدەلیفە، بەکۆکردنەوەی دواخراو (بە جەمعە تەئخیر) نوێژی شێوانو خەوتنانی بەکۆمەڵی (بە جەماعەت) بۆمانکرد بەیەك قامەت). ئەبوداوود (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەمەی زیادکردووە، لەم فەرموودەی ئیبنو عومەر، کە موسلیم، بەشێوەی پێشەوە

گێڕاویەتەوە: (بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ لِكُلِّ صَلَاةٍ) هەر نوێژەی لەسەرەتایەوە قامەتی بۆ کرا.

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەبوداوودا لەئیبنو عومەرەوە: بەڵام بۆ هیچیان بانگ نەدرا).

ئەمەیش دەقی گێڕانەوەی ژمارە (٧١٥)ی پوختەی موسلیمە، کە لە شیحادا، ژمارە (٣١٠٣)یە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێوارەی شەوی عەرەفە، کە لە عەرەفەوە جماین بۆ مینا، لە خزمەتی ئیبنو عومەردا کەوتینەڕێ، کاتێ گەیشتینە موزدەلیفە لەوێ، ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) بە جەمعە تەئخیر، نوێژی شێوانو خەوتنانی بەکۆمەڵی بۆ کردین، بەیەك قامەت، ئیبنو عومەر خۆی بەرنوێژیەکەی بۆمانکرد، لەپاشا جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتو فەرمووی: ئا بەم شێوەیە، لەم شوێنەدا کە موزدەلیفەیە لەحەجی ماڵاوایدا، پێغەمبەر خۆی، ئەم دوو نوێژەی بەم شێوەیە بەیەك قامەت بۆ کردینو قامەتیان بۆ نوێژی خەوتنان نەکرد).

٢٠٥ - وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {إِنَّ بِلَالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ اِبْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ"، وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى لَا يُنَادِي، حَتَّى يُقَالَ لَهُ: أَصْبَحْتَ، أَصْبَحْتَ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي آخِرِهِ إِدْرَاجٌ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٥٨ = ٦١٧، ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٥٨٤ = ٢٥٣٣ شیحا = ١٠٩٢ مسلم} :

ئیبنو عومەرو عائیشە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو بانگدەری هەبوو، یەکێکیان بیلال بوو، ئەوی تریان ئیبنو ئوممی مەکتووم بوو، کەپیاوێکی کوێر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (بیلال کەبانگی یەکەم دەدا، هێشتا شەوی

دەمێنێ، جا لەبەر ئەوە بخۆن و بخۆنەوە، تا ئیبنو ئوممی مەکتووم بانگ دەدا).

ئیبنو عومەر فەرمووی: ئیبنو ئوممی مەکتووم پیاوێکی کوێر بوو، بانگی نەدەدا، هەتا لەهەموو لایەکەوە خەڵکەکە پێیان دەگوت: وا بەیانە بانگ بدە). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ١٣١٠}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مامۆستای دانەر کەئیمامی ئەسقەلانییە، لە بارەی مەتنەکەوە دەفەرموێ: (وَفِي آخِرِهِ إِدْرَاجٌ) واتە: لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەوە ئیدراج هەیە، ئیدراج ئەوەیە، کەقسەی راوی تێهەڵکێش بکرێ لەگەڵ دەقی فەرموودەکەی پێغەمبەردا. لەم شوێنەدا هەتا وشەی (يُنَادِي ابْنُ أُمِّ مكتوم) دەقی قسەکانی پێغەمبەرە، لە (وَكَانَ رَجلاً أعممى لاَيُنَادِي... تادوایی) قسەی ئیبنو عومەرە، یاقسەی زوهرییە.

٢- ئیبنو ئوممی مەکتووم (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی عەمری کوڕی قەیس بوو، هەندێ دەڵێن: ناوی عەبدوڵڵای کوڕی زائیدە بووە، هەندێ تر دەڵێن: ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسی کوڕی مالیك بووە، دایکی ناوی عاتیکەی کچی عەبدوڵڵا بوو، ئیبنو ئوممی مەکتووم قوڕەیشییە لەپێشینانی کۆچکارانە، لەگەڵ موصعەبی کوڕی عومەیردا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەرلەوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچ بکا بۆ مەدینە، زۆرینەی کات کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ غەزا، ئیبنو ئوممی مەکتوومی دەکرد، بەجێگەنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، پێشنوێژیی بۆ خەڵکەکە دەکرد، بانگبێژی پێغەمبەر بوو لەگەڵ بیلالا، کە لەژمارە (١٩١) دا، لەپێشەوە ژیاننامەکەی رابورد. دەڵێن: خاڵۆزای خاتوو خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر بووە، کوڕی برای دایکی خەدیجە بووە

لەدایکەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سیازدەجار لەجێگەی خۆی کردی بە سەرەکشاری سەر مەدینە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشت بۆ حەجی ماڵاوایی هەر ئەوی کرد بەجێگەنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، هەتا خۆی هاتەوە.

ئیبنو بەککار دەفەرموێ: ئامادەی جەنگی قادسیە بووە، ئاڵای سوپای ئیسلام لەلای ئەو بوو، هەر لەوێیش شەهیدکرا.

ئەو نابینایەیە کە سەبارەت بەو، سەرەتای سورەتی عەبەسە هات بۆ پێغەمبەر هەروا ئەو کوێرەیە کەبوو بەهۆی هاتنی (غَيْرِ أُولِي الضَّرَرِ).

٢٠٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ" { إِنَّ بِلَالاً أَذَّنَ قَبْلَ اَلْفَجْرِ، فَأَمَرَهُ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنْ يَرْجِعَ، فَيُنَادِيَ: "أَلَا إِنَّ اَلْعَبْدَ نَامَ} . رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَضَعَّفَهُ.

{أبوداود رقم: ٥٣٢. ترمذی رقم: ٢٠٣}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ بیلال بەهەڵە، شەوی دەمێنێ کەبانگی بەیانی دەدا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکا، کە بگەڕێتەوەو بەخەڵکەکە ڕابگەیەنێ، کەبانگ نەبووە، بەهەڵە بانگ دراوە، بەندەی بانگدەر چاوی بەخەوەوە بووە کە بانگی داوە، لەبەر ئەوە بەهەڵە بانگی داوە). {ئەبوداوود گێڕاویەتەوەو بەلاوازی داناوە}.

٢٠٧- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) {إِذَا سَمِعْتُمْ اَلنِّدَاءَ، فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ اَلْمُؤَذِّنُ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە/٣٥٥ = ٦١١، ٦١٢، ٦١٣، ٩١٤، پوختەی موسلیم ١٩٨ = ٨٤٧ شیحا = ٣٨٣ موسلیم + ١٩٩ پوختەی موسلیم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لەبانگ دەبێ، بانگدەر چی دەڵێ، ئێوەیش ئەوە بڵێنەوە!).

٢٠٨- وَلِلْبُخَارِيِّ: عَنْ مُعَاوِيَةَ مِثْلُهُ. {٣٥٥ دووبارە/تەجریدی بوخاری/١ = ٦١٢، ٥١٣، ٩١٤}:

ئەمەیش ئەو فەرموودەیە، لە پوختەی بوخاریدا، کەدانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی بۆ دەکا:

موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیان (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) ڕۆژێ گوێی لەبانگ بوو، لەسەرەتای بانگەوە، بانگدەر هەرچی دەفەرموو، ئەویش گوتەکەی ئەوی دەگوتەوە، هەتا (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ).

بەڵام کاتێ بانگدەر گوتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) موعاوییە فەرمووی: (لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّهِ). کاتێکیش بانگدەر گوتی (حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ) موعاوییە فەرموویەوە: (لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّهِ) ئیتر لەپاش (حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ) بانگدەر هەرچی فەرموو، موعاوییە ئەوەی دووبارە دەکردەوە، بەبێ زیادوکەم. لەپاشا فەرمووی: لەسەر ئەم شێوەیەی کە ڕابورد، وەڵامی سەندنەوەی بانگم بەگوێی خۆم ژنەوتووە لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستی ئێوە (دروودو سڵاوی خودای لەسەر بێ).

٢٠٩- وَلِمُسْلِمٍ: {عَنْ عُمَرَ فِي فَضْلِ اَلْقَوْلِ كَمَا يَقُولُ اَلْمُؤَذِّنُ كَلِمَةً كَلِمَةً، سِوَى اَلْحَيْعَلَتَيْنِ، فَيَقُولُ: "لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ"}.

{١٩٩ پوختەی موسلیم = ٨٤٨ صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٣٨٥ مسلم}:

ئەمە پوختەی ئەم فەرموودەیەیە لەپوختەی موسلیمدا، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا لێرەدا:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەمەیە کەوا لەم فەرموودەیەدا، کە لەسەر فەرمایشتی تاجول ئوصول، موسلیم‌و ئەبوداوود گێڕاویانەتەوە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ کە بانگدەر بانگ دەدا، چی دەڵێ، ئەویش لەیەکەم وشەوە، وشە بەوشە، لەشوێن ئەوەوە، گوتەکەی ئەو بەزمان بڵێتەوەو بەدڵیش باوەڕی پێی هەبێ‌و بەسۆزی دڵ بیڵێ، ئەوە دەچێتە بەهەشت! بەڵام لەوشەی (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)و (حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ)یدا، وەك بانگدەر نەڵێ، بەڵکوو لەکاتی بیستنی ئەم دوو وشەیەدا بڵێ: (لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّهِ) هێزو توانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتی‌و بەس. {تاج/١، زنجیرە/٦٣، ژمارە: ٤٣٢}.

(ڕوونکردنەوە):

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) قوڕەیشییە، عەدەوییە، لەپشتی هەشتەما ڕەچەڵەکی لەباوکەوە دەگاتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایکی ناوی حەنتەمەی کچی هاشمە، کەسناوی (کونیەی) ئەبو حەفصە، نازناوی (لەقەب)ی فاورووقە، لەعەشەرەی موبەششەرەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، عومەر جێنشینی (خەلیفە)ی دووەمە، لەپێش هاتنی پێغەمبەردا، بە (٣٠) سیی ساڵ، یابە (١٣) سیازدە ساڵ، لەدایك بووە، لەسەردەمی نەزانیدا پایەی نوێنەری قوڕەیش بەو سپێردراوە، کەشەڕێ، کێشەیێ، هەرایێ، سەری هەڵ دەدا، ئەو دەکەوتە نێوانیانەوە، لەسەرەتای ئیسلامەوە زۆر توندوتیژ بوو، لەدژی موسوڵمانان، بەڵام کاتێ ئیسلام بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچووە ئیسلامبوونی دانرا بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسوڵمانان.

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (هەتا عومەر ئیسلام نەبوو، نەماندەوێرا بەئاشکرا خودا بپەرستین).

عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لەکۆچکارە پێشینەکان، ئامادەی بەیعەتی ڕیضوانو غەزای بەدرو هەموو شەڕگەو مەڵبەندی جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە. یەکێ بوو لەو چەند کەسانەی، کە پێغەمبەر مەرگ بوو بەمیوانی لێیان ڕازی بوو، لەپاش مەرگی ئەبوبکر، لەساڵی سیازدەی کۆچیدا بوو بەدووەم جێنشین، ئەم وڵاتانەو چەندین شوێنی تری ئازادکردو خەڵکەکەی لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بوون: شامو عێراقو میصر، دیوان ئەو داینا، هەر ئەو مووچەی بۆ پیاوانی سوپا بەپێی خزمەتیان بۆ ئیسلام بڕییەوە، کارە هەرە گرنگەکانی تری: ئەو نوێژی تەراویحی لەسەر ئەم شێوەیەی ئێستا، لەشەوانی ڕەمەزاندا، دامەزراند، مێژووی کۆچی دانا، کەهەتا ئەمڕۆ (١٨ جمادی الآخرە/١٤٣٠) بەردەوامە، وەبەپشتی خوددا هەتا نزیکی قیامەت هەر بەرقەرار دەبێت، ئەو یەکەم کەس بوو، کەنازناوی (ئەمیرولموئمینین: فەرمانڕەوای موسوڵمانان)ی پێ بەخشرا.

سەرەتای صەحیحی بوخاری، لەناوی هاوەڵانی پێغەمبەردا، بەناوی عومەر دەست پێ دەکات، هەرخۆی لەناو هاوەڵاندا ناوی (عومەری کوڕی خەتتاب) بووە، بەڵام بیستو چوار عومەر ناوی تریان لەناودا بووە، پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) پیاوێکی باڵابەرزی تەواو کەڵەگەتی تێکسمڕاوی گڕانە (أصلع) بوو، قووچێکی وابوو کە لەناو خەڵکا دەوەستا، دەتگوت: ئەو سووارەو ئەو خەڵکەی تر لەدەوری پیادەن، لەساڵی گرانیو برسێتیەکەدا وازی لەخواردنی گۆشتو چەوریو خواردنی شتی خۆش هێنا، لەجیاتی ئەوە بەخواردنی ڕۆن زەیتوون ئیکتیفای دەکرد، هەتا هەست بەو ئێشو ئازارو سەختڵەتییە بکا، کە خەڵکانی هەژاری ئەو ڕۆژگارە ناهەموارە هەستیان پێ کردووە، ئەوەندە جەڕەبابەی خۆی دابوو، ڕەنگی هەڵبڕسکا بوو، ئیمامی عومەر پیاوێکی تووکن بوو، مووی خۆی دەگرتە خەنەو وسمە، پێشەوا عومەر زۆر دادپەروەر بوو، عەدالەتو دادپەروەریی عومەر زۆر ئاشکرایە،

عومـەر چـەپەوانە بـوو، ڕیـشی زۆر پـڕ بـوو، لـە فـەرموودەو سـوننەتی زۆر دروستدا، وەسپو مەتحی زۆری عومەر، لەلایەنی پێغەمبەرو یارانو هاوەڵانی پێغەمبـەرەوە کـراوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (گریمان لەپاش من پێغەمبەری تر ببوایە، عومەر دەبوو بە پێغەمبەر، بـەڵام لەدوای من پێغەمبەری تر نییە!).

پێـشەوا عومـەر خـەزووری پێغەمبـەر بـوو، بـاوکی خـاتوو حەفـصەی هاوسـەری پێغەمبـەرە، مـۆری ئەموسـتیلەکەی عومـەر (كَفَـى بِـالمَوْتِ وَاعِظـاً ياعُمَرُ: ئەی عومەر! بەراستی مردن ئامۆژگاری چاکە).

عومەر یەکەم قازی بـوو لەئیـسلاما، ئـەبوبکر کـردی بـەقازی، دە ساڵو نیو جێنشین بوو، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لەشاری مەدینـە، لـەمانگی قوربـانی سـاڵی بیـستو سـێی کۆچـیدا لـەناو میحرابەکـەی مزگەوتەکـەی پێغەمبەردا، لەکاتێکا کـە بەرنوێـژی نوێـژی بـەیانی، بـۆ موسـوڵمانان دەکـرد، ئـەبو لوئلوئـەی فارسـی مەجووسـی بـەکێردێکی دوودەم کوشـتی، وەسـیازدە کەسی تریشی زامـارکرد، حـەوتیان مـردن، هـەر لەوێـدا ئـەبو لوئلوئـە خۆشـی کوشت، ئەو ڕۆژە ڕۆژی چوارشـەممە بـوو، هەنـدێ دەفـەرموون: کاتـێ عومـەر شەهید بوو تەمەنی لەشەستو سێ کەمتر بوو، هەنـدێ دەڵـێن: ئـەبو لوئلوئـە مەجووسـی بـووە، هەنـدێ دەڵـێن: مەسـیحی بـووە، عومـەر سـێ شـەو بـە برینەکەیـەوە ژیـا، ئەوسـا مـرد، بـۆ شـارەزایی تـەواو لـەژیانو شـانازیەکانی عومەر، بڕوانە: صەحیحی بوخاری، فضائل الصحابة، لـە فـەرموودەی ژمـارە: ٣٦٨٢وە، هـەتا ژمـارە: ٣٦٩٤، هـەروا ئـەم ژمارانـە/٣٨٦٣، ٦١٧١، ٧١٥٣، ٦٢٦٤، ٦٦٣٢، ٣٧٠٠. هەروا بڕوانە: ژمارە: ٦٢ کە لەپێشەوە رابورد.

هەروا بڕوانە فضائلی صەحابە لەصەحیحی موسـلیمدا، لـە فـەرموودەی ژمارە: ٦١٣٩وە هەتا ژمارە: ٦١٥٨. هەروا بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمـارە: ٣٢٤٥

هەتا ژمارە: ٣٢٥٧ + زنجیرە/٥، ژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ٣٢٦٩ + زنجیرە/٦، ژمارە: ٣٢٧٠ + زنجیرە: ٧، ژمارە: ٣٢٧١ باسی شەهید بوونی عومەر + تاج ژمارە: ٣٢٣٣) + پوختەی موسلیم ١٩٩ + تەجریدی/٢، ژمارە: ١١٦).

٢١٠- وَعَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّهُ قَالَ : يَا رَسُولَ اَللَّهِ اِجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي . قَالَ : "أَنْتَ إِمَامُهُمْ ، وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{ترمذی رقم: ٢٠٩. أبوداود رقم: ٥٣١. نسائی ٢٣/٢. ابن ماجه رقم: ٧١٤، ٩٨٧. أحمد ٢١/٤}:

عوثمانی کوڕی ئەبولعاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی گوتم: ئەی پیغەمبەری خودا! بمکە بەپێشنوێژی خزمەکانم؟ فەرمووی: (تۆ پێشنوێژی ئەوانیت، وەلەکاتی نوێژکردندا، کاتێ کە بەرنوێژیان بۆ دەکەیت، چاوت لەهەرە زەبوونەکەیان بێ، ئاگات لەحاڵی بێو نەکەی بە بەرنوێژیی دوورودرێژ ئەوەندەی تر ئەو لاوازو لازەبوونانە، ماندوو بێ تاقەتیان بکەی!).

(وەبانگدەرێکیش دابنێ کە لەباتی بانگدانەکەی مووچە وەرنەگرێ). {تاج/١، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٤٢٢} + {موسلیم شیحا ١٠٥٠}. بۆ ژیاننامەی عوثمانی کوڕی ئەبولعاص بڕوانە ژمارە: ٢١١ کەوا لەدوا ئەم ژمارەیەوە.

٢١١- وَعَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ لَنَا اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {وَإِذَا حَضَرَتِ اَلصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ . . .} اَلْحَدِيثَ أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٦٢ = ٦٢٨، ٦٣٠، ٦٣١، ٦٨٥، ٦٥٨، ٨١٩، ٢٨٤٨، ٦٠٠٨، ٧٢٤٦. مسلم ٦٧٤ = ١٥٣٦ مسلم شیحا. أبوداود ٥٨٩. ترمذی رقم: ٢٠٥. نسائی رقم: ٦٣٥. ابن ماجه رقم: ٩٧٩. ابن حبان رقم: ١٦٥٨}:

لە تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٦٢ ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

مالیکی کوڕی حووەیریث (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ دەستەیێ لەخزمانم چووین بۆ مەدینە، بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیست شەو لەخزمەتیدا ماینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر میهرەبانو بەسۆزو دڵسۆز بوو لەگەڵمانا، جاکاتێ هەستی کرد کەوا ئێمە تاسەی لای کەسوکارمان دەکەین، فەرمووی: (بچنەوە بۆ ناو کەسوکارتان لەناویان بنو فێری ئایینیان بکەنو فێری نوێژیان بکەن، وەمن ئەم ماوەیە چۆن نوێژم بۆ ئێوە دەکرد ئێوەیش ئاوا نوێژیان بۆ بکەن، کاتێ کەنوێژ دەبێ، یەکێك لەخۆتان با بانگتان بۆ بدا، وەکێتان بەتەمەن گەورە تر بوو با ئەوە بەرنوێژیتان بۆ بکات).

(ڕوونکردنەوە):

١- عوثمانی کوڕی ئەبولعاص ئەل-ثەقەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، کۆمەڵێ فەرموودەی هەیە لەصەحیحی موسلیمدا، هەروا لە (السنن)دا، کە ئەم چوار سونەنەن:

١- سونەنی ئەبو داوود.

٢- سونەنی تەرمەزی.

٣- سونەنی نەسائی.

٤- سونەنی ئیبنو ماجە.

نوێنەر (وەفد)ەکەی هۆزی ثەقیف کاتێ هاتن بۆ ئیسلام بوون، ئەویشیان لەگەڵدابوو، ئیسلام بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەکارمەندی سەر شاری طائیف، ئەبوبەکرو عومەریش لەوێ هێشتیانەوە، لەپاشا لەساڵی پازدەی کۆچیدا، پێشەوا عومەر کردی بەکارمەندی سەر وڵاتی عومانو بەحرەین، لەپاشا لە بەصرە نیشتەجێ بوو، هەتا لەوێ لەسەردەمی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیاندا، مەرگ بوو

بەمیوانی، هەندێ دەڵێن: ساڵی پەنجاو پێنجو هەندێ دەڵێن: ساڵی پەنجاو یەکی کۆچی مردووە.

لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ هۆز لە ئیسلام هەلگەڕانەوە، ثەقیفیش ویستیان لە ئیسلام پاشگەز ببنەوە، بەلاّم عوثمان نەیهێشتن پاشگەز ببنەوەو وتارێکی دا بۆیانو فەرمووی: (ئێوە دواترین هۆز بوون کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامتان قەبوولکردووە، مەبن بەسووری بەر لەشکرو یەکەم هۆز بن کە لەئیسلام پاشگەز ببنەوە!).

عوثمانی کوڕی ئەبولعاص خۆی دەفەرموێ: (کاتێ ئامینەی کچی وەهەب، پێغەمبەری بوو، من ئامادەی ئەوکاتە بووم).

لەسەر ئەم بنیاتە بێ، دەبێ عوثمان نزیکەی سەدو بیست ساڵێ ژیابێ.

٢- مالیکی کوڕی حووەیریث (رەزای خودای لێ بێ) لە هاوەڵانی پێغەمبەرە، چەند فەرموودەیەکی لە صەحیحەیندا هەیە، لە بەصرە دادەنیشت، لە نەوەدو پێنجی کۆچیدا، لەوێ مردووە، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: عوبەیدوڵلاّی کوڕیو ئەبو قلابەو ئەبو عەطییەو سەلەمەی ئەل‌جەرمی، ئەم فەرموودەیەی بەلگەیە لەسەرئەوە کە هاوڕێی پێغەمبەر بووە، چونکە خۆی دەفەرموێ: لەگەڵ دەستەیێ لەخزمانم رۆیشتین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بیست رۆژ لەخزمەتیدا ماینەوەو قسەو گفتوگۆمان لەگەڵیا کردو خۆی مۆڵەتی پێماندا کە بگەڕێینەوە بۆناو کەسوکارمان. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٦٢}.

٢١٢- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لِبِلَالٍ : { إِذَا أَذَّنْتَ فَتَرَسَّلْ ، وَإِذَا أَقَمْتُ فَاحْدُرْ ، وَاجْعَلْ بَيْنَ أَذَانِكَ وَإِقَامَتِكَ قَدْرَ مَا يَفْرُغُ اَلْآكِلُ مِنْ أَكْلِهِ} . اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَضَعَّفَهُ.

{ترمذي/ رقم: ١٩٥}:

جابيرى كوڕى عەبدوللا (ڕەزاى خودا لەخۆى و باوكى) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بە بيلالى فەرموو: (ئەى بيلال! كە بانگ دەدەيت لەسەرخۆ بەشێنەيى بانگ بدەو، پەلەى لێ مەكە، بەلام قامەت بەگورجى تێ پەڕێنە، وە ئەوەندەيش بەينى بانگو قامەت بخە، كە نانخۆر لەخواردنەكەى ببێتەوەو ئاوخۆر لەخواردنەوەكەى ببێتەوەو تەنگاو بچێ بۆ سەراوو لەسەراوەكەى ببێتەوە، كە ديتان وامن هاتم ئەوسا ئێوە هەڵسن و لەڕيزى نوێژەكەدا ريزببن). {تاج/١، زنجيرە: ٦١، ژمارە: ٤٢٦ — تەرمەزى سەنەد ضەعيف}.

(ڕوونكردنەوە):

دانەر پێشەوا عەسقەلانى (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) لەكۆتايى فەرموودەكەوە، دەڵێ: (الحديثَ) مەبەستى ئەوەيە كەمن ئەم فەرموودەيەى جابيرم بەتەواوى نەنووسيوە، ئەگەر تۆ حەز دەكەى تا كۆتايى فەرموودەكە بخوێنەرەوە، وشەى (الحديثَ) لەم جۆرە شوێنەدا، وەك وشەى (الآيةَ) وايە، كەزۆرجار لەكۆتايى ئايەتێكەوە دەنووسرێ كە ئاماژەيە بۆ ئەوە كە ئايەتەكە هەمووى نەنووسرابێ، يا وەك (البَيتَ) كە لەدواى پارچەيێ لەشيعرێ دەگوترێ.

بەلام من فەرموودەكەم بەتەواوى لە وەرگەڕاوەكەدا نووسى، تەواوى فەرموودەكەم لە (سبل السلام) وەرگرت لەم جێگەيەدا.

٢١٣- وَلَهُ : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يُؤَذِّنُ إِلَّا مُتَوَضِّئٌ} . وَضَعَّفَهُ أَيْضًا.

{ترمذي/ رقم: ٢٠٠}:

دیـسان پێـشەوا تەرمـەزی بەڕشـتەیەکی لاواز لـە ئـەبو هـورەیرەوە دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (بـەبێ دەسنوێژ نابێ کەس بانگ بدا).

(ڕوونکردنەوە):

١- واباشو سوننەتە بانگدەر دەستی بە دەسنوێژ بێ، بەڵام ئەگەر بـەبێ دەسنوێژیش کەسێ بانگ بدا دەبێ، هەروا قامەت.

٢- لەشپیـسیش دووڕا هەیـە لەبارەیـەوە: ڕای بـەهێز ئەوەیـە کـە بـانگ بەلەشی پیسەوە دروست نییە، دیارە قامەت باشتر دروست نییە.

٢١٤- وَلَهُ : عَنْ زِيَادِ بْنِ اَلْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {وَمَنْ أَذَّنَ فَهُوَ يُقِيمُ} وَضَعَّفَهُ أَيْضًا.

{ترمذی. سنن. رقم: ١٩٩}:

ئەبو داوود دیـسان بەڕشتەیەکی بـێ هێـز لـە زیـادی کوڕی ئـەلحاریثـی صودائی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو، کە بۆ نوێژی بەیانی بانگ بدەم، جا کە بانگمـدا، بـیلال ویـستی قامــەت بکـا، پێغەمبــەریش (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فەرمووی: (کاکەی صودائی بانگیدا، کێش بانگ بدا، هـەر ئـەو خۆشـی قامـەت دەکا). {تاج/١، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٤٢٣، چ/٤ – سند ضعيف}.

٢١٥- وَلِأَبِي دَاوُدَ: فِي حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّهُ قَالَ : أَنَا رَأَيْتُهُ – يَعْنِي: اَلْأَذَانَ – وَأَنَا كُنْتُ أُرِيدُهُ . قَالَ : "فَأَقِمْ أَنْتَ " وَفِيهِ ضَعْفٌ أَيْضًا.

{أبو داود. رقم: ٥١٤. ترمذی. رقم: ١٩٩}:

(ڕوونکردنەوە):

زیادی کوڕی حـاریثی صودائی، یەکێکە لەوانـەی کـە پـەیمانیان بەسـت لەگەڵ پێغەمبەردا، لە خزمەت پێغەمبەردا بانگی داوە، دادەنرێ بـە بەصـری،

صـوداء نـاوی هۆزەکەیـەتی، لەئیـستیعابا دەفـەرموێ: ڕۆیـشتم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پـەیمانم داپێـی لەسـەر ئیـسلامەتی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپایەکی نارد بۆ سەر هـۆزی صـوداء، منـیش عـەرزیمکرد: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! سـوپاکە بگێـڕەرەوە دواوە، مـن ئیسلام بوونی ئەوانت بۆ دەستەبەر دەکەم، پێغەمبەریش سوپاکەی گێڕایەوە، وە نامەیـەکی نووسـی بۆیـان، نوێنـەرەکانیان وەڵامـی نامەکـەی پێغەمبـەریان هێنایـەوە، کـە هـۆزی صـوداء ئیـسلامیان پەسـەند کـردووە. پێغەمبـەر بـەم بۆنەیەوە بەزیادی فەرموو: (ئەی کاکی سودائی، بەڕاستی تـۆ لـەناو هۆزەکـەتا بەگوێ کراوی).

٢١٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْمُؤَذِّنُ أَمْلَكُ بِالْأَذَانِ ، وَالْإِمَـامُ أَمْلَـكُ بِالْإِقَامَـةِ} . رَوَاهُ اِبْـنُ عَـدِي وَضَعَّفَهُ.

{الكامل ٤/١٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بانگبێژ خۆی خاوەنی بڕیـارە لـەدیاری کردنـی کاتی بانگداندا، بەڵام پێشنوێژ (ئیمام) ئەو خاوەنی بڕیارە لەدەست پێکردنـی قامەتدا). ئیبنو عەدی گێڕاویەتەوەو بەلاوازی داناوە.

٢١٧- وَلِلْبَيْهَقِيِّ نَحْوُهُ: عَنْ عَلِيّ مِنْ قَوْلِهِ.

{بیهقی ١٩/١٢ رقم: ٢١١٢}:

بەیهـەقی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەگێڕێتـەوە: کـە ئیمـامی عـەلی (ڕەزای خــودای لێ بــێ) خــۆی قــسەیەکی وای کــردووە، وە نــەیگوتووە کــە پێغەمبەر وایفەرموو.

٢١٨- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يُرَدُّ اَلدُّعَاءُ بَيْنَ اَلْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{نسائي السنن الكبرى رقم: ٩٨٩٥. ابن خزيمة رقم: ٤٢٨، ٤٢٥. أبوداود رقم: ٥٢١. ترمذي رقم: ٢١٢}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دوعاو نزاو پاڕانەوە لەنێوانی بانگو قامەتدا ڕەت نابێتەوە). {تاج/١، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٤٣٤، چ/٤ – د/ت/ن – س ح}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لە (غاية المأمول شرح التاج الجامع للأصول) دەفەرموێ: خاوەنانی سونەن، کە ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائین، ئەم فەرمووودەیان بەڕشتەیەکی شیرین گێڕاوەتەوە. ڕشتەی شیرین واتە: سند حسن. دانەریش دەفەرموێ: ئیبنو خوزەیمە بەتەندروستی داناوە.

٢- ئەم بەهرانە لەم فەرمووودەیەوە وەردەگیرێ.

١- نێوانی بانگو قامەت، کاتێکی زۆر باشە بۆ پاڕانەوەو نزاکردن چ لەژنەوە بێ، چ لەپیاوە بێ، چی بۆ نوێژکەر چی بۆ کەسی تر.

٢- ئەگەر دونیا بوو، کەسێ لەم کاتەدا نزایەکی کردو گیرا نەبوو ئەوە چۆن؟ کورتو پوخت، بەکوردی پەتی: (دیارە نەهێڵێ نەیهێشتووە کە ئەو نزایە جێبەجێ ببێ).

٣- گرنگ ئەوەیە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نیشانمان دەدا کەنێوانی بانگو قامەت شوێنی نزاو پاڕانەوەیە، مرۆڤ ئەو هەلە سازاوە بقۆزێتەوەو لەکیسی نەدات.

٢١٩- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ اَلنِّدَاءَ : اَللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ اَلدَّعْوَةِ اَلتَّامَّةِ ، وَالصَّلَاةِ اَلْقَائِمَةِ،

آتِ مُحَمَّدًا اَلْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا اَلَّذِي وَعَدْتَهُ ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ.

{أحمد رقم: ١٤٨٥٩. تجريدى بوخارى/١ ژمارە: ٣٥٦ = ٦١٤، ٤٧١٩ فتح البارى. أبوداود رقم: ٥٢٩. ترمذى رقم: ٢١١. ابن ماجه رقم: ٧٢٢}:

لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەکاتی بیستنی بانگدا، کە بانگەکە تەواو دەبێ، بڵێ: «اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِى وَعَدْتَهُ» واتە:

ئەی خودایە! ئەی خاوەندی ئەم بانگەوازی تەواوە! ئەی پەروەردگاری ئەم نوێژە دابەستراوە! ببەخشە بە موحەممەد، پایەی هەرە بەرزی ئەلوەصیلەو، پلەی هەرە گەورەی ئەلفەضیلە، وە بیبەرە ئەو بارەگا پەسەندەی کەخۆت بەڵێنت پێی داوە، وە رەوانەی ئەوێی بکە، کە مەقامی شەفاعەتی گەورەیە.

هەرکەسێ لەم کاتەدا ئەمە بڵێ‌و ئەم نزایە بخوێنێ، لەرۆژی قیامەتدا، تکای من بۆ ئەو قەبووڵ دەبێ. {تاج/١، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٣٠} + {ریاض/٣، ژمارە: ١٠٣٧}.

(روونکردنەوە):

١- باسی بانگ‌و قامەت، بیست فەرموودەی واتیادا، لەژمارە (١٩٠)وە هەتا ژمارە (٢١٩) کەواتە: (٢١٩ — ١٨٩ = ٢٠) بیست فەرموودە.

٢- بانگ‌و ئاگادارکردنەوە بۆ نوێژ لە ئایینە دێرینەکانیشا بووە، جوولەکەکان لەکاتی داهاتنی نوێژی خۆیانا، کەڕەنایان لێ دەدا، گاورەکان ناقووس لێ دەدەن.

٣- واباش‌و سوننەتە، کە لەکاتی پێنج فەرزەکەدا، بانگ لەهەموو مزگەوتی بدرێ، ئەگەر جێگەکە یەك مزگەوتی تیادابوو لەو مزگەوتەدا بانگ بدرێ‌و بەس، وەك لادێ‌و گوند کە تاقە یەك مزگەوتیان واتیادا.

٤- ئەگەر جێگەکە مزگەوتی تیادا نەبوو، وە دوور بوو لەناو شارو گوندەوە، سوننەتە بانگی تیادا بدرێ، وەك زانکۆیێ دوور لەشار دروست کرابێ، یا لەشکرگایێ، یامەخفەری پۆلیسێ، یا رەبایەی پێشمەرگەو سەربازی، کە زۆرینەی کات وان لەدەشت‌و دەرو سەرلووتکەی شاخەکان.

٥- وا سوننەتە کە هەمیشە بۆ پێنج فەرزەکان لەگشت مزگەوتێ بانگ بدرێ، تەنانەت لەنیوەڕۆی رۆژی هەینیشدا هەر سوننەتە کە بانگ لەهەموو مزگەوتێ بدرێ، با ئەو مزگەوتە جومعەیشی لێ نەکرێ، یا ئەو نیوەڕۆیە جەماعەتی لێ نەکرێ، لەلایەن کەسێکەوە بانگ بدرێ کەخۆی هێشتا نەچووبێ بۆنوێژی هەینی ئەو رۆژە.

٦- بانگ بۆ کۆمەڵ سوننەتی کفایەیە، بۆ تاك سوننەتی عەینە، بەڵام هەندێ دەفەرموون: بانگ بۆ نوێژی جومعە فەرزی کیفایەیە.

٧- تەرجیع‌و تەثویب لەبانگا سوننەتن {بڕوانە ژمارە: ١٩٠}.

٨- قامەت بۆ نوێژە فەرزەکان، بەگشتی سوننەتێکی گەورەیە.

٩- (مەرجەکانی بانگ‌و قامەت).

١/ بانگدەر یان قامەتکار، مەرجە موسوڵمان بێ، نێرینە بێ، تەمیزی هەبێ‌و بفامێ، بانگەکە کاتی هاتبێ، هەروا قامەت کاتی هاتبێ.

٢/ جەماعەتی ژنان، بۆیان هەیە ژنێکیان بانگ بدا، بەڵام بەدەنگی بەرز نا، بەڵام سوننەتە ژنێکیان لەکاتی قامەتدا قامەت بکات.

٣/ مەرجە وشەکانی بانگ‌و قامەت بەرودوا بگوترێن، لەیەکتری نەپچڕێن‌و ناوبڕیان تی نەکەوێ.

٤/ بانگ یا قامەت، ئەوەی دەستی پێ کرد، مەرجە خۆشی تـەواوی بکـا، نابێ بەدوو کەس بانگ بدەن، یان بەدوو کەس قامەت بکەن.

١٠- بۆ ئەو کەسەی کە گوێی لـەبانگ دەبـێ، یـان گـوێی لەقامـەت دەبـێ، وشەکان و ڕستەکانی بانگ، یاقامەت لەشوێن ئەوەوە وەك خـۆی بڵێتەوە،تـەنها وشەکانی (حَيَّ عَلَـى الـصَلاة)و (حَـيَّ عَلَـى الفَـلاَح) نـەبێ، لـەجیاتی ئـەم دوو وشەیە دووجار بڵێ (لاحَوْلَ وَلاقَوَّةَ إلاَّ بِاللّٰه).

١١- لەنوێـژی بەیانیـدا کاتێـك بانگـدەر دەڵـێ: (الـصلاةُ خَيْـرُ مِـنَ النَّوْمِ)گوێبیست دووجار بڵێ: (صَـدَقْتَ وَبَـرِرْتَ وَبِـالحَقِ نَطَقْـتَ: راسـتت گـوت و چاکت فەرموو، گوتەیەکی دروستت بێژا).

١٢- کاتێ قامەتکار دووجار دەڵێ: (قَدْ قَامَـتِ الـصلاة) گوێبیـستیش بڵـێ: (أَقَامَهَا اللهُ وَأَدَامَهَا، أَقَامَهَا اللهُ وَأَدَامَهَا).

١٣- وەڵامدانـەوەی بـانگ یـا قامـەت بـۆ ئـەم جـۆرە کەسـانە نابـاش و ناپەسەندە لەسەر فەرمایشتی بەهێزتر:

١/ کەسێ لەشی گران بێ.

٢/ ژنی بێنوێژ.

٣/ ژنی زەیستان.

٤/ کەسێ خەریکی سەراو بێ.

١٤- سوننەتەکانی کاتی بانگ و قامەت:

١/ ڕوویان لەقیبلە بێ، بەڕاوەستانەوە بانگ بدەن، یا قامەت بکەن.

٢/ سوننەتە بانگدەر، دوو پەنجەی شایەتمانی دانێ لەناو هـەردوو کونـە گوێی خۆیداو لەجێگەیەکی بەرز بانگ بدات.

٣/ سـوننەتە بـۆ بانگبێـژ، لـەکاتی گـوتنی (حَـيَّ عَلَـى الـصلاة)دا، بـەلای ڕاستدا، ملی وەربگێڕێ، وەلەکاتی گـوتنی (حَيَّ عَلَـى الفَـلاَح)دا، بـەلای چـەپدا

ملــی وەرچـــەرخێنێ، بـــەڵام ســـینگی لەرووگـــە وەرنـــەگێڕێو لـــەکاتی بانگەکەداررووی سینگی لەرووگە بێ.

٤/ سوننەتە بەدەنگی بەرز، لەسەرخۆو بەشێنەیی وشەکانی بانگ بڵێو بەروونی گۆیان پێ بکا، بەڵام قامەت بەخێراییو بە گورجی بڵێ.

٥/ سوننەتە بانگدەر ناسراو بێ، رەوشت جوان بێ، دادپەروەر بێ، دەنگ لەبانگەکە بەتەواوی هەڵبڕێ، ئەگەر لەمزگەوتو جێگەی وا بانگی دەدا.

٦/ سوننەتە مزگەوت دوو بانگدەری هەبێ.

٧/ سوننەتە بۆ نوێژی بەیانی دوو بانگ بدرێ، کاتی یەکەمیان لەنیوە شـەوەوە دەسـت پـێ دەکـا، کـاتی دووەمیـان یەکـسەر لـەپاش شـەبەقی بـەیان. لـەنیوەڕۆی ڕۆژی هەینیـشدا، لـەپێش دابەسـتنی نوێـژی هەینیـدا دووبـانگ هەیە، لەسەردەمی پێشەوا عوثمانی کوڕی عەففانەوە، کار بـەدوو بـانگی رۆژی هەینی کراوە ئێستا لـە مەککەو مەدینـە، وەك سـەردەمی عوثمـان دوو بـانگ دەدرێ بۆ نیوەڕۆی رۆژی هەینی.

١٥- سـوننەتە بـۆ بانگـدەرو قامـەتکارو بیـسەر، لـەپاش تـەواوبوونی بانگەکە، یا لەپاش تەواوبوونی قامەتەکە، یەکسەر بڵێ:

«اللّٰهُمَّ صَلِ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى النَّبِيِ الكَرِيمِ، اللّٰهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّـةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَالدَّرَجَةَ الرَّفِيعَةَ العَالِيَة، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ يَاأَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ، إِنَّكَ لاَتُخْلِفُ المِعَادَ».

١٦- هـەروا سـوننەتە دوعـاو نـزای خێـری هـەردوو جیهـان بـۆ خـۆیو کەسوکارو سەرجەمی موسوڵمانان بکا، وەك ئەوە بڵێت:

(إِلَهَنَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَـا وَتَرْحَمْنَـا لَنَكُـونَنَّ مِـنَ الْخَاسِـرِينَ، اَللّٰهُمَ يارَبَّنَا لاَتَجْعَلْنَا مِنَ القَوْمِ الخَاسِرِينَ، واجْعَلْنَـا مِـنْ عِبَـادِكَ الـصَّالِحِينَ الفَـائِزِينَ التَّائِبِين، وَاحْشُرْنَا تَحْتَ لِوَاءِ سَيِدِ الْمُرْسَلِينَ. آمين آمين. والحمدلله رب العالمين).

**١٧- بانگو قامەت، بێجگە لەنوێژ بۆچیتر دەگوترێ:**

**١/ بۆ کەسێ خەفەتبارو خەمبار بێو خەمۆکی سەری لێ هەڵدابێ، واباشە، کەسێکی باشی وا، کە مەرجەکانی بانگدانی تیا بێ، بانگ بدا بەسەریا، بەپشتی خودا خەمەکەی دەڕەوەێتەوە.**

**٢/ بۆ کەسێ پەرکەمی لەگەڵدا بێ، بەتایبەتی لەکاتی فێ لێ هاتنەکەدا کەسێ بانگ بدا بەگوێیدا،**

**٣/ بۆ کەسێ لەحاڵەتی ڕقهەڵساندا بێ، بانگ بدرێ بەسەریدا.**

**٤/ بانگ بدرێ بەگوێی مرۆڤێکا، کەخووی بەد بوو بێ، یا بەگوێی ئاژەڵ، یا وڵاخێکا، کە خووی خراپ بوو بێ، یان لەکاتی ئاگرکەوتنەوەدا، سوننەتە بانگ بدرێ.**

**٥/ کاتێ ترسی دیوەزمەو مۆتەکە ڕوو دەدەن لەکەسێ وا سوننەتە خۆی، یاکەسێ تر بانگ بدا.**

**٦/ بانگو قامەت بدرێن بەگوێی منداڵی ساوادا، بەتایبەتی لەکاتی ناوناندا، مەرجە بانگدەرو قامەتکار موسوڵمان بێ، منداڵەکەیش موسوڵمان بێ، بانگەکە بەگوێی ڕاستی ساواکەدا دەدرێو، قامەتەکە بەگوێی چەپیدا.**

**٧/ مرۆڤ کەدەچێ بۆ سەفەر، کە دەکەوێتە ڕێ، بانگو قامەت بەشوێنیا بدرێن، سوننەتن. یا منداڵ کە لەماڵ دەردەچێو دەچێ بۆ ئیمتیحانو تاقیکردنەوەی گران، بانگو قامەت بەدوایدا بدرێ.**

**١٨- واباشە بانگ بە بڵەندگۆ بدرێ، هەتا خەڵکی گەڕەك یا دێ هەموویان، گوێیان لێی بێ، وەك ئێستا واباوە.**

**١٩- هەروا واباشە قامەتیش بە بڵەندگۆ بدرێ، ئەگەر پێویستی بەوە هەبوو، وەکوو قامەت بۆ نوێژی هەینی، یا قامەت بۆ جەماعەتی گەورە، وەك مزگەوتەکانی حەرەمەینو هەموو مزگەوتێکی تر، کە دەنگی قامەتکار بەبێ بڵەندگۆ، ئاگا بەهەموو نوێژکارەکان!!**

## ١٣- باسی مەرجەکانی نوێژ
## بَـــابُ: شُـــرُوطِ اَلصَّلَاةِ

{بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٣٧٨ هەتا زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٣}.

٢٢٠- عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فِي اَلصَّلَاةِ فَلْيَنْصَرِفْ، وَلْيَتَوَضَّأْ، وَلْيُعِـدْ اَلـصَّلَاةَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد رقـم: ٦٥٥. أبـوداود رقـم: ٢٠٥. ترمـذی رقـم: ١١٦٤. نـسائی فـی الکبری رقم: ٩٠٢٦. ابن حبان رقم: ٤٢٠. بیهقی رقم: ٣١٩٧}:

عەلی کوڕی طەلق (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئەگـەر دونیـا بـوو کەسـێکتان لـەناو نوێـژدا تـسێکی کەنـد، یـا بایـەکی لێ بوویـەوە، بـا نوێژەکـەی بـبڕێو بـچێ دەسـنوێژ بگرێتەوەو ئـەوجا نوێژەکـەی بەتـەواوی بکـا). ئیبنـو حیببـان بەتەندروستی داناوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەسـت ئەوەیـە بـە بـا لێبوونـەوە دەسـنوێژ دەشـکێ، ئـیتر لـەپێش دەستپێکردن بێ بەنوێژ، یان لەناو نوێژەکەدا بێ، دەسنوێژەکە دەشکێ.

٢- عــەلی کـوڕی طـەلـق هـاوەڵی پێغەمبـەرە، ئـەبوداوودو تەرمـەزیو نەسائی، فەرموودەی ئەویان گێڕاوەتەوە، بوخاری دەفەرموێ: بەپێی ئاگاداری من، عەلی کوڕی طەلق، تەنیا ئەم فەرموودەیەی هەیە کەوا لێرەدا.

٢٢١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَقْبَلُ اَللَّهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ}. رَوَاهُ اَلْخَمْـسَةُ إِلَّـا النَّـسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أبوداود رقم: ٦٤١. ترمذی رقـم: ٣٧٧. حـاکم رقـم: ٩١٧. بیهقـی رقـم: ٤٨٦٩. أحمد رقم: ٢٥٨٧٦. إسحاق بن راهوية رقم: ١٢٨٤}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا نوێژی ژنی ڕەسیدە (بالغ) بەبێ سەرپۆش و لەچکە گیرا ناکا). {تاج/١، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٠٧ — د/ت — س ح = تاجول ئوصولْ بەکوردی، بەرگی یەکەم چاپی چوارەم، زنجیرە/٥٦، ژمارە: ٤٠٧. ئەبوداوودو تەرمەزی بەڕشتەیەکی شیرین گێڕاویانەتەوە}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ڕەسیدە بوون بەچەند شتێك دەبێ بۆ ژن:

آ- بەشەیتانی بوون.

ب- بەساڵ، زۆرینەی کات لەنێوانی یازدە ساڵی و چواردە ساڵیدا ژن ڕەسیدە دەبێ، ئەگەر نەبوو، ئەوا کەچواردەی تەواو کرد دائەنرێ بە ڕەسیدە.

٢- ژن شەرمگای شەرعی نەپۆشێ نوێژەکەی پووچەو بەتاڵە.

٣- کچی مناڵ واباشە کە نوێژ دەکا، وەك ژنی گەورە بەتەواوی خۆی داپۆشێ، بەڵام ئەگەر بەبێ لەچکیش نوێژ بکا دروستە، بەمەرجێ وەك پیاو، نێوانی ناوك و ئەژنۆی داپۆشێ. بەڵام لەلای شافیعیەکان کچی مناڵیش لەنوێژدا، بۆ داپۆشینی شەرمگا، وەك ژنی گەورە وایە.

٤- ئێمە لەڕۆژگارێکا دەژین کە عەلمانیەت و عەولەمە، وەك دوو سەگی برسی، یان وەك دوو جەجاڵی هێرشبەر، بەهەر چوارلادا هەڵپە دەکەن و هەڵمەت دەبەن و ئایین و ڕەوشت و بەها بەرزەکان قەڵاچۆ دەکەن و پاکۆ دەدەن، گەورەترین دێوجامەو زەهری هەلاهیل، بەدەست ئەم دوو دیوەزمەوە، بۆ رووخانی ئایین و بۆ دروێنەی ڕەوشتی بەرز، بۆ کردنی کۆمەڵگا بەگەندەڵخانەی بێ ڕەوشتی و بە مەڵبەندی لەزەتپەرستی و بەس، گەورەترین دیوەجامەو کوشندەترین زەهری هەلاهەل، بەدەست ئەم دوو جەجاڵەوە: ژن و وێنەیە. لەڕێگەی بەرەڵایی ژنەوەو لەڕێگەی فلیمی رووت و

قووتو جنسییەوە زاڵبوون بەسەر هەستو نەستو دڵو مێشکی لاوەکانداو جیهانیان کردووە بەتیاترۆ.

جا بۆئەوەی کەئێمەیش نەبین بەدۆستی نەزانو نەدان، واباشە ئەوەندەی دەتوانین کارئاسانی بۆ رەگەزی مێ بکەین، باریان قورس نەکەین، جاوا لێرەدا بەم مەبەستە ئەمە روون دەکەینەوە:

آ- مەزهەبی مالیکی، مەزهەبێکی متمانەدارە، یەکێکە لەچوار مەزهەبە گەورەکەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، تەقلید کردنی ئەم مەزهەبە پیرۆزە، بەشێوەی گشتی، یابەشێوەی جوزئی، کارێ دروستو ڕەوایە، بەتایبەتی لەم جۆرە بابەتانەدا.

ب- جا لەمەزهەبی ئیمامی مالکیدا، کەناسراوە بە مەزهەبی مالیکی، شەرمگا دوو بەشە: بەشێکیان شەرمگای قورسە، کەپێی دەگوترێ (عەورە موغەللەظە).

بەشەکەی تریان: شەرمگای سووکە، کەپێی دەگوترێ (عەورە موخەففەفە). شەرمگای قورس بۆ پیاو چووکو گونو ئەڵقەی کۆمیەتیو بەس، سووکەکەیشی زیاد لەوە نێوانی ناوکو ئەژنۆیەتی، شەرمگای قورس بۆ ژن لای خوارووی سینگەوەیە هەتا ئەژنۆ، واتە: سەرو هەرچوار پەلو گەردنو لە ئەژنۆ بەرەوخوار عەورە موخەففەفەیە، عەورە موغەللەظە نییە، هەروا سینگو ئەوەی لەپشت بەرابەر سینگە، عەورە موغەللەظە نییە، بەڵکوو عەورە موخەففەفەیە. جا ئەگەر کەسێ ژن بێ، یاپیاو شەرمگای قورسی دابپۆشێ، بەڵام شەرمگای سووکی دانەپۆشێ، وەبەو شێوە نوێژ بکا، ئەوە نوێژەکەی دائەمەزرێو نوێژەکەی بەتاڵ نییە، گەرچی کاری حەرامی ئەنجام داوە.

ژنێکی مۆده بەجلی مۆدەوه نوێژ بکا، نوێژەکەی دائەمەزری و فەرزەکەی لەکۆڵ دەخا، گەرچی بەهۆی دەرخستنی شەرمگای سووکەوە، گوناهی دەگات).

٢٢٢- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهُ : {إِنْ كَانَ اَلثَّوْبُ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ"} - يَعْنِي : فِي اَلصَّلَاةِ - وَلِمُسْلِمٍ: {"فَخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ - وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ "} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٢٨ = ٣٦١، ٣٥٢. مسلم رقم: ٣٠٠٦ = ٧٤٣٧ صحيح مسلم ترقيم شيحا}:

لەتەجریددا ئاوایە:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆی و لە عەبدوڵڵای باوکی) فەرمووی: لەسەفەرێکا، لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، شەوێ بۆ ئیشێکی خۆم چووم بۆ خزمەتی، کاتێ چووم خەریکبوو نوێژی دەکرد، منیش یەك پارچە جلم پێوە بوو، ڕاست و چەپ ئاڵاندبووم لەخۆمەوە، لەتەنیشتیەوە دەستم کرد بەنوێژکردن و پەیڕەوی (ئیقتیدا)م پێی کرد، کاتێ لەنوێژەکە بۆوە و ڕووی لەرووگە نەما، فەرمووی: ئەی جابیر! بەم شەوە خێرە واهاتووی؟

منیش کارەکەی خۆمم عەزیکرد، جاکاتێ ئیشەکەمم تەواوکرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی جابیر! ئەگەر جلەکە فەرەح بوو، دووچەمکەکەی ڕاست و چەپ بکە، بەڵام ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بەکەمەرەتەوە!).

ئەم فەرموودەیە لە تاجدا بەدوورو درێژی کراوە بەکوردی، ئەگەر بفەرمووی، موتاڵای بکەی بێ بەهرە نابێ (تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٣١٨٥، چاپی چوارەم لاپەڕە/٤٨٨).

(ڕوونكردنەوە):

١- مەبەست لەم فەرموودەیە ئەمەیە، ئەگەر جلەكە فەرەح بوو، ئەوە وەك كراسی ئاودامان لەبەری بكەو سەرو لای خوارووی لەشتی پێ داپۆشە بەمە دەگوترێ: ئیلتیحاف، چونكە وەك لێفە هەموو لەشی مرۆڤ دەپۆشێ، بەڵام ئەگەر جلەكە تەسك بوو، ئەوە بیكە بەئیزار، كە بەواتا دەرپێیەو لای خوارووی لەشتی پێ داپۆشە.

٢- ئەم فەرموودەیە (متفق علیة)ییە، تەنیا ڕستەی (فَخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ) ئەم پارچەیەی هی موسلیمە.

٢٢٣- وَلَهُمَا مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {لَا يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي اَلثَّوْبِ اَلْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ}.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٢٦ = ٣٥٩، ٣٦٠ فتح الباری. مسلم ٥١٦ = ١١٥١ شیحا}:

بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەیەك پارچە جلی واوە نوێژ مەكەن، كە لەبەر كەموكورتی، نەگاتەوە بەسەر هەردوو شانتانا). {تاج/١، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٣٩٧ ج/٤ – ش/د/ن}.

٢٢٤- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا سَأَلَتْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَتُصَلِّي اَلْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ ، بِغَيْرِ إِزَارٍ ؟ قَالَ : "إِذَا كَانَ اَلدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَصَحَّحَ اَلْأَئِمَّةُ وَقْفَهُ.

{أبوداود رقم: ٦٤٠. حاكم رقم: ٩١٥. وقال صحيح عَلى شرط البخاری ووافقه الذَّهِبِیُ}:

ئەبوداوود ئاوا بە مەوقوفی لەسەر ئوم سەلەمە دەیگێڕێتەوە كە پێشەوایانی فەرموودەناسی وەقفەكەی بەتەندروست دەزانن:

پرسیارکرا له ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزاو رەحمەتی خودا لەسەر هەموو هاوسەرو هاوەڵانی بێ):

ئایا ئافرەت بەچی جلێکەوە نوێژ بکا؟ فەرمووی: بەلەچكو بەكراسی ئاودامانەوە، کەپشتی هەردوو پێی دابپۆشێ، با نوێژ بکات). {تاج/١، زنجیرە: ٥٦ — بەرگی ژنی ئازاد لەنوێژدا}.

بەڵام لێرەدا بە مەرفوعی ئاوایە:

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایا ئافرەت بەچی جلێکەوە نوێژ بکا، بەکراسو سەرپۆشەوە نوێژ بکا، ئەگەر دەرپێی لەبەردا نەبوو؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەگەر کراسەکە ئاودامان بوو، پشتی هەردوو پێی دادەپۆشێ، ئەوا با بەلەچكو کراسی واوە نوێژ بکا).

٢٢٥- وَعَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : {كُنَّا مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي لَيْلَةٍ مُظْلَمَةٍ ، فَأَشْكَلَتْ عَلَيْنَا اَلْقِبْلَةُ ، فَصَلَّيْنَا . فَلَمَّا طَلَعَتِ اَلشَّمْسُ إِذَا نَحْنُ صَلَّيْنَا إِلَى غَيْرِ اَلْقِبْلَةِ ، فَنَزَلَتْ : (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اَللَّهِ)} . أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَضَعَّفَهُ.

{ترمذی رقم: ٣٤٥. ابن ماجه رقم: ١٠٢٠}:

عامیری کوڕی رەبیعە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ تاریکە شەو بوو، لەسەفەرێکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، دونیا هەور بوو، نەمان دەزانی کە قیبلە لەکوێ وەیە، جا لەسەر ئەو حاڵە نوێژمان کرد، کەرۆژ بۆوەو خۆرهەڵهات، بۆمان دەرکەوت کە بەرەو رووگە نوێژمان نەکردووە، بەڵکوو بەرەو جێگەیێ تر نوێژمان کردووە، جا بەم بۆنەیەوە ئایەتی {وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ — البقرة/١١٥}. هاتە خوارەوە.

تەرمەزی گێڕاویەتەوەو بەلاوازی داناوە.

لەتاجا ئەم حەدیثە ئاوایە: {تاج/١، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٣٩٢ ج/٤}:
عامیری کوڕی رەبیعە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، شەوبوو، گەلێ تاریك بوو، لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، نەمان دەزانی کە رووگە لەکوێوەیە، جا هەرکەسەی بەڕای خۆی کوێی بەرووگە زانی، لەنوێژەکەیا، رووی کردە ئەوێ، جا بۆ بەیانی کە ئەم باسەمان عەرزی حەزرەت کرد، بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ – البقرة/٢/١١٥}.

واتە: لەنوێژا، لە بارودۆخی ئاوادا، کەسووچی ئێوەی تیانییە، ئەگەر رووگەتان هەڵەکرد، رووبکەنە هەرکوێ‌و رووبکەنە هەرلایێ، روو بەخودایەو نوێژەکەتان گیرایە. {ترمذی- سند ضعیف}.

(روونکردنەوە):

عامیری کوڕی رەبیعەی عەنەزی، یەکێکە لە هاوەڵە دێرینەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو کۆچوی کردووە، یەکێ بۆ حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەکانی پاشی بووە، فەرمودەی لە صەحیحەین‌و پەڕاوە ناودارەکانی تری فەرموودەدا هەیە، ئیمامی عوثمان کاتێ چوو بۆ حەج، عامیری کرد بەجێگەنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە. ئەو سەردەمەی کە خەڵك بەرە بەرە رەخنەیان لە سیاسەتی عوثمان دەگرت، شەوێ عامیر سەرقاڵی شەونوێژ بوو، کەسێ هات پێی گووت: هەڵسە لە خودای گەورە داوابکە، کە لە ئاشووب‌و ئاژاوە بتپارێزێت).

ئەویش هەڵسا دەستی کرد بە شەونوێژ، ئیتر نەخۆش کەوت‌و هەڵنەسایەوە لەو نەخۆشییە، هەتا تەرمەکەیان برد بۆسەر گۆڕستان –

دەڵێن: ساڵی (٣٢) سیی‌و دوو، یا (٣٧) سیی‌و حەوتی کۆچی مـردووە، بەچەند ڕۆژێ لەپاش شەهیدبوونی عوثمان مردووە.

٢٢٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَا بَيْنَ اَلْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ قِبْلَةٌ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ ، وَقَوَّاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{ترمذی. رقم: ٣٤٤}:

لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (نێـوانی خۆرهـەڵات‌و خۆرئـاوا هـەمووی قیبلەیـە!). {تـاج/١، زنجـیرە: ٥٣، ژمـارە: ٣٩١ — ئیبنـو ماجـەو حـاکم‌و دارە قوطنی‌و تەرمەزی گێڕاویانەتەوە، تەرمەزی بە صەحیحی داناوە}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست ئەوەیـە: ئەگـەر کەسێ نەیـدەزانی ئاسـتی ڕووگـە کامەیـە، ڕووبکاتـە ڕووی ڕووگـە، ئـیتر ئەوەنـدەی بەسـە، مـەرج نییـە کـە لـەکاتی وادا ڕێك‌و ڕاست ڕووبکاتە خوودی ڕووگە، بەڵکوو ڕووکردنە لای قیبلە بەسە.

٢٢٧- وَعَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِيَ اللّٰـهُ عَنْـهُ) قَـالَ : {رَأَيْـتُ رَسُـولَ اَللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِـهِ}. مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ. وَزَادَ اَلْبُخَارِيُّ : {يُومِئُ بِرَأْسِهِ ، وَلَمْ يَكُنْ يَصْنَعُهُ فِي اَلْمَكْتُوبَةِ}.

{تجریدی بوخاری/١، ژمـارە: ٢٥٣ = ٤٠٠، ١٠٩٤، ٤١٤٠ فـتح البـاری. مسلم ٥٧٢ = ١٦١٤ شیحا} + {بخاری/ ١٠٩٨، ١٠٩٩}.

عامیری کوڕی ڕەبیعـە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بەچاوی خـۆم پێغەمبـەرم بینـی بەسـەر پـشتی وڵاخەکەیـەوە، نوێـژی سـوننەتی دەکـرد، بەمـەرجێ لـەکاتی ڕۆشـتنەکەیدا، وڵاخەکـەی ڕووی لەوشـوێنەبوایە، کـە مەبەستی بوو، بۆی بچێ (بوخاری‌و موسلیم) بوخاری ئەمەی لێ پتر کردووە:

لەتاجدا {بەرگی/١، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٩٣ چ/٤} ئاوایە:

**جـابـر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـەفەردا، بەسـواری وڵاخ نوێـژی سـوننەتی دەکـرد، بەمـەرجێ وڵاخەکـەی لەژێریـدا، رووی لەشـوێنی مەبەسـت بوایـە، کـەبۆی دەچوو، بـەڵام کـە دەیویـست نوێـژی فـەرزبکا، لـە وڵاخەکە دادەبـەزیو رووی دەکردە رووگە {ش/د/ت/ن = شەیخەین + ئەبو داوود + تەرمەزی + نەسائی = تـاج/١، زنجـیره: ٥٤، ژمـاره: ٣٩٣ چ/٤}. لەگێڕانەوەیـەکا: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێـژی سـوننەتو نوێـژی وەتـری بەسـەر پـشتی وڵاخەوە دەکرد، بەرەو هەرلایێ ببوایە، بەمـەرجێ رووی لـە مەقـصەد بوایـە، بەڵام نوێژی فەرزی بەسەر وڵاخەوە نەدەکرد.**

**٢٢٨**- وَلِأَبِي دَاوُدَ : مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ: {كَـانَ إِذَا سَـافَرَ فَـأَرَادَ أَنْ يَتَطَـوَّعَ اِسْتَقْبَلَ بِنَاقَتِهِ اَلْقِبْلَةِ ، فَكَبَّرَ ، ثُمَّ صَلَّى حَيْثُ كَانَ وَجْهَ رِكَابِهِ}. وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ.
{أبوداود. رقم: ١٢٢٥}:

**ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەفەردا، کـە دەیویـست نوێـژی سـوننەت بکـا، لەپێشان رووی وشترە مێکەی دەکردە قیبلە، ئـەنجا بـەرەو رووگـە بـە ئـەڵڵاهو ئەکبەر، نوێـژی دادەبەسـت، ئـیتر نوێژەکـەی تـەواو دەکـردو وشـترەکەی رووی لەهـەر لایـێ بکردایـە مەبەسـتی نـەبوو، بەمـەرجێ بـەرەو جێگـەی مەبەسـت بڕۆیشتایە). {تاج/١، زنجیره: ٥٤، ژماره: ٣٩٤ چ/٤ = چاپی چوارەم}.**

**دانەر (رەحمەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: رشـتەکەی شـیرینە (واتـە: ئیسنادەکەی حەسەنە).**

**٢٢٩**- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم): {اَلْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا اَلْمَقْبَرَةَ وَالْحَمَّامَ}. رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ ، وَلَهُ عِلَّةٌ.
{ترمذی. رقم: ٣١٧}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەر زەوی گشتی وەك مزگەوت وایە، دەست دەدا بۆ جێگە نوێژ، جگە لە گۆڕستانو جگە لە گەرماو). {تەرمەزی گێڕاویەتەوە، بەڵام لاوازە}. {تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٣٨}.

٢٣٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {نَهَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يُصَلَّى فِي سَبْعِ مَوَاطِنَ : اَلْمَزْبَلَةِ ، وَالْمَجْزَرَةِ، وَالْمَقْبَرَةِ، وَقَارِعَةِ اَلطَّرِيقِ، وَالْحَمَّامِ، وَمَعَاطِنِ اَلْإِبِلِ، وَفَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ اَللّٰهِ}. رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَضَعَّفَهُ.

{ترمذی. رقم: ٣٤٦، ٣٤٧}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی كردووە لەنوێژكردن لەم حەوت شوێنەدا: لە سەلوێنكو قەسابخانەو گۆڕستانو سەرەڕێو گەرماوو مۆڵگەی سەر سەرچاوەی ئاو خواردنەوەی وشترو، لەسەر سەربانی كەعبە). {تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٤١ چ/٤}. (تەرمەزی گێڕاویەتەوە، بەبێهێزی داناوە).

٢٣١- وَعَنْ أَبِي مَرْثَدٍ اَلْغَنَوِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا تُصَلُّوا إِلَى اَلْقُبُورِ ، وَلَا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم شيحا/ ٢٢٤٨ = ٩٧٢ مسلم}:

ئەبو مەرثەدی ئەلغەنەوی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (كە نوێژدەكەن ڕوومەكەنە گۆڕو لەسەریشی دامەنیشن). (موسلیم گێڕاویەتەوە).

(ڕوونكردنەوە):

ئەبو مەرثەد ناوی مەرثەدی كوڕی ئەبو مەرثەدە، خۆیو باوكی موسوڵمان بوون، لەگەڵ پێغەمبەردا خۆیو باوكی ئامادەی غەزای بەدر بوون، خۆیو باوكی لەسەر دەستووری كۆن، هاوپەیمانی حەمزەی كوڕی

عەبدولموطـەلیب بوون، هەروا ئامادەی جەنگی ئوحود بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوانی ئەوو لەنێوانی ئەوسی کوڕی صامیتدا، پەیمانی برایەتی بەست، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، ئەبو مەرثەد لەغەزای رەجیعدا شەهیدکرا.

٢٣٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ اَلْمَسْجِدَ ، فَلْيَنْظُرْ، فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ أَذًى أَوْ قَذَرًا فَلْيَمْسَحْهُ، وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا}. أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أبوداود رقم: ٦٥٠. بيهقي رقم: ٤٠٤٩. ابن خزيمة رقم: ١٠١٧. ابن حِبان رقم: ٢١٨٥}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجا ئاوایە: دەیکەین بەراڤەو روونکردنەوە بۆ ئێرە:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی دەکرد بۆ هاوڕێکانی، لەپڕ لەناو نوێژەکەیدا، پێڵاوەکانی خۆی داکەندو لەلای چەپیەوە دانان، هاوەڵانیش، کە ئەمەیان بینی، ئەوانیش پیلاوەکانی خۆیان فڕێدا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: (ئەوە ئێوە بۆچی پیلاوەکانی خۆتان داکەند؟). گوتیان: دیمان کە تۆ پیلاوەکانی خۆتت داکەند، ئێمەیش چاومان لەتۆ کردو پیلاوەکانی خۆمانمان داکەند، فەرمووی: (من بۆیە وام کرد چونکە جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلامو پێی گوتم کەپیسیو ئازار بە پیلاوەکانمەوە هەیە، بۆیە من دامکەند) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (کە دێن بۆ مزگەوت، سەرەنجی پیلاوەکانتان بدەن، ئەگەر پیسی یا ئازاریان پێوە بوو، بیسڕنو نوێژیان پێوە بکەن). {تاج/١، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٣٨٤}.

٢٣٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ اَلْأَذَى بِخُفَّيْهِ فَطَهُورُهُمَا اَلتُّرَابُ}. أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{ابن خزيمة رقم: ٢٩٢. أبوداود رقم: ٣٨٥، ٣٨٦. ابن حبان رقم: ١٤٠٤}:

**ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (ئەگەر کەسێکتان پێی نا لەئازارێ، وەپێڵاوەکانی لەو ئازارو پیسییەیان بەرکەوت، خۆڵ پاکیان دەکاتەوە).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە: ئەوەیە خۆپاراستن لەپیسی لەکاتی نوێژدا کارێ پێویستە، وەهۆی پاکەوە بوونی شتیش مەرج نییە کە هەر بەئاو بێ، جاری وادەبێ کەمێ پیسی ڕێگە بەبنی سۆلەوە دەبێ، ئەگەر نوێژکەر ویستی پیلاوەکانی دانەکەنێ، ئەوە بۆی هەیە، ئەو ئازارو پیسییە بە زەوییەکە بسڕێو نوێژەکەی بکا.**

**بەڵام ئێستا بەشێوەیەکی گشتی، نوێژکەر کە دەچن بۆ مزگەوت، پێڵاو دادەکەنو بەپێڵاوەوە نوێژ ناکەن، بەڵام جاروبار لەڕێگەوبان شتی وا ڕوودەدا، یا حەنەفییەکان نوێژی تەرم، جاروبار بەپێڵاوەوە دەکەن.**

٢٣٤- وَعَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ اَلْحَكَمِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ هَذِهِ اَلصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ اَلنَّاسِ ، إِنَّمَا هُوَ اَلتَّسْبِيحُ، وَالتَّكْبِيرُ، وَقِرَاءَةُ اَلْقُرْآنِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{موسليم شيحا/ ٥٧٧٤، ١١٩٩}:

**موعاوییەی کوڕی ئەبو ئەلحەکەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڕاستی ئەم نوێژە بە کەڵکی قسەی دونیایی نایێ، چونکە نوێژ خوا دایناوە کە هەر تەسبیحاتو ئەڵڵاوئەکبەری تیا بکرێو، ستایشو سوپاسی خودای تیابکرێو، باسی**

گەورەیی خودای تیابکرێو قورئانی تیابخوێنرێ) {تاج/١، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤١١}.

(ڕوونکردنەوە):

موعاوییەی کوڕی حەکەم هاوەڵی پێغەمبەرە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، یەك فەرموودەی لەصەحیحی موسلیمدا هەیە کە ئەم فەرموودەیە، موعاوییە دەفەرموێ: (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕۆژێ لەگەڵ عەلی برامـا، لەخزمـەتی حەزرەتدا بووین، عەلی برام دەیی لە ئەسپەکەی کرد، کە لەخەندەکێ بە قەڵەمبازێ بپەڕێتەوە، بەلام ئەسپەکە کورتی هێناو کەوت، لەبەر ئەوە دیواری خەنەکەکە لاقی عەلی برامی ورد کرد، جا لەسەر ئەوحاڵە عەلیمان برد بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هێنا بەسەر لاقە شکاوەکەیداو فەرمووی: (بِسْمِ الله) ئیتر ئەلەم لەلاقیا نەما، کەدابەزی تەواو چاك بوو بۆوە).

٢٣٥- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ : {إِنْ كُنَّـا لَنَـتَكَلَّمُ فِـي اَلصَّلَاةِ عَلَى عَهْدِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُكَلِّمُ أَحَدُنَا صَاحِبَهُ بِحَاجَتِـهِ ، حَتَّـى نَزَلَتْ: (حَافِظُوا عَلَى اَلصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ اَلْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) اَلْبَقَرَة: ٢٣٨، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ ، وَنُهِينَا عَنْ اَلْكَلَامِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٥٩٠ = ١٢٠٠، ٤٥٣٤. پوختەی موسلیم ٣٣٤ = ١٢٠٣ شیحا = ٥٣٩ موسلیم. تحفة الأشراف: ٣٦١١. أبوداود رقم: ٩٤٩. ترمذي رقم: ٤٠٥. نسائي رقم: ١٢١٨}:

لەزەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە لەپێشدا، لەناو نوێژدا، قسەمان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ — البقرة/٢٣٨}. واتە:

بەباشی ئاگاداری هەموو نوێژە فەرزەکانتان بکەن، بەتایبەتی نوێژی ناسراو بە (الصَّلاَةِ الْوُسْطَى) کەنوێژی عەصرە، وەلەناو نوێژدا، بەسەرکزیو بەملکەچی ڕاوەستنو، دەم بەذیکرو یادی خودابنو، لەکاری دونیاییو لەقسەی ئاسایی بەدووربن!).

ئیتر بەپێی ئەم ئایەتە فەرمانمان پێ کرا بەبی دەنگیو خامۆشی لەنوێژاو، قسەکردنی ئاساییمان لێ قەدەغە کرا. {تاج/١، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٠٩}.

(ڕوونکردنەوە):

زەیدی کوڕی ئەرقەمی قەیسی ئەنصارییە، خەزرەجییە، ماڵی ئەرقەمی باوکی (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) لەسەرەتای ئیسلامەوە بوو بوو بەمەکۆو جێگەی کۆبوونەوەی نهێنی موسوڵمانەکان، کە لەسەر گردی صەفا بوو، هەتا ژمارەیان بە عومەری کوڕی خەتابەوە بووبە چل کەس، دواهەمینی ئەو چل کەسەیە، عومەری کوڕی خەتاب بوو، ئیتر لەوێ گواستیانەوەو دەرچوون، ئەرقەم کۆچەری بوو، ئامادەی جەنگی بەدرو ئوحودو گشت نەبەردگاکانی تری پێغەمبەر بوو بوو، ئەرقەم لە مەدینە مردووە، لەتەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدا، هەندێ دەڵێن: باوکی ئەرقەمیش موسوڵمان بووە.

زەیدی کوڕی ئەرقەم، لەڕۆژی غەزای ئوحوددا ویستی هاوبەشی ئەو جەنگە بکا، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ نەدا، لەبەرئەوەی کە مێردمناڵ بوو، یەکەم شەڕگە، کە زەید ئامادەی بوو، غەزای خەندەق بوو، زەید لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی حەفدە غەزا بووە، فەرموودەی زۆری پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، لەپیاوانی صەحیحی موسلیمو صەحیحی بوخارییە، دادەنرێت بەیەکێك لە خۆشەویستەکانی ئیمامی عەلی، لەپێشەوا عەلییەوە، گێڕانەوەی زۆرە، ئامادەی ڕووداوی صەفین بووە، ساڵی (٦٦) یا (٦٨)ی کۆچی لەسەردەمی (المختار)دا، لەکووفە مردووە.

جارێ زەید گوێی لێ دەبێ، لە سەفەرێکا، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، سەرۆکی ناپاکەکان، هەڕەشە لە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکاو دەڵێ: (ئەگەر گەڕاینەوە لەم سەفەرە بۆ مەدینە، دەستەی مـن‌و، دەستەی موحەممەد، کاممان ئازاو دلێرو توانا بووین، دەستەی داماوو بێ دەسەڵاتمان، لەمەدینە وەدەر دەنێین!).

جا زەید ئەمە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەبدوڵڵا دەپرسێ، کە شتی وای گوتووە، یانا؟ ئەویش حاشای لێ دەکاو سوێند دەخوات کەشتی وای نەگوتووە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) باوەڕی پێ دەکاو باوەڕ بەقەسەکەی زەید ناکا، تا لەئەنجامدا، خودا ئایەتی نارده خوارەوە ڕاستیی قسەی زەیدی چەسپاندو، قسەی ئیبنو سەلوولی بەدرۆ خستەوە. {بڕوانە: تەجرید/٢، ژمارە: ٥٩٠ + تەجریدی/٢، ژمارە: ٦٠٩}.

٢٣٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلتَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ . زَادَ مُسْلِمٌ {فِي اَلصَّلَاةِ}.

{بخاری تصفیق فی صلاة/ رقم:١٢٠٣. پوختەی موسلیم/٣٣٥ = ٩٥٣، ٩٥٥ شیحا}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ ڕوویدا، با بڵێ سوبحانەڵڵاە،) چونکە کە سوبحانەڵڵای کرد، ئیتر تێ دەگەن، لەکارەکە، وەڵێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بۆ ژنانەو بەس). {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٦٩ + تەجرید/١، لاپەڕە: ٣٧٦، ژمارە: ٣٨٥ = ٦٨٤، ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٣}.

لەگێڕانەوەی یەکەمی ئێرەدا، کە ژمارە (٩٥٣ شیحا)یە، ئاوایە:

ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (سوبحانەڵڵا لەناو نوێژدا، بۆ هۆشیار کردنەوە بۆ پیاوانەو، چەپڵەیش بۆ ژنانە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٦٨ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست ئەویە گەلێ جار نوێژکار هەست دەکا، کەواشتێ نائاسایی روودەدا، جا بۆ هۆشیارکردنەوەی کەسی مەبەست، خۆنابێ نوێژخوێن بەقسە پێی بڵێ، ئەی دەبی چی بکا، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەم چەند نموونەیە دەنووسین:

١- مامۆستا بەرنوێژیمان بۆ دەکا، قورئانخوێندنەکەی لێ تێك دەچێ، لەکاتی وادا، ئەوکەسەی کە قورئانەکەی بەباشی لەبەرە، بابۆ مامۆستای راست بکاتەوە، هەروا ئەگەر مامۆستا دانیشت بۆ تەحیاتو شوێنی تەحیات نەبوو، بەتەسبیح بۆ پیاو، یا بەچەپڵە بۆ ژن هۆشیاری دەکەنەوە کە شوێنی تەحیات نییە.

٢- نوێژخوێن سەرگەرمی نوێژە، خەڵکانێ وان لەدەوری، لەبەر سەرقاڵی خۆیان ئاگایان لەوە نییە کەوا منالێ خەریکە سوپاکە دەخاو ئاگرێ دەخاتەوە، لەکاتی وادا نوێژخوێن ئەگەر پیاو بوو، با سوبحانەڵڵا بکا، تادانیشتووەکان هۆشیار بکاتەوە، هەتا دەستی ساواکە بگرن، خۆ ئەگەر نوێژخوێن ژن بوو، با چەپڵە لێ بدا، هەتا ئامادەبووان ئاگادار دەبنەوەو ناهێڵن کارەساتێ، یا رووداوێکی ناخۆش رووبدات، ئیتر نموونەی تری لەم بابەتە هەر زۆرە.

٢٣٧- وَعَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي، وَفِي صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ اَلْمِرْجَلِ، مِنْ اَلْبُكَاءِ}. أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ، إِلَّا اِبْنَ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود رقم: ٩٠٤. ترمذي في الشمائل ٣٢٣، ٣١٥. نسائي ١٣/٣. ابن حبان رقم: ٦٦٥. ابن خزيمة/٩٠٠}:

**موطەریفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەل‌شەخیر فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد، لەناو نوێژەکەدا، لەبەر کوڵی گریان دەنگی سینگی دەتگوت ویزەی ئاشە، یاگیزەی مەنجەڵی سەر ئاگرە).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**عەبدوڵڵای کوڕی ئەل‌شەخیر، لەگەڵ هۆزی بەنی عامیردا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر، خۆی لەبەرەبابی حەریشە، کەخێڵێکن لەخێڵەکانی بەنی عامیر، بە بەصرەیی دەژمێردرێ، دوو کوڕی زانای هەبوو، کە موطەرریفولفەقیەو، یەزیدی ئەبولعەلاء بوون. (پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٤٨).**

٢٣٨- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ لِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَدْخَلَانِ، فَكُنْتُ إِذَا أَتَيْتُهُ وَهُوَ يُصَلِّي تَنَحْنَحَ لِي} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ.

{نسائي/ ١١٣٦. ابن ماجه/ رقم: ٣٧٠٨. أحمد ٨٠/١. بيهقي/ ٢٤٧/٢}:

**عەلی کوڕی ئەبوطالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو کاتی تایبەتم هەبوو، کە لەو دوو کاتەدا دەچووم بۆ خزمەتی، جا کە دەچووم، کە داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم دەکرد، ئەگەر نوێژی بکردایە، بەکۆکە وەڵامی دەدامەوەو دەچوومە ژوورەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٧٢}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**ئەوەیش واتای وایە نوێژ بەکۆکە پووچ نابێ، بەهەرحاڵ بۆ دەربازبوون لەڕاجیایی، واباشە نوێژخوێن بەبێ مەهانەی ڕەوا نەکۆکێ، چونکە هەندێ**

دەفورمـوون: (ئەگـەر كۆكـە دوو پیتـی لێ دروسـت بـێ، نوێـژ پـووچ دەكاتـەوە، وەك (ئح، ئح).

ئەمەیش گێڕانەوەی تاجە.

عـەلی (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: كـاتێكی تایبـەتم هـەبوو تیـادا دەچـووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـە دەچـووم لەپێشدا داوای ڕێگەی چوونە ژوورەوەم دەكـرد، ئەگـەر نوێـژی بكردایـە بـۆم دەكـۆكیو دەچـوومە ژوورەوە ئەگـەر دەستیـشی بـەتاڵ بوایـە خـۆی ڕێگـەی دەدامو دەچوومە ژوورەوە بۆ خزمەتی (ئەبوداوودو ئەحمەدو ئیبنـو سـەكەن گێڕاویانەتەوە، ئیبنو سەكەن بەصەحیحی داناوە).

٢٣٩- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {قُلْتُ لِبِلَـالٍ: كَيْـفَ رَأَيْـتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَرُدُّ عَلَيْهِمْ حِينَ يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ ، وَهُوَ يُـصَلِّي ؟ قَـالَ : يَقُولُ هَكَذَا ، وَبَسَطَ كَفَّهُ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{أبوداود رقم: ٩٢٥. ترمذی رقم: ٣٦٧ وقال حسن صحيح. ابن ماجـه رقـم: ١٠١٧. نسائی ٣/٥}.

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: گوتم بە بـیلال: جاران كە لەناو نوێژدا، سڵاویان لە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەكـرد، وەك تۆ دیوتە، چۆن سڵاوی دەسەندەوە؟

فەرمووی: بەدەستی ئاوای دەكردو بە ئاماژەی دەست وەڵامی سڵاوەكەی دەسەندەوە، نەوەك بەقسە. راوی لـە ئیبنـو عومـەرەوە كـە جەعفـەری كوڕی عەونە، ئاوا ئاماژەكەی پێغەمبـەری روون كـردەوە: لـەپی درێـژ دەكـرد، بـەری لەپی بۆ خوارەوەو پشتی بۆ سەرەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٧٠ ج/٤}.

(ڕوونكردنەوە):

ئەم ڕووداوە ئاوا بووە: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ قوباء، نوێژی لێ بكا، ئەنصار هاتن بۆ خزمەتی، حەزرەت نوێژی دەكرد، سڵاویان لێ كرد، ئیبنو عومەر فەرمووی: لەبیلالم پرسی... تاد).

٢٤٠- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتِ زَيْنَبَ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .وَلِمُسْلِمٍ: { وَهُوَ يَؤُمُّ اَلنَّاسَ فِي اَلْمَسْجِدِ} .

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٠٧ = ٥١٦. فتح الباری. مسلم شیحا ١٢١٢، ١٢١٤}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم، پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا، بەرنوێژی بۆ مەردومەكە دەكرد، لەوكاتەدا ئومامەی كچی ئەبولعاصی بەسەرشانەوە بوو، كە كچی زەینەبی كچی پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر كچو نەوەی بێ) جا لەكاتی چەمینەوە، (ڕوكوع)دا، ئومامەی لەسەر زەوییەكە دادەنا، هەتا كاتێ لەكوڕنووش هەڵدەسایەوە، ئەوسا دەیكردەوە قەڵادۆشكانی. {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٦٤} .

٢٤١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {اُقْتُلُوا اَلْأَسْوَدَيْنِ فِي اَلصَّلَاةِ : اَلْحَيَّةَ، وَالْعَقْرَبَ} . أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود رقم: ٩٢١. ترمذی رقم: ٣٩٠. ابن ماجه رقم: ١٢٤٥. ابن حبان رقم: ٢٣٥٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەتا تەنانەت لەناو نوێژیشدا دوو ڕەشەكە

واته: مارو دووپشك بكوژنو بوارەیان مەدەن). {تاج/١، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٦٦٥}.

(ڕوونكردنەوە):

١- باسی مەرجەكانی نوێژ (٢٢) بیستو دوو فەرموودەی لەخۆگرتووە، لە (٢٢٠)وە هەتا (٢٤١) ئاوا: (٢٤١ — ٢١٩ = ٢٢ بیستو دوو فەرموودە).

## ١٤- باسی بەربەستی نوێژ (سترة المصلی)

## بَابُ: سترة المُصَلّى

٢٤٢- عَنْ أَبِي جُهَيْمِ بْنِ اَلْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {لَوْ يَعْلَمُ اَلْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ اَلْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ مِنَ اَلْإِثْمِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَوَقَعَ فِي "اَلْبَزَّارِ" مِنْ وَجْهٍ آخَرَ: {أَرْبَعِينَ خَرِيفًا}.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٠٥ = ٥١٠ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٣٣٧ = موسلیم شیحا ١١٣٢ موسلیم ٥٠٧. بزار ٣٧٨٢. ترمذی رقم: ٣٣٦. أبوداود رقم: ٧٠١. نسائی رقم: ٧٥٦}:

ئەبو جوهەیمی كوڕی حاریث (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاموشۆكەر كاتێ لەبەردەمی نوێژكەرەوە رەت دەبێ، ئەگەر بزانی بەوە چەندێ گوناهی توش دەبێ، حەزی دەكرد كە چل... ڕابوەستایەو لەبەردەمیەوە ڕەت نەبوایە).

ئەبو نەضر (رەحمەتی خودای لێ بێ) یەكێكە لەپیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە، دەڵێ: نازانم بوسری كوڕی سەعید، كە ئەمەی بۆ من گێڕایەوە، فەرمووی: چل ڕۆژ ڕابووەستایە، یاچل مانگ، یاچل ساڵ. {تاج/١، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٤٥٨}.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئەبو جوهەيم خۆیو باوكی لەهاوڕێیانی پێغەمبەر بوون، باوكی یەكێ بوو لەهاوڕێ مەزنەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو جوهەیم ناوی عەبدوڵلای كوڕی حاریثی صیممەی ئەنصارییە، ئەبو جوهەیم جیایە لە ئەبو جەهم، كە ژیاننامەی ئەبو جەهم لەپوختەی بوخاریدا، وا لەژمارە (٢٣٢)دا.

ئەبو جوهەیم لەغەزای ئوحوددا، پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەكرد، پەیمانی پێی دا لەسەر مردن، لەكارەساتە دڵتەزێنەكەی بیری مەعوونەدا، لەگەڵ حەفتا قورئانخوێنەكاندا شەهید كرا، ئەبو جوهەیم دوو فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، هەروا لە صەحیحی موسلیمدا فەرموودەی هەیە.

٢- ئەو ماوەیەی كە لەبەردەم نوێژخوێنەوە قەدەغەیە، چەندەو چۆنەو چییە؟ زاناكان قسەیان جیایە:

آ- هەندێ دەفەرموون: لەنووكی پێی نوێژخوێنەوە هەتا شوێنی كوڕنووشەكەی، ڕۆیشتن لەبەینی نوێژخوێنو جێ كوڕنووشەكەیدا قەدەغەیەو ڕۆیشتن بەو ماوەیەدا پێی گوناهبار دەبێ.

ب- هەندێ دەفەرموون: بەئەندازەی ئەوەندەیە، كە بەخوشوعەوە نوێژ بكاو تەماشای جێگە كوڕنووشەكەی خۆی بكا، ئەگەر كەسێ لەو ئاقارەوە ڕۆیشت چاوی لێی بێ.

ج- هەندێ تر دەفەرموون: سێ باڵ.

جا نوێژكارو هامشۆكار، كامیان گوناهبار دەبنو مەرجی چییە، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بڕوانە (فتح الملهم شرح صحيح مسلم ژمارە: ١١١٧).

٢٤٣- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {سُئِلَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) (فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ) عَنْ سُتْرَةِ اَلْمُصَلِّي. فَقَالَ: "مِثْلُ مُؤْخِرَةِ اَلرَّحْلِ} . أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/ ٣٣٩ = ١١١٢، ١١١٣، ١١١٤ = مسلم/ ٥٠٠}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای تەبوکا، لەبارەی بەربەستی نوێژخوێنەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەقەد کۆپارەی پاشەوەی کۆپانە وشترێ بارستایی هەبێ) {تاج/١، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٥٠}.

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

تەلحەی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو کە نوێژمان دەکرد، ئاژەڵو وڵاخو چوارپێ بە بەردەم نوێژەکەماندا دەڕۆیشت، جا کەباسی ئەمەمان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: (کاتێ کەسێ لەئێوە کە نوێژدەکا، ئەگەر شتێ لەبەردەم خۆیدا دابنێو بیکا بە بەربەست، کە بەقەد کۆپارەی پاشەوەی کۆپانە وشترێ بارستایی هەبێ، ئیتر بانوێژی خۆی لێ بکاو، دەربەستی ئەو شتانە نەبێ کە لەو دیوی ئەو بەربەستەوە دێنو دەچن، وەك مرۆڤو ئاژەڵو شتی تری وا). {تاج/١، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٥١ ج/٤}.

لە تاجدا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەندازەی بەرزایی بەربەستی نوێژکەر (سُتْرَةُ الْمُصَلِّيْ) چەندێ باشە؟ فەرمووی: (بەقەد قوتکەی دواوەی کۆپانە وشترێ!) {تاج/١، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٤٥٠ ج/٤}.

٢٤٤- وَعَنْ سَبْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ اَلْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لِيَسْتَتِرْ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ وَلَوْ بِسَهْمٍ}. أَخْرَجَهُ اَلْحَاكِمُ. {حاكم رقم: ٩٢٥}:

سەبرەی کوڕی مەعبەدی ئەلجوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بابۆ نوێژ بەربەست

دابنێن، تەنانەت ئەگەر دەمە تیرێکیش لەبەردەم خۆیەوە دابچەقێنێو بیکا بە بەربەست هەر دەبێ).

(ڕوونکردنەوە):

سەبرەی کوڕی مەعبەدی ئەلجوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، ئامادەی غەزای خەندەق بوو، بوخاری لە صەحیحی بوخاریدا، بە تەعلیق ڕیوایەتی لێیەوە کردووە، موسلیم گێڕانەوەی بەڕشتەی خۆی لێیەوە هەیە، بڕوانە ژمارە (٨١١) لەپوختەی موسلیم.

فروستادەی ئیمامی عەلی بوو، بۆلای موعاویە لەشام هەتا پەیمان لەخەڵکی شام بۆ عەلی وەربگرێ.

٢٤٥- وَعَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَقْطَعُ صَلَاةَ اَلْمَرْءِ اَلْمُسْلِمِ - إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ مُؤْخِرَةِ اَلرَّحْلِ - اَلْمَرْأَةُ، وَالْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ اَلْأَسْوَدُ . . . " اَلْحَدِيثَ.} وَفِيهِ {اَلْكَلْبُ اَلْأَسْوَدِ شَيْطَانٌ} . أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{موسليم شيحا/ ١١٣٧}:

ئەمە دەقی ژمارە (١١٣٧)ی صەحیحی موسلیمە، کە مامۆستای دانەر، بە تەصەروفو دەستکارییەوە، وەك سەرەوە ئاماژەی بۆ دەکا:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی نوێژ کردندا، ئەگەر شتێ بەقەد قوتکەی داواوەی کۆپانە وشترێ، لەبەردەمتانەوە هەبێ، ئیتر ئەوە دەبێ بە محەجەرەو پەردە بۆی، ئەگەر شتێ بە بەردەم نوێژکەشیدا ڕابووری، زیانی نییە، بەڵام ئەگەر بەربەستێکی وا لەبەردەم نوێژەکەتانا نەبوو، ئەوە لەم کاتەدا، کەرو ژنو سەگی ڕەش، ئەگەر بەبەردەم نوێژکەتانا تێپەڕن، نوێژەکەتان دەبڕن،

قسەبەر دەڵێ: گوتم: ئەی ئەبوزەڕ! سەگی ڕەش جیاوازی چییە لەسەگی سوور، یاسەگی زەرد، یالەهەر سەگێکی تر؟

فەرمووی: ئەی کوڕی برام! ئەم پرسیارەی کەتۆ لەمنت پرسی، منیشس هەمان پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسی، لە وەلاما حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەگی ڕەش شەیتانە). {تاج/١، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٦٣ — موسلیم/ ئەبوداوود/تەرمەزی/نەسائی}.

٢٤٦– وَلَهُ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) نَحْوُهُ دُونَ: "اَلْكَلْبِ"}.

{موسليم شيحا/ ١١٣٩}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا، بەڵام وەك لە (سبل السلام شرح بلوغ المرام)دا، دەفەرموێ: وشەی (الكلب)یش لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا هەیە، ئەویش جۆرە بەسەرچوونێکە لەدانەرەوە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ وَالْكَلْبُ وَيَقِي ذَلِكَ مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ».

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێ بەبێ بەربەست، نوێژ بکا، ئەوە ژنو گوێدرێژو سەگ، ئەگەر لەبەردەمیەوە تێپەڕن نوێژەکەی دەبڕن، بەڵام ئەگەر شتێکی وا بەقەد قوتکەی دواوەی کۆپانە وشترێ لەبەردەمیەوە هەبوو، ئەوە دەیپارێزێو ئەگەر ئەوانەیش ناومان هێنان بە بەردەم نوێژەکەدا بڕۆن نایبڕن).

٢٤٧– وَلِأَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ: عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) نَحْوُهُ، دُونَ آخِرِهِ. وَقَيَّدَ اَلْمَرْأَةَ بِالْحَائِضِ.

{أبوداود/ رقم: ٧٠٣. نسائى ٢/٦٤}:

ئەم فەرموودەیە لە سونەنی ئەبوداوودا، لەچوار کەسەوە لەهاوەڵانی قەتادەوە ریوایەت کراوە، لەم سێ شاگردەی قەتادەوە، کە (سعیدو هشامو

همام)ن، بەمەوقووفی لەسەر ئیبنو عەبباس ریوایەت کراوە، بەڵام شوعبە کە ئەویش فەقێو شاگردی قەتادەیە بە مەرفوعی ریوایەتی کردووە ئاوا:

{عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: يَقْطَعُ الصَّلاَةَ الْمَرْأَةُ الحَائِضُ والكَلْبُ}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژنی رەسیدە بوو، کە یەکێ لەنیشانە دیارییەکانی بالّقبوونی ژن ئەوەیە کە بکەوێتە بێنوێژییەوەو سووڕی مانگانەی بۆبێ، ژنی رەسیدە بوو، یاسەگ، ئەگەر بەبەردەم نوێژدا بڕۆن، نوێژەکە دەبڕن).

دانەر دەفەرموێ: ئەم گێڕانەوەی ئیبنو عەبباس، ئاخری فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەی تیادا نییە، کە ئەم ڕستەیە بوو (وَيَقِـي ذَلِـكَ مِثْـلُ مُـؤْخِرَةِ الرَّحْلِ).

هەروا دانەر دەفەرموێ: کە لە فەرموودەکەی ئیبنو عەبباسدا، ئەم زیادەیەی تیایە: (ژنی رەسیدە) نەوەك ژنی رووت.

٢٤٨- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ : قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنْ اَلنَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَـدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِـي رِوَايَةٍ: {فَإِنَّ مَعَهُ اَلْقَرِينَ}.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٠٤ = ٥٠٩، ٣٢٧٤ فتح الباری. پوختەی موسلیم: ٣٣٨ = ١٢٢٨، ١١٢٩ شیحا}:

له پوختەی موسلیما ئاوایە، دەیکەین بەڕاڤە بۆ ئێرە:

ئەبو صالحی سەممان فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو، ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) نوێژی دەکرد، لەبەردەمیەوە شتێکی کردبوو بە بەربەرست هەتا کەس بە بەرنوێژەکەیدا نەڕوات، لاوێکیش کە لە خێڵی

ئەبو موعەیط بوو، ویستی بە بەرنوێژەکەیدا بڕواتو تێ پەڕێ، ئەبوسەعید نەی هێشتو، پاڵێکی نا بەسینگیەوەو تەسی پێی کردەوە دواوە، لاوەکەیش سەرەنجی دا تەنها لەبەردەم ئەوەوە ڕێگەی گوزەر هەیەو بەس، لەبەر ئەوە دووبارە ویستی لەوێوە بڕوات، ئەبو سەعیدیش دیسان ڕێگەی پێ نەداو ئەمجارە توندتر لەجاری یەکەم پاڵی پێوەی نا، لاوەکەیش قسەی ناشیرینی بە ئەبو سەعید گوت لەسەر ئەوە، ئەوجا چوو بۆلای مەڕوانو لەلای مەڕوان — کە ئەو سەردەمە مەڕوان فەرمانڕەوای سەرشاری مەدینە بوو — سکاڵای حاڵی لەدەست ئەبو سەعیدی خودری کرد، ئەبو سەعیدیش — بەدوا ئەودا — چووە ژوورەوە بۆلای مەڕوان.

مەڕوان عەرزیکرد: ئەی ئەبو سەعید! ئەی باوکی سەعید! ئەوە چیتانە لەگەڵ ئەم لاوەدا، خۆ تۆو ئەو بەپێی دەقی قورئان مامەو برازای یەکترین، قورئان دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ – الحجرات/١٠} کەواتە خێرە وا نێوانتان تێك چووە؟

ئەبوسەعید فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێکتان بەرەو بەربەرستێ، نوێژی دەکردو ئەو بەربەرستەی کردبوو بەنێوانی خۆیو خەڵکی تر، هەتا کەسێ بە بەردەم نوێژەکەیدا نەڕوات، لەوکاتەدا یەکێ تر ویستی لەبەردەم نوێژەکەیەوە تێپەڕێ، با نەهێڵێو بەدەستی پاڵی پێوە بنێ، جا ئەگەر کابرا هەر سەرەخەرێی کردو بەلاساری ویستی بڕوا بە بەرنوێژەکەیدا، ئەوە با نەهێڵێ ئەگەر هەر وازی نەهێنا، بابچێ بەگژیدا، چونکە ئەو جۆرە کردارە لە ڕەفتاری شەیتانەو شەیتان ئەوەی پێ دەکا).

{تاج/١، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٤٦٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژە بۆ گێڕانەوەی ئیبنو عومەر دەکا، بۆ ئەو فەرموودەیە کە لەئاخرەکەیەوە ئاوایە: (فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّ مَعَهُ

اَلْقَرِينَ): {صحيح مسلم تخريج شيخ خەليل مەئموون شيحا ژمارە: ١١٣٠}

واتە:

ئەگەر هەر وازى نەهێنا بابچێ بەگژیدا، چونکە ئەوە هاوملەکەیەتی کە ئەوەی پێ دەکا). مەبەست لە (قەرین) ئەوەیە کە لەم فەرموودەی تردا روونکراوەتەوە کە لە پوختەی موسلیمدا، ژمارە (١٨٠٥ = ٧٠٣٤ شیحا) ئەمە دەقەکەیەتی:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەوێ نۆرە شەوی خۆم بوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای من بوو، لەو شەوەدا دەرچووە دەرەوە، منیش ئەوەم لەبەر گران بوو، جا کە هاتەوەو زانی کەمن دەرچوونەکەی ئەوم لەبەر گرانە، فەرمووی: (ئەی عائیشە! ئەوە چیتە؟ ئەوە ژار لە هەوێکانت دەکێشیت؟).

گوتم: جا بۆچی ئەگەر لەسەر تۆ ژاریشیان لێ بکێشم هەقی خۆم نییە؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە چیتە؟ شەیتانەکەت سەری لێ داویت؟).

گوتم: دیارە کەهەموو کەسێ شەیتانێکی هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ وایە). گوتم: هەتا تۆیش شەیتانت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: (بەڵێ منیش شەیتانێکم هەبوو، بەڵام من خودا زاڵی کردووم بەسەریداو شەیتانەکەم موسوڵمان بووەو رزگارم بووە لەزیانو وەزەنی).

٢٤٩– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ شَيْئًا، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَنْصِبْ عَصًا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَلْيَخُطَّ خَطًّا، ثُمَّ لَا يَضُرُّهُ مَنْ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ}. أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَلَمْ يُصِبْ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ مُضْطَرِبٌ، بَلْ هُوَ حَسَنٌ.

{أحمد رقم: ٧٣٨٦. ابن ماجه رقم: ٩٤٣. بيهقي رقم: ٣٢٧٨. ابن حبان رقم: ٢٣٦١. أبوداود رقم: ٦٨٩}:

ئـەبو هـورەيرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کاتـێ کەسـێکتان کەنوێـژ دەکـا، بـا ڕووبکاتـە شتـێ، یا شتـێ لەبەردەم خۆیەوە دابنـێ، ئەگەر هەر هیـچی دەسـت نەکـەوت بـا داردەستـێ داچەقێنـێ، ئەگەر داردەستیـشی پـێ نـەبوو، باهێڵـێ لەبـەردەم جـێ نوێژەکەیدا بکێشـێ، ئیتر ئەوەی لەودیوی خەتەکەوە بە بەردەمی نوێژەکەیـدا بڕوا زیانی نابـێ بۆی). {تاج/١، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٤٥٣}.

دانەر پێشەوا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: ئیبنـو حیببـان بەصـەحیحی دانـاوە، ئـەوەی دەڵـێ: ئـەم فەرموودەیـە موزتەریبـەو شـڵۆق و شـەڵەقاوە نـەیپێکاوە، بـەڵکوو ئـەم فەرموودەیـە لەپلەبەنـدیی فەرموودەدا، دەگاتە پلەی حەسەن.

٢٥٠ – وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ : قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَقْطَعُ اَلصَّلَاةَ شَيْءٌ، وَادْرَأْ مَا اِسْتَطَعْتَ}. أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ ، وَفِي سَنَدِهِ ضَعْفٌ.

{أبوداود رقم: ٧١٩}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـیچ شـتـێ نوێـژ نـابڕێ، بـا بـە بەردەمیـشیا بـڕوا، بـەڵام هـەتا دەتـوانن مـەهێڵن شـت بـە بـەردەمتانا بـڕوا، چونکە ئەوەی بە بەردەمی نوێژدا بڕوا شەیتانە). {تاج/١، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٦٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- باسی بەربەست لەنوێژدا نـۆ فـەرموودەی لـەخۆ گرتـووە ئـاوا (٢٥٠ – ٢٤١ = ٩) فەرموودە.

٢- پوختەی بڕیارەکانی بابەتی بەربەستی نوێژ:

أ/ بەربەست دانان لەكاتی نوێژكردندا سوننەتە، وەك دیواری رووی قیبلەی مزگەوت، بەمەرجێ نوێژكەر لێی نزیك ببێتەوە.

ب- لەنوێژی جەماعەتدا، بەربەستی پێشنوێژ هەم بۆ خۆیەتیو هەم بۆ ئەوانەیشە كە لە پشتیەوە نوێژ دەكەن. {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٤٦١ ج/٤}. جا ئەو بەربەستە دیوار بێ، یا كۆڵەكە بێ، یا بەرماڵ بێ، یا هەر شتێ تر بێ دەبێ.

ج- نوێژخوێن تەنیا بێ، یا لەكۆمەڵا بێ، نوێژی سوننەت بكا، یا فەرز، رووكردنە بەربەست سوننەتە.

د- بەربەست بە قەدبالێ بەرزبێ بەسە، ئەگەر بەرزتریش بێ باشترە، واباشە لەجێ پێی نوێژخوێنەوە هەتا بەربەستەكە لە (٣) باڵ زیاتر نەبێ، ئەگەر هیچی دەست نەكەوت پاڵتۆكەی خۆی قوت بكاتەوە لەبەردەم خۆیەوە، پاجانتاكەی دابنێ. ئەگەر هەر هیچ نەبوو هێڵێ لەبەردەمیەوە بكێشێ.

٣- قسەی ڕاست ئەوەیە هەرشتێ بە بەرنوێژدا بڕوات نوێژەكە نابڕێ، گەرچی بۆ مرۆڤ ئەوە نادروستە.

٤- بەپێی توانا نوێژخوێن رێگەنەدا هاموشۆكار بە بەردەمیدا بڕوات.

## ١٥- هاندان لەسەر ملكەچیو سەركزی لەنوێژدا
## باب: الحَثِ عَلَى الخُشُوعِ فِى الصَّلَاةِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی یەكەم، زنجیرە/٩٠ لاپەڕە/٢٧٢ لەژمارە: ٥٥٠ وە هەتا ژمارە: ٥٥٧}.

٢٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يُصَلِّيَ اَلرَّجُلُ مُخْتَصِرًا}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَمَعْنَاهُ: أَنْ يَجْعَلَ يَدَهُ عَلَى خَاصِرَتِهِ.

{تجريد بوخـاری بەکوردی/١، ژمارە: ٥٩٥ = ١٢٢٠، ١٢١٩ فـتح البـاری. پوختەی موسلیم ٣٤٣ = ١٢١٨ شیحا = ٥٤٥ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) جلەوگیری کردووە لەوە: کە مـرۆڤ، چ پیـاو، چ ژن، لـەناو نوێـژدا، دەست بگرێ بەهەردوو لاکەلەکەیەوە). {تاج/١، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٨٠ چ/٤}.

(روونکردنەوە):

دەسـتگرتن، بەلاکەلەکـەوە ئەوەیـە: کـەمرۆڤ هـەردوو دەسـتی لەسـەر هەردوو لاکەلەکەی خـۆی دابنـێو ئانیـشکەکانی لەلاقەبرخـەی دوور بخاتـەوە، لەسەر شێوەی نیوە بازنەیی، ئەم کارەیش بۆیە ناباشە چونکە خـووی فیـزنو دەعیەدارەکانە، گەلێ جاریش ماتەمدارو خەمبارو دەستەوسانیش وادەکەن.

دەڵێن: جوولەکـەیش زۆر وادەکـەن. بەهـەر حـاڵ کـارە پەرسـتشییەکان، مـەرج نییـە، هۆکـارو حیکمەتەکـەی بـزانین، ئەوەنـدەمان بەسـە کـە بڵـێین: کـارێکی تەعەببودییـەو بـەس {بڕوانـە: ژمـارە: ٢٥٢ لـەم پـەڕاوە پیرۆزەکـە یەکسەر وا لەدوا ئەم فەرموودەیەوە}:

٢٥٢- وَفِي اَلْبُخَارِيِّ: عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ ذَلِكَ فِعْلُ اَلْيَهُودِ فِي صَلَاتِهِمْ.

{بخاری: ٣٤٥٨}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریدا:

مەسرووق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) حـەزی لـەوە نـەبوو، کـە نوێـژخوێن دەسـتی لەسـەر کەلەکـەی دابنـێ، دەیفەرموو: چونکە جوولەکە لەنوێژی خۆیاندا وا دەکەن).

٢٥٣- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {إِذَا قُدِّمَ اَلْعَشَاءُ فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا اَلْمَغْرِبَ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١ ٣٨٠١ = ٦٧٢، ٤٦٣ فتح البارى. پوختەى موسليم ٣٥٠ = ١٢٤٢ مسلم شيحا = مسلم ٥٥٧. أبوداود رقم: ٣٧٥٧}:

ئەنەسى كوڕى ماليك (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر شێو دانرا، دەستى پێ بكەن، لەپێش كردنى نوێژى شێوانا، بانويێژيش بووبێ، وەهيچ پەلە لە شێوەكەتان مەكەن‌و، نانەكەتان بەشێنەيى بەتەواوى بخۆن‌و، ئەوسا بە فەرەحى نوێژەكەتان بكەن، بەبێ ئەوەى كە دڵتان لاى نانەكە بێ، وەهەروەها نوێژەكانى تريش). {تاج/١، زنجيرە: ٩٨، ژمارە: ٥٨٣}.

٢٥٤- وَعَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ فِي اَلصَّلَاةِ فَلَا يَمْسَحِ اَلْحَصَى، فَإِنَّ اَلرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ}. رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ. وَزَادَ أَحْمَدُ: "وَاحِدَةً أَوْ دَعْ".

{أحمد رقم: ٢١٣٦. أبوداود رقم: ٩٤٥. ترمذى رقم: ٣٧٩. نسائى رقم: ١١٩١. ابن ماجه رقم: ١٠٢٧}:

ئەبوزەڕ (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ ئێوە هەڵدەستن بۆ نوێژ، ئيتر دەرگاى ڕەحمەتى خوداتان لێ دەكرێتەوەو خودا رووى ڕەحمەت‌و سۆزو ميهرەبانى خۆيتان تێ دەكاو، ئەو زاتە مەزنە گوفتوگۆتان لەگەڵ دەكا). {تاج/١، زنجيرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٢} + {ژمارە: ٢٥٧} كەوابوو ئيتر ئێوەيش بەپێى ئەو شوێن‌و پايەيە، ڕەفتار بكەن‌و زۆر سەلارو بە نەزاكەت بن‌و، خۆتان بەرێكخستنى زيخ‌و چەوەوە خەريك مەكەن). {تاج/١، زنجيرە: ٥٨، ژمارە: ٤١٣ — د/ت/ن — سەنەد حەسەن}.

دانەر (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) دەڵێ: پێنج فەرموودەزانەكان كە لەپێشەكى كتێبەكەدا، ديارىمان كردوون، بەڕشتەيەكى تەندروست گێڕاويانەتەوە، كە ئەم زاتانەن: ١- ئەحمەد ٢- ئەبوداوود ٣- تەرمەزى ٤-

نەسائی ٥- ئیبنو ماجە. وەگێڕانەوەی ئەحمەد پترێکی تری هەیە ئاوا: ئەبو زەڕ دەفەرموێ: سەبارەت بەهەموو شتێ پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە، تەنانەت لەبارەی ماڵین و تەختکردنی زیخ و چەوی جێگە نوێژو جێگە کوڕنووشیش پرسیارم لێی کرد، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەر ناچار بوون بەیەك جار ماڵین، زیخ و چەوەکە ڕێك بخەن، یاوازی لێ بهێنن!).

٢٥٥- وَفِي "اَلصَّحِيحِ" عَنْ مُعَيْقِيبٍ نَحْوُهُ بِغَيْرِ تَعْلِيلٍ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٩١ = ١٢٠٧ = پوختەی موسلیم ٣٤٧ = ١٢١٩ موسلیم شیحا = ٥٤٦ موسلیم}:

موعەیقیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار کرا: لەناو نوێژدا، ئەگەر کەسێ لەجێگەی سوژدەکەیدا، چەوو خۆڵ ڕێك بخاو، بەدەستی خۆڵ و چەوی شوێن کوڕنووشەکەی تەخت بکا، یان هی جێگە نوێژەکەی، ئیتر لەناو مزگەوتا بێ، یا لەدەرەوەی مزگەوت بێ، ئایا شتی وا دروستە، یان نادروستە؟

فەرمووی: (ئەگەر ناچار بوویت، شتی وا بکەیت، ئەوا بەیەکجار بیکەو بەس). واتە: بەیەکجار دەست پیادا هێنان چەوەکە یا قۆقزاییەکە ڕێك بخەو مەیکە بەدوو جار. {تاج/١، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤١٢}.

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەگێڕانەوەکەی موعەیقیبدا، ئاخری فەرموودەکەی ئەبو زەڕی تیادا نییە، کەهۆی خۆ خەریك نەکردنە بە تەختکردنی چەوو زیخەوە.

٢- هەم بۆ پیاو، هەم بۆ ژن، دروستە کە لەناو نوێژدا، ناڕێکی کوڕنووشگاکەیان ڕێك بکەن، ئەگەر بەهۆی خۆڵ و زیخ و چەوو شتی تری واوە، بەرزونزمی تیادا بوو، سوننەتە کە لەپێش نوێژ دابەستندا، ئەم جۆرە

کارانــە ئــەنجام بــدرێن‌و، جێگــە نوێژەکــە ئامــادەو ســاز بکــرێ، لەڕاڤەنامــە (شەرحە)کانا، دەفەرموێ: (حیکمەتی ئەم دوو شتەیە: یەکەم چەوەکە حەز دەکا کەسەجدەکە لەسەر ئەو ببرێ‌و لەپیرۆزیی ئەو کوڕنووشەی بەرکەوێ. دووەم: لــەناو نوێــژدا ڕەحمــەتی خــودا ڕووبــەڕووی نوێژخوێنــە، کەواتــە: بانوێژکار ئارام‌و هێمن بێ‌و بەشتی ترەوە خۆی خەریك نــەکا، واباشە ئەگەر لــەناو نوێــژدا، خۆڵــێ، چــەوێ، پووشــکەیێ، نووســا بەناوچــاوانیەوە، هــەتا لەمزگەوتەکــە دەردەچــێ، یاجێگــە نوێژەکــەی بــەجێ دەهێڵــێ، ئــەو شــتەی کەنووساوە بەتەوێڵیەوە لێی نەکاتەوە.)

٣- موعەیقیبی کوڕی ئــەبو فــاطیمی دەوســی (ڕەزای خــودای لێ بــێ) لــە موســوڵمانە هــەرە پێــشینەکانە، لەمەککــە موســوڵمان بــووە، لــەوێوە کۆچــی کردووە بۆ حەبەشە، لــەوێ مایــەوە هــەتا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بێ) کۆچی فەرموو بۆ مەدینەی نــازدار، جا ئــەویش لەحەبەشــەوە تەشــریفی بــرد بــۆلای پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســــەر بــێ) ئامــادەی پــەیمانی بەیعەتولڕیضوان بووە، هەروا هەموو شەڕگەو مەڵبەندەکانی تــری پــاش ئــەو، چاودێری سەر ئەموستیلەکەی پێغەمبەر بــوو، فــەرموودەی کــەم گێڕاوەتــەوە، ئــەم فەرموودەیــەی ئێرەیــەی (متفــق علیــە)یــە، بووخــاری‌و موســلیم گێڕاویانەتــەوە، لەســەردەمی جێنــشینی ئــەبوبکرو عومــەردا، موعــەیقیب ســـەرکاری ســـەر بـــەیتولمال بـــوو، ڕەزای خـــودا لەهـــەموویان بـــێ، ئـــەو ئەموستیلەیەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کەوتــە لای ئیمــامی عوثمان‌و، ئیمامی عوثمان زۆر زۆر بایەخی پێ دەداو تەباروکی پێوەی دەکردو دادەنــرا بەسەرچــاوەی شــانس‌و نگــین‌و بەختــەوەری گــەلی ئیــسلام، بەدەســتی ئەمــەوە کەوتــە نــاو بــیری ئەریــسەوە، کــە عوثمــان ئــەم ڕووداوە چــاوەڕوان نەکراوەی زۆر پێ ناخۆش بوو، وەهەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆریدا، بــۆ دۆزینــەوەی

بەلاَم ڕەشە ڕاهاتو نەدۆزرایەوە تەنانەت دەڵێن: ئیمامی عوثمان فوڕو لیتەی بن بیرەکەی گشت دەرهێناو، بەبێژنگ بێژرایەوە هەر نەدۆزرایەوە، ئیتر بەرەبەرە دووبەرەکیو ناکۆکیو ناتەبایی سەری هەڵدا، وەهەتا ئەمڕۆکەیش هەر بەردەوامەو لێرەو لەوێ، جیهانی ئیسلامی ناوبەناو گورزێکی کاریگەری لێ دەدریو شەڕی خۆخۆری سەرهەڵدەدا، هەر ڕۆژێ بەناوێکەوەو هەرجارێ لەلایەکەوە، خودای گەورە پەنامان بدا. لەئاخرو ئۆخری جێنشینی پێشەوا عوسماندا، مەرگ بوو، بەمیوانیو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، ڕەحمەتو ڕەزای خودای لێ بێ. ئامین.

٢٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {سَأَلْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلِالْتِفَاتِ فِي اَلصَّلَاةِ ؟ فَقَالَ: "هُوَ اِخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ اَلشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ اَلْعَبْدِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَلِلتِّرْمِذِيِّ: عَنْ أَنَسٍ (وَصَحَّحَهُ) {إِيَّاكَ وَالِالْتِفَاتَ فِي اَلصَّلَاةِ ، فَإِنَّهُ هَلَكَةٌ ، فَإِنْ كَانَ فَلَا بُدَّ فَفِي اَلتَّطَوُّعِ}.

{تجريدی بوخاری/١، ژماره: ٤٠٩ = ٧٥١، ٣٢٩١. ترمذی رقم: ٥٩٠}.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا، لە پێغەمبەرم پرسی؟ فەرمووی: (ئەوە لێ دزینەوەیە، شەیتان دەیفڕێنێ لەنوێژی بەندەی خودا). {تاج/١، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٣ ج/٤}.

گێڕانەوەکەی تەرمەزی، کە تەرمەزی بەتەندروستی داناوە، لە تاجا ئاوایە: ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (کوڕی شیرینم! نەکەی لەناو نوێژدا لابکەیتەوە بەم لاولادا، چونکە شتی وا، سەرتیاچوونەو ماڵوێرانی، ئەگەر هەر چارەت نەبوو، با ئاوەڕدانەوە لەنوێژی سوننەتدا بێ، سووچی کەمترە، هەتا لەنوێژی فەرزا). {تاج/١، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٦ ج/٤}.

٢٥٧- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي اَلصَّلَاةِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلَا يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ شِمَالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: {أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ}.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٢٥٦ = ٤٠٥، ٢٤١ فتح البارى بشرح صحيح البخارى. پوختەی موسليم ٣٤٤ = ١٢٢٨ موسليم شيحا = ٥٥١ موسليم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا، بەرووی ڕووگەوە، بەڵغەمێکی بینی بەدیوارەکەوە، زۆر پێی ناخۆش بوو، جا هەڵسا بەشتێ بەڵغەمەکەی کڕاند، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئێوە کە لەناو نوێژدا دەبن، ئەوە ڕازو قسەی نهێنیو گوفتوگۆی دۆستانە لەگەڵ خودای پەروەردگاری خۆتانا دەکەن، کەوابوو لەڕووی ڕووگەوە تفو بەڵغەمو چڵم ڕۆمەکەن، بەڵام ئەگەر هەر چارتان نەبوو، لەلای چەپتانەوە، لەژێر پێتانا تف داکەنو، بەخۆڵو چەوی ناو مزگەوتەکە دایپۆشن). ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) چمکی عاباکەی خۆی گرتو تفی تی کردو ولی بەسەریەکا، فەرمووی: (یان ئاوا بکەن وەك ئەوەی من کردم). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٤ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیەو کۆمەڵێ دەقو فەرموودەی تری ڕاستو دروست، تف ڕۆکردنو هەروا چڵمو بەڵغەم فڕێدان، لەبەردەمداو، هەروا لەلای ڕاستەوە، لەناو نوێژداو، لەگشت کاتێکی تردا ناباشە، بەشێوەیەکی گشتی ئیسلام بایەخی باش بە پاكو خاوێنی دەدا، پێشگیری لە پیسیو پۆخڵیو قێزەونی دەکا، وە هەوڵی داوەو هەوڵ دەدا، کە بەپێی تواناو بەپێی کاتو شوێن، بایەخی تەواو بەپاکیو خاوێنی بدرێ، بەپێی دەقەکانی ئیسلام ئاستی مزگەوتی پێغەمبەرو ڕووی ئاستی گۆڕی پیرۆزی، ئەم لا (جیهە)یانە،

ڕێزی تایبەتی خۆیان هەیە، دەبێ ئەو ڕێزەیان بپارێزرێ، بەتایبەتی لەکاتی تفکردنو سەراوکردنو شتی تری وادا. وە ئەم نموونانەیش کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی هێناون بۆ چارەسەری ئەم جۆرە دیاردانە، وەك داپۆشینی تفو بەڵغەم بەخۆڵو لمی ناو مزگەوت، بەپێی حاڵو بەپێی کاریگەری ئەو ڕۆژگارە بووە، دەنا مەبەستی سەرەکی لەم جۆرە فەرموودانە هاندانە لەسەر پاكو خاوێنیو خۆپاراستنە لە پیسیو چەپەڵی، دەنا شتی وا سوننەت نییە هەتا بگوترێ: تفو بەڵغەم لەناو مزگەوتا دەبێ هەر بەداپۆشینی بە چەوو خۆڵو لم چارەسەر بکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەکارهێنانی هۆکارە نوێکانی خۆپاك ڕاگرتن، گەلێ لەم نموونانە باشترە، وەك بەکارهێنانی دەستەسڕو خاولیو کرێنستو شتی تری وا.

٢٥٧- مكرر وَعَنْهُ قَالَ: {كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّـهُ عَنْهَا) سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَمِيطِي عَنَّا قِرَامَكِ هَذَا ، فَإِنَّهُ لَا تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ لِي فِي صَلَاتِي} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٣٨ = ٣٧٤، ٥٩٥٩ فتح الباری. تحفة الأشراف/١٢٥١}:

ئەنەسی کوڕی مەمالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) پۆپەشمینێکی هەبوو، وێنەی لێ نەخشابوو، کردبووی بە پەردە بۆ کولێنی ناو ماڵەکەی خۆی، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی بینی، پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! ئەم پۆپەشمینەی خۆتمان لێ دوور بخەرەوە، چونکە لەناو نوێژەکەمدا، وێنەکانی دێنە بەرچاومو نوێژەکەم لێ دەشێوێنێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٥}.

٢٥٨- وَاتَّفَقَا عَلَى حَدِيثِهَا فِي قِصَّةِ أَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ، وَفِيهِ: {فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي عَنْ صَلَاتِي}.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٣٧ = ٣٧٣، ٧٥٢، ٥٨١٧ فتح الباری. پوختەی موسليم/٢٣٢ = ١٢٣٩ موسليم تەرقيمی شيحا = ٥٥٦ موسليم}:

ئەمە ئەو فەرموودەيە كە لێرەدا دانەر ئاماژەی بۆ دەكا، لە پوختەی موسليما (٢٣٢):

عائيشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا دەستی كرد بەنوێژكردن، كراسێكی لەسەر خەتی خوری گوڵ گوڵی لەبەردا بوو، لەناو نوێژەكەيدا سەرنجێكی گوڵو نەخشەكانی كراسەكەی دا، كاتێ لە نوێژەكەی بۆوە، فەرمووی: (گوڵو نەخشەكانی ئەم كراسە خەرێكيان كردمو نەيانهێشت لەناو نوێژەكەمدا، باش دڵ بدەمە نوێژەكەم كەواتە ئەمە ببەنەوە بۆ ئەبو جەهمی كوڕی حوزەيفەو كراسە ئەنبيجانييە سادەكەی ئەو بهێنن بۆ من!). {تاج/٣، زنجيرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٥ - ش}.

(ڕوونكردنەوە):

ئەبو جەهم هاوڕێيەكی ناوداری پێغەمبەرە، كراسێكی گوڵ گوڵی خوری بەدياری دەدەدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەو هۆيەی كە لە فەرموودەكەدا باسكرا، كراسەكە دەنێرێتەوە بۆ ئەبو جەهم، بەڵام لەبەرئەوەی كە بەهۆی گێڕانەوەی دياريیەكەيەوە بۆی، دڵگيرنەبێ، داوای لێ دەكا: كە بيگۆڕێتەوە بە كراسێكی سادەی بێ نەخش بۆی.

ئەم فەرموودەيە بەڵگەی ئەوەيە كە ئەو نەخشو نيگارو نووسينو وێنانەی كەوان بە ميحرابو ديواری رووی قيبلەی مزگەوتەوە، هەمووی كارێكی ناباشو ناپەسەندن، نەبوونيان گەلێ چاكرتە، بگرە ئەگەر بكرێ فەرشو رايەخو بەرماڵی ناو مزگەوتيش هەتا سادەو بێ نەخشو نيگار بێ باشترە، بەڵام هەرچۆن بێ بەم جۆرەشتانە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە.

ئـەبو جـەهم لـە مەسـلەمەی فەتحـە، یـەکێ بـوو لـەپیاو مـاقووڵانی قورەیش، رەگەز ناسێکی چاك بوو، یەکێ بوو لـەو چـوار کەسـە، کـە قـورەیش زانستی رەگەزو نژادی لێ وەردەگرتن، زۆر تەمەن درێژ بـوو، دووجـار ئامـادەی دروسـتکردنەوەی خـانووی کەعبـە بـوو بـوو، جـارێ لەسـەردەمی نەزانیـداو، جارێ لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا، یـەکێ بـوو لـەو چـوار کەسـەی کـە تـەرمی ئیمـامی عوثمانیـان ناشـت، کـە حـەکیمی کـوڕی حـزامو جوبـەیری کـوڕی موطعیمو نیاری کوڕی مکرمو ئەبو جەهم بوون.

ئەبو جەهم دەیفەرموو: لە نەزانیدا وازم لەمەینۆشی هێنـا، مـەبادا بـێ ئەقڵم بکا، ناوی لە بوخاریو موسلیمدا هاتووە، ئەمە ئەو ئەبو جەهمەیە، کە فاطیمەی کچی قەیس، راوێژی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد لەبارەیـەوەو عـەرزیکرد: موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیانو ئـەبو جـەهم خوازبێنییان کـردووم، تـۆ فـەرمانت بەچییە). {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ ج/٤} + {بوخاری/١، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٧٧}.

٢٥٩- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَـى اَلـسَّمَاءِ فِـي اَلـصَّلَاةِ أَوْ لَـا تَرْجِعَ إِلَيْهِمْ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{تجریـــدی بوخـــاری/١، ژمـــارە: ٤٠٨ = ٧٥٠ فـــتح البـــاری. پوختـــەی موسلیم/٣٣٦ = ٩٦٦ شیحا = ٤٢٨ مسلم}.

لەتاجدا ئاوایە:

جابیری کوڕی سەمموورە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لەبەرچـی هەنـدێ کـەس لەنوێـژدا، چاو هەڵ دەبڕن بۆ ئاسمان، بۆ وادەکەن بۆ؟! ئـیتر حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەمبارەیەوە گەڵێ بەتونـدی هەڕەشـەی کـرد، تەنانـەت فـەرمووی: (دەبێ واز لەم کارە ناشیرینە بهێـنن، ئـەگینا بێگومـان کوێر دەبـن!). {تـاج/١،

زنجیره: ٩٦، ژماره: ٥٧٢ ج/٤ – ش/د/ن} . گوتەی موسلیم: (کەسانێ کە لەنوێژدا، چاویان هەڵ دەبڕن بەرەو ئاسمان، لەکاتی نزای ناو نوێژدا، یان دەبێ واز لەم کارە ناپەسەندە ناشیرینەیە بهێنن، یا بێگومان چاویان کوێر دەبێ).

(ڕوونکردنەوە):

١- (گێڕانەوەی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوەیە).

٢- لەنوێژدا نادروستە نوێژکار تەماشای لای سەرووی خۆی بکا، وەك ئەوە تەماشای ئاسمان بکا، یا ئەگەر لەناو خانوودا بوو تەماشای بنمیچی هۆدەکە بکا.

٢٦٠- وَلَهُ : عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ ، وَلَا هُوَ يُدَافِعُهُ اَلْأَخْبَثَانِ} .

{موسلیم شیحا/ ١٢٤٨ = مسلم/٥٦٠} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کەنان دانرا نوێژکردن باش نییە، کە سەراویش تەنگەتاوی کردن هەروەها). {تاج/١، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٥٨٤، ٥٨٣} .

٢٦١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلتَّثَاؤُبُ مِنْ اَلشَّيْطَانِ فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اِسْتَطَاعَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَزَادَ: {فِي اَلصَّلَاةِ} .

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٣٢٦ = ٣٢٨٩، ٦٢٢٣، ٦٢٢٦. فتح الباری. موسلیم شیحا/ ٧٤١٥ – ٧٤١٨ = ٢٩٩٤ مسلم} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باوێشك لەشەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان باوێشکی هات، با هەتا دەتوانێ بەری بگرێ و بیداتە دواوە، چونکە کاتێ ئێوە

باوێـشك دەدەنو لـەكاتی باوێـشكدانەكەدا دەم دادەچـەقێننو دەڵـێن: هاهـا، شـەیتان لەخۆشـییانا بـەوە پێدەكـەنێ!). {ریـاض الـصالحین/٢، زنجـیرە: ١٤٢، ژمارە: ٨٧٨} + {تاج/١، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٥٩٠ ج/٤}.

(ڕوونكردنەوە):

١- پێـشەوا تەرمـەزی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ئەمـەی پـترە: (ئەگـەر كەسێكتان لەنوێژا... تادوایی فەرموودەكە).

٢- لە شەرحو ڕاڤە نامەكانا، دەفەرموێ: (مرۆڤ ژن بێ، یا پیـاو، لەنوێـژا بـێ، یـا لـەدەرەوەی نوێـژ، ئەگـەر باوێـشكی هـات، بـا تادەتوانـێ بـەری بگـرێو بیداتـە دواوەو دەم بنووقێنـێو بەپـشتی دەسـتی چـەپی بـەری دەمـی بگـرێ، چونكە لەوكاتەدا كە دەم پان دەكاتەوەو دەڵێ: هاها، شەیتان پێـی پێدەكـەنێ. كەواتـە هـۆی بڕیـاری دەمگـرتن، ئەوەیـە بـەر لەخۆشـیو پێكـەنینی شـەیتان بگیرێ، ئەویش لەناو نوێژو لەدەرەوەی نوێژ هەروەك یەكە.

٣- ئەم جۆرە تەعلیلو بایستو ڕوونكردنەوەیە، كـە لـەزۆر فـەرموودەدا هەیـە، كـە دەفـەرموێ: ئـەوە مەكـەن، چـونكە ئـەوە لەشـەیتانەوەیە، دوو لێكدانەوەی بۆ كراوە:

أ/ كـە دەگـوترێ (لەشـەیتانەوە) مەبەسـت ئەوەیـە كـەهۆی ئـەو كـارە شـەیتانەو شـەیتان ئـەوەی پـێ كـردووەو زاڵ بـووە بەسـەر هـۆشو دڵیـدا، بەشێوەیێ هەرچی خوا پێی ناخۆشە، شەیتان دەیكا بەو كەسە.

ب/ ئەو جۆرە كارە، كارێ ناشـیرینو ناشـەرعییە، لـەو ڕووەوە شـەیتان حـەزی لێیـەتیو وەك بڵێـی خـۆی كردبێتـی وایـە. دوورنییـە كـە ئـەم دوو بۆچوونەیش لە تەعلیلەكەدا كۆببنەوە.

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحيم

## ١٦- باسی مزگەوت

## بَابُ: المَسَاجِدِ

٢٦٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: {أَمَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) بِبِنَاءِ اَلْمَسَاجِدِ فِي اَلدُّورِ ، وَأَنْ تُنَظَّفَ ، وتُطَيَّبَ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَ إِرْسَالَهُ.

{أحمد: ٢٧٩/٦. أبو داود رقم: ٤٥٥. ترمذى رقم: ٥٩٤. ابن ماجه رقم: ٧٥٨، ٧٥٩}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی داوە، کە لەناو گەڕەکەکاندا، مزگەوت دروست بکرێ، وەپاكو خاوێنو بۆنخۆش ڕابگیرێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٧٧ چاپی/٤}.**

**تیرمیذیش گێڕاویەتەوەو دەفەرموێ: ئەوە ڕاستو دروسترە کە فەرموودەیەکی مورسەلە، بەڵام ئەبوداوود بەموسنەدی، لەپیاوانی خاوەن متمانەوە گێڕاویەتەوە.**

٢٦٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {قَاتَلَ اَللَّهُ اَلْيَهُودَ: اِتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَزَادَ مُسْلِمُ وَالنَّصَارَى }.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٦٧ = ٤٣٧ فتح الباری. موسلیم شیحا ١١٨٥ = ٥٣٠ موسلیم}:

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا بچێت بەگژ جوولەکەدا، گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوت).**

ئەمەیش دەقی ئەو فەرموودەی موسلیمە کەدانەر ئاماژەی بۆ دەکا لەپوختەی موسلیما (ژمارە: ٢٥٥ = ١١٨٧ شیحا هەروا لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە: ٢٦٨ = ١٣٣٠، ٤٢٥).

عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: (کاتێ فریشتەی گیانکێشان هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەرەمەرگا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پۆپەشمینێکی گوڵ گوڵی دابوو بەسەر ڕوخساری خۆیدا، ناوبەناو کەپۆپەشمینەکەخەفەو تەنگەنەفەسی دەکرد، ڕووی خۆی لادەدا، وەلەکاتی ئەم سەخڵەتیو سەرەمەرگەدا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەعنەتو نەفرینی خودا لەسەر جوولەکەو گاور بێ، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم فەرمایشتەی هەڕەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد، نەبادا موسوڵمانانیش چاو لەوان بکەنو، هەمان تاوان بکەنو، گۆڕی پێغەمبەرەکەیان بکەن بەمزگەوتو، نوێژو پەرستشی تیادا بکەنو، بەرەبەرە لەپاش ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، گۆڕەکە خۆشی بپەرستن). {تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٣٦ چاپی/٤}.

٢٦٤- وَلَهُمَا: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {كَانُوا إِذَا مَاتَ فِيهِمْ اَلرَّجُلُ اَلصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا} وَفِيهِ: {أُولَئِكَ شِرَارُ اَلْخَلْقِ}.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٦٣ = ٤٢٧، ٤٣٤، ١٣٤١، ٣٥٧٣ فتح الباری. مسلم شیحا ١١٨١ = ٥٢٨ مسلم. ترقیم محمد فؤاد}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو حەبیبەو ئوممو سەلەمە (ڕەزای خودایان لێ بێ) کە هەردووکیان لەگەڵ عائیشەدا هاوسەری پێغەمبەرن، لەوڵاتی حەبەشە، لەکاتی کۆچ کردنیان بۆ ئەوێ، کڵێسایەکیان

دیبوو، بەناوی مارییە، باسی ئەو پەیکەرو وێنانـەیان بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە، کە لـەناو ئـەو کڵێـسایەدا دیبوویـانن، فـەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (ئەوانـە هـۆزێکن کاتـێ بەندەیـەکی بـاش، یـا پیاوچاکێ، لەناویاندا هەڵدەکەوێ، کە دەمرێ دەچن مزگەوت لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکەنو ئەو وێنانەی تیادا دەکێشن، ئەم جۆرە کەسانەیش ئەم جـۆرە رەوشـتە ناپەسـەندەیان داهێنـاوە بـەدترینی دروسـتکراوانی خـودان، لـەلای خودای مەزن لە رۆژی قیامەتدا). {تاج/١، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٧٣٥ چاپی/٤}:

(روونکردنەوە):

ئوم حەبیبە (رەزای خودای لێ بێ) کـە هاوسـەری پێغەمبـەر بـوو، نـاوی رەملـەی کـچی ئـەبو سـوفیان: صـەخری کـوڕی حەربـە، خوشـکی موعاوییـەی کوڕی ئەبو سوفیانە، لەپێش پێغەمبەرایەتیدا، بە حەڤدە سـاڵ لـەدایك بـووە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لەپێناوی ئیسلاما کۆچی کـرد بـۆ حەبەشـە، لەوێ بێوەژن کەوت، ئوم حەبیبە دەفەرموێ: پیاوێ لەخەوما فـەرمووی پـێم: ئەی دایکی موسوڵمانان: ئەی ئوممولوئمینین!).

لەم خەونە شەڵەژام، بەڵام زۆری پێ نەچوو، هەر کـە حەیـەو عیـددەی شەرعیم لەمێردی پێشینم تـەواو بـوو، پاشـای حەبەشـە، کـەنیزەکێکی خـۆیی نارد بۆ لام، کە بەو کەنیزەیان دەگوت (أبرهـة). پاشـای حەبەشـە لـەرێی ئـەو کەنیزەکەیەوە خوازبێنی کردم بۆ پێغەمبەرو، منیش رازی بـووم‌و شـووم پـێ کـرد، خالیـدی کـوڕی وەلیـدم کـرد بـە وەکیلـی خـۆم، وەکیلـی پێغەمبـەریش، جەعفـەری کـوڕی ئـەبو طالیـب بـوو، نەجاشـی لـەجیاتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار سەد لیرەی زێڕی کرد بە مارەییم خالیـد وەریگـرت‌و دوایی دایەوە بەخۆم، ئوم حەبیبە نزیکەی هەشـتاو سـێ سـاڵ ژیـاوە، عائیـشە دەفەرموێ: لەکاتی سەرەمەرگا، ئوم حەبیبە ناردی بەدواما، فـەرمووی: خـۆت دەزانی کە من‌و تۆ هەوێی یەکتری بووین، هەوێش لـەوەزەنی هـەوێی رزگـاری

نابێ، کەواتە: بەخێری خۆت گەردنم ئازاد بکە، منیش گەردنیم ئازاد کردو لەخودا پاڕامەوە بۆی کە لەگوناهی خۆش بێ، ئەویش پێی فەرمووم: (بەڕاستی دڵت خۆشکردم، خودا دڵت خۆش بکا). {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٧٠ + تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦١٤ + تاج/٢، لاپەڕە: ٤٨٨، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٤، چاپی/٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٣٩، لاپەڕە: ٦٨٠، ژمارە: ٣٤٤٢، چ/٤ – ڕێزداریی ئوم سەلەمەو ئوم حەبیبە}.

٢٦٥– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {بَعَثَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خَيْلاً، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي اَلْمَسْجِدِ} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٤، لاپەڕە: ٣٥٦، ژمارە: ١٦٠٧ = ٤٣٧٢، ٤٦٢٠، ٤٦٩٠، ٢٤٢٢، ٢٤٢٣ فتح الباری. پوختەی موسلیم ژمارە: ١١٥٢ = ٤٥٦٤ مسلم شیحا = ١٧٦٤ مسلم. أبو داود. جهاد: ٢٦٧٩. نسائی. طهارة: ١٨٩. تحفة الأشراف: ١٣٠٠٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بڕکەیێ سواری بەرەو نەجد نارد، کەهاتنەوە پیاوێکی بەنی حەنیفەییان هێنابوو، بەدیل گرتبوویان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ناوی ثومامەی کوڕی ئوسال بوو، سەرگەورەی خەڵکی یەمامە بوو، جا لەبەرئەوەی کە لەسەردەمی حەزرەتدا بەندیخانەیان نەبوو، چونکە حوکمیان تابلێی سادەو پڕ دادو عەدالەت بوو، پێویستیان بە پۆلیس و کەلەبچەو زیندان نەبوو، لەبەرئەوە پیاوەکەیان بەستەوە بە کۆڵەکەیێ لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە... تا کۆتایی فەرموودەکە، کە گەلێ درێژە، لەم شوێنانەدا بەتەواوی کراوە بەکوردی. {پوختەی موسلیم/ ١١٥٢ + تەجرید/٤، ژمارە: ١٦٠٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٤٥٣٨. بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٩}.

٢٦٦- وَعَنْهُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): { أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) مُرَّ بِحَسَّانَ يَنْشُدُ فِي اَلْمَسْجِدِ، فَلَحَظَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: "قَدْ كُنْتُ أَنْشُدُ، وَفِيهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٢٧٧ = ٤٥٣، ٣٢١٢، ٦١٥٢ فتح البارى. پوختەى موسليم ١٧١٣ = ٦٣٣٤ مسلم شيحا = ٢٤٨٥ مسلم. أبو داوود. أدب: ٥٠١٣. نسائى. مساجد: ٧١٥. تحفة مالأشراف: ١٣١٤٠}:

لەپوختەى موسليما ئاوايە:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: حەسسانى كوڕى ثابيتى ئەنصارى (رەزاى خوداى لێ بێ) لەناو مزگەوتەكەى پێغەمبەردا (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەمەدينەى نازدار، هۆنراوى دەخوێندەوە، عومەرى كوڕى خەتاب (رەزاى خوداى لێ بێ) لەلايەوە رەت بوو، بەگۆشەى چاو، خێسەيەكى لێى كردو لێى مۆڕ بۆوە، حەسسانيش فەرمووى: من كارێ ناشايستەم نەكردووە، تاتۆ بێزاريم لێ دەربڕى، ئالەم شوێنەى حازريەدا، هۆنراوەم تيادا خوێندۆتەوەو، لەوكاتەدا پياوێ لەتۆ باشتريش لەوێ بووە، كە پێغەمبەر بوو (دروودى خوداى لەسەر بێ) وە كارەكەى منى لەلا پەسەند بوو، ئەوجا حەسسان رووى كردە منو فەرمووى: توخوا ئەى ئەبو هورەيرە! ئايا تۆ بۆخۆت لە پێغەمبەرت نەبيستووە كە بەمن بفەرموێ: (ئەى حەسسان! لەجياتى من، تۆ بەشيعر وەرامو بەرپەرچى تانەو تەشەرو رەخنەى بێبڕواكان بدەرەوە، خودايە! بەگيانى پاك، كە جوبرائيلە، پشتيوانى حەسسان بكە)؟ واتە: بەهۆى جوبرائيلەوە ياريدەى حەسسان بدە، لەدانانى شيعردا، بۆ لەسەركردنەوەى پێغەمبەرى خودا. ئايا ئەى ئەبو هورەيرە! تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر بيستووە يانا؟

ئەبو هورەیرە فەرمووی: منیش گوتم: خـودا ئاگادارە کـە چۆن دەڵێـی، ئەی حەسسان! وایەو قسەکەت راستو دروستە). {تـاج/٣، زنجـیرە: ٥٧، ژمـارە: ٣٤٩٥، ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

حەســانی کـوڕی ثـابیتی ئەنــصاری، هــاوەڵێکی ناســراوو نــاوداری پێغەمبـەرە، شـاعیرێکی جـوان بـوو، ناسـراوە بەشـاعیری پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ژمارە (١٧١٦)دا، لە پوختەی موسلیما، هـەروا لـە تـاجول ئوصولدا، بـەرگی/٣، زنجیرە: ٥٧، ژمـارە: ٣٤٩٧} چامەیەکی جوانی حەسـسان تۆمار کراوە.

حەسسان ئەنصارییە، خەزرەجییە، دایکی ناوی فورەیعەیە، بـە ئیـسلاما گەیشتووە، موسوڵمان بووە، لەگەڵ ژناندا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا.

حەسسان بەم سێ بەهرەیە، باو دەدرێ بەسەر شاعیرانا:

١- لەسەردەمی نەزانیدا، شاعیری ئەنصارەکان بوو.

٢- لەسەردەمی ئیسلاما، شاعیری پێغەمبەر بوو.

٣- شاعیری سەراسەری یەمەن بوو، لەسەردەمی ئیسلاما هەنـدێ دەڵێن: حەسسان ترسنۆك بووە، وە زۆر نوکتەی لەم لایەنەوە لێ دەگێڕنەوە. هەمیشە بەشیعر بەرگریی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و لـە ئیـسلامو لـە موسوڵمانان دەکرد.

حەسـسان سـەدو بیـست سـاڵ ژیـاوە، شەسـتی لەسـەردەمی نەزانیـداو، شەستی لەسەردەمی ئیسلامدا، لەسـەردەمی ئیمامی عەلیـدا، لەسـاڵی پـەنجای کۆچیدا، لەتەمـەنی سـەدو بیـست سـاڵیدا، بـەمردنی خـودا مـردووە. راجیـایی هەیە لەساڵی مردنیو لەکۆی ساڵی تەمەنی، بەڵام جـەماوەری زانایـان دەڵێن: سەدو بیست سـاڵ ژیـاوە، شەسـتی لەنـەزانیو شەسـتی لـە ئیـسلاما. {بڕوانـە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٧١٣}.

٢٦٧- وَعَنْهُ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي اَلْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لَا رَدَّهَا اَللَّهُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ اَلْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٢٥٤ = ١٢٦٠ موسلیم شیحا = ٥٦٨ مسلم. أبو داود. صلاة/٢١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر گوێتان لێ بوو کە یەکێ لەناو مزگەوتا بانگەواز هەڵ دەدات بۆ دۆزینەوەی شتی گومبوو، بڵێن: یاخوا نەیدۆزیتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەمە دروست نەکراوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٢ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست ئەوەیە کە بانگەوازەکە شەڵەژانو بشێوی لە مزگەوتەکەدا دروست بکا. بەڵام بەشێنەییو لەسەرخۆ پرسو راوێژ بۆ دۆزینەوەی ونبوو قەیدی نییە. تەنانەت جاڕدان لە بڵندگۆی مزگەوتەوە، بۆ دۆزینەوەی منداڵو بۆ راگەیاندنی هەندێ هەواڵی گرنگ وەك هاتنی رەمەزانو هاتنی جەژنو خوانەخواست ڕوودانی کارەساتێ، کارێ باشەو هیچ خراپییەکی تیادا نییە.

٢٦٨- وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ، أَوْ يَبْتَاعُ فِي اَلْمَسْجِدِ، فَقُولُوا: لَا أَرْبَحَ اَللَّهُ تِجَارَتَكَ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{نسائي في الكبرى/١٠٠٠٤، رقم: ١٧٦، ترمذی. رقم: ١٣٢١}:

دیسان ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بینیتان کەسێ لەناو مزگەوتا شت دەفرۆشێ، یاشت ددەکڕێ، پێی بڵێن: یاخوا بازرگانییەکەت قازانج

نـەكات). نەسائیو تەرمـەزی گێڕاویانەتـەوە، تەرمـەزی بـە حەسـەنی دانـاوە. گەرچی کڕینو فرۆشتنو مامەڵەکاری لـەناو مزگـەوتا ناباشـە، بـەڵام عقدەکـە دادەمەزرێ.

٢٦٩- وَعَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم): {لَا تُقَامُ اَلْحُدُودُ فِي اَلْمَسَاجِدِ ، وَلَا يُسْتَقَادُ فِيهَا} . رَوَاهُ أَحْمَـدُ، وَأَبُـو دَاوُدَ بِـسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{أحمد. رقم: ١٥٦١٧. أبو داود: ٤٤٩٠}:

حـەکیمی کـوڕی حیـزام (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نە لـەناو مزگـەوتا حـەددی شـەرعی جێبەجێ دەکرێ، وەنە تۆڵەی کوشتنەوە لـەناو مزگـەوتا جێبـەجێ دەکـرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٢٣٨٨ ج/٤} .

(ڕوونکـردنەوە):

حـەکیمی کـوڕی حیـزام بـرازای حـەزرەتی دایکـە خەدیجـەی هاوسـەری پێغەمبــەرە (دروودی خــودا لەســەر پێغەمبــەرو ڕەزای خــودا لــە خەدیجـەو حەکیم بێ). حەکیم یەکێك بوو لە خانەدانو بەگزادەکانی قـوڕەیش، ڕیفـادە لەدەستی ئەودا بوو، ڕیفادە ئەوەبوو: قوڕەیش لەناو خۆیانا، هەرکەسێ بەپێی توانای خۆی، بڕێ بەخششی دەدا، هەتا سامانێکی زۆریان کۆدەکردەوە، جا لەو ماڵــە خواردەمــەنیو مێــووژو خۆشــاویان دەکــڕی، وە لــەڕۆژانی حەجــدا، دەرخـواردی خـەڵكو حاجیانیـان دەدا، حـەکیم دەیفـەرموو: (سـیازدە سـاڵ لەپێش ساڵی فیل (عامولفیل)دا، لەدایکبووم، لەبیرم دێ، کە عەبدولموطەلیبـی بـاپیرەی پێغەمبـەر، دەیویـست بـۆ جێبـەجێ کردنـی نەزرەکـەی، عەبـدوڵڵای کوڕی سـەرببڕێو بیکـات بـە قوربـانی، چونکە عەبدولموتتـەلیب ئـاهو نـەزری کردبـوو، ئەگـەر (١٠) دە کـوڕی ببـێ، یـەکێکیان بکـات بـەقوربانی، وەویـستی عەبدوڵڵای کوڕی بکات بـەقوربانی، چونکە ئاهەکـەی هـاتبووە دیو دە کـوڕی

بوو بوو، دوایی فیدیەی دا. حەكیم لەناو ژووری كەعبەدا لەدایك بووە لە جاهیلییەتدا (٦٠) شەست ساڵ ژیاوە، لەكاتی ئیسلامیشدا (٦٠) شەست ساڵ ژیاوە، ئەمە دەكاتە: (٦٠ + ٦٠ = ١٢٠) ساڵ ژیاوە (١٠٠) سەد كۆیلەی لەسەردەمی نەزانیو نەدانیدا، لەپێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، ئازاد كردووە، لەسەردەمی ئیسلامدا حەجی كردووە، لەحەجێكا سەد وشتری دیاری بەیتی پێ بوو، كاتێ لەچیای عەرەفە، لەرۆژی عەرەفەدا راوەستا، سەد كۆیلەی هێنابوو، لەوێ لەگەڵیا راوەستابوون، لەگەڵیا حەجیان دەكرد، هەر سەدیان، یەكی سەرو تەوقی زیوینیان لە گەردندا بوو، بە نەخش لە تەوقەكان نووسرابوو: (ئەمانە ئازادكراوی خودان، لەبەر رەزای خودا، حەكیمی كوڕی حیزام ئازادی كردوون) هەزار سەر پەزیشی كرد بەدیاری (هەدی)ی بەیت.

حیزامی باوكی لەهەراكەی (فجار)دا كوژرا، زكە لەمێژوودا ناسراوە بە (حرب الفجار).

حەكیم خۆشی ئامادەی ئەم هەرایە بووە، لەپێش سەردەمی هاتنی پێغەمبەرایەتیو رەوانەكردنی موحەممەددا حەكیم دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بیعثەتیش هەر پێغەمبەری خۆشدەویست، بەڵام درەنگ ئیسلام بوو، یەكێ بوو لە (مَسلَمَة)ی فەتح، واتە: لەو موسوڵمانانەیە كە لەرۆژوی ئازادكردنی مەككەدا، بۆ پاراستنی خوێنی خۆیان موسوڵمان بوون، وە زۆرینەی ئەمانە، گەرچی لەسەرەتاوە بەناچاری موسوڵمان بوون، بەڵام لەدواییدا، كاتێ لە پەیامی ئیسلام حاڵی بوون، موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو. لەرۆژی ئازادكردنی مەككەدا، بۆ دەستی قەدرو رێزنان لە حەكیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەركەسێ بڕواتە ماڵی حەكیمی كوڕی حیزام، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیابێ!).

حـەكيم پيـاوێكی ژيـری رێـزداری لـەخوا ترسـی دەوڵەمەنـد بـوو، زۆر بەخشندە بوو، زۆر خێركەر بوو، وەكوو وتمان سەدو بيست سـاڵ ژيـاوە، سـاڵی پەنجاو چواری كۆچی لەسەردەمی جێنشينيی موعاوييەدا، لەمەدينە، لەماڵی خۆيدا، بە مردنی خوا زايە بووەو مردووە!!

حـەكيم چـوار كـوڕی بـوو، هـەر چـواريان سـەحابەی پێغەمبـەر بـوون، زناويان: عەبدوڵلاو خاليدوو يەحياو هيشام بوو.

حەكيم (رەزای خـودای لێ بـێ) لـەڕۆژی نەبـەردی بـەدرا، لەگـەڵ هـاوەڵ پەيـداكاران بـوو، بـەڵام نـەكوژرا، جـا كاتـێ كـە ئيـسلام بـوو، زۆر جـاران كـە سـوێندی دەخـوارد، ددەيگـوت: (نـا، بەوكەسـەی كـە لـەڕۆژی بـەدرا، لەمـەرگی سوور رزگاريكردم!).

ئەم زاتانەيش گێڕانەوەيان لەوەوە ئەنجام داوە: عوروەی كوڕی زوبەيرو سەعيدی كوڕی موسەييەبو مووسای كوڕی طەلحە.

٢٧٠- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {أُصِيبَ سَـعْدٌ يَـوْمَ اَلْخَنْـدَقِ، فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خَيْمَـةً فِـي اَلْمَـسْجِدِ، لِيَعُـودَهُ مِـنْ قَرِيبٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريـــدی بوخـــاری/١، ژمـــارە: ٢٨٢ = ٤٦٣، ٢٨١٣، ٣٩٠١، ٤١١٧، ٤١٢٢. مسلم شيحا ٤٥٧٣ = مسلم/١٧٦٩}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەيە لە تەجريدی بوخاريدا:

عائيـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەغـەزای خەنـدەقا سـەعدی كوڕی موعاز، زامار بوو، ئيبنولعەرەقە ناوێ، لە هۆزی قوڕەيش، تيرێكی دابـوو لەشـا دەمـاری بـاڵی، كـە بەعـەرەبی پێـی دەڵـێن: (ئەكحـەل: عـرق الحيـاة) بـە كورديش پێی دەڵێن: رەگی حەيات، يا رەگی ژيـان، حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتەكەدا، چاتۆڵێكی بۆی هەڵدابوو، لە پـەناوە زوو زوو سـەری لێ دەداو، تەشـريفی دەچـوو بـۆ هەواڵپرسـينی، لـەناو مزگەوتەكـەدا

چادرێکی تریش هەبوو، هی هۆزی بەنی غیفار بوو، هەڵیاندا بوو بۆ روفیەی ئەنصارییە، کە ئافرەتێ بوو دەستی پزیشکی هەبوو، زامارەکانی دەرمان دەکرد، جا کاتێ بەنی غیفاریەکان چۆڕاوگەی خوێنیان بینی، هات بۆ ناو چادرەکەی خۆیان، راچەنین و هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئەرێ ئەی دانیشتوانی ناو ئەو چادرەی تەنیشتمان! ئەم جۆگەلەی خوێنە چییە کە لەلای ئێوەوە دێ بۆلای ئێمە؟

کە تەماشایان کرد وا برینەکەی سەعد تەقیوەو کفارەی خوێنی دێو چۆڕاوگەی وەك جۆگەلە رۆیشتووە، ئیتر لەناو ئەو چادرەدا سەعد بەو پێکانە شەهید بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٦٦، ٣٤٦٨، ٣٤٦٩ + تاج/١، زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٤}.

(روونکردنەوە):

بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروستە مزگەوت بۆ هەندێ کاروبابەتی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێ، بەڵام بەمەرجێ رێگە لەنوێژو دجەماعەت نەگرێو قازانجێکی موسوڵمانانی تیادا بێ.

٢٧١- وَعَنْهَا قَالَتْ: {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْتُرُنِي، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى اَلْحَبَشَةِ يَلْعَبُونَ فِي اَلْمَسْجِدِ . . .} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٧٨ = ٤٥٤، ٤٥٥، ٩٥٠، ٩٨٨، ٢٩٠٦، ٣٥٢٩، ٣٩٣١، ٥١٩٠، ٥٢٣٦. پوختەی مسلم ٤٣٢ = ٢٠٦٢ مسلم شیحا = ٨٩٢ مسلم}:

دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما (ژمارە: ٤٣٢):

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو کەنیزم لەلابوو گۆرانی یان دەگوت، بەسەر هەراکەی رۆژەکەی بوعاثدا، سروودیان دەگوت، کە کوشتارێکی زۆر لەو رۆژەدا، لەپێش هاتنی ئیسلامدا، لەنێوانی ئەوس و خەزرەجدا، رووی دابوو، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

هاته ژوورەوە، تەشریفی چوو لەسەر نوێنەکەی خۆی پاڵکەوتو رووی لەئێمە وەرچەرخان، پاش کەمێ ئەبوبکری باوکیشم هات، چاوی بەحاڵەکە کەوت، لەپێشا لەمنی خوڕیو پیاما هەڵشاخا، ئەوجا فەرمووی: (بالۆرەی شەیتانو لەخزمەت پێغەمبەری خوادا؟ شتی وا چۆن دەبێ؟).

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی کردە ئەبوبکرو پێی فەرموو: (ئەی ئەبوبکر! وازیان لێبهێنە، با سروودەکەیان بڵێن، چونکە ئەمڕۆ جەژنی موسوڵمانانە).

دیسان عائیشە فەرمووی: کات رۆژی جەژنی قوربان بوو، حەبەشییەکان بەقەڵغانو نیزە یارییان دەکرد، یاخۆم داوام کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یاخود خۆی فەرمووی: (ئەی عائیشە! حەز دەکەی تەماشای ئەم یارییە بکەی؟) منیش گوتم: بەڵێ، جامنی لەپشتی خۆیەوە وەستاندو، چەناکەم نایە سەرشانیو روومەتم نابە روومەتیەوە جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی نەوەی ئەرفیدە! خەریکی یاری خۆتان بن!).

ئیتر منیش دەستم کرد بەتەماشا کردن، تاخۆم تاقەتم نەما، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر بەستە؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەبڕۆ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ٩١٦}.

(روونکردنەوە):

بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم جۆرە یاریو ئاهەنگو خۆشی دەربڕینە، لەبۆنەکانا لە مزگەوتا دروستە.

٢٧٢- وَعَنْهَا: {أَنَّ وَلِيدَةً سَوْدَاءَ كَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الْمَسْجِدِ، فَكَانَتْ تَأْتِينِي، فَتَحَدَّثُ عِنْدِي . . .} الْحَدِيثَ. مُتَّفِقٌ عَلَيْه.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/١، ژمارە: ٢٦٩ = ٤٣٩، ٣٨٣٥. لە (بَدْرُ التَّامّ شَرْحُ بُلُوغ المرام)دا دەفەرموێ: ئەم

فەرموودەیــە لەئــەفرادی بوخاریــە، موســلیم نەیگێڕاوەتــەوە، ئــەوەی کەدانــەر دەفەرمویَ ئەم فەرموودەیە (متفق علیە)یە، وەهمەو هەڵەیە} :

دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی بوخاریدا (ژمارە: ٢٦٩) ئاوایە:

عائیــشە (ڕەزای خــودای لیَ بــیَ) دەفــەرمویَ: هــۆزێکی عــەرەب هــەبوو، کــەنیزێکی ڕەشــیان هــەبوو، کاتــیَ ئازادیــان کــرد هــەر لەگــەڵیان مایــەوە، کەنیزەکەکە بۆی گێڕامەوە، وتی: کچۆڵەیەکیان هەبوو، تازە بووك بوو، دەچیَ بـۆ کـوڵو کـانی، بـەرمووریَکی سـووری کـشتەك چـەرمینی لـەخۆدا بـوو، دوو گورزە بوو، دوو ڕەنگ بوو، بەمرواریو کووژەکە هۆنرابۆوە، بەسیرمە لەسـەر تــەختی چــەرم، لەســەر شــێوەی کەمــەرەو هەیاســە دروســتکرابوو، گــوتی: جاکیژەکە بەرموورەکـە لـە شـوێنیَ دادەنـیَ، یـاگوتی: لێـی دەکـەویَ، کۆلارەیـیَ بەدانراوی دەیبینیَ، لەبەر سووریی چەرمەکەو سپێتی مرواریيەکە، کۆلارەکـە وادەزانــیَ کــە ئــەو پارچــەییَ گۆشــتو بــەزە، جــا کۆلارەکــە پڕدەکــا بــە بــە بەرموورەکەداو دەیفڕێنیَو دەیبا.

گوتی: گــەلیَ بۆیگــەڕان نەیاندۆزییــەوە، گــوتی: ئــیتر منیــان کــرد بــەدزو تۆمــەتی ناهــەقیان لەبارەیــەوە لەمنــدا، وە دەســتیانکرد بەپــشکنینم، وتــی: تەنانــەت ناوگەڵیــشیان پــشکنیم! وە نــاو شەرمیــشم گــەڕان بــۆی! جــا گــوتی: منیش بەکوڵی دڵ لەخودا پاڕامەوە، کە پاکیو بیَ تاوانی من ئاشکرا بکا، ئـیتر هێشتا مـن لەناویانـدا، بـەپێوە ڕاوەسـتابووم، کـە لـەپڕ لـەولاوە کۆلارەکـە لـە ئاسمانەوە هات، بەر موورەکەی فڕیَ دایە نێوانی کۆمەڵەکەیانەوە!!

گوتی: جا گوتم: ئەوا خــودای گــەورەو ســەروەر، پــاکیو بێتــاوانیی منــی دەربــڕیو، بوختیــانو شــەڵتاخەکەی ئێــوەی پــووچ کــردەوە، ئــەوەتا ئەمــە بەرموورەکەیە.

عائیــشە (ڕەزای خــودای لیَ بــیَ) فــەرمووی: جــا ژنەکــە هاتــە خزمــەتی حەزرەت (درוودی خودای لەسەر بیَ) وە موســوڵمان بــوو، عائیــشە فــەرمووی:

ئەم ژنە چاتۆڵێكی لەناو مزگەوتا هەبوو. عائیشە فەرمووی: گەلێ جار دەهات بۆ لام‌و قسەی بۆم دەكرد، هەموو جارێ كە دادەنیشت لەلام دەیگوت: (تەویل):

وَيَــوْمَ الوِشَــاحِ مِــنْ أَعَاجِيــبِ رَبِّنَــا
إِلاَّ إِنَّــهُ مِــنْ بَلْــدَةِ الكُفْــرِ أَنْجَــانِي

واتە:

رۆژەكــەی بــەرموور، ســڕی یــەزدانی
رزگـــــاری كـــــردم لەگاورســـــانی

بە پەخشانیش واتە: رۆژەكەی بەرموورو كۆلارەكە، یەكێكە لەڕۆژە سەیرەكانی پەروەردگارمان، ئۆخەی! كە رزگاری كردم لە گاورسانی. منیش جارێ بەو كەنیزەم گوت: ئەوە چییە لەهەموو گۆڕو دانیشتنێكا، ئەم هەڵبەستە دەخوێنیتەوە؟ ئیتر ئەویش ئەم داستانە عەنتیكەیەی بۆم باسكرد.

(روونكردنەوە):

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە: مرۆڤی بێ جێگەو رێگە، ژن بێ یان پیاو، دروستە بۆی لەناو مزگەوتا ستاربگرێ، چ بەشەو، چ بەڕۆژ، بەمەرجێ مەترسی تووشبوونی ئاژاوەی نەبێ، بەڵگەی ئەوەیشە كە نزای ستەمبار، با بێبڕوایش بێ گیرا دەبێ.

٢٧٣- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْبُزَاقُ فِي اَلْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٥٨ = ٤١٥. پوختەی موسلیم ٢٥٠ = ١٢٣١ مسلم شيحا = ٥٥٢ مسلم محمد فؤاد}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تف ڕۆکردن لەناو مزگەوتا گوناهە، کەفارەتەکەی ئەوەیە: کە بەخۆڵی ناو مزگەوتەکە دایپۆشێ). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٢}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەمە کاتی وایە: کە مزگەوتەکە وەك جاران، زەوییەکەی خۆڵ بێو مەودای ئەوەی هەبێ کە تفو دەردراوە دەمیەکە بەخۆڵ دابپۆشرێ. بەڵام بۆ ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ، لەسەدا نەوەدی، مزگەوت وەك جاران نەماوە هەمووی بە حەسیرو ڕایەخ ڕاخراوە، چیمەنتۆو گەچکاری کراوە، جێگەی تف ڕۆکردن نەماوە، لەبەرئەوە ڕێگەی شتی وا نادرێ.

٢٧٤- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَقُومُ اَلسَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى اَلنَّاسُ فِي اَلْمَسَاجِدِ} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{أحمد رقم: ١٢٤٠٢. أبو داوود رقم: ٤٤٩. إبن ماجة رقم: ٧٣٩. نسائي رقم: ٦٨٩. ابن خزيمة رقم: ١٣٢١}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ هەتا خەڵك شانازیو فیز دەکەن بەدروستکردنی مزگەوتەوەو مزگەوتی کەشخەو بەرزو ڕازاوە دروست دەکەن، تا خەڵك بڵێن: ئەوە مزگەوتی فیسارە کەسە). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٧٣٣ ج/٤}.

٢٧٥- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَا أُمِرْتُ بِتَشْيِيدِ اَلْمَسَاجِدِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبو داود رقم: ٤٤٨. ابن حبان رقم: ١٦١٥. صحيح الجامع: ٥٥٥٠}:

ئیبنـو عـەبباس (رەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (خـودا فـەرمانی بـەمن نەکردووە کە مزگەوتی کەشخەو بـەرزو بەرچاویی دروسـت بکـەم). {تـاج/١، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٧٣١}.

تەواوی فەرموودەکە ئاوایە لە (تاج/١، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٧٣٢):

ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەوەی کە گومانی تیادا نییە، موسوڵمانانیش چاو لە جوولەکەو گاورەکان دەکەنو، هەروەك چۆن جوولەکەکان کە نیشتەی خۆیانو گاورەکان کڵێسەی خۆیان نەخشاندووەو زەرکەشیان دەکەن، ئێوەیش ئاوەها چـاو لـەوان دەکـەنو مزگەوتـەکانی خۆتـان دەنەخـشێننو زەرکەشـیان دەکەن!). {رواه البخاريّ تعليقاً بعد رقم: ٤٤٥ في الباب ٦٢ من كتاب الصلاة}.

(ڕوونکردنەوە):

بەدیمەن ئەم دوو فەرموودەیە:

١- بەڵگـەن لەسـەرئەوە کـە مزگـەوت واباشـە سـادەو ئاسـایی بـێو، زیادەڕەوی نەکرێ لە کەشخەییو ڕازانەوەیدا.

٢- تەشییدو زەخرەفەو کەشـخەیی مزگـەوت لـەزاتی خۆیـدا مەبەسـتی شـەرع نییـە، لەبەرئـەوە هـەرکاتێ شـتی وا ڕوویـدا نیـشانەی نزیکبوونـەوەی قیامەتە.

٣- بەڵام هەرکاتێ گرنگی دان بە مزگەوتی گەورەو باشو قایمو ڕازاوەو کەشخە، بۆ ئیعزازی ئیسلام بوو، وەبۆ مەبەستێکی کۆمەڵایـەتی جوانی بـاوی نـاو کۆمـەڵگا بـوو، وەبـۆ ڕیـاو فیـزو دەعیـەو قـازانجی دنیـایی نـەبوو، ئـەوە بەریەکێ لەم دوو ڕێسا جوانە دەکەوێ:

یەکەم: (هەرچی شتێ کە موسوڵمانان بەجوانی بزانن، ئـەو شـتە لـەلای خودایش جوانە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ١٣٥٣ چاپی چوارەم}.

دووەم: (هەركەسىَ بۆ رەزای خـودا مزگـەوتىَ دروسـت بكـا، خـودا لـە بەهەشـتا لـە وێنـەی ئـەو مزگەوتـە، كۆشـكێكی بـۆ دروسـت دەكـا). {تـاج/١، زنجيرە: ١١٤، ژمارە: ٦٧٥ چاپی چوارەم – تەجريـدی بوخـاری/١، ژمـارە: ٢٧٤ = ٤٥٠ فتح البـاری. مـسلم. مـساجد/١١٩٠ شـيحا = پوختـەی موسـلم ٢٤٠. ترمـذی. مساجد/٣١٨}.

زاناكـان دەفــەرموون: (شــتەكە بەمــەرجىَ سـاخ بــۆ رەزای خودابــىَ، مزگەوتە دروستكراوەكە هەتا گـەورەترو باشـتر بـىَ، تەلارەكـەيش لەبەهەشـتا گەورەترو باشتر دەبىَ).

٤- ئەنجامی كۆی ئەم خاڵانە ئەمەيە:

(لەم رۆژگارەی ئێمـەدا، مزگـەوت بـەردی بناغـەی ئيـسلامە، لەهـەركوىَ مزگەوت هەبوو ئيسلام هەيە. لەم روانگەيەوە رازانەوەو كەشخەيی مزگـەوت كـارێكی رەوايـە، مايـەی سـەربەرزیو توانـايی ئيـسلامو موسـوڵمانانە، بـەڵام ئەوەندەی دەتوانرىَ: سادەيی ناو ماڵی مزگەوت بپارێزرىَ!).

٢٧٦- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {عُرِضَتْ عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتِي، حَتَّى اَلْقَذَاةُ يُخْرِجُهَا اَلرَّجُلُ مِنْ اَلْمَسْجِدِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَاسْتَغْرَبَهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{ابو داوود رقم: ٤٦١. ترمذی رقم: ٢٩١٦. ابن خزيمة: ١٢٩٧. ضعيف الجامع: ٣٧٠٠}:

ئەنەسـی كـوڕی ماليـك (رەزای خـودای لىَ بـىَ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـىَ) فـەرمووی: (هەرچـی پاداشـی ئۆمـەتم هەيـە، هەمووی رانوێنرا بۆمو پيشانم درا، تەنانەت پاداشی ئەو پـووشو پەڵاشەيـشم نيـشاندرا، كـە كەسـىَ لەمزگـەوت دەيماڵـىَو فڕێـی دەدا، وە هەرچـی گونـاهی ئۆمەتيـشم هەيـە رانـوێنرا بـۆمو پيـشانم درا، كەسـم نـەدی كـە گونـاهی لـە گونـاهی ئـەو پيـاوە گـەورەتر بـىَ، كـە سـوورەتىَ، يـا ئايـەتێكی قورئـانی

لەبەربووبێو لەپاشا لەبیری بچێتەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٦}.
{ئەبو داوودو تەرمەزیو ئیبنو خوزەیمە گێڕاویانەتەوە، تەرمەزی دەڵێ: غەریبە، ئیبنو خوزەیمە دەڵێ: صەحیحە}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەڵگەیە لەسەر پاکو خاوێنی مزگەوت {بڕوانە: ژمارە: ٢٦٢ لەپێشەوە رابورد}.

٢- بەڵگە هێنانەوە بەم جۆرە فەرموودەیە دروستەو کارێ پەسەندە گەرچی فەرموودەکە، نەیشگاتە پلەی صەحیح.

٢٧٧- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ اَلْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٧١ = ٤٤٤ فتح الباری. مسلم شیحا ١٦٥١ = ٧١٤ مسلم}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ چوونە ناو مزگەوت لەپێش ئەوەدا کە دابنیشن دوو رکات نوێژی دیاری مزگەوت بکەن!).

(ڕوونکردنەوە):

١- دروستکردنی مزگەوت کارێ زۆر خێرو گرنگی ئایینییە.

٢- لەهەموو گەڕەكو گوندێکا، بەپێی پێداویستی مزگەوتی پاكو خاوێن هەبێ.

٣- باسی مزگەوت برێتییە لە (٢٧٧ – ٢٦١ = ١٦) شازدە فەرموودە.

٤- گۆڕ نابێ بکرێ بە مزگەوتو لەنوێژدا رووی تێ بکرێ، بەڵام گۆڕستانی کۆن بەمەرجی خۆی دروستە بکرێ بەمزگەوت.

٥- دروستە سوود لەمزگەوت وەربگیرێ بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، وەك ئەوە خەڵکی تیا بحەوێتەوەو تیا بخەوێ، بەمەرجێ رێ لەنوێژو جەماعەت نەگرێ.

٦- دروستە شیعری جوانو چامەی ئایینیو ئاهەنگی ئایینیو کۆمەڵایەتی رەوا، لەمزگەوتا بخوێنرێو بخوێنرێتەوە، وەك دەورو دەرسی فەقێو مەلا.

٧- کڕینو فرۆشتنو سەوداو مامەڵە لەناو مزگەوتا ناباشە، هەروا جاڕ هەڵدانو شتی وا، بەڵام لەکڕینو فرۆشتندا گرێبەستو عەقدەکە دادەمەزرێ.

## ١٧- باسی چۆنێتی نوێژ
## بَابُ: صِفَةِ اَلصَّلَاةِ

٢٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {إِذَا قُمْتُ إِلَى اَلصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ اَلْوُضُوءَ ، ثُمَّ اِسْتَقْبِلِ اَلْقِبْلَةَ ، فَكَبِّرْ ، ثُمَّ اِقْرَأْ مَـا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنْ اَلْقُرْآنِ، ثُمَّ اِرْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ اِرْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُـمَّ اُسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ اِرْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُـمَّ اُسْـجُدْ حَتَّـى تَطْمَـئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ اِرْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اُسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ اِفْعَلْ ذَلِـكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا} أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَـارِيِّ وَلِـابْنِ مَاجَـهْ بِإِسْـنَادِ مُـسْلِمٍ: {حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِمًا} .

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤١٢ = ٧٥٧، ٧٩٣، ٦٢٥١، ٦٢٥٢، ٦٦٦٧ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٦١ = ٨٨٣، ٨٨٤ شیحا = ٣٩٧ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە گۆشەیەکی مزگەوتدا، دانیشتبوو، لەوکاتەدا پیاوێ هاتە ژوورەوە، دەستی کرد بەنوێژکردنو دوایی چوو بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و سڵاوی لێی کردو ئەویش سڵاوەکەی سەندەوەو

فەرمووی: (بچۆرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کەتۆ کردت).

تا سێ‌جار پیاوەکە نوێژەکەی دەکردەوەو پێغەمبەریش دیسانەوە هەروای پێ دەگوتەوە، تا لەسەری جاری سێیەمدا پیاوەکە گوتی: بەو خودایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری ڕاستو دروست، لەمە باشتری لێ نازانم، دەی بفەرموو فێرم بکە، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەویش فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووبکەرە ڕووگەو بەوشەی ئەڵڵاوئەکبەری تەحەڕوم نوێژ دابەستەو بڵێ: ئەڵڵاوئەکبەر، ئینجا چەندەت بۆ دەلوێ لەو قورئانەی لەبەرتە بیخوێنە، ئینجا بچەمێرەوەو ڕوکوع بەرەو ئەوەندە لەچەمینەوە (ڕوکوع)دا بمێنەرەوە هەتا جەستەت لەجموجول دەکەوێو ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا ڕێك هەڵسەرەوەو پشتت هەڵبڕە، تاڕەپ ڕادەوەستێت، ئینجا دانەرەوە بۆ کوڕنووشو کوڕنووش بەرەو ئەوەندە لە کوڕنووشا بمێنەرەوە تا ئەندامەکانت ئارام دەگرنو لەشت لەجموجول دەکەوێ، ئەنجا سەر لەکوڕنووش بەرزبکەرەوە، تاقنج دائەنیشیت، ئینجا دیسانەوە کوڕنووشێکی تری وەك کوڕنووشی یەکەم بەرەوە، ئیتر هەموو ڕکاتەکانی تر هەتا سەر، بەم شێوەیە بکەو، هەموو کاتێ لەنوێژدا ئاوا بکە).
{تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٠ چاپی/٤} .

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەوت فەرموودەنامەکە گێڕاویانەتەوە، ئەمەی لەفظی بوخارییە، ئیبنو ماجە لەگێڕانەوی خۆیدا بۆ ئەم فەرموودەیە، کەپیاوانی ڕشتەکەی بەپێی مەرجی پیاوانی ڕشتەی صەحیحی موسلیمە، لەجیاتی ڕشتەی (حَتَّى تَعْتَدِلَ قائِماً) ئاوایە: (حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِماً).

٢٧٩- وَمِثْلُهُ فِي حَدِيثِ رِفاعَةَ بْنِ رَافِعٍ عِنْدَ أَحمدَ وابْنِ حِبَّانَ {حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِمًا}.

{ابن حبان/١٧٨٧. أحمد ٤/٣٤٠}:

**ئیمامی ئەحمەدو ئیبنو حیببان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) وێنەی ئەم فەرموودەی ئیبنو ماجەیان لەریفاعەی کوڕی رافیعەوە گێڕاوەتەوە، لەگێڕانەوەی ئەمانیشدا، لەجیاتی رستەی (حَتَّى تَعْتَدِلَ قائِماً) ئەم ڕستەی ترە (حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِماً).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- ریفاعەی کوڕی رافیع، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، خۆیو باوکیو دوو برای، کەناویان خەللادو مالیك بوو، صەحابە بوون، ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون، ئوبەیی کوڕی سەلوول باوکی دایکیەتی، لەخزمەت حەزرەتدا ئامادەی گشت مەڵبەندو شەڕگاکان بووە، بیستو چوار فەرموودەی هەیە، لەپەڕاوە بایەخدارەکانی سوننەتدا تۆمارکراون، سێ فەرموودەی لەصەحیحی بوخاریدا هەیە، لەلایەنگیرانی عەلی بوو، لەگەڵ پێشەوا عەلیدا ئامادەی جەنگی جەمەلو صەفین بووە، لەسەردەمی موعاوییەدا لەچلو یەك یان لەچلو دوودا فەوتی کردووە (ڕەزای خودای لێ بێ).**

**٢- واتای (حَتَّى تَعْتَدِلَ قائِماً) ئەمەیە: (لەچەمینەوە ڕاست بەرەوە، هەتا ڕێكو ڕەپ رادەوەستیت).**

**واتای (حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِماً) ئەمەیە: (لەچەمینەوە ڕاست بەرەوەو ڕێك راوەستە هەتا ئەندامەکانت ئارام دەگرن).**

٢٨٠- وَفِي لَفْظٍ لِأَحْمَدَ: {فَأَقِمْ صُلْبَكَ حَتَّى تَرْجِعَ الْعِظَامُ}.

{صحيح الجامع: ٣٢٤. المسند ٤/٣٤٠}:

له لەفظیکی ئەحمەدا، لەجیاتی ڕستەی (حَتَّى تَطْمَئِنَّ قَائِماً) ئـەم ڕسـتەی تره (فَأَقِمْ صُلْبَكَ حَتَّى تَرْجِعَ العِظَامُ) واتـه: ئـەوجا بڕبـڕەی پـشتت ڕاسـتکەرەوه هەتا ئێسقانەکان دەچنەوه جێگەی ئاسایی خۆیان).

٢٨١- وَلِلنَّسَائِيِّ، وَأَبِي دَاوُدَ مِنْ حَدِيثِ رِفَاعَةَ بْـنِ رَافِـعٍ: {إِنَّهَـا لَـنْ تَـتِمُّ صَلَاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ اَلْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اَللَّهُ، ثُمَّ يُكَبِّـرَ اَللَّـهَ، وَيَحْمَـدَهُ، وَيُثْنِـيَ عَلَيْهِ} . وَفِيهَا {فَإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرَأْ وَإِلَّا فَاحْمَدِ اَللَّهَ، وَكَبِّرْهُ، وهلِّلْهُ} .

{صحيح الجامع/٢٤٢٠} :

ریفاعـەی کـوڕی ڕافیـع (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕاستیدا نوێژی کەسێ لەئێوه تەواو نییـه، هـەتا بـەو شـێوەیەی کـەخودا فـەرمانی پـێ کـردووه لـه ئایەتەکـەی سوورەتی مائیدەدا، دەسنوێژێکی تەواو ئەگرێ، که دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْـسِلُواْ وُجُـوهَكُمْ وَأَيْـدِيَكُمْ إِلَـى الْمَرَافِـقِ وَامْـسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ - المائدة/٦} . واته:

ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هێناوه بەئایینی ئیسلام، کاتـێ ویـستتان بـچن بـەلای نوێـژەوه، ڕوخـسارو دەموچاوتان بـشۆرن، ئینجـا دەسـتەکانتان بـشۆرن هـەتا هـەردوو ئانیـشکتان ئینجـا دەسـتی تـەڕ بهێـنن بەسـەرتانا، ئـەوجا قاچەکانتان هەتا هەردوو قاپه ڕەقەڵەکان بشۆرن).

ئـەوجا کاتـێ دەیـەوێ کەنوێـژ دابەسـتێ، ئەڵڵاوئەکبـەر بکـاو بەوشـەی پـیرۆزی ئەڵڵاوئەکبـەری تەحـەرووم نوێـژ دابەسـتێو دەسـت بکـا بەسـوپاسو ستایـشی خـودای گـەورە، بـەهۆی خوێنـدنی سـوورەتی فاتیحـاوه، یـان بـەهۆی خوێندنی نزای سەرەتای نوێـژەوه، کـه ئەمەیـه: «وَجَّهْـتُ وَجْهِـيَ لِلَّـذِي فَطَـرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ».

لـەم فەرموودەیـەدا کـە نەسـائیو ئـەبوداوود گێڕاویانەتـەوە ئەمـەی واتیادا:

(ئەی نوێژخوێن! ئەگەر قورئانت لەبەر بوو، چەندە ئارەزوو دەکەی لەو قورئانەی کە لەبەرتە بیخوێنە، بەڵام ئەگەر هەر هیچ قورئانت لەبەر نەبوو، ئەوا لەباتی خوێندنی قورئان سوپاسو ستایشی خودا بکەو ئەڵلاوئەکبەر بکەو تەلیلەو لائیلاهەئیللەڵلا بکە) واباشە بەم شێوەیە بێ:

(الحَمدُلِلّٰهِ وَاللّٰهُ أكبَرُ وَلا إِلهَ إلاَّ اللّٰهُ).

٢٨٢- وَلِأَبِي دَاوُدَ: {ثُمَّ اِقْرَأْ بِأُمِّ اَلْقُرْآنِ وَبِمَا شَاءَ اَللّٰهُ}.

{صحيح أبي داود: ٧٦٥}:

ئەبوداوود لەریفاعەی کوڕی ریفاعەوە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (... ئەوجا سوورەتی فاتیحە بخوێنە، هەروا چەند حەزی خودای لەسەر بوو، قورئانی تریش بخوێنە...). ئەمە فەرموودەکەی نوێژ ناڕەوانەکەیە، کە لەژمارە (٢٧٨) ئاماژەمان بۆ سەرچاوەکانی لەبوخاریو موسلیمدا کرد. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٥٧ بڕگەی (٤ – بنیاتی چوارەم)}.

٢٨٣- وَلِابْنِ حِبَّانَ: {ثُمَّ بِمَا شِئْتَ}.

{ابن حبان: ١٧٨٧}:

ئیبنو حیببان لەریفاعەی کوڕی رافیعەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (... ئەوجا سوورەتی فاتیحە بخوێنە، هەروا خۆت چەندەت ئارەزوو لێ بوو قورئانی تریش بخوێنە، لەدوای فاتیحە). واتە: لەگێڕانەوەی ئیبنو حیببان‌دا، لەجێگەی (وَبِمَاشَاءَالله) کەوا لەگێڕانەوەی ئەبوداوودا، لەژمارە (٢٨٢)دا، ڕستەی (ثُمَّ بِمَاشِئْتَ)ەیە.

٢٨٤- وَعَنْ أَبِي حُمَيْدٍ اَلسَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {رَأَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهِ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اِسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلَا قَابِضِهِمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ اَلْقِبْلَةَ، وَإِذَا جَلَسَ فِي اَلرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ اَلْيُسْرَى وَنَصَبَ اَلْيُمْنَى ، وَإِذَا جَلَسَ فِي اَلرَّكْعَةِ اَلْأَخِيرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ اَلْيُسْرَى وَنَصَبَ اَلْأُخْرَى، وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٤٤٤ = ٨٢٨. ترمذى رقم: ٣٠٤. أبوداود رقم: ٧٣٠، ٩٦٦. ابن ماجه رقم: ١٠٦١}:

**ئەبو حومەیدی ئەل – ساعیدی (رەزای خودای لێ بێ) بەچەند کەسێ، لەیارانی پێغەمبەری فەرمووێ: من لەهەمووتان باشتر ئاگام لێیەتی کەنوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو، سەرەنجم دەدا کە ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، هەردوو دەستی لەئاستی هەردوو شانی هەڵدەبڕی، کە روکوعیشی دەبرد، هەردوو دەستی لەهەردوو ئەژنۆکانی خۆی گیردەکرد، وەرێك پشتی خۆی دەچەماندەوە، پشتو ملی خۆی ڕێك لەیەك ئاست بەبێ کووڕی ڕادەگرت، کەسەریشی لەچەمینەوە هەڵدەبڕی، ڕێك هەڵدەستایەوەو قنج لەسەر پێ ڕادەوەستایەوە، تا یەك یەك بڕگەکانی بڕبڕاگەی پشتی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، کە کوڕنووشیشی دەبرد، هەردوو لەپی دەستی لەسەر زەوییەکە دادەنا، بەڵام باسکی خۆیی ڕانەدەخست لەسەر زەوییەکە، وەکەمێ باسکەکانیو ئانیشکەکانی، لەکوڕنووشدا بەرز دەگرت، وەنەیشی دەنووساندن بەلاتەنیشتی خۆیەوە، بەڵکوو هەردوو باڵی خۆیی بڵاودەکردەوە، وەسینگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دادەناو، نووکی پەنجەکانی قچای ڕوویان دەکردە رووگە (قیبلە) لە تەحیاتی یەکەمیشدا، لەسەر قاچی چەپی دادەنیشتو قاچی ڕاستی هەڵ دەنا، لەتەحیاتی دوا رکاتیشدا، پێی**

چەپی ڕادەخستو لەژێرخۆیەوە ڕەتی دەکردو، لەژێر پێی ڕاستیەوە نووکی قاچی چەپی دەردەکردو، قاچی ڕاستیشی هەڵ دەناو لەسەر لاڕانی چەپی دادەنیشت). {تاج/١، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥١٨ – ب/د/ت/ن}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، ناوی عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعدە، ئەنصارییە، خەڵکی مەدینەیە، مەنسووبە بۆلای (ساعدە)کە بابەگەورەی هۆزی خەزرەجە لەمەدینە، بەکەسناوەکەی ناسراوەو ناوی دەرکردووە، ئامادەی جەنگی ئوحودو مەڵبەندو شەڕگاکانی دوای ئوحود بووە، لە خزمەتی پێغەمبەردا لە دژی بێ باوەڕەکان، لەپێناوی ئیسلامدا، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: لەو صەحابانەیە کە گێڕانەوەیان لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمدا هەیە، لەکۆتایی جێنشینی موعاوییەدا فەوتی کردووە، (ڕەزای خودای لێ بێ).

٢٨٥– وَعَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى اَلصَّلَاةِ قَالَ: "وَجَّهْتُ وَجْهِي لِلَّذِي فَطَرَ اَلسَّمَوَاتِ " وَالأَرْضَ. إِلَى قَوْلِهِ: "مِنْ اَلْمُسْلِمِينَ ، اَللَّهُمَّ أَنْتَ اَلْمَلِكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ . . .} إِلَى آخِرِهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: أَنَّ ذَلِكَ فِي صَلَاةِ اَللَّيْلِ.

{پوختەی موسلیم ٢٧٨ = ١٨٠٩ مسلم تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا = مسلم محمد فؤاد: ٧٧١}:

دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە هەڵدەسا بۆ نوێژ، لەپێشا ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستنی دەکرد، ئینجا یەکسەر دەستی دەکرد بەنزای سەرەتای نوێژو دەیفەرموو:

«وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ وَاهْدِنِي لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدِي لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ».

بەدڵێکی پاكو بێگەردەوە، ڕوو دەکەمە ئەو خودایە کە ئەم ئاسمانانەو زەمینەی لەنەبوون دروست کردووە، من موسوڵمانێکی پاكو بێ خەوشمو بەهیچ جۆرێ لەدەستەی هاوبەشپەیداکەران نیم، بێگومان کەنوێژو ئادابی حەجو خواپەرستیمو ژیانمو مردنم، هەمووی هەر بۆ خودایەو بەس، کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، کە هیچ هاوبەشو هاوەڵو هاوڕێیەکی بۆ نییە، وە بەمە فەرمانم پێ کراوە، وەمن یەکێکم لە موسوڵمانانو یەکێکم لە فەرمانبەرانی خودا، ئەی خودایە! پادشای ڕاستو دروست هەرتۆی، لەتۆ بەولاوە خودای تر نییە، تۆ خودای منیت، منیش بەندەی تۆم، زۆرو ستەمم لەخۆم کردووەو، پێ لەتاوانی خۆم دەنێم، دەی تۆیش بەگەورەیی خۆتو بەمیهرەبانیو سۆزو مەرحەمەتی خۆت، لەهەموو تاوانەکانم خۆش بە.

پەروەردگاری من! فێری ڕەوشتی بەرزو خوی شیرینم بفەرموو، چونکە ئەوە هەر لەتۆ دەوەشێتەوە، وەلام بدە لە خوی خراپو لەڕەفتاری بەد، چونکە ئەوە هەر بەتۆ دەکرێ، من هەمیشە گوێ لەمشتی تۆمو ئامادەم بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی تۆ، خێروخۆشیو چاکە هەمووی بەدەستی تۆیە، شەڕ لەتۆ ناوەشێتەوە، من لەبنەڕەتدا بەتۆ بەندەمو لەسایەی تۆوە هەمو بەس، وەپشتو پەنام هەر تۆیو سەرەنجام هەر دیمەوە بەردەستی خۆت!).

بەڕاستی ئەی پەروەردگارم! تۆ خودایەکی بەفەڕو پیرۆزو گەورەو بەرزیت، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەمو پەشیمانمو تەوبە دەکەمو دەگەڕێمەوە بەکۆڵێ تاوانو پەشیمانییەوە بۆلای تۆ!). {تاج/١، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٤٩٤ چ/٤ = چاپی چوارەم} . دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا دەفەرموێ: (أَنَّ ذَلِكَ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ) واتە: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) ئەم نزای سەرەتای نوێژەی، لە شەونوێژدا دەخوێند.

(ڕوونکردنەوە):

بەپشتی خودای گەورەو سەروەر، لەم ژمارەیە بەدواوە سوود لەم نوسخەیەی (بلوغ المرام)یش وەردەگرم، کە حەدیثەکانی، هەندێ تەعلیقاتیان لەسەر نووسراوەو لەهەمان کاتا تەخریج کراون لەبەر کتێبەکانی:

١- العَلاّمة: محمد ناصرالدين الألبانى (رَحِمَهُ اللهُ).

٢- العَلاّمة: مقبل بن هادى الوادعى (رحمه الله).

٣- ومزيّلة بحاشية العلامة عبدالعزيز بن باز (على بلوغ المرام).

٤- وعليها تعليقات أصحاب الفضيلةِ.

الدكتوُر/ صالح الفوزان والشيخ/محمد حامد الفقى

اِعتنى بهَا مكتبُ عبدالرحمن

لێرەدا لەسەر ئەم گێڕانەوەی کە دەفەرموێ: (ئەمە لەشەونوێژدا بووە). ئیبنو باز (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەم گێڕانەوەیەم لەموسلیمدا نەدۆزییەوە، وادیارە کە تیادا نییە).

بەلاّم لەژمارە (١٨٠٥) هەتا ژمارە (١٨٠٨) نزای سەرەتای نوێژی شەونوێژی واتیادا.

٢٨٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا كَبَّرَ لِلصَّلَاةِ سَكَتَ هُنَيَّةً ، قَبْلَ أَنْ يَقْرَأَ ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: "أَقُولُ: اَللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ اَلْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اَللَّهُمَّ نقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى اَلثَّوْبُ اَلْأَبْيَضُ مِنْ اَلدَّنَسِ، اَللَّهُمَّ اِغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٠٥ = ٧٤٤ فتح الباری. مسلم شیحا ١٣٥٣. أبوداود ٧٨١. نسائی: ٦٠، ٨٩٤}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە تجریدو تاجدا:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، لەدوای ئەڵلاهوئەکبەری نوێژ دابەستن، لەپێش دەستکردن بەخوێندنی فاتیحە، ئێست (سکتة خفيفة: وێستانێکی کەم)ی دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەباوکم و بەدایکمەوە بەقوربانت بم، لەم ئێستەدا، بەنهێنی چی دەخوێنی؟

فەرمووی: دەڵێم: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَاىَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ، اللَّهُمَّ نَقِّنِى مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَاىَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِضض» واتە:

خودایە! لەگوناه دوورم بخەرەوە، وەك دووریی خۆرهەڵات لەخۆرئاوا، خودایە! لەگوناه پاکم بکەرەوە، وەك پارچەیێ بلووری سپی بێگەرد، خودایە! گوناهەکانم بەئاوو بە بەفرو بەتەرزە پاك پاك بشۆرەوە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٤٩٢ ج/٤}.

٢٨٧- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: {سُبْحَانَكَ اَللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اِسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهُ غَيْرُكَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ بِسَنَدٍ مُنْقَطِعٍ، وَالدَّارَقُطْنِيُّ مَوْصُولاً وَهُوَ مَوْقُوفٌ.

{مسلم شيحا. ٨٩٠ = ٣٩٩ مسلم. دار قطني ١/٣٠٠}:

عەبدەی کوڕی ئەبولبابە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابووە، لەپاش ئەللاهوئەکبەری نوێژ دابەستن، بەدەنگی بەرز، ئەم وشانەی دەفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ). واتە:

ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری پاك‌و پیرۆزم! پاکی‌و پیرۆزی‌و بێ نەنگی هەربۆ تۆیە، لەگەڵ سوپاس‌و ستایش، پیرۆزی‌و بەرەکەت‌و پیت‌و فەڕی ناوی تۆ لەهەموو گێتی دیارو ئاشکرایە، پایەو شان‌و شکۆی تۆ گەلێ بەرزو بڵندە، بێجگە لەتۆ کەخودای راست‌و دروستی، هیچ خودایەکی تر نییە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٤٩٥ چ/٤}:

(ڕوونکردنەوە):

١- بنباز (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بۆیە بە مونقەطیع دائەنرێ چونکە عەبدە فریای عومەر نەکەوتووە.

٢- بۆ تەقوییەی ئەم فەرموودەیە بڕوانە ژمارەی دوای خۆی کە ژمارە (٢٨٨)ە.

٢٨٨- وَنَحْوُهُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مَرْفُوعًا عِنْدَ اَلْخَمْسَةِ وَفِيهِ: وَكَانَ يَقُولُ بَعْدَ اَلتَّكْبِيرِ: {أَعُوذُ بِاَللَّهِ اَلسَّمِيعِ اَلْعَلِيمِ مِنَ اَلشَّيْطَانِ اَلرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ}.

{أبوداود رقم: ٧٧٥. ترمذی رقم: ٢٤٢. نسائی ٢/١٣٢. ابن ماجة رقم: ٨٠٤. أحمد ٣/٥٠. صحيح أبی داود/٧٠١}:

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، کەدانەر (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) ئاماژەی بۆ دەکا، لەتاجول ئوصول دا، (بەرگی یەکەم زنجیرە/٧٥ لاپەڕە/٢٤٩، ژمارە: ٤٩٥ چاپی چوارەم).

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) وابوو، بەشەو کە هەڵدەسا بۆ شەونوێژ، لەپێشدا بەگوتنی (اللهُ أَكْبَر) نوێژی دادەبەست، ئینجا نزای سەرەتای نوێژی دەخوێند، دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ). ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بیّ) دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ». واتە:

پەنا دەگرم بەو خودایە، کە ئاگای لەهەموو شتیّ هەیە، کە بیسەرو زانایە، وەخۆم دەهاومە پەنای ئەوزاتە ژنەواو دانایە، لەشەڕی شەیتانی بەشبڕاو لەسۆزو میهرەبانی خودا، لەخۆی، لەدەست لێوەشاندنی، لەپسەپسی شیعر گوتنی، لەفشەکردنی!).

٢٨٩- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْتَفْتِحُ اَلصَّلَاةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالْقِرَاءَةَ: بِـ(اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ) وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ، وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ. وَكَانَ إِذَا رَفَعَ مِنْ اَلرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا. وَإِذَا رَفَعَ مِنْ اَلسُّجُودِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا. وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ اَلتَّحِيَّةَ. وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ اَلْيُسْرَى وَيَنْصِبُ اَلْيُمْنَى. وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ اَلشَّيْطَانِ، وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ اَلرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ اِفْتِرَاشَ اَلسَّبُعِ. وَكَانَ يُخْتَمُ اَلصَّلَاةَ بِالتَّسْلِيمِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، وَلَهُ عِلَّةٌ.

{مسلم شيحا: ١١١٠ = پوختەی مسلیم ٢٧٣ = مسلم ٤٩٨}:

عائیشە (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: هەمیشە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) نوێژی بە ئەڵلاهوئەکبەر دادەبەست، وە قورئان خوێندنی

بەسوورەتی (الحمدلله ربِ العالمین) دەست پێ دەکرد، لەچەمینەوەشا، نەسەری قیتو ڕەپ دەگرتو نەملی شۆڕ دەکردەوە، بەڵام سەرو ملو پشتی خۆی ڕێك دەگرت، لەیەك ئاست وەك دووخ، وەهەمیشە کەسەری لەچەمینەوە هەڵدەبڕی، ڕێك ڕادەوەستایەوەو پشتی خۆی بەتەواوی ڕاست دەکردەوە، ئەوجا دادەنەوی بۆ کوڕنووش، وەهەروەها کەسەری بەرز دەکردەوە لە کوڕنووشی یەکەم، قنج دادەنیشت، ئەوسا کوڕنووشی دووەمی دەبرد، وەلەهەموو دوو رکاتێکیشدا، لەکۆتایی رکاتی دووەمدا تەحیاتی دەخوێند، هەمیشە دایش دەنیشت بۆ تەحیات خوێندنو بۆ وچانی نێوانی دوو کوڕنووش، پێی چەپی ڕادەخستو پێی ڕاستی هەڵ دەناو لەسەر ئەو شێوەیە لەسەریان دادەنیشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری (نەهی) دەکرد لەقنگەڵتس لەتەحیاتا، کە ئەوەیە لەسەر قنگ چیچکە بکاو هەردوو دەستی لەسەر زەوی دابنێ، وەك سەگ گەڵ جار وادەکا، وەهەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەڕاخستنی باڵ لەسەر زەوی لەناو کوڕنووشا، لەچەشنی ڕاکشانی درندە لەسەردەم، وە بەردەوام کۆتایی بەنوێژ دەهێنا بەسڵاودانەوە بەلای ڕاستو بەلای چەپدا).

{تاج/١، زنجیرە: ٨٩ لاپەڕە/٢٨٢ ج/١، ژمارە: ٥٤٧ چاپی چوارەم} .

(ڕوونکردنەوە):

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: موسلیم گێڕاویەتەوە بەڵام بێ مەڵامەت (عیللەت) نییە، کە ئەوەیە ئەبولجەوزاء کە لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە عائیشەی نەدیوە، موسلیم لە ئەوزاعیشەوە بەموکاتەبە گێڕاویەتەوە، جا هەم نەبیستنو هەم موکاتەبە، دادەنرێن بە مەڵامەتو عیللەت بۆ فەرمووده.

٢٩٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إِذَا اِفْتَتَحَ اَلصَّلَاةَ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ اَلرُّكُوعِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٤٠٢ = ٧٣٥، ٧٣٦، ٧٣٨، ٧٣٩. پوختەی موسليم ٢٧٢ = موسليم شيحا ٨٦٠ = مسلم ٣٩٠}:

دەقی ئەم فەرموودەيە لە پوختەی موسليما:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رەزای خودايان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەويست (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ دابەستن، لەپێشا بەرەو رووگە ڕادەوەستاو، ئەوجا هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە، هەتا پشتی هەردوو دەستی ڕێك دەگەيشتە بەرابەر هەردوو شانیو، سەرپەنجەكانی دەگەيشتنە ئاستی نەرمەی گوێكانی، ئاوا لەسەر ئەو شێوەيە رووی هەردوو لەپەكانی بەرەو رووگە بوو، ئەوجا بە ئەڵڵاهوئەكبەر نوێژی دادەبەست. وەكاتێ دەيويست كەبچێت بۆ چەمينەوە ديسان بەو چەشنە دەستەكانی بەرز دەكردنەوەو ئەڵڵاهوئەكبەری دەكردو، دەچەمايەوە، كاتێ لەچەمينەوە هەڵدەسايەوە، دەيفەرموو: (سَمِعَ اللّه لِمَنْ حَمِدَهُ) ديسان لەم كاتەيشدا، هەردوو دەستی بەهەمان چەشن بەرزدەكردەوە، هەتا ئاستی هەردوو سەرشانەكانی، ئەوجا دەيفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ). بەڵام كاتێ كوڕنووشی دەبردو كاتێ سەری لەكوڕنووش هەڵدەبڕی ئەڵڵاهوئەكبەری دەكرد، بەڵام دەستی بەرز نەدەكردەوە. {تاج/١ لاپەڕە ٢٥٥، زنجيرە: ٧٣، چاپی يەكەم، ژمارە: ٤٨٦ چاپی چوارەم — ش/د/ت/ن}.

٢٩١- وَفِي حَدِيثِ أَبِي حُمَيْدٍ، عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ: {يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يُكَبِّرَ}.

{صحيح أبى داود: ٦٧٠}:

فەرموودەکەی ئەبو حومەیدە لەژمارە (٢٨٤)دا ڕۆیشت، بەڵام ئەوەی کەلەوێ ڕۆیشت لەفظو ریوایەتی بوخاری بوو بۆ ئەم فەرموودەیە، بەڵام دەستبەرزکردنەوەی بەس لەکاتی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستندا تیادا بوو، بەڵام لەگێڕانەوەی ئەبوداوودا بۆ ئەم فەرموودەیە، ئەبو حومەید وەك ئیبنو عومەر دەفەرموێ: (... پێغەمبەر لەسێ شوێنا دەستی بەرز دەکردەوە... هەرسێ شوێنەکە لە فەرموودەی ژمارە (٢٩٠)دا نووسراون).

مەبەستی دانەر لەم فەرموودەیە ئەمە بوو کەعەرزکرا، گەچی وەك (سُبُلُ السَّلاَمِ) دەفەرموێ: (عیبارەتی دانەر بۆنی پێچەوانەی مەبەستی لێ دێ، چونکە مەبەست ئەوەیە کە لەگێڕانەوەی ئەبوداوودا بۆ فەرموودەکەی ئەبو حومەید، دەست بەرزکردنەوە لەسێ شوێندا هەیە، وەك فەرموودەکەی ئیبنو عومەر، بەڵام عیبارەتی دانەر لێرەدا بۆنی ئەوەی لێ دێ کە ئەبو حومەید بەس لەکاتی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستندا دەستی هەڵبڕیوە! ئەوەیش وانییە).

٢٩٢- وَلِمُسْلِمٍ عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) نَحْوُ حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ، وَلَكِنْ قَالَ: {حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ}.

{مسلم شيحا ٨٦٤ = مسلم ٣٩١}:

ئەمە ئەم فەرموودەیە لە موسلیمدا:

مالیکی کوڕی حووەیریث (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی کاتێ نوێژی دائەبەست... تا دوایی ڕێك وەك فەرموودەکەی ئیبنو عومەر کە لەژمارە (٢٩٠)دن ڕۆیشت.

(ڕوونکردنەوە):

١- جیاوازی فەرموودەکەی مالیکی کوڕی حووەیریث لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ئەوەیە: (فەرموودەکەی ئیبنو عومەر دەفەرموێ: پێغەمبەر

لەم سێ کاتەدا دەستەکانی تا ئاستی سەرشانەکانی هەڵدەبڕی، بەلام فەرموودەکەی مالیك دەڵێ: پێغەمبەر لەم سێ کاتەدا دەستەکانی تا ئاستی هەردوو سەرشانی هەڵدەبڕین و سەرپەنجەکانی دەگەیشتنە ئاستی نەرمەی گوێکانی).

٢- بەلام من زیادەی گێڕانەوەی مالیکم، لەگەڵ گێڕانەوەکەی ئیبنو عومەردا نووسیوە، بۆ راڤەو ئاسانکاری و دەرخستنی بڕیاری شەرعی و کردەیی.

٢٩٣- وَعَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّيْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَوَضَعَ يَدَهُ اَلْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ اَلْيُسْرَى عَلَى صَدْرِهِ} أَخْرَجَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{صحيح الألباني نحوه، صحيح أبي داود: ٦٨٧. ابن خزيمة: ٤٧٩}:

وائیلی کوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە نوێژم کردووە، دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی لەسەر سینگی، لەکاتی ڕاوەستانا دادەنا). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٤٨٧، ٤٨٨، ٤٨٩، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە، بۆ بەهرەی پتر دەینووسین:

وائیلی کوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، کەنوێژی دادەبەست، هەردوو دەستەکانی خۆی، هەتا ئاستی هەردوو نەرمەی گوێکانی بەرز دەکردنەوەو ئەوجا بەوشەی (الله اکبر) نوێژی دادەبست ئەوجا جلەکانی دەپێچا بەخۆیەوە، ئەوجا لەسەر سینگی دەستی دەگرت و دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی خۆی دادەنا، وەکاتێ دەیویست کەچەمینەوە ئەنجام بدات، ددەستەکانی خۆی لەجلەکانی دەردەهێناو ئەوسا بەرزی دەکردنەوەو ئەوجا ئەڵلاهوئەکبەری دەکردو رووکووعی دەبرد،

کاتێکیش لەچەمینەوە بەرز دەبۆوە، دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّٰه لِمَنْ حَمِدَهُ) وەهەردوو دەستی بەرزدەکردەوە، کە کوڕنووشیشی دەبرد، هەردوو لەپەکانی لەسەر زەوی دادەنان و ئەوجا لەنێوانیانا کوڕنووشی دەبرد لەسەر جێگەی نوێژەکەی).

(ڕوونکردنەوە):

وائیلی کوڕی حوجر هاوەڵێکی مەزنی پێغەمبەرە، لە قەبیلەکانی حەچرەمەوتە، کەوڵاتێکە دەکەوێتە باشووری دوورگەی عەرەبەوە، لەنێوانی سعودییەو یەمەن و عەدەن و دەریای عوماندایە، قەیل بەشایەك دەگوترێ کەپایەی لەخوار پایەی شاهەنشاوە بێ، هەروا حوجری باوکی لەپاشایانی حەزرەموت بووە، وائیل بەخواستی خۆی هات بۆ مەدینەو موسوڵمان بوو، دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەی موعجیزە، موژدەی ئەمەی لەپێشدا دابەهاوەڵەکانی و پێی فەرموون: (وا وائیلی کوڕی حوجر، لە حەضرە مەوتەوە، لەو وڵاتە دوورەوە دێ بۆلاتان، بەخۆشی خۆی دێ، کەس بەزۆر نەیهێناوە، بەڵکوو لەبەر ئەوە دێ چونکە حەزی لەدۆستایەتی خوداو پێغەمبەری خودایە).

جاکاتێ وائیل گەیشتەجێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشوازییەکی گەرمی لێ کردو نزیکی کردەوە لەخۆی و عاباکەی خۆی بۆ ڕاخست و خۆی و ئەو دووبەدوو لەسەری دانیشتن و وائیلی لەجێگەی دانیشتنی خۆیدا دانیشاندو فەرمووی: (خودایە! وائیل و نەوەی وائیل پیرۆزو فەڕدار بفەرموو).

ئەوجا کردی بەکارگێڕی خۆی لەسەر قەیلەکانی وڵاتی حەزرەمەوت، وەموعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەگەڵا ناردەوە بۆ وڵاتی خۆی، موعاوییە لەڕێ پیادە بوو، بەڵام وائیل بەسواری وشترە مێیەکی خۆی بوو، موعاوییە لەڕێ سکاڵای حاڵی خۆی لەلای وائیل کردو پێی گوت: گەرمای چەوو لی

ڕێگەکە زۆر بۆم هێناوە. وائیلیش پێی گوت: لەسێبەری وشترەکەی ژێر منەوە بڕۆ، سێبەرەکە بکە بەپێڵاو بۆخۆت، موعاوییە گوتی: ئەوە دادم نادات، بریا لەپاشکۆی خۆتەوە جێت دەکردمەوە، وائیل پێی گوت: دە وسبە، لەکوێ تۆ شایانی ئەوەیت کە ببیت بەپاشکۆی پاشایان!

وائیل ما، هەتا موعاوییە بووبەجێنشین، وائیل چوو بۆلای، موعاوییە ناسییەوەو بەخێرهاتنێکی شایانی لێ کردو ئەمەی وەبیر هێنایەوەو ویستی خەلاتی پێ بدا، وەری نەگرت، گوتی: من داراو دەوڵەمەنم، بیدە بەکەسێ کەکاری پێی هەبێ، بەلام گوتی: خۆزگەم کاتی خۆی لەبەردەم خۆمەوە سوارم دەکردیو ڕێزی شایانم دەگرتی.

وائیل لەئەفرادی صەحیحی موسلیمە، لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەی نییە.

٢٩٤- وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِأُمِّ اَلْقُرْآنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١ - ٤١١ = ٧٥٦ فتح البارى شرح صحيح البخارى. مسلم شيحا ٨٧٢ = مسلم ٣٩٤}:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەنوێژدا، لەهەموو ڕکاتێکا، سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نییە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧١}.

(ڕوونکردنەوە):

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، خەزرەجییە، ئەنصارەکان کە خەڵکی مەدینە بوون، زۆربەیان لەهۆزی خەزرەجو لەهۆزی ئەوس بوون، عوبادە ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەکەمو دووەم بووە، هەروا ئامادەی غەزای بەدرو جەنگی ئوحوددو پەیمانی خۆشنوودی (بەیعەتی

ریزوان)و هەموو شەڕگاکانی تری پێغەمبەر بووە، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا، (دروودی خودای لەسەر بێ).

عوبادە لە پێغەمبەرەوە هەشتاو یەك فەرموودەی گێڕاوەتەوە، شەشیان پەسەندی هەردوو پیرن، (واتە: متفق علیه)ین، دوانیان لە بوخاریدا هەیە، بەڵام لە موسلیمدا نییە، دوانیشیان لەموسلیمدا هەیە، لەبوخاریدا نییە، یەکەم کەس بووە کەبووە بەقازی فەلەستین، پیاوێکی کەڵەگەتی قەویلەی قۆزی بەهرەمەند بووە، ساڵی (٣٤)ی کۆچی مردووە، گۆڕەکەی وا لەبەیتولمەقدیس، جێگەی زانراوە. لەئیستیعابا دەفەرموێ: لە فەلەستین مردووە، لە بەیتولمەقدیس نێژراوە. وەهەتا ئێستا گۆڕەکەی ناسراوە، ساڵی (٣٤) سیی‌و چواری کۆچی، لەتەمەنی (٧٢) حەفتاو دوو ساڵیدا مردووە. یەکێ بووە لەو کەسانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانیان لەبەر بووە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری بەرگی یەکەم ژمارە/١٨ لاپەڕە — ٣٧ چاپی یەکەم}.

٢٩٥- وَفِي رِوَايَةٍ، لِابْنِ حِبَّانَ وَاَلدَّارَقُطْنِيِّ: {لَا تَجْزِي صَلَاةٌ لَا يُقْرَأُ فِيهَا بِفَاتِحَةِ اَلْكِتَابِ}.

{ذكرة الألباني مستدلاًّ بِهِ صفةَ الصَّلاَةِ: ٩٧. ابن حبان رقم: ١٧٨٩. دار قطني ٣٢١/١}:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر نوێژێ سوورەتی فاتیحەی تیادا نەخوێندرێ بری هیچ ناکەوێ‌و دانامەزرێ).

٢٩٦- وَفِي أُخْرَى، لِأَحْمَدَ وَأَبِي دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيِّ، وَابْنِ حِبَّانَ: {لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ؟ " قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: "لَا تَفْعَلُوا إِلَّا بِفَاتِحَةِ اَلْكِتَابِ، فَإِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا}.

{ضعيف الجامع/٤٦٨١. الصحيح المسند: ١٤٧٧. أحمد رقم: ١٨٠٩٥. أبوداود رقم: ٨٢٣. ترمذي ٣١١. ابن حبان ١٧٩٢}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ دەکردین، قورئان خوێندنەکەی لێ شێواو، بەگران بۆی خوێندرا، جا کاتێ لەنوێژەکە لێ بووەوە، فەرمووی: (ڕەنگە ئێوەیش لەنوێژدا وەك پێشنوێژ خوێن قورئان بخوێنن؟) گوتیان: بەڵێ، ئەی پیغەمبەری خودا! ئێمەیش دەیخوێنین. فەرمووی: (بەس سوورەتی فاتیحە بخوێنن. چونکە ئەوەی لەنوێژدا ئەم سوورەتە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نییە). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٣}.

٢٩٧- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانُوا يَفْتَتِحُونَ اَلصَّلَاةَ بِـ(اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٤٠٤ = ٧٤٣ فتح البارى شرح صحيح البخارى. پوختەی موسليم ٢٧٩ = ٨٨٨ مسلم شيحا = ٣٩٩ مسلم}:

له تجريدا ئاوایە: ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) بەخوێندنی سوورەتی (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ) دەستیان دەکرد بەنوێژ.

لەپوختەی موسلیمیشا ئاوایە:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپشتی پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەرو عوسمانەوە، نوێژی زۆرم بەجەماعەت (بەکۆمەڵ) کردووە، لێم نەبیستوون کە لەپێش سوورەتی فاتیحاوە (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ) بخوێنن. {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٧}.

٢٩٨- زَادَ مُسْلِمٌ: {لَا يَذْكُرُونَ: (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ ) فِي أَوَّلِ قِرَاءَةٍ وَلَا فِي آخِرِهَا}.

{مسلم شيحا ٨٩٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نوێژی زۆرم بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەرو عوسمانەوە کردووە، دەستووریان وابوو: بەئایەتی (اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ) دەستیان بەخوێندنی قورئان دەکرد، نە لەسەرەتای قورئان خوێندنەوە نە لەکۆتاییەوە (بِسْمِ اَللّٰهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيم)یان نەدەکرد.

٢٩٩- وَفِي رِوَايَةٍ لِأَحْمَدَ ، وَالنَّسَائِيِّ وَابْنِ خُزَيْمَةَ : {لَا يَجْهَرُونَ بِبِسْمِ اَللّٰهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ} .

{صحيح النسائى ٩٠٧. أحمد ١٧٩/٣. نسائى ٣١٥/٢. أبن خزيمة رقم: ٤٩٥}:

لەگێڕانەوەیەکی ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو خوزەیمەدا ئەنەس دەفەرموێ: نوێژی زۆرم بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەرەوە کردووە، دەستووریان وابوو بەدەنگی بەرز (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم)یان نەدەخوێند.

٣٠٠- وَفِي أُخْرَى لِابْنِ خُزَيْمَةَ: {كَانُوا يُسِرُّونَ} . وَعَلَى هَذَا يُحْمَلُ اَلنَّفْيُ فِي رِوَايَةِ مُسْلِمٍ، خِلَافًا لِمَنْ أَعَلَّهَا.

{ابن خزيمة ٤٩٨}:

لەگێڕانەوەیەکی تری ئیبنو خوزەیمەدا: ئەنەس فەرمووی: نوێژی زۆرم بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەرەوە کردووە، دەستووریان وابوو، لەسەرەتای سوورەتی فاتیحەوەو لەسەرەتای قورئان خوێندنەوە، بەنهێنی (بِسْمِ اَللّٰهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيم)یان دەخوێند.

**(ڕوونكردنەوە):**

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەپێی دەقی ئەم گێڕانەوەی ژمارە (٣٠٠) سێ سەدە، کە ئیبنو خووزەیمە لەئیمامی ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەر، لەسەرەتای قورئان خوێندنەکەیانەوە لەنوێژدا، بەنهێنی بیسمیلایان خوێندووە، نەك بەئاشکراو بەدەنگی بەرز، کەوابوو ئەو زیادەیەی کە لەگێڕانەوەی ژمارە (٢٩٨)دا هەیە، کە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتەوە، کە قسە لەوە دەکا کە ئەم سێ زاتە، لەسەرەتای قورئان خوێندنەوە، یان لەسەرەتای فاتیحەوە، بیسمیلایان نەکردووە، دەبێ ئەم زیادەیە حەمل بکرێتەوە سەر گێڕانەوەی ئیبنو خوزەیمەیەو لەگەڵ ئەمدا بسازێنرێ‌و بگوترێ: ئەم سێ زاتە بەئاشکرا بیسمیلایان نەکردووە، بەڵام بەنهێنی کردوویانە، بە بەڵگەی گێڕانەوەی ئیبنو خوزەیمە بۆ ئەم فەرموودەیە، جا ئەم حەمل کردنە باشترە لەوەی کەهەندێ کەس گێڕانەوەکەی موسلیم ڕەتدەکەنەوە بەبیانووی ئەوەوە: کە بێ مەلامەت نییەو عیللەتێکی هەیە، کە ئەوەیە (کە ئەم زیادەی موسلیمە، ئەوزاعی بەمکاتبە لەقەتادەوە دەیگێڕێتەوە، مکاتبەش عیللەتە). چونکە ئەم زیادەی موسلیمە هەر ئەوزاعی نەیگێڕاوەتەوە، بەڵکوو کەسانی تریش بەشێوەیەکی ڕاست‌و دروست گێڕاویانەتەوە.

٢- دوو ڕای جیاواز هەیە، کە بیسمیلا لەسەرەتای فاتیحەوە بخوێندرێ، یانا؟ ئەگەر بخوێندرێ هەموو کاتێ بەنهێنی‌و پەنامەکی بخوێندرێ، یا لەگەڵ پەنامەکیدا بەپەنامەکی بخوێندرێ‌و لەگەڵ ئاشکرادا بەئاشکرا بخوێندرێ؟!

ئەمە وەڵامێکی دوورو درێژی هەیە، بەڵام بەڕای دانە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) (بیسمیلا دەخوێندرێ، لەگەڵ نهێنیدا بەنهێنی‌و لەگەڵ ئاشکرادا بە ئاشکرا).

٣٠١- وَعَنْ نُعَيْمٍ اَلْمُجَمِّرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّيْتُ وَرَاءَ أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَرَأَ: (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ). ثُمَّ قَرَأَ بِأُمِّ اَلْقُرْآنِ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ: (وَلَا اَلضَّالِّينَ)، قَالَ: "آمِينَ" وَيَقُولُ كُلَّمَا سَجَدَ، وَإِذَا قَامَ مِنْ اَلْجُلُوسِ: اَللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: وَاَلَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ وَابْنُ خُزَيْمَةَ.

{ضعيف النسائي: ٩٠٥. نسائي ٢/١٣٤. ابن خزيمة ٤٩٩}:

نوعەیمی ئەلوجمیر فەرمووی: لەپشتی ئەبو هورەیرەوە بەجەماعەت نوێژم کرد، نوێژەکەی نوێژی جەهری بوو، بەدەنگی بەرز ئەبو هورەیرە فاتیحەو قورئانی خوێند، لەسەرەتاوە بەئاشکرا، بەدەنگی بەرز (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ)ی خوێند، ئەوجا یەکسەر بەشوێنی بیسمیلادا، سوورەتی فاتیحەی خوێند، کەپێشی دەگوترێ (ئوممولقورئان) هەتا گەیشتە کۆتایی (وَلاَ الضَّالِينَ) ئەوجا بەدەنگی بەرز فەرمووی: (آمین: خودایە ئەم نزاو پارانەوەمان گیرابکەو لێمان قەبووڵ بفەرموو).

لەم کاتانەدا، بەدەنگی بیستراو دەیگوت (أَللّهُ أَكْبَرُ):

١- هەموو جارێ کە کوڕنووشی دەبرد، دەیگوت (أَللّهُ أَكْبَرُ).

٢- کە لەتەحیاتی یەکەم هەڵدەستایەوە دەیگوت: (أَللّهُ أَكْبَرُ).

٣- کە لە کوڕنووشی یەکەم هەڵدەستایەوە دەیگوت: (أَللّهُ أَكْبَرُ).

٤- کە لە کوڕنووشی دووەم هەڵدەستایەوە دەیگوت: (أَللّهُ أَكْبَرُ).

کاتێکیش ئەبو هورەیرە سڵاوی دایەوە فەرمووی: (سوێندم بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە، دیارە کەخودای گەورەو سەروەرە، نوێژی من لەهی هەمووتان زیاتر لەنوێژی پێغەمبەر خۆی دەچێ).

٣٠٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا قَرَأْتُمْ اَلْفَاتِحَةِ فَاقْرَءُوا: (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، فَإِنَّهَا إِحْدَى آيَاتِهَا} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَوَّبَ وَقْفَهُ.

{صحيح الجامع: ٧٢٩. دارقطنى ٣١٢/١}:

ئـەبو هـورەیره (رەزای خـودای لیّ بـیّ) فـەرمووی: پیّغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـیّ) فـەرمووی: (کاتـیّ سـوورەتی فاتیحـە دەخـویّنن، لەسـەرەتایەوە (بِسْمِ اَللَّهِ اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيم)ی بخویّنن، چونکە بیـسمیلا یەکیّکە لەئایەتەکانی سوورەتی فاتیحە).

دارە قـوطنی (رەحمـەتی خـودای لیّ بـیّ) گیّڕاویەتـەوە، بـەلاّم ئـەوەی بەڕاستو دروست داناوە، کە ئەم فەرموودەیە موقوفە لەسەر ئـەبو هـورەیرەو ئەمە قسەی ئەبو هورەیرەیەو مەرفووع نییە بۆ سەر پیّغەمبەرو فەرمایشتی ئەو نییە، لەحالّەتی وەقفەکەدا فەرموودەکە ئاوای لیّ دیّ:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: کاتـیّ سوورەتی فاتیحـە دەخویّنن... تاکۆتایی فەرموودەکە).

٣٠٣- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ أُمِّ اَلْقُرْآنِ رَفَعَ صَوْتَهُ وَقَالَ: "آمِينَ"}. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَالْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ.

{السلسلة الصحيحة ٤٦٤. دار قطنى ٣٣٥/١. حاكم المستدرك ٢٢٣/١ - ٣٤٥/١. وقال: صحيح على شرط الشيخين}:

دیـسان ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لیّ بـیّ) فـەرمووی: دەسـتووری پیّغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـیّ) وابـوو، کاتـیّ لەخویّنـدنی سـوورەتی فاتیحە لەنویّژدا دەبۆوە، دەنگی هەڵدەبڕیو بەدەنگی بەرز دەیفـەرموو (آمین: قەبووڵ بیّت) . دارە قوطنی دەفەرمویّ: حەسەنە، حاکم دەفەرمویّ: صحیحە.

٣٠٤- وَلِأَبِي دَاوُدَ وَاَلتِّرْمِذِيِّ مِنْ حَدِيثِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ نَحْوُهُ.

{صحيح أبى داود: ٨٢٤، الصحيح المسند: ١١٨٨. أبوداود رقم ٩٣٢. ترمذى رقم: ٢٤٨}:

**ئەمەیش ئەو فەرموودەیە کەدانەر لەم ژمارەیەدا ئاماژەی بۆ دەکا: وائیلی کوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ بەجەماعەت لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژم کرد، کاتێ فەرمووی: (وَلاَ الضَّالِينَ) بەدوایدافە (ئامیین) ئامینەکەی درێژکردەوە.**

٣٠٥- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَالَ: إِنِّي لَا أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ مِنْ اَلْقُرْآنِ شَيْئًا، فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِئُنِيّ مِنْهُ. قَالَ: قُلْ: "سُبْحَانَ اَللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَاَللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ اَلْعَلِيِّ اَلْعَظِيمِ . . .} اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَالْحَاكِمُ.

{حسن، صحيح أبى داود: ٧٤٢. أحمد (٣٥٣/٤) أبوداود رقم: ٨٣٢. نسائى (١٤٣/٢) ابن حبان رقم: ١٨٠٨ الاحسان. دار قطنى (٣١٣/١) حاكم فى المستدرك ٣٦٧/١}:

**عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێستاکە بەم دەستوبردە ناتوانم هیچ قورئان لەبەر بکەم، کەوابوو شتێکم فێربکە کە لەباتی قورئان لەنوێژدا بیخوێنم، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) بڵێ: «سُبْحَانَ اَللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَاَللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ اَلْعَلِيِّ اَلْعَظِيمِ».**

**پاکیو بێگەردیو سوپاسو ستایش هەر بۆ خودایە، خودای گەورە نەبێ خودای تر نییە، هێزو توانایی هەر بەدەستی خودای بڵندو گەورەیەو بەس. ئەمەیش تەواوی فەرموودەکەیە، کەدانەر ئاماژەی بۆ دەکا جا پیاوەکە گوتی:**

ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە یادو زیکری خودایەو بۆ ئەوە، ئەی چی بۆ منە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): بڵێ: «اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي وَعَافِنِي وَاهْدِنِي».

ئەی خودایە! بەزەییت بێتەوە پێماو رۆژیم بدەو ئاسوودەو بێوەیم کەو شارەزای رێگەی راستم بفەرموو.

جا پیاوەکە کەهەڵسا بروا وشە وشە بەپەنجەکانی هەر دوو دەستی، دەیژماردن، هەر وشەیەکی دەگوتو پەنجەیەکی خۆی دەنووقاندو دەیگوت ئەمە یەكو ئەمە دوو... تاد.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ: ئەم پیاوە هەردوو دەستی خۆی پڕکرد لەخێروخۆشی) {تاج/١، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥٧٠}.

(روونکردنەوە):

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودای لێ بێ) خۆیو باوکی، لەهاوەڵو یارانی پێغەمبەر بوون، ئەبو ئەوفا ناوی عەلقەمەی کوڕی خالیدە، لە عەبدوڵڵاوە نەوەدو پێنج فەرموودە گێڕانەوە کراوە، بووخاری یازدە فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەبو ئەوفا، یەکێك بوو لەو کۆمەڵە هاوەڵانە، کە لەرۆژەکەی حودەیبییەدا، لەبن دار سەموورەکەدا، پەیمانی خۆشنوودیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، کەناوداره بە (بەیعەتی ریزوان). چونکە ئەنجامەکەی ئەوەبوو، خودا لە بەشدارانی ئەم پەیمانە رازی بوو، کەژمارەیان دەوروبەری (١٣٠٠) هەوارو سێ سەد کەس بوو، بەپێی دەقی ئەم ئایەتەی سوورەتی فتح، کە دەفەرموێ: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا – الفتح/٤٨/١٨}. واتە:

لەڕاستیدا خودا لەو کۆمەڵە موسوڵمانە خاوەن باوەڕانە رازییەو خۆشنوودە لێیان کەوا لەبن درەختەکەدا، لەرۆژی حودەیبییەدا پەیمانیان بەتۆدا، کەتا دوا دڵۆپ خوێن، لەپێناوی سەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، خەبات بگێڕنو بەرگری لەتۆو لە ئایینی تۆ بکەن، خودا دەیزانی کە چی نیاز پاکیو دڵسۆزییەك بەرابەر بەتۆو بەرابەر بەئایینی تۆ لەناو دڵیانا هەیە، جا لەبەر ئەوە ئارامیو دڵنیایی داباران بەسەریاناو، سەرکەوتنێکی گەورەو نزیکی رەخساند بۆیان، کە رزگارکردنی قەڵای خەیبەر بوو، یا ئازادکردنی شاری مەککە بوو.

عەبدوڵڵا یەکێکە لەو حەوت سەحابەیە، کەپێشەوا ئیمامی ئەبو حەنیفە (رەزای خودای لێ بێ) بەخزمەتیان گەیشتووە، کە یەکێکی تریان ئەنەسی کوڕی مالیکە، ئەوکاتە کە ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەخزمەت عەبدوڵڵا دەگا، ساڵی هەشتای کۆچی بووە، ئەبو حەنیفە حەوت ساڵان بووە، کە تەمەنی فامینو لەشت تێگەیشتنە، کەواتە: ئەبو حەنیفە تابیعییە، بەپێی فەرموودەی ساغی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباشیو چاکیدا، لەپلەی دووەمی چاکانی نەتەوەی ئیسلامدایە، وەك دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): «خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ – تاج/٣ لاپەڕە: ٥٣١، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١ – ش/د/ت».

عەبدوڵڵا ئامادەی حودەیبییەو خەیبەرو مەڵبەندو شەڕگەکانی تری دوا ئەوانیش بووە، خۆیو باوکی لەدەستەی بەیعەتی ریزوانن، عەبدوڵڵا هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، لەمەدینە، لەخزمەتیدا بوو، لەپاشا باری کرد بۆ کووفە، لەکۆتایی تەمەنیدا نابینا بوو، عەبدوڵڵا دەیفەرموو: (شەش غەزام لەخزمەتی پێغەمبەردا کردووە، لەو غەززایانەدا لەبرسانا کوللەمان دەخوارد، لەهەشتاو حەوت، یان لە هەشتاو شەشی کۆچی لەکووفە مردووە، دوا هاوەڵی پێغەمبەر بووە کە لە کووفە

مـردووه، ئـهم زاتانــه فـهرموودهيان لـهوهوه گێڕاوهتــهوه: ئـهبو ئيـسحاقی شهيبانیو سهلهمهی كوڕی كههيل (رهزاو رهحمهتی خودايان لێ بێ).

٣٠٦- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي بِنَا، فَيَقْرَأُ فِي اَلظُّهْرِ وَالْعَصْرِ - فِي اَلرَّكْعَتَيْنِ اَلْأُولَيَيْنِ - بِفَاتِحَـةِ اَلْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَيُسْمِعُنَا اَلْآيَةَ أَحْيَانًا، وَيُطَوِّلُ اَلرَّكْعَةَ اَلْأُولَى، وَيَقْرَأُ فِي اَلْـأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ اَلْكِتَابِ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٤١٣ = ٧٥٩، ٧٦٢، ٧٧٦، ٧٧٨، ٧٧٩ فتح البارى. پوختەى موسليم ٢٨٦ = ١٠١٣ مسلم شيحا = ٤٥١ مسلم}:

ئهمه دهقهكهيهتی له پوختهی موسليما:

ئــهبو قــهتاده (رهزای خــودای لێ بــێ) فــهرمووی: پێغهمبــهر (دروودی خودای لهسهر بێ) كه بهرنوێـژيی بۆمـان دهكـرد، دهسـتووری وابـوو، لـهركاتی يهكهمی نوێژی نێوهڕۆو لهركاتی يهكهمی نوێژی عهصـردا، لهپێـشا سوورهتی فاتيحـای دهخوێنـد، ئـهوجا لـهپاش فاتيحـاوه سـوورهتێكی دهخوێنـد، هـهروا لهركاتی دووهمی نوێژی نيـوهڕۆو لـهركاتی دووهمـی نوێـژی عهصـردا، لهپێـشا فاتيحـای دهخوێنــد، ئهوسـا سـوورهتێ. ئــهو سـوورهتهی لــهركاتی يهكــهما دهيخوێنـد درێـژتر بـوو لـهو سـوورهتهی كـه لـهركاتی دووهمـدا دهيخوێنـد، جارجارهيش دهنگی ئهوهنده بهرزدهكردهوه كه ئايهتهكه دهبيسترا.

بهڵام لهم دوو نوێژهدا، لهركاتی سێيهمو چوارهمدا، تـهنها فاتيحـهی تيـا دهخوێندن). {تاج/١، زنجيره: ٧٨، ژماره: ٥٠٢} .

لهپوختهی بوخاریو تاجدا ئهم پترييهی ههيه:

لــهركاتی يهكــهمی نوێــژی بهيانيــشا، ســوورهتی درێــژتری دهخوێنــد لهسوورهتی ركاتی دووهمی).

٣٠٧- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: {كُنَّـا نَحْـزُرُ قِيَـامَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، فَحَزَرْنَا قِيَامَـهُ فِـي اَلـرَّكْعَتَيْنِ

اَلْأُولَيَيْنِ مِنْ اَلظُّهْرِ قَدْرَ: (الم تَنْزِيلُ) اَلسَّجْدَةِ. وَفِي اَلْأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ اَلنِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ. وَفِي اَلْأُولَيَيْنِ مِنْ اَلْعَصْرِ عَلَى قَدْرِ اَلْأُخْرَيَيْنِ مِنْ اَلظُّهْرِ، وَالْأُخْرَيَيْنِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٢٨٧ = ١٠١٤ مسلم شيحا = ٤٥٢ مسلم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، قورئان خوێندنی پێغەمبەرمان دەقەبلاند، کە لەپاش فاتیحە، لەنوێژی نیوەڕۆو لەنوێژی عەصردا دەیخوێند، وامان خەملاند کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش سوورەتی فاتیحە، لەرکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا، بە ئەندازەی سوورەتی: (الم، تنزیل) السَّجْدَةی دەخوێند، هەروا لەپاش فاتیحە، لەرکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆدا، دیسان بە ئەندازەی سوورەتی (الم، تنزیل) السجدةی دەخوێند، بەلام لەرکاتی سێیەمو چوارەمی نوێژی نیوەڕۆدا، لەپاش خوێندنی فاتیحە تیایاندا، بەقەد نیوەی ئەوەی دەخوێند، کە لەپاش فاتیحە، لەرکاتی یەکەمو دووەمدا دەیخوێند.

بەلام لەرکاتی یەکەمو دووەمی نوێژی عەصردا، لەپاش خوێندنی فاتیحە تیایاندا، بەقەد ئەوەی دەخوێند، کەوا لە رکاتی سێیەمو چوارەمی نیوەڕۆدا دەیخوێند، بەلام لەرکاتی سێیەمو چوارەمی عەصردا، لەپاش خوێندنی فاتیحە تیایاندا، بەئەندازەی نیوەی ئەوەی دەخوێند، کە لەرکاتی یەکەمو دووەمی عەصردا، لەپاش خوێندنی فاتیحە تیایاندا دەیخوێند.

(ڕوونکردنەوە):

ئەمە پوختەی مەبەست لەم فەرموودەیە، کە هەم دەقە عەرەبییەکەی و هەم وەرگەڕاوە کوردییەکەی ئاڵۆزە:

**١- لەرکاتی یەکەمی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحەی دەخوێنند، لەپاش ئەو بەقەد سوورەتی (الم سجدة)ی دەخوێنند.**

**٢- لەرکاتی دووەمی نیوەڕۆدا، هەروەها، بەبێ کەمو زیاد وەك رکاتی یەکەمی دەخوێنند (فاتیحەو بەقەد سوورەتی سەجدەی دەخوێنند).**

**٣- لەرکاتی سێیەمی نیوەڕۆدا، فاتیحەی دەخوێنند، ئەوجا بەقەد نیوەی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند.**

**٤- لەرکاتی چوارەمی نوێژی نیوەڕۆدا هەروەها، بەبێ کەمو زیاد فاتیحەی دەخوێندو لەپاش فاتیحە بەقەد نیوەی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند. نوێژی نیوەڕۆ تەواو.**

**نوێژی عەصریش:**

**١- لەرکاتی یەکەمدا لەپاش فاتیحە بەقەد نیوەی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند.**

**٢- لەرکاتی دووەمدا هەروەها: لەپاش خوێندنی فاتیحە بەقەد نیوەی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند.**

**٣- لەرکاتی سێیەمدا، لەپاش خوێندنی فاتیحە بەقەد چواریەکی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند.**

**٤- لەرکاتی چوارەمدا هەروەها: لەپاش فاتیحە، بەقەد چواریەکی سوورەتی سەجدەی دەخوێنند!!**

٣٠٨- وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ فُلَانٍ يُطِيلُ اَلْأُولَيَيْنِ مِنْ اَلظُّهْرِ، وَيُخَفِّفُ اَلْعَصْرَ، وَيَقْرَأُ فِي اَلْمَغْرِبِ بِقِصَارِ اَلْمُفَصَّلِ وَفِي اَلْعِشَاءِ بِوَسَطِهِ وَفِي اَلصُّبْحِ بِطُولِهِ. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: "مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ أَحَدٍ أَشْبَهَ صَلَاةِ بِرَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مِنْ هَذَا}. أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ .

{صحيح النسائى: ٩٨٢، الصحيح المسند: ١٢٥٠}:

سولەیمانی كوڕی یەسار (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو، سەرەكشاری سەر مەدینە بوو، ناوی عەمری كوڕی سەلەمە بوو، بەم شێوەیە نوێژی دەكرد: ركاتی یەكەم و دووەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژدەكردەوە، لە عەصردا نوێژێكی سووكەڵەی دەكرد، لەشێوانا لەپاش فاتیحە، لەو سوورەتانەی دەخوێند كە ناسراون بە (قِصَارُ الْمُفَصَّل) لەنوێژی خەوتنانیشا لەپاش خوێندنی فاتیحە لەو سوورەتانەی دەخوێند كە ناسراون بە سوورەتە مامناوەندیەكانی (الْمُفَصَّل) لەنوێژی بەیانیشا، لەپاش خوێندنی فاتیحە سوورەتێ لەو سوورەتانەی دەخوێند كە ناسراون بە سوورەتە درێژەكانی بەشی (الْمُفَصَّل) لە قورئان.

جا ئەبو هورەیرە، كە نوێژی لەپشت ئەم فەرمانڕەوایەوە دەكرد، بۆ دەربڕینی رەزامەندیی لەبەرنوێژییەكەی، دەیفەرموو: (لەپشتی كەسی ترەوە نوێژی جەماعەتم نەكردووە، كەوەك نوێژی ئەم سەرەكشارە، لەنوێژی پێغەمبەر بكا).

(روونكردنەوە):

١- سولەیمانی كوڕی یەسار، كەسناو (كونیە)ی ئەبو عەبدوڕەحمانە برای عەطای كوڕی یەسارە، خەڵكی مەدینەیە، لەگەورە پیاوانی تابیعینە، شەرعزانێكی گەورە بوو، پیاوێكی رێزدار بوو، خاوەنی متمانە بوو، خواناسێكی گەورە بوو، خاوەن وەرع و تەقوا بوو، دادەنرا بە حوجحە، یەكێ بوو لەحەوت شەرعزانە گەورەكانی مەدینە كە ناسراون بە (الْفُقَهَاءُ السَّبْعَةُ). زوهری گێڕانەوەی لێوە ئەنجام دەدا، سولەیمان لەم زاتانەوە گێڕانەوە ئەنجام دەدا:

لەئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەو ئوم سەلەمەوە، لەتەمەنی (٧٣) حەفتاو سێ ساڵیدا، لەساڵی (١٠٧) سەدو حەوتی کۆچیدا، فەرمانی حەقی بەجێ هێناوەو ئەم جیهانە گەندەڵەی بەجێ هێشتووە.

لەبارەی مەبەست لە سوورەتەکانی (المُفَصَّل) راو بۆچوونی جیاجیا هەیە، پوختەکەیان ئەمەیە:

١- موفەصەل بۆیە پێیان دەگوترێ موفەصەل، چونکە زوو زوو تەواودەبن و ناوبڕیان تێ دەکەوێ، چونکە سوورەتەکانی کورتن.

٢- موفەصەلی قورئان لەسوورەتی (ق)وە دەست پێ دەکا، بەسوورەتی ناس تەواو دەبێ.

٣- درێژەکانی موفەصەل (کە ناسراون بە (طوال المفصّل) لە (ق)وەیە هەتا (عَمَّ).

٤- کورتەکانی موفەصەل (کە ناسراون بە (قِصَارُ المفصّل) لەسوورەتی (الضحی)وەیە هەتا ئاخری قورئان کە سوورەتی (الناس)ە.

٥- مامناوەندییەکانی موفەصەل (کە ناسراون بە (أوساط المفصّل) لەبەینی (عَمَّ) و (وَالضُّحی)دان.

٣٠٩- وَعَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَمِعْتَ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْرَأُ فِي اَلْمَغْرِبِ بِالطُّورِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٤١٦ = ٧٦٥ فتح البارى. مسلم شيحا ١٠٣٣ = مسلم ٤٦٣. أبو داود/٨١٠. ترمذى/٣٠٨. نسائى/٩٨٥}:

جوبەیری کوڕی موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی شێوانا سوورەتی (وَالطُّورِ)ی دەخوێند: نیوەی لەرکاتی یەکەماو ئەو نیوەکەی تری لەرکاتی دووەما).

{تـاج/١، زنجـيره: ٨٠، ژمـاره: ٥٠٨} + {تـاج/٤، زنجـيره: ٣٥ – سـوورەتى طـوور ژماره: ٤١٢١ چاپى چوارەم}.

(ڕوونكردنەوە):

جوبەير لەمكاتـەدا كە گوێى لـە پێغەمبـەر بـوو، لەنوێـژى شێوانا، كـە بەرنوێژى بـۆ هـاوەڵانى دەكـرد، جوبـەير لەمكاتـەدا هێشتا موسـوڵمان نـەبوو بوو، چونكە ديلێ بوو لەديلەكانى غەزاى بەدر.

٣١٠– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ اَلْفَجْرِ يَوْمَ اَلْجُمْعَةِ: (الم تَنْزِيـلُ) اَلـسَّجْدَةَ، و (هَـلْ أَتَـى عَلَى اَلْإِنْسَانِ)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٤٧٣ = ٨٩١، ١٠٦٨ فتح البارى شرح صحيح البخارى. پوختەى موسليم ٤٠٣ = ٢٠٢٨ صحيح مـسلم بـشرح الإمـام محى الـدين النووى/ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٨٧٩ مسلم}:

ئەمـە لـەفظى بوخارييـە، كـە لـە ئـەبو هورەيرەوەيـە، هـەروا لـەفظى موسليمە لە ژماره (٢٠٣١)و لەژماره (٢٠٣٢)دا، تـەرقيم شـيحا، ئەمـەيش دەقـى ژمـاره (٤٠٣) پوختـەى موسـليمە، كـە يەكـسانە بـە ژمـاره (٢٠٢٨)ى تـەرقيمى مامۆستا خەليل شيحا، كە لەئيبنو عەبباسەوەيە:

ئيبنـو عـەبباس (ڕەزاى خودايـان لێ بـێ) فـەرمووى: زۆرينـەى كـات، پێغەمبـەر (درוודى خـوداى لەسـەر بـێ) لەنوێـژى بـەيانى ڕۆژى هەينيـدا، لـەركاتى يەكـەما، لـەپاش خوێنـدنى سـوورەتى فاتيحـە، سـوورەتى ئـەليف لام ميمى سەجدەى بەتەواوى دەخوێند، وە لەركاتى دووەميدا، لـەپاش خوێنـدنى سـوورەتى فاتيحە، سوورەتى {هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ}ى دەخوێنـد، هەروەها پێغەمبەر (درוודى خوداى لەسەر بێ) زۆر جاران، لەپاش خوێنـدنى سـوورەتى فاتيحـە، لـەركاتى يەكـەمى نوێـژى هەينيـدا، سـوورەتى جومعـەى دەخوێند، وە لەركاتى دووەميدا سوورەتى مونافيقينەى دەخوێند).

٣١١- وَلِلطَّبَرَانِيِّ مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ مَسْعُودٍ: {يُدِيمُ ذَلِكَ}. {قَالَ الهَيْثَمِيُّ في المجمع: رَوَاهُ الطبرانِي فِي الصغير وَرِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبەردەوامی ئەم دوو سوورەتەی لەنوێژی بەیانیدا دەخوێند). تەبەرانی گێڕاویەتەوە، هەیثەمی بەصەحیحی دائەنێ.

٣١٢- وَعَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّيْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) فَمَا مَرَّتْ بِهِ آيَةُ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ عِنْدَهَا يَسْأَلُ، وَلَا آيَةُ عَذَابٍ إِلَّا تَعَوَّذَ مِنْهَا} أَخْرَجَهُ اَلْخَمْسَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح أبي داود/٧٧٤. ترمذى رقم: ٢٦٢. أبو داوود/٨٧١. نسائى/(٢/١٩٠) ابن ماجة رقم: ٨٨٨. أحمد/(٥/٣٨٢)}:

ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیما ئاوایە:

حوذەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەشەونوێژا، لەپشت پێغەمبەرەوە بەجەماعەت شەونوێژم دەکرد، لەپاش خوێندنی فاتیحە، دەستی کرد بەخوێندنی سوورەتی بەقرە، بەردەوام بوو لەسەری، لەدڵی خۆما گوتم: لەم رکاتەدا سەد ئایەتی لێ دەخوێنێ، بەڵام لەوەیشی تێ پەڕاند، لەدڵی خۆما گوتم: وادەردەکەوێ ئەم سوورەتە دابەش دەکا بەسەر هەردوو رکاتەکەی ئەم نوێژەدا، بەڵام کە لەوەیشی تێ پەڕاندو زۆرینەی سوورەتەکەی خوێندو بەشی ئەوەی نەما، کەدابەشی بکا بەسەر دوورکاتدا، لەدڵی خۆما گوتم: وادیارە کە ئەم سوورەتە هەمووی لەم رکاتەدا دەخوێنێو کە تەواوبوو روکوع دەبا، کەچی روکوعی نەبردو لەپاش تەواوبوونی سوورەتی بەقەرە دەستی کرد بەخوێندنی سوورەتی نیساءو ئەویشی هەر لەو رکاتەدا تەواوکردو، ئەوسا دەستی کرد بەخوێندنی سوورەتی ئالی عیمرانو ئەویشی هەر لەورکاتەدا تەواوکرد، بەشێنەیی قورئانەکەی دەخوێند، کاتێ دەگەیشتە

ئایەتێ تەسبیحاتی تیابێ، تەسبیحی دەکرد، وەك ئایەتی {فَسُبْحَانَ اللَّـهِ حِـينَ تُمْـسُونَ وَحِـينَ تُـصْبِحُونَ} یـا وەك ئایـەتی {فَـسَبِّحْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الْعَظِـيمِ} دەیفەرموو: (سُبْحَانَ اللَّهِ!).

کاتـێ دەگەیـشتە ئایـەتێ جێگـەی پاڕانـەوەو خـەڵاتو بەخـشش بـێ، لەخودا دەپاڕایەوەو داوای ئەو خەڵاتەی لێی دەکرد، وەك ئـەم ئایەتـە: {وَقُـل رَّبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ الـرَّاحِمِينَ} دەوەسـتا لەسـەریو دەیفـەرموو: {رَبِّ اغْفِرْلِي وَارْحَمْنِي: پەروەردگارم! لێم خۆشبەو میهرەبان بە لەگەڵما}.

کاتێ دەگەیشتە جێگەی پەناگرتن بەخودا، لەخەراپیو شەڕی ئەوەی لە ئایەتەکەدا باسکراوە، پەنای دەگـرت بـەخودا لێـی، وەك ئـەم ئایەتـە {وَالَّـذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ} لەسـەری دەوەسـتاو دەیفـەرموو: {أَعُوذُ بِاللَّهِ: پەنا دەگرم بەخودا}.

ئەوجا کە ئەم سێ سوورەتەی لەیـەك رکاتـدا، لـەپاش فاتیحـە خوێنـد، چەمایەوەو روکوعی یەکەمی بردو دەستی کرد بەگوتنی {سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيمِ: پاكو بێگەردو بێ نەنگە پەروەردگاری گەورەم}. پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) مانەوەی لەناو چەمینەوەداو، درێژەدان بەویردی نـاوی، لەشـێوەی درێــژی راوەســـتانەکەی بـــوو، کـــە بـــەپێوە قورئـــانی تیـــا دەخوێنـــد، چەمینەوەکەیـــشی وەك راوەســـتانەکەی دوورو درێـــژبوو. ئەوســـا ســـەری لەچـەمینەوە بـەرزەوەکردو فـەرمووی: (سَـمِعَ اللَّـهُ لِمَـنْ حَمِـدَهُ: هەرکەسـێ سوپاسی خودا بکا، بەنیازی پاداشی بـاش، خـودا سـوپاسو نیازەکـەی قـەبووڵ دەکا). ئەوجا بـەدوورو درێـژی لەسـەرپێ راوەسـتاو دەسـتی کـرد بەخوێنـدنی ویـرد، ئەوەنـدە درێژەیـدا بەڕاوەسـتانی ئیعتیـدالو بـەویردی نـاوی، لـەویردو مانــەوەی نــاو روکــوعی نزیــك کــردەوە، ئــەوجا کوڕنووشــی یەکــەمی بــردو فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى: پاكو پیرۆزو بێ گەردە پـەروەردگاری بڵنـدم).

مانـــەوەو ویـــردی نـــاو کوڕنووشـــەکەی، مانەنـــدی مانـــەوەو ویـــردی نـــاو ڕاوەستانەکەی بوو). {موسلیم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا، ژمارە: ١٨١١}.

ئەمـــەیش لـــەدواوە، دەقێکـــی گێڕانەوەیـــەکی تـــری ئـــەم فـــەرموودەی حوذەیفەیە، لەتاجول ئوصولا، زنجیرە:٨٥، ژمارە: ٥٣٣ بەرگی یەکەم:

حـــوذەیفـــە (ڕەزای خـــودای لێ بـــێ) فـــەرمووی: نوێـــژم دەکـــرد لەگـــەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەچەمینەوەدا دەیفـەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيمِ: پاكو بێگەردو بێ نەنگە پەروەردگاری گەورەم). لە کوڕنووشیشدا دەیفـەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّـيَ الْـأَعْلَى: پـاكو بێگـەردو بـێ نەنگـە پـەروەردگاری بڵندم).

کە دەشگەیـشتە سـەر ئایـەتی ڕەحمـەت دەیخوێنـدو لەسـەری دەوەسـتاو دەپاڕایەوەو لەخودا داوای بەشی لەو ڕەحمەتـە دەکـرد، کـە دەشگەیـشتە سـەر ئایەتی سزاو عەزاب دەیخوێندو لەسەری ڕادەوەسـتاو پـەنای دەگـرت بەپـەنای خودا لەو سزاو عەزابە کە لەو ئایەتەدا باسکراوە.

٣١٣- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَلَا وَإِنِّي نُهِيـتُ أَنْ أَقْـرَأَ اَلْقُـرْآنَ رَاكِعًـا أَوْ سَـاجِدًا، فَأَمَّـا اَلرُّكُـوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ اَلرَّبَّ، وَأَمَّا اَلسُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي اَلدُّعَاءِ، فَقَمِـنٌ أَنْ يُـسْتَجَابَ لَكُـمْ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم: ٢٩٥ = ١٠٧٤ شیحا}:

ئەمە دەقەکەیەتی لەپوختەی موسلیما:

ئیبنـــو عـــەبباس (ڕەزای خودایـــان لێ بـــێ) فـــەرمووی: لەنەخۆشـــینی سەرەمەرگا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پـەردەی هۆدەکـەی خـۆی لادا، کـە دەرگاکـەی لەسـەر مـاڵی مزگـەوت بـوو، تەماشـای کـرد وا خەڵکەکـە لەپـشت ئەبوبـەکرەوە ڕیزبـوونو نوێـژیان دابەسـتووەو، ئەبوبـەکر (ڕەزای

خودای لیٚ بیٚ) بەرنویٚژییان بۆ دەکا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بیٚو باوكو دایكو هەسمتو نەست بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بیٚ):

(ئەی خەڵکینە! باش باش بزانن کە لە پێغەمبەرایەتی لەدوای مەرگی من هیچ نەماوە، جگە لەموژدە دەرەکانی، کەبریٚتین لەخەونی باش، کەوادەبیٚ مرۆی موسوڵمان دەیبینیٚ، یا کەسیٚ تر خەوی باش بەمرۆی موسوڵمانەوە دەبینیٚ هۆشیاربن! کەمن پێشگیریی ئەوەم لیٚ کراوە، کە لەناو چەمینەوەدا، یا لەناو کوڕنووشدا، قورئان بخویٚنم، جابۆ ئیٚوەیش هەروایە، جا کەوابوو لەناو چەمینەوەدا، باسی مەزنیو گەورەیی یەزدانی پاك بکەن، لەناو کوڕنووشیشدا زۆر بەکوڵو بەدڵ، سەرگەرمی نزاو پاڕانەوەبن، چونکە لەبارودۆخی وادا، شایانی ئەوەن کە خودای گەورە نزاو پاڕانەوەکانتان لیٚ وەربگریٚ). {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٥٤٠ چاپی چوارەم}.

٣١٤- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: "سُبْحَانَكَ اَللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اَللَّهُمَّ اِغْفِرْ لِي} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٣٠ = ٧٩٤، ٨١٧، ٤٢٩٣، ٤٩٦٧، ٤٩٦٨، فتح الباری = پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٩٤ = ١٠٨٥ شیحا = ٤٨٤ مسلم}:

ئەمە دەقەکەیەتی لەپوختەی موسلیمدا:

عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) وابوو، لەناو چەمینەوەو کوڕنووشدا دەیفەرموو (سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللّهُمَّ اغْفِرلِي: خودایە! تۆ خودایەکی پاكو بیٚ نەنگیت، فەڕدارو پیرۆزیت، ئەی پەروەردگارم! لەسایەی تۆوەیە کەمن تەسبیحو سوپاسو ستایشی تۆ دەکەم، ئەی خودایە! لیٚم خۆشبە).

عائیشه فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوتنی ئەم نزاو ویردە لەچەمینەوەو کوڕنووشدا، کاری بەم ئایەتەی قورئان دەکرد، کە دەفەرموێ:

{فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ} وە مەبەستی ئایەتەکەی روون دەکردەوە: کەخودا فەرماندەکا بە خۆشەویست، تەسبیحاتی خودای خۆی بکا، وە سوپاس‌و ستایشی بکا، وە داوای لێ خۆشبوونی لێ بکا، چونکە ناو نوێژ باشترین کاتە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە). {تاج/١، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥٢٠ چ/١، لاپەڕە: ٢٧٢}.

٣١٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا قَامَ إِلَى اَلصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: "سَمِعَ اَللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ" حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنْ اَلرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: "رَبَّنَا وَلَكَ اَلْحَمْدُ" ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ، ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي اَلصَّلَاةِ كُلِّهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنْ اِثْنَتَيْنِ بَعْدَ اَلْجُلُوسِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٢٧ = ٧٨٩، ٧٨٥ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٧٤ = ٨٦٦ شیحا = ٣٩٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ هەڵ دەستا بۆ نوێژ، رووەو رووگەی پیرۆز رادەوەستاو، ئەوجا لەپێش هەموو شتێکا بە ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستن، نوێژی دادەبەست، کاتێ کەدەچوویش بۆ چەمینەوە، ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، کاتێ لە چەمینەوەیش پشتی هەڵ دەبڕی، دەیفەرموو (سَمِعَ اَللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا، خودا سوپاسەکەی لێ وەردەگرێ).

ئینجا کەرێك رادەوەستا دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ اَلْحَمْدُ: ئەی پەروەردگارمان! سوپاس هەر بۆتۆیە).

ئەوجاکە دائەنوی بۆ کوڕنووش، لەوکاتەدا دەیفەرموو: (ئەڵڵاهوئەکبەر). کاتێکیش کەسەری لە کوڕنووش هەڵ دەبڕی، دیسان ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، دیسان کە دادەنوی بۆ کوڕنووشی دووەم ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، دیسان کەسەری لەکوڕنووشی ددووەم هەڵدەبڕی، دەیفەرموو: (ئەڵڵاهوئەکبەر).

ئیتر لەهەموو رکاتێکا ئاوای دەکرد، هەتا نوێژەکەی تەواو دەکرد، لەپاش دانیشتنی تەحیاتی یەکەمیش، کە لەرکاتی دووەمدا دەخوێنرێ، کە هەڵ دەستایەوە بۆ رکاتی سێیەم ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد.

ئەوجا ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (من لەهەمووتان زیاتر هەوڵ دەدەم کە نوێژەکەم لەنوێژی پێغەمبەر بچێت، هەتا کار بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر بکەین کە دەفەرموێ: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي: وەك خۆم نوێژ بکەن، کەدەمبینن لەبەرچاوتان نوێژدەکەم!).

٣١٦- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ اَلرُّكُوعِ قَالَ: " اَللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ اَلْحَمْدُ مِلْءَ اَلسَّمَوَاتِ وَمِلْءَ اَلْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ اَلثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ اَلْعَبْدُ -وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ- اَللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا اَلْجَدِّ مِنْكَ اَلْجَدُّ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم شيحا/١٠٧١ = ٢٩٦ پوختەی موسلیم = ٤٧٧ مسلم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کەسەری لەچەمینەوە بەرزدەکردەوە، دەیفەرموو: {سَمِعَ اَللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ اَلْحَمْدُ، مِلْءَ

اَلسَّمَوَاتِ وَاَلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ اَلثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ اَلْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا اَلْجَدِّ مِنْكَ اَلْجَدُّ}.

ئەوەی ستایش‌و سوپاسی یەزدانی پاك بكاو، نیازی خۆی عەرزی بارەگای ئەو زاتە بكا، ئەوە هەم سوپاسەكەی‌و هەم نیازەكەی گیرایەو وەرگیراوە، پەروەردگارا! كەواتە سوپاسێكی زۆری بێ شومارو بێ سنوور بۆ تۆ، پڕ بەئاسمانەكان، پڕ بەزەوی، پڕ بەنێوانی ئەم دوانە، سەرەڕای ئەمانەیش پڕ بەهەرشتێكی تریش، سوپاس بۆ تۆبێ، كە حەزی تۆی لەسەربێ، ئەی كەسێ كە شایان‌و شایستەی هەموو ستایش‌و گەورەییەكی!

دروستترین‌و رەواترین وشەیێ، كەیەكێ لەئێمە بیڵێ، كە هەموومان بەندەی تۆین‌و تۆ پەرستین، ئەم وشە پیرۆزەیە: خودایە! هەرچی تۆ بیدەیت بەكەسی تر نابڕێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بەكەسی تر نادرێ، دارایی داراو، دەستداریی دەستدار، هیچ دادێكیان نادەن لەلای تۆ). {تاج/١، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٥٢٦ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

٣١٧- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: عَلَى اَلْجَبْهَةِ - وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أَنْفِهِ - وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ اَلْقَدَمَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٣٨ = ٨١٢ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٩٩ = ١٠٩٨ شیحا}:

لەپوختەی موسلیماو لەتەجریددا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە فەرمانی پێم كردووە كە لەسەر ئەم حەوت ئێسكە كوڕنووش ببەم: لەسەر تەوێڵ‌و هەردوو بەری دەست‌و هەردوو ئەژنۆو لەسەر نووكی هەردووپێ!).

بەدەستیشی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاماژەیکرد بۆئەوە کە لووتیش، بۆ مەبەستی کوڕنووش لەسەربردن، بەشێکە لەتەوێڵ. وە فەرموویشی: (هەروا فەرمانم پێ کراوە، کە لەناو نوێژا، جلو بەرگ کۆنەکەینەوە، وەك هەڵکردنی چاكو داوێنی دیشداشەو کەواو بەستنی فەقیانەو شتی وا، وەقژە سەریش خڕ هەڵ نەدەین!).

٣١٨- وَعَنْ اِبْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا صَلَّى وَسَجَدَ فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ، حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبِطَيْهِ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردى/١/٢٦٠، رقم: ٢٤٨ = ٣٩٠، ٨٠٧، ٣٥٦٤ فتح البارى. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم رقم: ٣٠١ = ١١٠٥ شيحا = ٤٩٥ مسلم}:

عەبدوڵڵای کوڕی مالیك، کە بەناوی دایکیشیەوە ناودەبرێو پێی ددەگوترێ: ئیبنو بوحەینە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی دەکرد، لەناو کوڕنووشدا، هەردوو باڵی خۆی بڵاودەکردەوە، تەنانەت جاروبار ئەوەندە بڵاوی دەکردنەوە، سپیدەی بنباخەڵەکانی دەردەکەوتن!).

(ڕوونکردنەوە):

١- بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٨٢ — باسی ژمارە: ٦٦ چاپی یەکەم — لاپەڕە: ٢٠٣، زنجیرە: ٦٦ چاپی دووەم.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی مالیك، یەکێکە لەهاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). بوحەینەی دایکیشی صەحابییە بووە، دەڵێن: باوکیشی لە هاوەڵانی پێغەمبەر بووە، لەهۆزی ئەزدە، لەمێژەوە موسوڵمان بوو بوو، پیاوێکی سۆفیلکەی خواپەرست بوو، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: ئەعرەجو حەفصی کوڕی عاصمو عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینە، لەئاخرو ئۆخری جێنشینیی موعاوییەدا، لەکاتی

فەرمانڕەوایی مەڕوان لەسەر مەدینە، لەپەنجاو شەشی کۆچیدا مردووە، یەکێکە لەپیاوانی صەحیحەین.

٣١٩- وَعَنْ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ ، وَارْفَعْ مِرْفَقَيْكَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم شيحا/١١٠٤ = ٤٩٤ مسلم}:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ کوڕنووش دەبەیت بەری هەردوو لەپەکانت لەسەر زەوییەکە دابنێو ئانیشکەکانت لەزەوی بەرزبکەرەوە).

(ڕوونکردنەوە):

بەرائی کوڕی عازیب ئەنصارییە، خەزرەجییە، لەڕۆژی بەدردا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تری پێغەمبەردا، بەبچووك دانران، لەبەرئەوە ڕێگەی هاوبەشیکردنیان لەو غەزایەدا نەدرا، یەکەم غەزا کە بەشداری تیادا کردووە، لەسەر فەرمایشتی واقیدی، غەزای خەندەق بووە، خۆی دەفەرموێ، وەك لە إصابەدا دەفەرموێ: ئامادەی چواردە نەبەرد (غەزا) بووم، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا، هەروا دەفەرموێ: هەژدە سەفەریشم لەخزمەت پێغەمبەردا کردووە، بەراء دەیفەرموو: (مەرج نییە کە هەموو فەرموودەیێ، کە دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە کە لەزاری خودی پێغەمبەر خۆیمان بیستبێ، هەیانە کە لەهاوڕێیانی خۆمانمان بیستووە، کە ئەوان لە پێغەمبەریان بیستووەو بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوەو ئێمەیش دەیگێڕینەوە بۆ ئێوە).

ئامادەی شەڕگای (تستر) بووە، لەگەڵ ئەبو موسادا، لەلایەنگیرانی ئیمامی عەلی بوو، ئامادەی شەڕی جەمەلو صفینو کوشتاری خەواریج بووە، لەکووفە نیشتەجێ بوو، لەوێ خانوویەکی دروست کرد بۆ خۆی، کۆمەڵێ فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، خۆیو عازیبی باوکی هاوڕێی پێغەمبەر

بوون، له صهحیحهینا دهفهرموێ: بهڕائی کوڕی عازیب فهرمووی: ئهبوبهکری صهدیق کۆپانه وشترێکی له عازیبی باوکم کڕی، ئهبوبهکر به باوکمی فهرموو: به بهرائی کوڕت بڵێ، با ئهم کۆپانهم بۆ ههڵبگرێ ههتا ماڵهوه، باوکیشم فهرمووی: (پێی ناڵێم ههتا بۆمان نهگێڕیتهوه کهچۆن کۆچت کرد لهگهڵ پێغهمبهردا... ههتا کۆتایی فهرموودهکه). {پوختهی موسلیم ژماره: ٢٦٢}.

٣٢٠- وَعَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا رَكَعَ فَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَإِذَا سَجَدَ ضَمَّ أَصَابِعَهُ} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع/ ٤٧٣٣}:

وائیلی کوڕی حوجر (ڕهزای خودای لێ بێ) فهرمووی: دهستووری پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) وابوو، لهکاتی چهمینهوهدا، دهستهکانی لهسهر ئهژنۆکانی دادهناو پهنجهکانی بڵاودهکردنهوه، وهك دهستی گرتبێ به ئهژنۆیهوه ئاوا، بهڵام کاتێ کوڕنووشی دهبرد، لهپهکانی لهسهرجێ نوێژهکه دائهناو پهنجهکانی دهلکان بهیهکهوه).

٣٢١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي مُتَرَبِّعًا} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{صحيح النسائی/١٦٦١. نسائی/(٣/٢٢٤) ابن خزيمة رقم: ١٢٣٨}:

عائیشهی هاوسهری پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: جارێ پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) ماینهکهی گلاندیو کهوتهخوارهوهو قاچی لهجێ چوو، لهبهر ئهوه بهدانیشتنهوه، بهچوارمشقی نوێژهکانی دهکرد).

٣٢٢- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَقُولُ بَيْنَ اَلسَّجْدَتَيْنِ: {اَللَّهُمَّ اِغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيُّ، وَاللَّفْظُ لِأَبِي دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حسن، صحيح أبي داود ٧٥٦. ترمذی رقم: ٢٨٤، ٢٨٥. أبوداود رقم: ٨٥٠. حاكم. المستدرك ١/٢٦٢}:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: یاسای پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) وابوو، لەدانیشتنی نیٚوانی دوو کوڕنووشەکاندا دەیفەرموو: (اللهُمَّ اغْفِرْلِي وَارْحَمْنِي واهْدِنِي وَعَافِنِي وارْزُقْنِي):**

**خودایە! لیٚم خۆشبەو ڕەحمم پیٚ بکەو ئاسوودەو سەرفرازو بیٚوەیم بکەو، شارەزای ڕیٚگەی ڕاستی هەردوو جیهانم بکەو، رزقو ڕۆژیم بدە). {تاج/١، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٥}.**

**٣٢٣- وَعَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّهُ رَأَى اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.**

{تجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ٤٤١ = ٨٢٣ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

**مالیکی کوڕەی حووەیریثی لەیثی (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پیٚغەمبەرم دیوە، کاتیٚ لەڕکاتی یەکەمو لەڕکاتی سیٚیەم، هەڵدەستایەوە، کەڕکاتە تاکەکانی نویٚژی سیٚ ڕکاتیو چوار ڕکاتین، یەکسەر هەڵنەدەستایەوە، بەڵکوو کەمیٚ دادەنیشت بۆ دانیشتنو وچان، ئەوسا هەڵدەسایەوە بۆ ڕکاتی نویٚ). {تاج/١، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٤٦}.**

**٣٢٤- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَنَتَ شَهْرًا بَعْدَ اَلرُّكُوعِ، يَدْعُو عَلَى أَحْيَاءٍ مِنْ أَحْيَاءِ اَلْعَرَبِ، ثُمَّ تَرَكَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

{پوختەی موسلیم ٣٥٥ = ١٥٣٨، ١٥٤٤، ١٥٥٠، تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥١٥ = ١٠٠١، ١٠٠٢، ١٠٠٣، ١٣٠٠، ٢٨٠١، ٢٨١٤، ٣٠٦٤،

٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٠، ٤٠٩١، ٤٠٩٢، ٤٠٩٤، ٤٠٩٥، ٤٠٩٦، ٦٣٩٤، ٧٣٤١}:

گوترا بە ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژەکانیدا، قونووتی دەخوێند؟ فەرمووی: بەڵێ، لەپاش روکووع بۆ ماوەی مانگێ قونووتی دەخوێند، نزای شەڕی لەچەند هۆزێکی عەرەب دەکرد، لەبکوژەکانی قورئان خوێنەکانی دەکرد، لەپاشا وازی لێ هێنا. {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٠} + {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٢}.

٣٢٥- وَلِأَحْمَدَ وَاَلدَّارَقُطْنِيِّ نَحْوُهُ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ، وَزَادَ: {فَأَمَّا فِي اَلصُّبْحِ فَلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ حَتَّى فَارَقَ اَلدُّنْيَا}.

{منكر، السلسلة الضعيفة ٦٣٩. أحمد (٣/١٦٢) دار قطني (٢/٣٩)}.

لەم گێڕانەوەدا ئەمەی زیاترە:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا لەدونیا دەرچوو هەمیشە لەنوێژی بەیانیدا قونووتی دەخوێند. {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٣}.

٣٢٦- وَعَنْهُ أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {كَانَ لَا يَقْنُتُ إِلَّا إِذَا دَعَا لِقَوْمٍ، أَوْ دَعَا عَلَى قَوْمٍ} صَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{السلسلة الصحيحة ٦٣٩. ابن خزيمة ٦٢٠}:

دیسان ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: قونووتی نەدەخوێند، لەنوێژدا، مەگەر لەکاتێکا کەبیویستایە نزای باش بۆ کۆمەڵێ بکا، یا نزای خراپ لەکۆمەڵێ بکا، تەنها لەم دوو دۆخەدا، لەنوێژدا قونووتی دەخوێند، دەنا نەیدەخوێند).

٣٢٧- وَعَنْ سَعْدِ بْنِ طَارِقٍ اَلْأَشْجَعِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ! إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرُ ،

وَعُثْمَانُ، وَعَلَيٍّ، أَفَكَانُوا يَقْنُتُونَ فِي اَلْفَجْرِ؟ قَالَ: أَيْ بُنَيَّ، مُحْدَثٌ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، إِلَّا أَبَا دَاوُدَ.

{صحيح الإرواء: ٤٣٥. الصحيح المسند: ٥١١. ترمذى رقم: ٤٠٢. نسائى (٢/٢٠٤) ابن ماجه رقم: ١٢٤١. أحمد (٣/٤٢٧، ٣٩٤)}:

سەعیدی کوڕی طاریقی ئەلئەشجەعی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی باوکم کرد: بابە! تۆ بۆخۆت لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژی بەیانیت کردووە، هەروەها لەپشتی ئەبوبکرو عومەرو عوسمانەوە، هەرکەسەیان لەکاتی جێنشینی خۆیاندا، هەروا لەپشتی عەلی کوڕی ئەبو طالیبیشەوە لەکووفە، کاتێ جێنشین بوو، نزیکی پێنج ساڵ نوێژی بەیانیت لەپشت ئەم زاتەوە بەکۆمەڵ کردووە، جا ئایا ئەم زاتانە کە پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەرو عوسمانو عەلی بوون، لەجەماعەتی نوێژی بەیانیدا، قونووتیان دەخوێند کە بەرنوێژیان بۆ موسوڵمانان دەکرد، یانا؟

باوکم فەرمووی: لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا: (شتی وا نەبووە، قونووت خوێندن، لەنوێژی بەیانیدا، شتێ تازە قەڵایە لەدوا ئەوان داهێنراوە!).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو مالیکی ئەشجەعی، ناوی سەعدی کوڕی تاریقی کوڕی ئەشیەمە سەعد خۆی تابیعییە، متمانەیە، طاریقی باوکی سەحابەی پێغەمبەر بوو، پێشەوا موسلیم دەفەرموێ: یەك بگێڕەوە (راوی)ی هەیە کە ئەبو مالیکی کوڕیەتی، ئەم فەرموودەیەی کەئێستا ڕۆیشت، ئەوە دەچەسپێنێ کەطاریق تەمەن درێژو خاوەن ئەزموون بووە، سەردەمی پێغەمبەرو هەرچوار جێنشینە باشەکانی بینیوە. عەسقەلانی دەفەرموێ: تەرمەزی ئەم فەرموودەیەی بەصەحیح داناوە. لە تەهزیبوتەهزیبا عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەبو مالیك هەتا دەوروبەرو سنووری ساڵی سەدو چلی کۆچی ژیاوە، ئیبنو

عەبدولبەڕ دەفەرموێ: کەسێ لەزانایانی فەرموودە، گومان نابەم کە ئەبو مالیك بەمتمانەو زانای دانا، دانەنێ!

٣٢٨- وَعَنْ اَلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّهُ قَالَ: {عَلَّمَنِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ اَلْوِتْرِ: " اَللَّهُمَّ اِهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَزِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ. وَزَادَ اَلطَّبَرَانِيُّ وَالْبَيْهَقِيُّ: {وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ}. زَادَ النَّسَائِيُّ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ فِي آخِرِهِ: {وَصَلَّى اَللَّهُ تعالى عَلَى اَلنَّبِيِّ}.

{صحيح ابن ماجه ٩٦٧ الصحيح المسند: ٣٠٨. صحيح أبى داود: ١٢٦٣. ضعيف الإرواء: ٤٣١}:

حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم چەند وشەیەی فێرکردم، کە لە قونووتی نوێژی وەتردا بیانڵێم: {اَللَّهُمَّ اِهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ} واتە:

خودایە! هیدایەتم بدەو شارەزای ڕێگەی ڕاستم بکە، لەگەڵ ئەوانەدا کە خۆت هیدایەتت داون، وەبێوەی و سەرئاسوودەو سەرفرازم بکە، لەگەڵ ئەوانەدا کەخۆت بێوەی و سەرئاسوودەت کردوون، وە ئەو بەخششەی داوتە پێم، پیت و فەڕی تێ بخە بۆم، وەبم پارێزە لەزیانی ئەوەی کەبڕیارت داوە، بەڕاستی تۆ خۆت بڕیاری هەموو شتێ دەدەیت، بەڵام هیچ شتێ لەسەر تۆ بڕیار نادرێ، ئەوەی کەتۆ دۆستی ئەویت، ئەوە قەت کەساس ناکەوێ و داماو

نابێ، وه ئەوەی کە تۆ دوژمنایەتی تێ ببەستیت ئەوە هەرگیز سەرناکەوێ، ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەڕاستی پیرۆزیو گەورەیی هەر لەخۆت جوانە).

بەیهەقی لەپاش وشەی (لاَيَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ)ەوە، ئەمەی پتر کردووە (وَلاَ يَعِزُ عَادَيْتَ).

نەسائیش لە تەریقێ ترەوە بۆ ئەم حەدیثە، لەدواییەکەوە ئەمەی پتر کردووە (وَصَلَّى اَللَّهُ تَعَالَى عَلَى اَلنَّبِيِّ: درودو رەحمەتی خودای گەورە لەسەر موحەممەد پێغەمبەر). {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٤}.

(ڕوونکردنەوە):

حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب، کچەزای پێغەمبەرە، دایکی فاطیمەی زەهرایە، کوڕە گەورەی حەزرەتی عەلیو حەزرەتی فاطیمەیە، کەسناوی ئەبو موحەممەدە، لەنیوەی مانگی رەمەزانی ساڵی سێی کۆچیدا لەدایك بووە، لەرۆژی حەوتەیدا، پێغەمبەر خۆی ناوی ناو، بەراننێکی بۆ کرد بەحەوتم، وەسەری تاشیو فەرمانی کرد کە سەنگی مووە تاشراوەکەی سەری، زیوی بۆ بکرێ بەخێر، ئیمامی حەسەن پیاوێکی سەلاری هێمنی لەخوا ترسی رێزدار بوو، کاتێ باوکی شەهید بوو، موسوڵمانان پەیمانیان پێدا، لەجێگەی باوکی بوو بەجێنشین، نزیکەی حەوت مانگ مایەوە لەپایەی جێنشینیدا، بەڵام بڕیاری دا کەخوێنی موسوڵمانان، بەهۆی ئەوەوە نەڕێژێ، لەبەر ئەوە وازی لەجیهانو لەجێنشینی هێناو تەسلیمی بە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان کرد، ئیمامی حەسەن باپیرە گەورەی هەموو سیدە حەسەنییەکانە، حوسەینی برایشی باوکی هەموو سیدە حوسەینییەکانە، هەرچی سەیید هەیە، یا دەچنەوە سەر حەسەن کە برا گەورە بووە، یادەچنەوە سەر حوسەینی برای حەسەن.

پێشەوا حەسەن نزیکەی (٤٦) چل‌و شەش ساڵ ژیاوە، بەزەهر کوژراوە، زەهرخوار کراوە، دەڵێن: ژنەکەی کە کچی ئەشعەپی کوڕی قەیسی کیندی بوو، ئەو بەدەسیسەی معاویە زەهرخواردی کردووە، لەمەدینە لەساڵی (٤٩) یا (٥١)ی کۆچی وەفاتی کردووە، فەرمانڕەوایی سەرشاری مەدینەی ئەو سەردەمە، کەسەعیدی کوڕی عاص بوو، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، حوسەینی برای ئەوی وەپێشخست کەنوێژی لەسەر بکا، گوتی: ئەمە سوننەتە، کەسەرەکشار نوێژ لەسەر مردووی شارەکەی بکا، دەنا خۆم نوێژم لەسەر تەرمی حوسەینی برام دەکرد، تۆم پێش نەدەخست.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) ڕێگەی دا، کە تەرمەکەی حەسەن لەناو هۆدەکەی ئەودا بنێژرێ، لەپاڵ گۆڕی پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەردا، حوسەین خۆی لەکاتی نەخۆشییەکەیدا داوای ئەوەی لەعائیشە کردبوو، بەڵام مەڕوان‌و بەنو ئومەییە ئەوەیان قەبووڵ نەکرد، لەبەر ئەوە تەرمەکەی حەسەن لە بەقیعولغەرقەد بەخاك سپێردرا، بڕوانە ئەم شوێنانە: ژمارە: ٣٨ لەم پەڕاوی (بلوغ المرام)ە، ژیاننامەی عەلی باوکی حەسەن + پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٩٢ + تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٢٨٨ هەتا ژمارە: ٣٣١١ چاپی چوارەم) + تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٦١ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٦ + تاج/٣ لاپەڕە ٦٣٤ — باسی مەزنایی حەسەن‌و حوسەین زنجیرە: ٢٠ لەژمارە: ٣٣٦٣وە هەتا ژمارە: ٣٣٨٠ + تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٣٣٥٧ هەتا ٣٣٦٢}.

٣٢٩- وَلِلْبَيْهَقِيِّ عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُعَلِّمُنَا دُعَاءً نَدْعُو بِهِ فِي اَلْقُنُوتِ مِنْ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ} وَفِي سَنَدِهِ ضَعْفٌ.

{سنن البيهقى الكبرى: ٢٩٦٠}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) نزایەکی فێر دەکـردین، کـە لـەقونووتا، لەنوێـژی بەیانیدا بیخوێنین). بەیهەقی گێڕاویەتەوە، ڕشتەکەی لاوازە.

٣٣٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَبْـرُكْ كَمَـا يَبْـرُكُ اَلْـبَعِيرُ، وَلْيَـضَعْ يَدَيْـهِ قَبْـلَ رُكْبَتَيْهِ} أَخْرَجَهُ اَلثَّلَاثَةُ. وَهُوَ أَقْوَى مِنْ حَدِيثِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رضي الله عنه).

{صحيح الجامع: ٥٩٥. أحمد رقم: ٨٩٤٢. أبوداود رقم: ٨٤٠. نـسائى رقـم: ١٠٩١. بيهقى رقم: ٢٤٦٥}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) دەفـەرموێ: (کاتـێ کەسـێ لـەئێوە کوڕنـووش دەبـا، بـاوەك حوشـتر چۆك دانـەدا، بالـەپێش ئـەوەدا کـە ئـەژنۆکانی لەسـەر زەوی دابنـێ، هەردوو بەری دەستی لەسەر جێ نوێژەکەی دابنێو ئەوجا ئەژنۆکانی!).

دانەر (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: ئـەم فەرموودەیـەی ئـەبو هورەیرە، لەڕووی ڕشتەوە بەهێزتـرە لـە فەرموودەکـەی وائیلـی کـوڕی حـوجر کە دەڵێ:

٣٣١- {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) إِذَا سَجَدَ وَضَـعَ رُكْبَتَيْـهِ قَبْلَ يَدَيْهِ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ. فَإِنْ لِلْأَوَّلِ شَاهِدًا مِنْ حَدِيثِ: اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) صَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَذَكَرَهُ اَلْبُخَارِيُّ مُعَلَّقًا مَوْقُوفًا.

{صحيح الإرواء: ٧٧/٢. ترمذى رقم: ٢٦٨. أبوداود رقم: ٨٣٨. ابـن ماجـه رقم: ٨٨٢. نسائى ٢٠٦/٢. ابن خزيمة رقم: ٦٢٦}:

وائیلـی کـوڕی حـوجر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کە کوڕنووشـی دەبـرد، ئـەژنۆی لەپێش دەستیدا دادەنا، کە هەڵیش دەسایەوە سەرپێ دەسـتی لـەپێش ئـەژنۆیا بەرز دەکردەوە). {تاج/١، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٥٢٨ — د/ت/ن — س/ح}.

دانەر شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بۆیە فەرموودەی یەکەم، کە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە، بەهێزترە، لە فەرموودەی دووەم، کە فەرموودەکەی وائیلی کوڕی حوجرە، چونکە یەکەم فەرموودەیەکی تر هەیە، کە نافیع لەئیبنو عومەرەوە دەیگێڕێتەوە، دەبێ بەشایەتو بەڵگەی بەهێزی فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە، کە ئەو شاهیدە ئەمەیە: بوخاری دەڵێ: (قال نَافِعٌ: ابنُ عُمَرَ يَضَعُ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ: واتە: نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، کە دادەنیشت بۆ کوڕنووش بردن، لەپێشا هەردوو دەستەکانی لەسەر جێگە نوێژەکە دادەنا، ئەوجا هەردوو ئەژنۆکانی).

ئەم شاهیدەش لەبەر ئەم دوو هۆیە بەهێزە:

١- ئیبنو خوزەیمە گێڕاویەتەوەو بەتەندروستی داناوە.

٢- بوخاری بە موعەللەقیو بە مەوقووفی لەسەر نافیع گێڕاویەتەوە.

٣٣٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا قَعَدَ لِلتَّشَهُّدِ وَضَعَ يَدَهُ اَلْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ اَلْيُسْرَى، وَالْيُمْنَى عَلَى اَلْيُمْنَى، وَعَقَدَ ثَلَاثَةً وَخَمْسِينَ، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ اَلسَّبَّابَةِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَشَارَ بِالَّتِي تَلِي اَلْإِبْهَامَ}.

{پوختەی موسلیم ٣٠٢ = ١٣٠٧ تا ١٣٠ شیحا = ٥٨٠ مسلم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر جاران کە لە تەحیاتا دادەنیشت، لەپی چەپی دادەنا لەسەر ڕانی چەپی، وەلەپی ڕاستیشی دادەنا لەسەر ڕانی ڕاستی، وە بەدەستی ڕاستی ئاماژەی پەنجاو سێی گرێ دەدا، کە ئەوەیە پەنجە تووتەو برا تووتەو بەرزە لووتەی دەستی ڕاستی لەسەر بەری لەپی بنووقێنێو پەنجەکەڵەکەی

دابنێ بەچەماوەیی لەسەر بنی پەنجەی شایەتوومانی، وەلەکاتی گوتنی وشەی (إلاّ الله)ی ناو شایەتووماندا، پەنجەی شایەتوومانی بەرز دەکردەوە).

ئەمەیش دەقی گێڕانەوەی دووەمی موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرجار کە لە تەحیاتا دادەنیشت، لەپی ڕاستی دادەنا لەسەر ڕانی ڕاستیو گشت پەنجەکانی دەنووقاندن، پەنجەی شایەتوومانی نەبێ، بەڵام پەنجەی شایەتوومانی بەرەڵا دەکردو لەکاتی گوتنی وشەی (إلاّ الله)ی ناو شایەتوومانا بەرزی دەکردەوە، ئاماژەی پی دەکرد بۆ یەکتایی خودا، وەلەپی چەپیشی بەکراوەیی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا). {تاج/١، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٥٤٨}.

٣٣٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِلْتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: " إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اَلتَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا اَلنَّبِيُّ وَرَحْمَةَ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اَللَّهِ اَلصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ لِيَتَخَيَّرْ مِنْ اَلدُّعَاءِ أَعْجَبُهُ إِلَيْهِ ، فَيَدْعُو} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَلِلنَّسَائِيِّ: {كُنَّا نَقُولُ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْنَا اَلتَّشَهُّدُ} . وَلِأَحْمَدَ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَّمَهُ اَلتَّشَهُّد، وَأَمَرَهُ أَنْ يُعَلِّمَهُ اَلنَّاسَ} .

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٤٦ = ٨٣١، ٨٣٥، ١٢٠٢، ٦٢٣٠، ٦٢٦٥، ٧٣٨١، ٦٣٢٨ فتح الباری شرح صحیح البخاری. مسلم شیحا ٨٩٥ – ٨٩٩ = مسلم ٤٠٢. بڕوانە: پوختەی موسلیم ٣٠٤، ٣٠٥. نسائی ٢/٢٣٧، ٣/٤٠. أبوداود رقم: ٩٦٨. ترمذی رقم: ٢٨٩. ابن ماجە رقم: ٨٩٩. احمد ١/٣٨٢}:

ئەمە یەکێکە لەگێڕانەوەکانی بوخاری بۆ ئەم فەرموودەیە:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشدا لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکۆمەڵ نوێژمان دەکرد، لەپێش دانانی تەحیاتا، دەمانگوت: سڵاو لەخودا، سڵاو لەجوبرائیل، سڵاو لەمیککائیل، سڵاو لەم، سڵاو لەو، هەتا ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێمان دایەوەو فەرمووی: (وا مەڵێن، چونکە خودا خۆی ناوی سەلامە، بەڵام کاتێ لەنوێژدا دادەنیشن بۆ خوێندنی تەحیات بڵێن: (اَلتَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا اَلنَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اَللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اَللّٰهِ اَلصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

هەرچی هۆی قەدرو ڕێزە، چی بەگوتار، چی بەکردار، وەهەرچی نوێژو داخوازیو لالانەوەو پاڕانەوەو دوعاو نزایە، وەهەرچی سەرچاوەی پاکیو خاوێنییە، ئەمانە هەموویان لەڕاستیدا، هەر شایستەن بۆ خودای مەزن، دروود لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ سۆزو میهرەبانیو پیتو فەڕو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودا، دروود لەسەر ئێمەیش کە گەلی ئەو پێغەمبەرەینو لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خودا، شایەتی دەدەم، بەزمان دەڵێمو بەدڵ باوەڕدەکەم: کە هەر خودای تاکو تەنیا خودایەو خودای تر نییە، وەشایەتی دەدەم بەهەمان شێوە: کە موحەممەد هەم بەندەی خوداو هەم پێغەمبەری خودایە).

چونکە هەرکەسێ ئەم وشەیە ئاوا بڵێو لەسەر ئەم شێوە دروود بنێرێو سڵاو بکا، ئەوە سڵاوەکەی بەر هەموو بەندەیەکی باشی خودا دەکەوێ، ئیتر ئەو بەندەیە خوای لەزەویدا بێ، وەخوای لە ئاسماندا بێ، ئەو سڵاوو دروودە هەر دەیگرێتەوە، ئەنجا با بەئارەزووی خۆی بپاڕێتەوە، بۆ خۆی حەزی لەچی بێ، لەخودا داوا بکات). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٨٠} : تائێرە (متفق علیه)یە، ئەمەیش لەفظی بوخاری بوو.

نەسائیش لەئیبنو مەسعوودەوە، ئاوا دەیگێڕێتەوە:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کەتەحیات پێویست بکرێ لەسەرمان، دەمانگوت: سلاّو لەخودا، سلاّو لە جوبرائیلو میکائیل، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وا مەڵێن، بەلاّم بڵێن: (التحیاتُ لِلهِ... تادوایی).

ئەحمەدیش لەئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری تەحیاتی کردم، وەفەرمانی پێم کرد: کەفێری خەڵکانیشی بکەم).

٣٣٤- وَلِمُسْلِمٍ: عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ يُعَلِّمُنَا اَلتَّشَهُّدَ: " اَلتَّحِيَّاتُ اَلْمُبَارَكَاتُ اَلصَّلَوَاتُ لِلَّهِ ...} إِلَى آخِرِهِ.

{پوختەی موسلیم ٣٠٥ = ٩٠٠ شیحا = ٤٠٣ مسلم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن فێری سوورەتەکانی قورئانی دەکردین، ئاوەهایش فێری تەحیاتی نوێژی دەکردین، گشت جارێ دەیفەرموو:

(اَلتَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ للهِ، اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا اَلنَّبِيُّ وَرَحْمَةَ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، اَلسَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اَللَّهِ اَلصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُهُ الله). {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٧٩}.

٣٣٥- وَعَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَمِعَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رجْلاً يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ، وَلَمْ يَحْمَدِ اَللَّهَ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: " عَجِلَ هَذَا " ثُمَّ دَعَاهُ، فَقَالَ: " إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ. رَبِّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ثُمَّ يَدْعُو بِمَا شَاءَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالثَّلَاثَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح أبي داود ١٣١٤. الصحيح المسند ١٠٦٤. أبوداود رقم: ١٤٨١. ترمذي رقم: ٣٤٧٧. ابن حبان رقم: ١٩٦٠. طبراني رقم: ٧٩١. حاكم رقم: ٨٤٠. بيهقي رقم: ٢٦٧٦}:

**فەضالەی كوڕی عوبەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لەپیاوێ بوو، لەتەحیتا نزای دەكردو لەخودا دەپاڕایەوە، نەسوپاس‌و ستایشی خودای كردو نەدروودی نارد بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).**

**جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە پەلەی كرد) ئەوجا پیاوەكەی بانگ كردو پێی فەرموو: (كاتی كەیەكێ لەئێوە نوێژ دەكا، بالەپێشدا، لەتەحیاتا، بەسوپاس‌و ستایشی جوانی خودا دەست پێ بكا، ئەوجا درووود بنێرێ بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوجا حەزی لەچی نزاو پاڕانەوەیێ بوو، با بیكات).**

**دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سێ فەرموودە زانەكان: ئەبوداوودو تەرمەزی‌و نەسائی گێڕاویانەتەوەو تەرمەزی بە فەرموودەیەكی تەندروستی داناوە، هەروا ئیبنو حیببان‌و حاكمیش گێڕاویانەتەوەو بە فەرموودەیەكی تەندروستیان داناوە.**

**(ڕوونكردنەوە):**

**فەضالەی كوڕی عوبەید هاوەڵە، ئەنصارییە، ئەوسییە، یەكەم نەبەرد كە ئامادەی بوو، شەڕی ئوحود بووە، ئەوجا هەموو شەڕگاكانی پاشی، لەژێر درختەكەدا پەیمانیدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرۆژی حودەیبییەدا، لەپاشا باری كرد بۆ شام، لەدیمەشق نیشتەجێ بووو، لەوێ خانوویەكی بۆ خۆی دروست كرد، موعاوییە كردی بەقازی، هەر لەدیمەشق مردووە، گۆڕەكەی والەوێ، گۆڕەكەی ناسراوە، موعاوییە كردی بەقازی پێی گوت: من لەبەر ئەوە نەمكردووی بەقازی كەتۆم خۆش دەوێ، بەلاّم تۆم**

کردووە بەپەردەی خۆم لەئاگری دۆزەخ! فەضالە لەسەردەمی موعاوییەدا مەرگ بوو بەمیوانی، موعاوییە خۆی چووە ژێر تەرمەکەی، بە عەبدوڵڵای کوڕی فەضالەی گوت: (تۆیش یارمەتیم بدە، شتی وات جارێ تر بۆ ڕێناکەوێ، دەوروبەری ساڵی (٥٣) پەنجاو سێی کۆچی مردووە).

٣٣٦- وَعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قَالَ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَمَرَنَا اَللَّهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَسَكَتَ، ثُمَّ قَالَ: " قُولُوا: اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي اَلْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. وَالسَّلَامُ كَمَا عَلَّمْتُكُمْ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَزَادَ اِبْنُ خُزَيْمَةَ فِيهِ: {فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ، إِذَا نَحْنُ صَلَّيْنَا عَلَيْكَ فِي صَلَاتِنَا}.

{پوختەی موسلیم ٣٠٩ = ٩٠٦ مسلم شیحا = مسلم ٤٠٥. تجرید البخاری/٤، ژمارە: ١٦٨٥ = ٤٧٩٨، ٦٣٥٨ فتح الباری شرح صحیح البخاری}:

لە پوختەی موسلیما ئاوایە:

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەدیوەخانەکەی سەعدی کوڕی عوبادە، لەلای دانیشتبووین، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلامان، بەشیری کوڕی سەعد پێی فەرموو: قووربان! ئەی پیغەمبەری خودا! خودای گەورەو سەروەر، فەرمانی پێمان کردووە کە صەڵاوات لەسەر تۆ بدەین، لەم ئایەتەدا پێمان دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا – الأحزاب/٥٦}.

باشە چۆن چۆنی صەڵاواتت لەسەر بدەین؟

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تاوێ مات بوو، بێ دەنگییەکەی وا درێژەی کێشا، تەنانەت گوتمان: خۆزگە ئەم پرسیارەی لێ نەدەکرد، نەبادا

لەو جۆرە پرسیارانە بێ، کە لەم ئایەتەدا نەهیان لێ کراوە: {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ – المائدة/١٠١}. واتە:

پرسیار لەهەندی شت مەکەن، ئەگەر روون بکرێتەوە بۆتان دەبن بەمایەی نیگەرانی بۆتان!).

جا لەپاش ماوەیێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نیگاو سروشتی بۆ هاتو فەرمووی: (بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي العَالَمِين، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»).

ئەنجا فەرمووی: (ئەمە یەکێکە لەشێوە نایابەکانی سەلاواتدان لەسەرمن، لەکۆتایی تەحیاتا، وەشێوەی سڵاوکردنیش لەمن، وەك لەتەحیاتا فێرکراون ئاوایە: بڵێن: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ: سڵاوو درودو سۆزو میهرەبانیو پیتو فەڕو پیرۆزیی خودا لەسەر تۆ ئەی پیغەمبەری خودا!).

(ڕوونکردنەوە):

١- لەهەندێ گێڕانەوەدا، کە لە فەتحولمولهیمدا ئاماژەی بۆدەکا، دەفەرموێ: (فَسَكَتَ حَتَّى جَاءَهُ الوَحْيُ).

٢- ئەم فەرموودەیە لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، پێشەوا نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەژێر ئەم سەرباسەدا داینـاوە، یا ئەم سەرباسەی بۆیداناوە: (بَابٌ: الصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بَعْدَ التَّشَهُّدِ).

٣- بەپێی ڕاڤەنامە (شەرحە) گەورەکان، مەبەست لەم فەرموودەیە، بەم وەرگێڕانە، تەواو روون دەبێتەوە، کە ئەوەیش مەبەستی سەرەکی بەندەیە، کە بەباشی لەمەبەستو ناوەڕۆکی فەرموودەکان تێ بگەین، تا سوودیان بەکردە لێ وەربگرین.

٤- مەبەست لەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء} ئەو جۆرە پرس‌و داوایانەیە، کە جەخت لەسەر هەندێ پرسیاری وا بکرێ، کە سەردەکێشێ بۆ کارگرانی‌و بارگرانی گەلی ئیسلام، وەك ئەوە کە حەج فەرزبوو، لەسەر موسوڵمانان، هەندێ کەس عەرزی حەزرەتیان کرد: ئایا هەموو ساڵێ حەج فەرزە لەسەرمان؟ پێغەمبەریش وەڵامی نەدایەوە، سوراقە سێ‌جار پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، ئەویش فەرمووی: (نەء، هەموو ساڵێ فەرزنییە، لەتەمەنا یەکجار فەرزە، وەلێ: نەدەبوو ئاوا ورك لەم پرسیارە بگری، خۆ ئەگەر بمگوتبایە ئا هەموو ساڵێ فەرزە، فەرزدەبوو لەسەرتان، وە لەتواناشتانا نەبوو، کەمن بێ دەنگبووم ئێوەیش بێ دەنگ بن).

٥- لەکاتی بانگکردندا، صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نادرێ، بۆ نموونە: کە کەسێ دەڵێ: (ئەی پیغەمبەری خودا!) یا (یا رەسولەللا) یا (ئەی محمد!) باش نییە، کە لەدوای ئەم جۆرە بانگکردن‌و نیدائانەوە بگوترێ: (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وسَلَم). ئێستا هەندێ کەس پەیدابوون، لەم کات‌و شوێنانەدا صەڵاوات لەدیاری پێغەمبەر دەدەن، شتی وا لەپێشینانی ئەم نەتەوەی ئیسلامەدا نەبیستراوە، بەتایبەتی لەپەڕاوە ناودارەکانی فەرموودەداو لە زانایانی فەرموودەوە.

٦- ئەبو مەسعوودی بەدری، ناوی عوقبەی کوڕی عەمرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، بەدرییە، لەگەڵ حەفتا کەسەکەدا، بەکۆی دەنگ ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە، لەوکاتەدا لەهەموویان بەتەمەن بچووکتر بووە، ئامادەی جەنگی ئوحودو نەبەردەکانی دوای ئوحود بووە، سەدو دوو فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا (١٠) دە فەرموودەی هەیە، لە موسلیمدا (١٦) شازدەی هەیە، (٩) نۆیان پەسەندی هەردوولایانن، واتە: بوخاری‌و موسلیم ئەو نۆیەیان گێڕاوەتەوە، کۆی فەرموودەکانی لەبوخاری‌و موسلیمدا یەکسانە بە (٩+١+٧ = ١٧) حەڤدە فەرموودە.

**بۆ ڕاهێنان ئەم کرداره ژمارەییە، شیی دەکەینەوە:**

١- پەسەندی هەردوولا (٩) نۆیە.

٢- بوخاری (١٠) دەی هەیە (٩) نۆکەی لێ دەرکە، ئاوا (١٠ - ٩ = ١) واتە: یەك فەرموودەی لە ئەفرادی بوخارییە لەم دە فەرموودەیە، ئەو نۆکەی تریان، موسلمیش گێڕاویەتەوە.

٣- موسلیم (١٦) شازدەی هەیە (٩) نۆکەی لێ دەرکە، ئاوا: (١٦ — ٩ = ٧) واتە: حەوت فەرموودەی لەئەفرادی موسلیمە.

٤- جا پاش ئەوە کەزانیمان چەند پەسەندی هەردوو لایانەو چەند لە ئەفرادی بوخارییە، یا لەئەفرادی موسلیمە، پەسەندەکەو هەردوو ئەندازە ئەفرادەکە کۆدەکەینەوە، سەرجەمی فەرموودەکانی ئەو کەسە لە صەحیحەیندا دەردەکەوێ، لێرەدا ئاوا: (٩+١+٧ = ١٧) حەڤدە فەرموودە، سەرجەمی فەرموودەکانی ئەبو مەسعوودی بەدری لە بوخاریو موسلیمدا.

ئەبو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) لەلایەنگیرانی عەلی بوو، لە کووفە نیشتەجێ بوو، هەرلەوێش مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموو هاوەڵان بێ).

٧- دانەر مامۆستای گەورەو سەروەر شێخی عەسقەلانی لەکۆتاوە دەفەرموێ: (موسلیم گێڕاویوەتەوە، هەروا ئیبنو خوزەیمە لەگەڵ ئەم زیادەیەدا: (باشە چۆن چۆنی صەڵاواتت لەسەربدەین، کاتێ لەناو نوێژەکانمانا، صەڵاواتت لێ بدەین؟).

٣٣٧– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ، يَقُولُ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ عَذَابِ اَلْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ اَلْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ اَلْمَسِيحِ اَلدَّجَّالِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنْ اَلتَّشَهُّدِ اَلْأَخِيرِ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژماره: ٦٥٧ = ١٣٧٧. مسلم شيحا/١٣٢٤ – ١٣٢٦ = مسلم/٥٨٨}:

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ تـەحيات دەخـوێنن، پـەنا بگـرن بـەخودا، لەم چوار شتە، بڵێن: {اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَـذَابِ اَلْقَبْـرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ اَلْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ اَلْمَسِيحِ اَلدَّجَّالِ}.

لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا (کاتێ لەتەحیاتی دوایی دەبنەوە، پـەنابگرن بەخودای گەورە لەم چوار شتە:

١- لەسزای ناو گۆڕ (مەبەست لەناو گۆڕ ژیانی بەرزەخە).

٢- لەسزای ئاگر (مەبەست دۆزەخە).

٣- لەئەزموونو ئاژاوەی ژیانو مردن.

٤- لەئاژاوەو ئاشووبی جەجاڵەکوێرەی جادووگەر.

٣٣٨- وَعَنْ أَبِي بَكْرٍ اَلصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ): {أَنَّـهُ قَـالَ لِرَسُـولِ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِـي صَـلَاتِي. قَـالَ قُـلْ: " اَللَّهُـمَّ إِنِّـي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ اَلذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِـرَةً مِـنْ عِنْـدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ اَلْغَفُورُ اَلرَّحِيمُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخـاری ٨٣٤، ٧٣٨٨، ٦٣٢٦ = تجريـدی بوخـاری/٤٤٨ = پوختـەی موسليم ٣٠٧ = مسلم/شـيحا ٦٨٠٩ = ٢٧٠٥ مـسلم تـرقيم محمـد فـؤاد. ترمـذی ٣٥٣١. نسائی ١٣٠١}:

ئـەبوبکری صـەدیق (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی بـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قوربان! نزایەکم فێربکە کە لەنوێژەکەما بیکەم.

لەگێڕانەوەیەکی تـری موسـلیما: لەنوێژەکـەماو لەماڵەوەم بیکـەمو ئـەو نزایە بخوێنم؟

فەرمووی: بڵێ: {اَللّٰهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ اَلذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ اَلْغَفُورُ اَلرَّحِيمُ}:

خودایە! من زۆرو ستەمێکی گەلێ زۆرو گەورەم لەخۆم کردووە، جگەلە تۆیش کەسی تر ڕادەی ئەوەی نییە کە لە گوناهان خۆش بێ، دەی بەلوتفو کەرەمو بەخششی خۆت لێم خۆشبەو سۆزو میهرەبانیم لەگەل بنوێنە، بەڕاستی ئەی خودایە! هەر خۆت تاوان پۆشو تاوانبەخشو بەسۆزو میهرەبانیت). {تاج/١، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥٦٦ چاپی چوارەم} + {ریاض/٣، ژمارە: ١٤٧٥، زنجیرە: ٢٥٠}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبوبکری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی (عەبدوڵلای کوڕی عوثمانە) ناسراوە بە ئەبوبکری کوڕی ئەبو قوحافە، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی عەبدولکەعبە بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە عەبدوڵلا، ئەبوبکر قوڕەیشییە، تەمیمییە، دایکی ناوی سەلمای کچی صەخرە، ناسراوە بە ئوممولخەیر. لەپاش ساڵی فیل (عامولفیل) بەدوو ساڵو نیو لەدایك بووە، لەپێش هاتنی ئیسلامو لەپاش هاتنی ئیسلام، هاوڕێتی پێغەمبەری کردووە، لەکاتی کۆچو لەسەفەری کۆچدا، هاوڕێی پێغەمبەر بوو، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، بەهەڵبژاردن ئەبوبکر کرا بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر، پیاوێکی سپیکاری لەڕکەلەی لاواز بوو، زۆر ڕووخۆشو نەرمو نیان بوو، شارەزای زانستی بنەچەی عەرەب بوو، بەتایبەتی لەرەگەزی هۆزی قوڕەیش بەباشی شارەزا بوو، بازرگان بوو، رەفتاری زۆر جوان بوو، هەمیشە خاوەنی دیوەخان بوو، متمانەی بەهەرکەسی بکردایە، بانگهێشتی لێ دەکرد بۆ ئیسلامەتی، زۆر کەس لەسەردەستی ئەودا ئیسلام بووە، وەك: عوسمانی کوڕی عەففانو طەلحەو زوبەیرو سەعدو عەبدولرحمانی کوڕی عەوف.

بەدەوڵەمەندی موسوڵمان بوو، بەڵام کاتێ مەرگ بوو هیچی لەپاش بەجێ نەما!

چەندەین کۆیلەی لەژیانی خۆیدا ئازاد کردووە، کە یەکی لەوانە بیلالی حەبەشی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خودای گەورە بەفەرمانی خۆی ناوی نا (صەدیق) واتە: راستو راستگۆ.

ئەبوبکر ئەو صاحیبی غارەیە، کە خودا لەم ئایەتەدا باسی فەزڵو بەهرەی ئەو دەکاو دەفەرموێ: {إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا – التوبة/ ٤٠}.

ئەبوبکر رابەری خێر بوو لەنێوانی خاتوو خەدیجەو پێغەمبەردا، هەتا لەئەنجاما پێغەمبەر مارەی کرد بۆ خۆی. ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبکر هەڵبژێردرا، کرا بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەی جێنشینییەکەی دوو ساڵو دەوری (٣) سێ مانگ بوو، رۆژی هەینی (٢١) بیستو یەکی (جمادی الآخرة) ساڵی سیازدەی کۆچی، مەرگ بوو بەمیوانی، بەهۆی نەخۆشی سیلەوە، خۆی رایسپارد کە ژنەکەی بیشوات، کە ئەسمای کچی عومەیس بوو، عومەری کوڕی خەتتاب نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەهۆدەکەی عائیشەدا، لەپاڵ گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەردا، بەشەو ناشتیان، تەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵ بوو، بۆ زانینی چمکێ لەکۆشش‌و هەوڵو فەضلی ئەبوبکر بۆ خزمەتی ئیسلام بڕوانە ئەم شوێنانە:

١- تاجی کوردی بەرگی سێ، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٥ + زنجیرە: ١٠١، بەتەواوی + تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٤، ٣٢٣٥، ٣٢٣٦، ٣٢٣٧، ٣٢٣٨، ٣٢٣٩، ٣٢٤٠، ٣٢٤١، ٣٢٤٢، ٣٢٤٣، ٣٢٤٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٢٥٤ + تاج/٣، زنجیرە:

٥، ژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ژمارە: ٣٢٦٩ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٤، ٣٢٧٥، ٣٢٧٣، ٣٢٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٩، ٣٢٨٠ + ژمارە: ١٥٣٤ لەپوختەی موسلیم.

هەروا بڕوانە ئەم شوێنانە بۆ شانازیو سەروەریەکانی ئەم بنەماڵەیە:

آ- لەتجریدی بوخاری بەشی کوردییەکەی.

١- ژمارە: ٣ ژیاننامەی خاتوو عائیشەی کچی ئەبوبکری صەدیق + ژمارە: ١٨٢، ١٠٩٤، ١٢٩٩، ٧٨٤.

٢- ژمارە: ٧٥ ژیاننامەی خاتوو ئەسمای کچی ئەبوبکری صەدیق.

٣- ژمارە: ٣٤٩ ژیاننامەی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبکری صەدیق.

ب- پوختەی موسلیم ژمارە: ١٥٣٣.

١- ژمارە: ٤١ خاتوو عائیشە.

٢- ئەسماء بنت أبی بکر الصدیق/١٨٩.

٣- ١٢٣٧ قاسم بن محمد بن أبی بکر الصدیق.

**٣٣٩**- وَعَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّيْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَكَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ: " اَلسَّلَام عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ " وَعَنْ شِمَالِهِ: " اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اَللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ} . رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِسَنَدٍ صَحِيحٍ.

{صحیح، تمام المنة: ١/١٧١، الصحیح المسند: ١١٩٢ + پوختەی موسلیم ٣١٠ = ١٣١٥ شیحا}:

واثیلی کوڕی حوجر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم بەجەماعەت کردووە، بەلای ڕاستو بەلای چەپی خۆیدا، سلاوی دەدایەوە، لەپێشا بەلای ڕاستیدا سلاوی دەدایەوەو دەیفەرموو:

«السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ». دروودو سۆزو پیتو فەڕی خوداتان لەسەر بێ.

ئەوجا بەلای چەپیدا سلاوی دەدایەوەو دەیفەرموو:

«السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ».

ئەبوداوود بەڕشتەیەکی تەندروست گێڕاویەتەوە. {تاج/١، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٤٨٤}.

٣٤٠- وَعَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ: " لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اَللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا اَلْجَدِّ مِنْكَ اَلْجَدُّ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٥٤ = ٨٤٤، ١٤٧٧، ٢٤٠٨، ٥٩٧٥، ٦٣٣٠، ٦٤٧٣، ٦٦١٥، ٧٢٩٢ فتح الباری. پوختەی موسلیم ژمارە: ٣١٢ = ١٣٣٧ مسلم/شیحا = مسلم ٥٩٣}:

وەرادی نۆکەری موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: موغیرە نامەی نووسی بۆ موعاوییە، لەسەر داوای موعاوییە خۆی، لەوکاتەدا کە موعاوییە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوون موغیرەیش میری سەر کووفە بوو، لەلایەنی موعاوییەوە کرابوو بە کارمەندی سەرشاری کووفە، موغیرە دەیگوتو من دەیمنووسی، بۆی نووسی: جاران کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژ دەبۆوەو سڵاوی دەددایەوە لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکان ئەم ویردەی دەخوێند: دەیفەرموو:

{لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اَللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا اَلْجَدِّ مِنْكَ اَلْجَدُّ}:

واتە: تەنها خودای گەورە خودایەو بەس، خودای تر نییە بێجگە لەو، خوایەکی تاکو تەنیایە، بێ هاوەڵە، هیچ هاوبەشی نییە، موڵکو دارایی و دەسەڵات هەمووی لەڕاستیدا هەر بۆ ئەوە، سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوە توانای هەموو شتێکی هەیە. ئەی پەروەردگارم! ئەوەی کە تۆ بیدەی بەکەس

نابڕێت، هەرچیش کەتۆ نەیدەیت بەکەس نادرێ، دارایی داراو، دەستداریی دەستدار، هیچ دادێکیان نادەن لەلای تۆ، تەنها سۆزو میهری تۆ فریای بەندە دەکەوێو بەس). {تاج/٣١٧/١ ج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٢٦}.

٣٤١- وَعَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: {إِنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ دُبُرَ كُلِّ اَلصَّلَاةِ: " اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِـكَ مِـنْ اَلْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ اَلْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ اَلْعُمُـرِ، وَأَعُـوذُ بِـكَ مِنْ فِتْنَةِ اَلدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ اَلْقَبْرِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/٥، ژمـارە: ١٩٨٨ = ٦٣٧٠، ٢٨٢٢، ٦٣٦٥، ٦٣٧٤، ٦٣٩٠ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

عەمری کوڕی مەیمون (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودای لێ بێ) وەك چۆن مامۆستا لەحوجرە منالْ فێری خوێندنەوەو نووسین دەکا، ئاوا کوڕەکانی خۆی، فێری ئەم وشانە دەکردو دەیفەرموو:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هەموو نوێژێ پەنای دەگرت بەخودا لەمانەو فەرمانی پێمان دەکرد، کە ئەم ڕستەو وشەو نزایانە بڵێینو پەنابگرین بەخودا لەمانە، پێغەمبەر لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە دەیفەرموو:

{اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ اَلْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ اَلْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِـكَ مِـنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ اَلْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ اَلدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ اَلْقَبْرِ}:

خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەڕەزیلیو چرووکیو، لەترسنۆکیو، لەوەی کەبگەمە تەمەنی کەسیفیو داماویی، هەروا پەنادەگرم بەتۆ لەئاژاوە گەورەکەی جیهان واتە: لەجەجالْ، وەپەنادەگرم بەتۆ لەسزای ناوگۆڕ).

لەژمارە (٢٨٢٢)ی بوخاریدا ئەمەی زیاترە، بگێڕ (ڕاوی) لەعەمری کوڕی مەیموونەوە، کە عەبدولەلیکی کوڕی عومەیرە، فەرمووی: ئەم

فەرموودەی عەمری کوڕی مەیموونم گێڕایەوە بۆ موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، کە عەمری کوڕی مەیموون فەرموودەیێ وا لەباوکتەوە دەگێڕێتەوە، موصعەب فەرمووی: عەمر ڕاست دەکات.

(ڕوونکردنەوە):

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) لە عەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دە کەسەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـوژدەی بەهەشـتی پێیـان داوە، لـە موسـوڵمانە هـەرە پێـشینەکانە، لەتەمەنی چواردە ساڵیدا ئیسلام بووە، ئامادەی جەنگی بەدر بووە، هەروا ئامادەی غەزاکانی تری پاش بەدر بووە، نزای گیرا بوو، یەکەم کەس بوو، کە یەکەم تیری لە ڕێگەی خودادا هاویشت، لەکۆچەرە هەرە پێشینەکانە، دووسەدو حەفتا فەرموودەی لەپەڕاوە ناودارەکانی سوننەتدا هەیە، لەبوخاری پیرۆزدا (٢٠) بیست فەرموودەی هەیە، لەموسلیمدا (٢٣) بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، موتتەفەقو عەلەیهین، سەرجەمی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا = ١١ + ٩ + ١٢ = ٣٢ فەرموودە، لەسەرەدەمی پێشەوا عوثماندا، لەسەر دەستی سەعددا مەدائین ئازاد کرا، سەعد کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بە فەرمانداری سەر وڵاتی عێراق، لە پەنجاو حەوتی کۆچیدا مردووە، لەبەقیع بەخاك سپێردراوە، دواترین کەسە لە عەشەرەی موبەششەرە کە مردووە. سەعد چواردە کوڕو حەڤدە کچی هەبووە، لەمانە پێنجیان فەرموودەیان لەباوکیان وەرگێڕاوەتەوە: ١- عامر ٢- محمد ٣- مصعب ٤- عائیشە ٥- عومەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) سەعد خۆی دەفەرموێ: لەپێش دانانو فەرز بوونی نوێژدا ئیسلام بووم، یەکێك بوو لەو شەش کەسە کە عومەر هەڵیبژاردن بۆ جێنشینی پێغەمبەر لەپاش خۆی، پێغەمبەر نزای بۆ کرد کە نزا گیرا بێ، یەکێ بوو لە سوارچاکانی هۆزی قوڕەیش، لەشەڕگەو غەزاکانی پێغەمبەردا، سەعد ئێشکی

پێغەمبــەری دەگــرت، عومــەر کــردی بــە فەرمانــدەی ســوپای ئیــسلام بــۆ رزگـارکردنی ولاتـی فـارس، وە زۆربـەی وڵاتـی فارسـی لەسـەر دەسـتی ئـەودا، ئـازادکرا، لـە نەبەردەکـەی قادسـیەدا، کـە لـەنێوان سـوپای ئیـسلامو ئێرانـدا روویدا، سەعد دەستی باڵای هەبوو.

لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عوسمان، لەکاتی ئاژاوەکەدا، خۆی پاراست لەشـەڕی براکوژیو لـەماڵی خـۆی دانیـشتو لەجـەنگ کـەناری گـرتو شـەڕی براکوژیو موسوڵمان کوژی نەکرد، وە بەخێزانەکـەی خـۆی گـوت کـە لـەبارەی ئەم جەنگو ئاژاوەوە هەواڵی پێ نەڵێن. لەعەقیق وەفاتی کردووە، کە دە میل لەشاری مەدینەوە دوورە، پیاوان بەسەرشان تەرمەکەیان هەڵگرتو بردیانەوە بۆ مەدینە، لەمزگەوتەکەی پێغەمبـەرا نوێـژی تـەرمی لەسـەر کـرا، مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم، بەنوێـژی کـرد. دەڵـێن: سـاڵی پـەنجاو پێنجـی کۆچـی گیـانی سـپاردووە، لەگۆڕسـتانی بـەقیع نێـژراوە، کاتـێ مـرد تەمـەنی بەچـەن سـاڵێ لەحەفتا تێپەڕی کردبـوو، لەسـەرەمەرگا راسـپێری کـرد: کەجببەیـەکی کۆنی هەیە، لەو جببە کۆنەدا کفنی بکەنو ئەو جببەیە بکەن بەکفنی، چونکە لـە رۆژی غـەزای بـەدردا، کاتـێ بـەرەنگاری هاوبەشـپەیداکەرەکان بـووە، ئـەو جبەیەی لەبەردا بووە، وە بۆ ئەم رۆژە هەتا ئێستا ئەم جببەیەی هەڵگرتووە، ئەو جبەیە لە خوری بوو. کاتـێ سـەعد مـەرگ بـوو بـەمیوانی، هاوسـەرەکانی پێغەمبەریش لەناو مزگەوتدا نوێژی مردوویان لەسەر تەرمەکەی کرد.

بڕوانە ئەم شوێنانە:

١- پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٠٠، ژمارە: ٢٩٦، ژمارە: ٣١٠، ژمارە: ٤٧٨.

٢- تاج/٣، زنجیرە: ١٢ چاپی چوارەم لاپـەڕە/٦٠٩ لـەژمارە: ٣٣٢٦وە هـەتا ژمارە: ٣٣٣١.

٣- تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٦ = ٢٧ فەتحولباری.

٣٤٢- وَعَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا اِنْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اِسْتَغْفَرَ اَللَّهَ ثَلَاثًا، وَقَالَ: " اَللَّهُمَّ أَنْتَ اَلسَّلَامُ وَمِنْكَ اَلسَّلَامُ. تَبَارَكْتَ يَا ذَا اَلْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم/شيحا ١٣٣٣، ١٣٣٤ = مسلم ٥٩١. أبوداود ١٥٢٣. ترمذى ٣٠٠. نسائى ١٣٣٦}:

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەسلاوی نوێژی دەدایەوە، سێ جار داوای لێبووردنی لەخودا دەکردو دەیفەرموو:

{اِسْتَغْفَرَ اَللَّهَ الَّذى لاَ إِلهَ إِلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ}.

سێ جار ئاوای دەفەرموو، ئەوجا دەیفەرموو:

{اَللَّهُمَّ أَنْتَ اَلسَّلَامُ وَمِنْكَ اَلسَّلَامُ. تَبَارَكْتَ يَا ذَا اَلْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ}.

واتە: خوداوەندە! ئەی پەروەردگارا! سەلام ناوی تۆیەو سەرچاوەی سەلامو سەلامەتیو ئامانو پەناو هانا هەرلەلای تۆیە، بەڕاستی تۆ زۆر بەفەڕو پیرۆزو گەورەیت، ئەی خاوەن شکۆی ڕێزدارو شکۆمەند!). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٢٤}.

٣٤٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ سَبَّحَ اَللَّهَ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَحَمِدَ اَللَّهِ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ ، وَكَبَّرَ اَللَّهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ ، فَتِلْكَ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ اَلْمِائَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ لَهُ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ اَلْبَحْرِ} . رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ أُخْرَى: أَنَّ اَلتَّكْبِيرَ أَرْبَعٌ وَثَلَاثُونَ.

{موسليم/شيحا ١٣٥١ = مسلم ٥٩٧ + موسليم/شيحا ١٣٤٦، ١٣٤٧، ١٣٤٩ = بخارى ٨٤٣، ٦٣٢٩}:

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسـێ لـەپاش هـەموو نوێـژێ، سـیو سـێ جار (سبحان الله) بکا، وەسیو سێ جار (الحمـدللهِ) بکـا، وە سـیو سـێ جـار (الله اکبر) بکا، کە ئەمە هەمووی دەکاتـە (٩٩) نـەوەدو نـۆ جـار، وەلەسـەری جـاری سەدهەما بڵێ:

{لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْـدُ، وَهُـوَ عَلَـى كُـلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}.

هەرکەسی لەپاش هەموو نوێژێ ئەمـە بکـا، خـودا لەهـەموو تاوانـەکانی خـۆش دەبـێ، ئەگـەر چـی تاوانـەکانی وەك کـەفی دەریـاش زۆربـن. {تـاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٢٩}.

ئەمـەیش گێڕانـەوەی دووەمـە، کـە دانـەر دەفـەرموێ: لەگێڕانەوەیـەکی تری موسلیما (الله اکبر)ەکان سیو چوارن، {موسلیم/شیحا ١٣٤٨و ١٣٤٩} ئەمـە دەقی ئەو گێڕانەوەیە کە دەڵێ:

کـەعبی کـوڕی عـوجرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چەند وشەو چـەند تەسـبیحاتێ هـەن لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە دەگوترێن، هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ بیانڵـێ، یابیانکـات قـەت نائومێـد نابـێ، ئـەویش ئەمەیـە: لـەپاش هـەموو نوێژێکی فەرز سیو سێ (سبحان الله)و سیو سـێ (الحمد لله)و سـیو چـوار (الله اکبر) بکا. {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٢٧}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەهەڵـەی چـاپ ئـەم رسـتەی (وَأربـع وثلاثـون تکـبیرة...) لـەتاجول ئوصولدا، لەعەرەبییەکەو وەرگـەڕاوە کوردییەکـەدا نووسـراوە: سـیو سـێ (الله اکبر) بکا، ڕاستەکەی (٣٤) سیو چوار (الله اکبر) بکا.

٢- کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەپیاوانی بوخاریو موسلیمە، واتە گێڕانەوەی هەم لەبوخاریو هەم لەموسلیمدا هەیە، ئامادەی داستانەکەی حودەیبییە بووە، لەشەڕێکا دەستێکی پەڕی، لەکووفە نیشتەجێ بوو، خەڵکی مەدینەو کووفە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەهێزترین ڕاوبۆچوون ئەوەیە کەساڵی پەنجاو سێی کۆچی لەشاری مەدینە مردووە، لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا.

{بڕوانە: تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٣٧ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٨٨ + تاج/٢، ژمارە: ١٦٥٠ (واتە: ژمارە: ١٦٤٩ی دووبارە، لەزنجیرە: ١٢٥} .

٣٤٤- وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهُ: " أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ: لَا تَدَعَنَّ دُبُرَ كُـلِّ صَـلَاةٍ أَنْ تَقُـولُ: اَللَّهُـمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُـسْنِ عِبَادَتِـكَ} رَوَاهُ أَحْمَـدُ، وَأَبُـو دَاوُدَ، وَالنَّـسَائِيُّ بِسَنَدٍ قَوِيّ. {صحيح الجامع ٧٩٦٩، الـصحيح المـسند ١١٠٧. أبـوداوود رقـم: ١٥٢٢. نسائی ١٣٠٣. احمد: ٢٤٤}:

دەقەکەی لەتاجول ئوصولدا:

موعـاذی کـوڕی جەبـەل (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) دەسـتی گـرتمو فـەرمووی پـێم: (ئـەی موعـاذ! بـەخودا مـن تـۆم زۆر خـۆش دەوێ، ئـەی موعـاذ! کەواتـە بـا ئامۆژگارییـەکت بکەم: لەپاش هەموو نوێژێ، ئەو وشانە بڵێو هەرگیز وازیان لێ مەهێنە، بڵێ: {اَللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ} .

خـودای گـەورەو سـەروەرم! یاریـدەم بـدە لەسـەر ذیکـرو یـادی خـۆتو، لەسەر سوپاسو ستایشی خۆتو، لەسـەر بەنـدەییو عیبـادەتی خـۆت، لەسـەر شێوەیەکی جوانو شیرین. {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣١} .

جیهان سەد چەندان، خۆش‌و نازدار بێ
تەمەنت بەساڵ هەزار هەزار بێ
تاماوی بەختت سەراسەر یاربێ
بەبێ یادی خوا بەزەهری ماربێ
یادی تۆ خوایە! ئارامی گیانە
دینی تۆ خوایە! نوری ژیانە
قەت خۆزگەت نەبێ برا! بەوانە
کە سەرلێشێواو هەردوو جیهانە

٣٤٥- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ قَرَأَ آيَةَ اَلْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ اَلْجَنَّةِ إِلَّا اَلْمَوْتُ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع ٦٤٦٤ الصحيح المسند: ٤٧٨. نسائي رقم: ٩٩٢٨. ابن حبان ٢٠٢٠. أبوداود رقم: ١٥٢٢}:

ئەبو ئومامە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ، هەموو جارێ، لەپاش نوێژە فەرزەکان، ئایەتولکورسی بخوێنێ، هەرکە مرد یەکسەر دەچێتە بەهەشت).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

فەرموودەزانی مەزن شێخی طەبەرانی ئەمەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە: (هەرکەسێ، هەموو جارێ، لەپاش نوێژە فەرزەکان ئایەتولکورسی‌و سوورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ) بخوێنێ، هەرکە مرد یەکسەر دەچێتە بەهەشت).

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیە وا سوننەتە کەنوێژخوێن، لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە، ئایەتولکورسی‌و سوورەتی قولهووەللا بخوێنێ.

٣٤٦- وَعَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. {بوخارى ٦٣١}:

**مالیکی کوڕی حووەیریث (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چۆن دەبینن کەمن نوێژ دەکەم ئێوەیش ئاوا نوێژ بکەن).**

٣٤٧- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {قَالَ لِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ وإِلاَّ فَأَوْمِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٥٦ = ١١١٧، ١١١٨ فتح البارى}:

**عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) کەخۆی پیاوێکی مەیاسیری دار بوو، فەرمووی: مەیاسیریم بوو، لە پێغەمبەرم پرسی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر مرۆڤی ساغ بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکا چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەی کە بەپێوە نوێژ بکاو فاتیحەو قورئانەکە بەڕاوەستانەوە بخوێنێ ئەوە خێرترە، بەڵام ئەوەی بەدانیشتنەوە نوێژبکا، ئەوە نیوەی پاداشی ڕاوەستانی بۆ هەیە، وە ئەوەی بەڕاکشانەوە بیکات، ئەوە نیوەی پاداشی دانیشتووی هەیە.**

**عیمران فەرمووی: وەلەبارەی نوێژی نەخۆشەوە لێم پرسی، فەرمووی: (ئەگەر دەتوانی ئەوا بەپێوە نوێژ بکە، خۆ ئەگەر ناتوانی ئەوا بەدانیشتنەوە بیکە، خۆ ئەگەر بەدانیشتنەوەش نەت توانی ئەوا بەرەو قیبلە لەسەرلا نوێژەکەت بکە، چی فەرز بێ، چی سوننەت، لەکاتی نەخۆشیدا، چونکە مەهانەی ڕەوای هەیە، بەهۆی دانیشتن یان پاڵکەوتنەوە پاداشی کەم ناکات).**

{تاج/١، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ٩٩٥}.

(ڕوونکردنەوە):

ئـەم ڕسـتەیە (وَإِلاّ فَـأَوْمِ) لەبوخاریـدا نییـە، بـەڵام ئیمـامی بوخـاری سەرباسـەکەی ئـاوا دانـاوە (بـاب: الـصلاة القاعِـدِ بالإيمـاءِ) بـەڵام لەهەنـدێ سەرچاوەی تردا، شتی وا هەیە، ئەگەر بەڕاکشانیشەوە نەت توانی، بەئاماژەی ئەندام نوێژ بکە، وە زاناکانیش کار بەوە دەکەنو دەڵێن:

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا}.

٣٤٨- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَـالَ لِمَرِيضٍ - صَلَّى عَلَى وِسَادَةٍ ، فَرَمَى بِهَا - وَقَالَ: " صَلِّ عَلَى اَلْأَرْضِ إِنْ اِسْتَطَعْتَ، وَإِلَّا فَأَوْمِئْ إِيمَاءً ، وَاجْعَلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ بِـسَنَدٍ قَـوِيّ وَلَكِنْ صَحَّحَ أَبُو حَاتِمٍ وَقْفَهُ.

{صحيح، صفة الصلاة ١/٧٨. بيهقى رقم: ٣٤٨٤}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ سەردانی نەخۆشێ، ڕوانی کـە کوڕنـووش دەبا سـەرینێکی دانـاوە، کوڕنووشـی لەسـەر دەبـا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) پشتییەکەی لابردو پێی فەرموو: (ئەگەر دەتوانی نوێژێکی ئاسایی بکە، چەمینەوەو کوڕنووشو بنەماکانی تری نوێژ، وەك خۆیـان ئـەنجام بـدە، ئەگەر شتێکت لەنوێژەکـەت بـۆ نـەدەکرا، ئـەوا بـەهێماو بـەئاماژە بیکـە، وەك ئەوە ئەگەر نەتدەتوانی بەپیوە نوێژ بکەیو چـەمینەوەو کوڕنووشـی ئاسـایی ئەنجام بدەی، ئەوا چۆنت بۆ دەست دەدا ئاوا نوێژ بکەو بەئاماژە ئامـاژە بکـە، با کوڕنووشەکەت نزمتر بێ، لەچەمینەوەکەت). بەیهەقی بەڕشتەیەکی بەهێز گێڕاویەتەوە، بەڵام ئەبو حاتەم ئەوە بەراسـت دادەنـێ، کـەموقوف بـێ لەسـەر جابیر.

(ڕوونکردنەوە):

١- باسی چۆنێتی نوێژ (٣٤٨ – ٢٢٧ = ٧١) حەفتاو یەك فەرموودەی واتیادا.

٢- سوننەتە کە مرۆڤ لەلای زانایەك چۆنێتی نوێژ لەهەموو ڕوویەکەوە فێربێ، بەڵام ئەو ئەندازەیەی کە نوێژە فەرزەکانی پێ لەکۆڵ بکەوێ، فێربوونی ئەو ئەندازەیە فەرزی عەینە، لەسەر موسوڵمانی عاقڵی ڕەسیدە.

٣- نوێژ کۆمەڵێ مەرجی هەیە، دەبێ بێنەدی لەکاتی نوێژ کردنا، وەك هەبوونی دەسنوێژ، یا تەیەمموم، لەگەڵ لەشپاکیو دەسنوێژو ڕوو کردنە ڕووگەو هاتنی کاتی نوێژەکە.

٤- لە فەرموودەکانا ڕوونکراوەتەوە کە لەناو نوێژدا چی دەکرێو چی ناکرێ.

٥- نزای سەرەتای نوێژ، نوێژخوێن بەتەنها بێ، یان لەکۆمەڵا بێ، نوێژەکە فەرز بێ یان سوننەت بێ، حازر بێ، یان قەزا نزای سەرەتای نوێژ سوننەتە.

٦- چەند ئێستی لەنوێژدا هەیە، هەر ئێستەی نزای تایبەتی هەیە.

٧- چۆنێتی دانیشتن لەتەحیاتا.

٨- چۆنێتی دەستگرتنو دەست بەرزکردنەوە لەکاتی الله اکبر کردنەکاندا.

٩- دەستگرتن لەسەر سینگ لەوەستاندا سوننەتە، دەستی ڕاست دادەنرێ لەسەر دەستی چەپ.

١٠- خوێندنی سوورەتی فاتیحە لەهەموو ڕکاتێکدا فەرزە.

١١- کەی (بسم الله الرحمن الرحیم) بەدەنگی بەرز دەکرێ.

١٢- ئامین لەپاش فاتیحە سوننەتە.

١٣- لەهەندێ كاتا، كە موسوڵمان قورئانی لەبەر نەبوو، دەتوانی لەباتی فاتیحە ویرد بخوێنێ، بەمەرجی خۆی.

١٤- لەچەمینەوەو كوڕنووشا قورئان ناخوێندرێ.

١٥- نزای ناوچەمینەوەو كوڕنووش‌و هەڵسانەوە لەچەمینەوە.

١٦- كوڕنووش ئەبی لەسەر حەوت ئێسك بێ (ژمارە: ٣١٧).

١٧- لەكوڕنووشا هەردوو باڵ بڵاو دەكرێنەوەو ئانیشك لە زەوی بەرز دەكرێتەوەو هەردوو بەری دەست بەكراوەیی لەسەر جێگە نوێژەكە دائەنرێ، سەری پەنجەكان بەرەو رووگە دەبن.

١٨- قونووت كەی هەیەو كەی نییە (ژمارە: ٣٢٤، ٣٢٥ هەتا ژمارە: ٣٢٩).

١٩- دەست لەپێش ئەژنۆ دادەنرێ لەكاتی دابەزین بۆ كوڕنووش.

٢٠- چۆنێتی دانیشتن بۆ تەحیات (ژمارە: ٣٣٢ هەتا ژمارە: ٣٣٨).

٢١- سڵاو لەپێشا بەلای راست‌و ئەوجا بەلای چەپا، یەكەم واجبەو دووەم سوننەتە، واباشە بڵێ: (السَّلاَمُ علیكم ورحمة اللهِ) وە درێژی نەكاتەوە.

٢٢- نزای پاش نوێژە فەرزەكان.

٢٣- خوێندنی ئایەتولكورسی‌و قولهووەڵلا لەپاش هەموو نوێژێكی فەرز سوننەتە.

٢٤- لەسەردەمی پێغەمبەردا، هاوەڵەكانی، خودی پێغەمبەریان دەكرد بەسەرەمەشق بۆ خۆیان، لەپاش مەرگی پێغەمبەریش فەرموودەو سوننتە دامەزراوەكانی دەكرێن بەسەرمەشق.

٢٥- بەهیچ شێوەیێ رێگە نادرێ، كەنوێژ نەكرێ، بەپێی توانی كەس دەبێ نوێژ بكا، ئەگەر نەیتوانی بەئاماژەی ئەندامەكانی وەك: سەر، وەك چاو ئەنجامی بدا.

٢٦- بۆ ئەم باسە بڕوانە: (ریاض الصالحین) بەرگی/٣، زنجیرە: ١٨٧ هەتا زنجیرە: ٢١٥.

## ١٨- باسى كوڕنووشى هەڵەو شتى تريش وەك كوڕنووشى قورئانخوێندنو كوڕنووشى سوپاس

## بَاب: سُجُودُ السَّهْوِ وَغَيْرِهِ مِنْ سُجُودِ التِّلَاوَةِ وَالشُّكْرِ

٣٤٩- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى بِهِمُ الظُّهْرَ، فَقَامَ فِي اَلرَّكْعَتَيْنِ اَلْأُولَيَيْنِ، وَلَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ اَلنَّاسُ مَعَهُ، حَتَّى إِذَا قَضَى اَلصَّلَاةَ، وَانْتَظَرَ اَلنَّاسُ تَسْلِيمَهُ، كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ. وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، ثُمَّ سَلَّمَ} أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ، وَهَذَا لَفْظُ اَلْبُخَارِيِّ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {يُكَبِّرُ فِي كُلِّ سَجْدَةٍ وَهُوَ جَالِسٌ وَيَسْجُدُ وَيَسْجُدُ اَلنَّاسُ مَعَهُ، مَكَانَ مَا نَسِيَ مِنَ الْجُلُوسِ}.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٤٤٥ = ٨٢٩، ٨٣٠، ١٢٢٤، ١٢٢٥، ١٢٣٠، ٦٦٧٠. فتح البارى. موسليم/شيحا/١٢٦٩}:

عەبدوڵلای كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) كە دایكی ناوی بوحەینەیە، كە لەهۆزی ئەزدی شەنووئەیە، كە هاوپەیمانی نەوەی عەبدومەنافە، كە یەكێكە لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی بۆمانكرد، لەڕكاتی دووەمیدا یەكسەر هەڵسایەوە، تەحیاتی یەكەمی نەخوێند، نوێژكەرەكانیش لەگەڵیدا هەڵسانەوە، جا كاتێ نوێژەكەی تەواوكرد، مەردوم چاوەڕوانی ئەوەبوون كە سڵاو بداتەوە، لەوكاتەدا بەدانیشتنەوە ئەڵڵاهوئەكبەری كردو لەپێش سڵاودانەوەدا دوو كوڕنووشی برد، لەجیاتی ئەو تەحیاتەی كە لەیادی چوو بوو، ئەوجا سڵاوی دایەوە، خەڵكەكەیش لەگەڵ ئەودا ئەم دوو كوڕنووشەیان برد {تاج/١، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٣٧}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (١٢٧٠)ی موسلیما/شیحا، عەبدوڵڵا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی دەكرد، تەحیاتی

يەکەمی نەخوێند، دوایی هەستی کرد کەوا تەحیاتێ فەرزارە، جا کاتێ نوێژەکەی تەواوکردو لەرکاتی چوارەمدا دانیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەپێش سلاودانەوەدا، دوو کوڕنووشی هەڵەیبرد، لەپێشا ئەڵلاهوئەکبەری دەکردو ئەوجا کوڕنووشی دەبرد، ئەڵلاهوئەکبەری بۆ بردنی هەردوو کوڕنووشەکە کرد، ئەم دوو کوڕنووشەی بەدانیشتنەوە لەپێش سلاوددانەوەدا برد، لەجیاتی ئەو تەحیاتە کە بەهەڵە نەیخوێندو دانەنیشت بۆی، خەڵکەکەیش چاویان لەوکردو ئەو دوو کوڕنووشەیان برد لەگەڵیدا، ئەوجا بەهەردوو لادا سلاوی نوێژەکەی دایەوەو نوێژکەرەکانیش لەدوائەوەوە سلاویان دایەوە).

٣٥٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِحْدَى صَلَاتِي اَلْعَشِيِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ فِي مُقَدَّمِ اَلْمَسْجِدِ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، وَفِي اَلْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَخَرَجَ سَرَعَانُ اَلنَّاسِ، فَقَالُوا: أَقُصِرَتْ. الصَّلَاةُ، وَفِي القَوْمِ رَجُلٌ يَدْعُوهُ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَا اَلْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، أَنَسِيتَ أَمْ قُصِرَتْ؟ فَقَالَ: " لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ " فَقَالَ: بَلَى، قَدْ نَسِيتُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ، أَوْ أَطْوَلَ[ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، فَكَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ، أَوْ أَطْوَلَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {صَلَاةُ اَلْعَصْرِ}.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٩٣ = ٤٨٢، ٧١٤، ٧١٥، ١٢٢٧، ١٢٢٨، ١٢٢٩، ٦٠٥١، ٧٢٥٠ فتح الباری شرح صحيح البخاری. پوختەی موسليم/٣٥٢ = ١٢٨٨ مسلم/شيحا = ٥٧٣ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی نیوەڕۆ یا عەصری بۆمانکرد، دووڕکاتی بۆ کردینو سلاوی دایەوە، تەختەیەك لەناو مزگەوتا، لەرووی

رووگەوە هەڵ سپێنرابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا چوو پاڵیدا بەو تەختەیەوە کە برێتی بوو لەو کۆتەرە خۆرمایە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش دروستکردنی دوانگەکەیدا پاڵی پێوەی دەدا، وەك عاجزو زیزوابوو، دەستی راستی نایە سەردەستی چەپی‌و پەنجەکانی تێك پەڕاندو روومەتی لای راستی دانا لەسەر پشتی دەستی چەپی، وە ئەوانەی کە بەپەلەبوون لەدەرگاکانی مزگەوتەوە چوونە دەرەوەو وایانزانی کە جەماعەت تەواو بووە، نوێژکەرەکانی تریش لەبەرخۆیانەوە گوتیان: ئەرێ نوێژ کورتکراوەتەوە؟ وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباتی چوار رکات دوو رکاتی کرد.

ئەبوبەکرو عومەریش (رەزای خودایان لێ بێ) لەناو کۆمەڵەی نوێژخوێنەکانا بوون، سامیان لەپێغەمبەر کردو پرکێشییان نەکرد کە سەبارەت بەم بابەتە پرسێ، قسەیێ لەگەڵ حەزرەتدا بکەن، لەناو کۆمەڵەکەدا پیاوێ هەبوو، پێیان دەگوت: خێرباقی کوڕی عەمر، ئەم پیاوە هەردوو دەستی، کەمێ درێژبوو لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی نابوو ذولیەدەین. واتە: دوو دەست درێژکوولە، جا ئەو پیاوە هەڵسا عەرزی خۆشەویستی کرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یاتۆ لەیادت نەبوو، کەوا لەجیاتی چوار رکات دوو رکاتت کرد؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ‌و باوك‌و دایك‌و ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست، گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دینیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: ئەم دووشتە هیچیان رووی نەداوە، نەمن لەبیرم چووەو نە نوێژیش کورت بۆتەوە، ئەویش عەرزی کرد: با، ئەی پیغەمبەری خودا! یەکێ لەم دووشتە رووی داوە، پێغەمبەریش بەڕاست‌و بەچەپا، تەماشای خەڵکەکەی کردو رووی تێ کردن‌و فەرمووی: (ئایا شتی وا رووی داوە، وەك

ذولیەدەین دەڵێ وایە؟) گوتیان: بەڵێ، ئەی پیغەمبەری خودا! قسەکەی زولیەدەین تەواوە، تەنیا دوو رکاتت کرد، ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆ جێگەی نوێژەکەی خۆی‌و، پێشکەوتەوەو دوو رکاتی تری کردو، بەدانیشتنەوە لەپاش سلاودانەوە، دوو کوڕنووشی هەڵەی لەسەر ئەم شێوەیە برد:

لەپاش سلاودانەوەی جاری دووەم، ئەڵلاهوئەکبەری کردو کوڕنووشێکی ئاسایی برد، یان کەمێ درێژتر لە کوڕنووشی ئاسایی، ئەوجا ئەڵلاهوئەکبەری کردو لەکوڕنووشی یەکەم سەری بەرزکردەوەو دانیشت، ئەوجا ئەڵلاهوئەکبەری کردو کوڕنووشێکی ئاسایی تری برد، یان کەمێ لە ئاسایی درێژتر، دیسانەوە ئەڵلاهوئەکبەری کردو سەری بەرزەوەکردو دانیشتو، بۆ جاری سێیەم، بەهەردوولادا سلاوی دایەوە!). {تاج/٣٢٦/١، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٤٠، ٦٤١، ٦٤٢ چاپی/١، لاپەڕە: ٣٢٦ چاپی چوارەم ژمارە: ٦٤٠}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژە بۆ ژمارە (١٢٩٢)ی موسلیم شیحا دەکا، کە لەم گێڕانەوەی موسلیمدا نوێژەکە دیاری دەکا کە نوێژی نیوەڕۆ بووە.

٣٥١- وَلِأَبِي دَاوُدَ، فَقَالَ: {أَصَدَقَ ذُو اَلْيَدَيْنِ؟ " فَأَوْمَئُوا: أَيْ نَعَمْ}. وَهِيَ فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" لَكِنْ بِلَفْظِ: فَقَالُوا.

لەم گێڕانەوەی ئەبو داووددا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا ئەم قسەی زولیەدەین راستە؟) ئەوانیش بە ئاماژە تێیان گەیاند، کە قسەکەی راستە، ئەم گێڕانەوەیە لە بوخاری‌و موسلیمیشدا هەیە، بەلام لەوانا ئاوا وەلام دەدەنەوە: گوتیان: بەڵێ راستە).

٣٥٢- وَهِيَ فِي رِوَايَةٍ لَهُ: {وَلَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَقَّنَهُ اَللَّهُ تَعَالَى ذَلِكَ}.

{أبو داود/١٠٠٨}:

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا خودا بێگومانی نەکرد لەوە کە دوورکاتی کردووەو بەهەڵە سڵاوی داوەتەوە، ئەو دوو کوڕنووشی هەڵەیەی نەبرد).

٣٥٣- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى بِهِمْ، فَسهَا فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، ثُمَّ سَلَّمَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَالْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ.

{ضعيف شاذ، الإرواء: ٤٠٣. أبو داود رقم: ١٠٣٩. ترمذى رقم: ٣٩٥. حاكم/المستدرك ١/٣٢٣}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ بەرنوێژی بۆمانکرد، هەڵەیکرد، جادوو کوڕنووشی هەڵەی برد، ئەوجا تەحیاتی خوێند، لەپاشا سڵاوی نوێژی دایەوە).

٣٥٤- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى أَثَلَاثًا أَوْ أَرْبَعًا؟ فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْساً شَفَعْنَ لَهُ صَلَاتَهُ، وَإِنْ كَانَ صَلَّى تَمَاً كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٣٥١ = ١٢٧٢ مسلم/شیحا = ٥٧١ مسلم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان لەناو نوێژدا، گومانی بۆ پەیدابوو، وە نەیدەزانی کە چەن ڕکات نوێژی کردووە، وەك ئەوە نەیدەزانی کەسێ ڕکاتی کردووە، یا چوار، ئەوە با لەدۆخ و باری وادا، گومانەکەی تووڕبدا، چەندەی لەلا یەقین و بێ گومانە، با لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکا، ئەوجا لەپێش سڵاودانەوەوە دوو کوڕنووشی هەڵەببات،

جا ئەگەر لەڕاستیدا پێنج ڕکاتی کردبوو لەباتی چوار ڕکات ئەوا ئەو دوو کوڕنووشە نوێژەکە دەکەنەوە بەجووت، چونکە نوێژی چوار ڕکاتی دەبێ جووت بێ، ئەگەر تەواویشی کردبوو، ئەوا ئەو دوو کوڕنووشە دەبن بەهۆی نوشوستیو سەرشۆڕیی بۆ شەیتان، چونکە پیلانەکەی کە کردبووی بۆ شێواندنی نوێژەکە پووچ دەکەنەوە!). {تاج/١/٣٢٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٥٣} .

٣٥٥- وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّى رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمَّا سَلَّمَ قِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اَللّٰهِ، أَحَدَثَ فِي اَلصَّلَاةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: " وَمَا ذَلِكَ؟ ". قَالُوا: صَلَّيْتَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَثَنَى رِجْلَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ اَلْقِبْلَةَ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: " إِنَّهُ لَوْ حَدَثَ فِي اَلصَّلَاةِ شَيْءٌ أَنْبَأْتُكُمْ بِهِ، وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي، وَإِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ اَلصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٥٤ = ٤٠١، ٤٠٤، ١٢٢٦، ٦٦٧١، ٧٢٤٩. مسلم/شیحا ١٢٨١ هەتا ١٢٨٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی بۆ یارانی کرد، ئیبراهیم کە ئەم فەرموودەیە لە عەلقەمەوە، لەئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە، لێی تێک چووبوو، دەیفەرموو: نازانم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژەکە زیاد دەکا، یا لێی کەم دەکاتەوە، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاو دەداتەوە عەرزی دەکەن: ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا هیچ گۆڕانێ لەنوێژدا رووی داوە؟ دەفەرموێ: (بۆچی چی بووە؟). گوتیان: واوا نوێژت کرد، وەك ڕۆژان بە ئاسایی نوێژت نەکرد. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر هەردوو چۆك بەرەو رووگە دانیشت، وەك بۆ تەحیات دابنیشێ ئاوا، وە دوو کوڕنووشی هەڵەی برد، ئەوجا سڵاوی دایەوە، پاشتر کاتێ رووی تێ کردین، فەرمووی: (ئەگەر گۆڕانێ

لەنوێژدا رووی بدایێ، پێتانم دەگوت، منیش هەر ئادەمیزادم، وەکوو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیر دەچێ منیش ئاوەها جاروبار شتم لەیاد دەچێ، جا ئەگەر رێکەوت جارێ شتێکم لەبیر نەمابوو، ئێوە بیخەنەوە یادم، ئەگەر لەنوێژەکەتاندا گومانتان بۆ پەیدابوو، وەك ئەوە کە نەتاندەزانی کەسێ رکاتتان کردووە یا دوورکات، ئەوە لەبارودۆخی وادا، با نوێژخوێن بەووردی بیربکاتەوە، مشووری رووی راستی بخوات‌و، جاچی بەڕاست ئەزانێ، لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواوبکات، ئەمجار سڵاو بداتەوە، ئەوجا دوو کورنووشی هەڵەببات). {تاج/١/٣٢٧/٩، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٤٢، ٦٤٣ چاپی چوارەم}.

٣٥٦- وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {فَلْيُتِمَّ، ثُمَّ يُسَلِّمْ، ثُمَّ يَسْجُدْ}.

{بوخاری/١ ٤٠}:

واتاکەی لەژمارە (٣٥٥)دا رابورد.

٣٥٧- وَلِمُسْلِمٍ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَجَدَ سَجْدَتَيْ اَلسَّهْوِ بَعْدَ اَلسَّلَامِ وَالْكَلَامِ}.

{مسلم/شيحا ١٢٨٦}:

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش سڵاودانەوەی نوێژو ئەو گفتوگۆیەی کردی لەگەڵ نوێژخوێنەکان، دوو کورنووشی هەڵەی برد.

٣٥٨- وَلِأَحْمَدَ، وَأَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ " مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ بْنِ جَعْفَرٍ مَرْفُوعاً: {مَنْ شَكَّ فِي صَلَاتِهِ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا يُسَلِّمُ} وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{ضعيف الجامع: ٥٦٤٧. أبوداود رقم: ١٠٣٣. نسائی رقم: ١٢٤٩. أحمد رقم: ١٧٦١}:

ئەحمەدو ئەبوداوودو نەسائی دەگێڕنەوە، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ لەنوێژەکەیدا گومانی بۆ پەیدابوو، کە ئایا زیادی کردووە،

یا کەمی کردووە، یا لەپاش سلاودانەوە، دوو کوڕنووشی هەڵەببات). ئیبنو خوزەیمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی بە تەندروست داناوە.

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب، برازای ئیمامی عەلیو عەقیلو طالیب بووە {بڕوانە: ژمارە:٣٨ لەپێشەوە لەم پەڕاوی (بلوغ المرام)ەدا} . کە هەرچواریان برابوون، ئامۆزای حەقی پێغەمبەری خودا بوون، کەواتە: عەبدوڵڵا ئامۆزازای پێغەمبەر بووە، دایکی ناوی ئەسمای کچی عومەیسە، عەبدوڵڵا یەکەم منالی موسوڵمانانە کە لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، لەوکاتەدا کە دایكو باوکیو کۆمەڵێ لە موسوڵمانان لە حەبەشە ئاوارەو کۆچبار بوون!

عەبدوڵڵایش وەك باوکی زۆر بەخشندەو سەخی بوو، زۆر ڕەوشت بەرزبوو، زۆر زۆر دەستو دامەن پاك بوو، زۆر هەست زناسك بوو، ناسراو بوو بە دەریای بەخشندەیی، دەڵێن: لەسەردەمی ئیسلامەتیدا لەو بەخشندەترو سەخی تر نەبووە عەبدوڵڵا گوێی لەگۆرانی دەگرت، گوێگرتنی لەگۆرانی بە ناباش نەدەزانی {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٤، لاپەڕە: ٢٥٦، ژمارە: ١٥٣١ هەتا کۆتایی} . عەبدوڵڵا شەونوێژێکی زۆری دەکرد، ئیبنو عومەر کاتێ پێی دەگەیشت، پێی دەگوت: سلاوت لێ بێ، ئەی کوڕی خاوەنی دووباڵ!).

عەبدوڵڵا فەرمووده لە پێغەمبەرو لە باوكو دایکیو لە عەلی مامەیو لە ئەبوبەکرو کەسانی تریشەوە دەگێڕێتەوە، ئەم زاتانەیش فەرموودەیان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە: ئیسماعیلو ئیسحاقو موعاوییە، کە ئەم سێ زاتە کوڕی خۆی بوون، هەروا ئەبو جەعفەری باقیرو عوروەو شەعبیو کەسانی تریش، لەبوخاری پیرۆزدا، دوو فەرموودەی هەیە، لە موسلیما فەرموودەی هەیە، بەحەوت ساڵی ئەوو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر پەیمانو بەیعەت دەدەن بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

عەبدوڵڵا لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا، لەساڵی هەشتای کۆچیدا، لەشاری مەدینە دەمرێ، ئیبانی کوڕی عوثمان نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، کە ئەوکاتە ئیبان میری سەر شاری مەدینە بوو، {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١٨٨/٢، ژمارە: ١٥٨٨/٧٦١ فتح + تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٣٣٨٤، ٣٣٨٥ + زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٣٥٢، ٣٣٥٣، ٣٣٥٤، ٣٣٥٥، ٣٣٥٦}.

٣٥٩- وَعَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ، فَقَامَ فِي اَلرَّكْعَتَيْنِ، فَاسْتَتَمَّ قَائِمًا، فَلْيَمْضِ، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ ، وَإِنْ لَمْ يَسْتَتِمْ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ وَلَا سَهْوَ عَلَيْهِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَاللَّفْظُ لَهُ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{صحيح الإرْوَاءِ: ٤٠٨. أبو داود رقم: ١٠٣٦. إبن ماجة رقم: ١٢٠٨. دار قطني ٣٧٨/١}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە، لەرکاتی دووەما، یەکسەر هەڵسایەوەو لەیادی نەبوو کە تەحیات بخوێنێ، ئەوە ئەگەر پێش ئەوەی کە رێك راوەستێ، یادی کەوتەوە کە تەحیاتی نەخوێندووە، بارێك دابنیشێتەوەو تەحیات بخوێنێ، ئەوە بەهەڵە دانانرێ بۆی، بەڵام ئەگەر راست راوەستا ئەوساکە یادی کەوتەوە کە تەحیاتی نەخوێندووە، ئەوە با دانەنیشێتەوە، بەڵکوو با نوێژەکەی تەواوبکا، وە لەپێش سەلام دانەوەدا، لەجیاتی ئەو هەڵەیە، کە تەحیاتی یەکەمی نەخوێند، دوو کوڕنووشی بەهەڵەدا چوون بباتو ئەوجا سڵاو بداتەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٦٣٨}.

٣٦٠- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَيْسَ عَلَى مَنْ خَلَفَ اَلْإِمَامَ سَهْوٌ فَإِنْ سَهَا اَلْإِمَامُ فَعَلَيْهِ وَعَلَى مَنْ خَلْفَهُ"} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ وَالْبَيْهَقِيُّ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف الإرواء: ٤٠٤. بيهقي رقم: ٣٧٠٠. دارقطني ١/٣٧٧}:

ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پاشنوێژ کە لەپشت پێشنوێژەوە نوێژدەکا، هەڵە بۆ ئەو نییە، بەڵام هەڵەی پێشنوێژ هەم بۆ خۆیەتیو هەم بۆ پاشنوێژەکانیەتی!). تەرمەزیو بەیهەقی بەڕشتەیەکی لاواز گێڕاویانەتەوە.

٣٦١- وَعَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لِكُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ بَعْدَمَا يُسَلِّمُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{صحيح الجامع/٥١٦٦. أبو داود رقم: ١٠٣٨. ابن ماجة رقم: ١٢١٩}:

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو هەڵەیێ، لەپاش سڵاودانەوە ددوو کوڕنووشی هەڵەی بۆ دەبرێ!). ئەبو داوودو ئیبنو ماجە بەدوو ڕشتەی لاواز گێڕاویانەتەوە.

(ڕوونکردنەوە):

بەڵگەیە بۆ ئەم دوو پرسە:

یەکەم: نوێژخوێن چەند هەڵەبکا، بۆ هەموو هەڵەیێ، دوو کوڕنووشی هەڵە دەبا، گریمان کەسێ لەنوێژەکەیدا (٣) سێ هەڵەیکرد، وەك کەسێ بەهەڵە سڵاوی دایەوەو بەهەڵە قسەی کردو بەهەڵە چەند هەنگاوێ ڕۆیشت، بەپێی ئەم فەرموودەیە دەبێ (٣×٢ = ٦) شەش کوڕنووش ببا، بۆ هەر هەڵەیێ دووان، بەڵام ئەمە بەپێچەوانەی ڕای جەماوەری زانایانی شەرعە، لەلای ئەوان لە بارودۆخی وادا تەنها دوو کوڕنووشی لەسەرەو بەس.

دووەم: بەڵگەیە بۆ ئەوانە کە دەفەرموون کە جێگەی کوڕنووشی هەڵەوا لەپاش سڵاودانەوەی نوێژەوە.

٣٦٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي: ( إِذَا اَلسَّمَاءُ اِنْشَقَّتْ )، و: (اِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ)} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم/شيحا/١٣٠١، ١٣٠٢، ١٣٠٦ = ٣٥٢ پوختەی موسلیم = مسلم/٥٧٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ}دا، لەکاتی خوێندنی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ – الإنشقاق/٢١}دا، وە لەئاخری سوورەتی {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ}ەدا، لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشی تیلاوەتمان دەبرد). {تاج/١، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٥٥ – م/د/ت/ن. چاپی چوارەم}.

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارەی پوختەی موسلیمە (٣٥٤):

ئەبو رافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆکردین، سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ}ی خوێند، کە گەیشتە ئایەتی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ} کوڕنووشی برد، کە لەنوێژ بووینەوە گوتم: ئەم کوڕنووشە چی بوو؟ فەرمووی: خۆم لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم بەجەماعەت کردووەو، لەدوای ئەم ئایەتەوە، لەناو ئەو نوێژەدا، لەگەڵ حەزرەتدا، کوڕنووشی قورئانخوێندنم بردووە، لەبەرئەوە هەتا دەگەمەوە بەخزمەتی لەودنیا، لەم شوێنەدا، ئەم کوڕنووشە هەر دەبەمو هەرگیز تەرکی ئەم کوڕنووشە لەم شوێنەدا ناکەمو وازی لێ ناهێنم). {تاج/١/٣٣٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٥٤ + تجریدی بوخاری/١/٤٠١، ژمارە: ٤١٧ = ٧٦٦، ٧٦٨، ١٠٧٤، ١٠٧٨}.

٣٦٣- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {(ص) لَيْسَتْ مِنْ عَزَائِمِ اَلسُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْجُدُ فِيهَا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/١، ژماره: ٥٣٩ = ١٠٦٩، ٣٤٢٢ فتح الباری شرح صحيح البخاری}:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئایەتەکەی سوورەتی (ص) لەئایەتە دامەزراوەکانی کوڕنووشی قورئانخوێندن نییە، لەگەڵ ئەوەیشا کەوا دەڵێم، من بەچاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشی تیادا دەبردو دەیفەرموو: (ئەمە بۆ داوود کوڕنووشی تەوبە بوو، واتە: کوڕنووشی تەوبەو ژێوان، بەلام بۆ ئێمە کوڕنووشی سوپاسە، سەجدەی شوکرە).**

**ئایەتەکەیش ئەمەیە:** {وَظَنَّ دَاوُدُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنابَ/ص/٣٨/٢٤}. **{تاج/١، لاپەڕە: ٣٣١، چاپی/١ = زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٥٠ چاپی چوارەم}.**

٣٦٤- وَعَنْهُ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَجَدَ بِالنَّجْمِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/١، ژماره: ٥٤٠ = ١٠٧١، ٤٨٦٢ فتح الباری}:

**ئەمە دەقەکەیەتی لە تەجریدی بوخاریدا:**

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوای ئایەتەکەی کوڕنووشی سوورەتی (وَالنجم)ەوە، کوڕنووشی برد، موسوڵمانەکانو ناموسوڵمانەکانو جنۆکەو ئادەمیزاد، ئەوەی کە لەوێ بوون، هەموویان کوڕنووشیان برد لەگەڵیدا، تەنانەت قاوداکەوت کە**

خەڵکی مەککە سەرجەم ئیسلامبوون!). {تاج/١، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٦٥٣ چاپی چوارەم}.

**٣٦٥- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قَرَأْتُ عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلنَّجْمَ، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٤١ = ١٠٧٢، ١٠٧٣ فتح البارى. مسلم شيحا/١٢٩٨ = مسلم/٥٧٧}:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوورەتی (وَالنّجمِ)م دەورکردەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشی تیادانەبرد). {تاج/١، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ٦٥٨ چاپی چوارەم}.

**(ڕوونکردنەوە):**

١- زەیدی کوڕی ثابیت، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، لەخەڵکی مەدینەیە، لە ئەنصارە، لە صەحیحی بوخاریدا، هەشت فەرموودەی هەیە، خەزرەجییە، زەید نووسەری سرووش بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەربوو، بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زمانی جوولەکە، بەپازدە ڕۆژ فێربوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاغەزی دەنووسی بۆیان، زەید بۆی دەنووسین، کە کاغەزیشیان دەهات بۆ پێغەمبەر، زەید دەیخوێندەوە بۆی. {بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ٦٢، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣٦٨٤، ٣٦٨٥ چاپی چوارەم}.

٢- بەپێی فەرموودەی ژمارە (٣٦٤) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەخۆی سوورەتی (وَالنجمِ)ی خوێندووە، کە گەیشتۆتە ئاخرەکەی کە ئەمەیە: {فَاسْجُدُوا لِلّهِ وَاعْبُدُوا — النجم/٦٢} کوڕنووشی قورئانخوێندنی بردووە، بەڵام کەزەید ئەم سوورەتەی خوێندووە، زەید خۆی کوڕنووشی نەبردووە، لەبەرئەوە پێغەمبەریش کوڕنووشی نەبردووە، کورت و پوخت:

(کورنووشــی قورئانخوێنــدن، لــەکاتی خوێنــدنی ســوورەتی (والــنجم)دا، لەئاخرەکەوە سوونەتە، چی لەنوێژدا کەسێ بیخوێنێ، چی لەدەرەوەی نوێژ بیخوێنێ).

٣٦٦- وَعَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {فُضِّلَتْ سُورَةُ اَلْحَجِّ بِسَجْدَتَيْنِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ فِي " اَلْمَرَاسِيلِ ".

{ضعيف الجامع/٣٩٨٣. أبو داود ١١٣/١. رقم: ٧٨}:

خالیدی کوڕی مەعدان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوی سوورەتی حەج بەوە دراوەو ڕێزی بەوە گیراوە کەدوو کوڕنووشی واتیـادا). دانـەر دەڵـێ: ئەبو داوود لەناو فەرمووده مورسەلەکانا گێڕاویەتەوە. بەڵام ئـەبو داوود ئـەم فەرموودەیەی لەڕێگەی عوقبەی کوڕی عـامیرەوە، بەمـەرفووعی گێڕاوەتـەوە، وەك لەژمارە (٣٦٧)دا لەدواوە دێت.

(ڕوونکردنەوە):

خالیـدی کـوڕی مەعـدان تابیعییـە، شـامییە، خـەڵکی حومـصە، خـۆی دەفـەرموێ: بەخزمـەت حـەفتا پیـاو لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر گەیـشتووم، لەمتمانەدارەکانی شامە، ساڵی سەدو چواری کۆچی مردووە.

٣٦٧- وَرَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ مَوْصُولًا مِنْ حَدِيثِ عُقْبَةَ بْـنِ عَـامِرٍ، وَزَادَ: {فَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا، فَلَا يَقْرَأْهَا} وَسَنَدُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف الجامع/٣٩٨٢. ترمذی رقم: ٥٧٨. أبو داود رقم: ١٤٠٢}:

لەتاجا ئاوایە بەمەوصوولی:

عوقبــەی کــوڕی عــامیر (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: عــەرزی پێغەمبەرم کرد (دروودی خودای لەسەر بێ): قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا سوورەتی حەج دوو ئایەتی سەجدەی واتیادا؟

فـەرمووی: (بـەڵێ، وەئـەوەی لـەکاتی خوێنـدنی ئـەو دوو ئایەتـەدا کوڕنووش نەبا، با نەشیان خوێنێ!). واتە: ئەگەر کەسێ لەسوورەتی حەجدا، ئەو دوو کوڕنووشە نەبا، با ئەو سوورەتە نەخوێنێ باشترە بۆی.

٣٦٨- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {يَا أَيُّهَا اَلنَّاسُ إِنَّا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَفِيهِ: {إِنَّ اَللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَفْرِضْ اَلسُّجُودَ إِلَّا أَنْ نَشَاءَ}. وَهُوَ فِي " اَلْمُوَطَّأِ.

{بخاری/١٠٧٧. مالك في الموطأ (ص/١٦٥ + ١/٢٦٠)}:

ئەمە دەقەکەیەتی لەتاجا:

ڕەبیعـەی کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژێکـی هەینی لەسەر دوانگە (مینبەر) عومەری کوڕی خـەطـاب، سوورەتی نـەحلی خوێنـدەوە، کـە گەیـشتە ئایەتەکـەی کوڕنـووش، لەمینبەرەکـە دابـەزیو کوڕنووشـی تیلاوەتـی بـردو خەڵکەکـەیش کوڕنووشـیان بـرد، وە لەهـەینی ئایندەدا، دیسانەوە ئەم سوورەتەی خوێندەوە، بـەڵام کاتـێ کـە گەیشتە سـەر ئایەتەکـەی سـەجدە، فـەرمووی: ئـەی خەڵکینـە! ئـەوا دەگەینـە سـەر ئایـەتی کوڕنووش، جا هەرکەسێ کوڕنووش دەبا، ئەوە دەق بەپێی سوننەتو ڕەوشـتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕەفتـارو کاردەکـا، وە ئەوەیـشی کـە کوڕنووش نەبات، ئەوە تاوانی لەسەرنییەو گوناهی ناگات، چونکە کوڕنووشـی تـیلاوەت بـەڕای مـن سـوننەتەو واجـبو پێویـست نییـە، وە عومـەر خـۆی کوڕنووشـی نـەبرد!). {تـاج/١، زنجـیرە: ١١١، ژمـارە: ٦٥٩ چـاپی چـوارەم - بوخاری}.

لەگێڕانـەوەی نافیعدا، لـەئیبنو عومـەرەوە بـۆ ئـەم فەرموودەیـە، کـەوا لەبوخاریدا، ئەم پترى (زیادە)یەی هەیە:

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خـودای گـەورە کـە

کورنووشــی قورئانخوێنــدنی دانــاوه بۆمــان، فــەرزی نــەکردووه لەســەرمان، بــەئارەزووی خۆمانــە دەتــوانین لــەکاتی قورئانخوێندنــدا، لــەپاش ئایــەتی سەجدەوه، ســەجده ببــەین، دەتــوانین ســەجده نەبــەین. {تــاج/١، زنجیره: ١١١، ژماره: ٦٦٠} . ئەم گێڕانەوەیە لە مووەططایشدا هەیە.

(ڕوونکردنەوه):

شـێخی عەسـقەلانی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ئـەم زیادەیـەیش، کـەوا لەژماره (٦٦٠)ی تاجیشدا، بەگوتەی عومەر دائەنێ، بـەڵام مامۆسـتای عـەینی، خاوەنی (عمـدة القـارئ)و دانـەری تـاج بەگوتـەی عەبـدوڵلای کوڕی عومـەری دائـەنێن. جێگــەی داخــە لێــرەدا، عــەینی هێرشــێکی گــەوره دەباتەســەر عەسقەلانی، بەبێ ئەوه ناوی ببات.

٣٦٩- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) يَقْرَأُ عَلَيْنَا اَلْقُرْآنَ، فَإِذَا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ، كَبَّرَ، وَسَجَدَ، وَسَجَدْنَا مَعَهُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِسَنَدٍ فِيهِ لِينٌ.

{أبو داود/١٤١٣. ضعيف الإرْوَاء/٤٧٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بـێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وابـوو، کـە قورئـانی پـێ دەخوێنـدین، کاتـێ دەگەیشته سەر ئایەتی کوڕنووش، ئەڵلاهوئەکبەری دەکردو کوڕنووشی دەبرد، ئێمـەیش لەگـەڵیا ئـەو کوڕنووشـەیەمان دەبـرد! {تـاج/١، زنجیره: ١١٠، ژمـاره: ٦٤٧} .

٣٧٠- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) {كَانَ إِذَا جَاءَهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ خَرَّ سَاجِداً لِلَّهِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ.

{صــحيح الجــامع/٤٧٠١. أبــو داود/٢٧٧٤. ترمــذی/١٥٧٨. ابــن ماجة/١٣٩٤. أحمد/٥/٤٥}:

ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە باسێکی خۆشی بۆ دەهات، یا موژدەیەکی خۆشیان دەدایە، یا هەواڵێکی خۆشی بۆ دەهات، دەکەوت بە ڕووداو لە پەورووو دەکەوتو سوجدەیەکی شوکری دەبرد بۆ خودا، گفتەی تەرمەزی ئاوایە: جارێ پێغەمبەر دەنگوباسێکی خۆشی بۆهات، گەلێکی پێ خۆش بوو، ئیتر بەروودا کەوتو کوڕنووشێکی بۆ خودا برد. {تاج/١، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٦٦٢}.

٣٧١- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَجَدَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَطَالَ اَلسُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَقَالَ: " إِنَّ جِبْرِيلَ آتَانِي، فَبَشَّرَنِي، فَسَجَدْتُ لِلَّهِ شُكْرًا"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أحمد رقم: ١٦٦٢. حاكم رقم: ٨١٠، صحيح لغيره، فضل الصَّلاَةِ عَلَى النبيِّ: ٢٥/١}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشێکی دوورو درێژی برد، لەپاشا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (جوبرائیل هات بۆلام، موژدەیەکی خۆشی پێمدا، منیش ئەوەبوو، بۆ سوپاسی خودای گەورە ئەم کوڕنووشەم برد بۆ خودا). {تاج/١، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٦٦٢}.

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) لەو دەکەسەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، کە ناسراون بە (عەشەرەی موبەشەرە = دەکەسە موژدە پێدراوەکان) هەروا یەکێکە لەو شەش کەسەیش، کە پێشەوا عومەر، لەپاش پێکانی خۆی، لەسەرەمەرگا، دەستنیشانیکردن کە یەکێکیان لێ هەڵبژێرن بەجێنشین، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا لێیان ڕازی

بووە. عەبدوڕەحمان بە (١٠) دەساڵ لەپاش عامول فیل لەدایك بووە، واتە: دەساڵ لە پێغەمبەر منداڵترە، لەپێش ئەوەدا کە موسوڵمانان بەدزییەوە لەماڵی ئەرقەم، ناو بەناو کۆببنەوە، موسوڵمان بووە، دوو کۆچی کردووە، کۆچی یەکەم بۆ حەبەشەو کۆچی دووەم بۆ مەدینە، بەدری بوو، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگەکانی تری پاش بەدر بووە، لەجەنگی ئوحوددا بیستو یەك زامی لێ کرا، بەهۆی یەکێك لەو زامانەوە دەلەنگی، لەپێشا ناوی عەبدولکەعبە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕیو کردی بە عەبدوڕەحمان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ ئازادکردنی دەومەتول جەندەل، بەدەستی خۆی مێزەری بۆی پێچایەوەو لفکەکەی بەناو شانیدا شۆڕکردەوە، پێی فەرموو: (ئەگەر خودا لەسەر دەستی تۆدا ئەم وڵاتەی ئازادکرد، کچی پادشاکەیان مارەبکە بۆ خۆت!).

پادشاکەیان ناوی ئەصبەغی کوڕی ئەعلەبەی ئەل‌کەلبی بوو، کچەکەی ناوی تەماضیر بوو، کوڕێکی لێی بوو، ناوی ئەبو سەلەمەی فەقیە بوو، مەلایەکی شەرعزانی گەورە بوو، لە بوخاری پیرۆزدا نۆ فەرموودەی هەیە، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، عەبدوڕەحمان فەتوای دەدا، لەسەردەمی پێغەمبەردا، نیوەی دارایی خۆی بەخشی لەڕێگەی خودادا، دەوڵەمەندێکی گەورە بوو، زۆرینەی سامانەکەی هی بازرگانی بوو، لەسەر راوێژی ئەو، ئیمامی عومەر لە (سەرەف)ەوە، گەڕایەوە بۆ مەدینە، نەچوو بۆ شام، تا موسوڵمانان لەو تاعوونە دووربخاتەوە، کە لەشام بڵاوە بوو بوو {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٨}.

لەسەر فەتوای عەبدوڕەحمان، ئیمامی عومەر، حیسابی ئەهلی کیتابی بۆ ئاگرپەرست (مەجووس)ەکان کردو، سەرانەی لێیان وەرگرت، ئەو ساڵەی کە عومەر بوو بەجێنشین، عەبدوڕەحمانی کرد بە میرحەج، لەسەفەرێکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی،

بەجەماعەت لەپشتیەوە کرد {بڕوانە: ژمارە: ٣٢٠ پوختەی موسلیم، باب: إذَا تَخَلَّفَ الإمَامُ تَقَدَّمَ غَيْرُهُ}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش مەرگی خۆم پیاو چاکێ، ئاگاداری جوانی هاوسەرەکانم دەکات). ئەو پیاو چاکە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو، دەیبردن بۆ حەج و کەژاوەی پەردەداری بۆیان دەگرتەوە، لەڕێگە لەشوێنێکی بەرێزی پەنادا، لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیانا، بارو بنەکەیانی دەخست بۆ وچان گرتن. عەبدوڕەحمان راسپێری کرد کە هەرکەسێ لەکاتی خۆیا، ئامادەی غەزای بەدر بووەو ماوە سەد لیرەی زێڕی پێ بدرێ، کە ژمارديانن و راسپێرییەکەیان جێبەجێ کرد، سەد پیاوی بەدری مابوون، زۆر زۆر سەخی بوو، لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا، لەمەدینە کۆچی دوایی کرد، لەسەر راسپێری خۆی ئیمامی عوثمان نوێژی تەرمی لەسەری کرد، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردرا (رەزاو رەحمەت و سۆزو میهری خودای لەسەر بێ). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٣٣، لاپەڕە: ٧ + پوختەی موسلیم ژمارە: ١١٤٤ + تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٣٣٣٥ هەتا ژمارە: ٣٣٣٧}.

٣٧٢- وَعَنْ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعَثَ عَلِيًّا إِلَى اَلْيَمَنِ (فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ) قَالَ: فَكَتَبَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بِإِسْلَامِهِمْ، فَلَمَّا قَرَأَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْكِتَابَ خَرَّ سَاجِدًا شُكْراً عَلَى ذَلِكَ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{بیهقی ٣٦٩/٢. پوختەی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٠٠ = ٤٣٤٩ فتح الباری}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی نارد بۆ یەمەن، فەرموودەکەی گێڕایەوە،

هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: عەلی نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر بۆ مەدینە کە سەرجەم گەلی یەمەن ئیسلام بوون، کە کاغەزەکەی عەلی گەیشتو پێغەمبەر خوێندیەوەو ئەم هەواڵە خۆشەی تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەوروو کوڕنووشێکی سوپاسی برد بۆ خودای گەورە، لەسەر ئەم موژدە خۆشە).

بەیهەقی گێڕاویەتەوە، ئەمەیش ئەصڵەکەیەتی لەبوخاریدا، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا: {تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٠٠}.

بەڕائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەل خالیدی کوڕی وەلیددا، ناردینی بۆ یەمەن، بۆ غەزاکردن، لەپاش گەڕانەوەمان لەتائیف، لەپاش ماوەیێ، عەلی نارد لەشوێن خالید، وەبەعەلی دەفەرموێ: (بەهاوڕێکانی خالید بڵێ: ئەوەی کە حەزدەکا لەگەل خالیددا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، ئەوە کەیفی خۆیەتی، وەئەوەیشی کە حەزدەکا لەگەل تۆدا بمێنێتەوەو لەپاشدا لەگەل تۆدا بگەڕێتەوە بۆ یەمەن، ئەویش هەر ئارەزووی خۆیەتی، من خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە لەگەڵ عەلیدا، گەڕاینەوە بۆ یەمەن‌و، لەگەڵیدا ماینەوە لەوێ، جا ئەندازەیەکی باش پارەو پوولم لەتالان وەدەست کەوت!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٤٦٤٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (٣٧٢ — ٣٤٨ = ٢٤) بیست‌و چوار فەرموودەیە.

٢- کوڕنووشی هەڵە، سوننەتە یا فەرزە، وەجێگەکەی کوێیە، ئەڵلاهوئەکبەری بۆ دەکرێ یانا، یا چی تیادەخوێندرێ، باسێکی دووورودرێژە، لە فەرموودەکاندا، ئاماژە بۆ وەلامی ئەم پرسیارانە کراوە، ئێمە لێرەدا پوختەی مەزهەبی شافیعی دەنووسین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

یەکەم: لەمەزهەبی کوردەواری خۆماندا، کە مەزهەبی شافیعییە:

١- كورنووشى هەڵە سوننەتێكى گەورەيە فەرز نييە.

٢- دوو كورنووشى بەرودوايە، لەرووكنو فەرزو سوننەتو مەرجدا، رێك وەك كورنووشى ئاسايى ناو نوێژ وايە.

٣- جێگەى پێش سلاٌودانەوەى كۆتاييە.

٤- بۆ هەموو نوێژخوێنێ سوننەتە، تاك بێ، يان جەماعەت نوێژ بكا، بەڵام ئەگەر بەرنوێژكار كورنووشى نەبرد، نابێ پاشنوێژ كورنووش بەرێ.

٥- نوێژەكە فەرز بێ، يا سوننەت بێ، جياوازيى نييە، ئەگەر نوێژخوێن هەڵەى كرد، سوننەتە كورنووشى هەڵە ببات.

٦- كاتێ دەچێ بۆ كورنووشەكە ئەللاهوئەكبەر دەكا، كەبەم تەكبيرە دەگوترێ ئەللاهوئەكبەرى ئيحرامى سجودى سەهو، كەسەرى لەكورنووشى يەكەم هەلبڕى ئەللاهوئەكبەر دەكاو دانيشتنى وچانى نێوان دوو سەجدە ئەنجام دەدا، ئەوجا ئەللاهوئەكبەر دەكاتەوەو كورنووشى دووەم دەبا، ئەوجا ئەللاهوئەكبەر دەكاو هەڵدەستێتەوەو رێك وەك بۆ تەحيات دابنيشێ ئاوا دائەنيشێ، ئەوجا بەلاى راستو بەلاى چەپا سلاٌو دەداتەوەو كۆتايى بەنوێژ دەهێنێ.

٧- ويردى ناو كورنووشى هەڵە، وەك ويردى ناو كورنووشى ناو نوێژ وايە، كە ئەمەيە (سَبْحانَ رَبّيِ ٱلأَعْلى وَبِحَمْدِ).

دووەم: نوێژخوێن يەك هەڵە بكا، يازياتر، يەكجار دوو سەجدە دەباو تەواو. (بڕوانە: فيقهى ئاسان، بەرگى يەكەم، زنجيرە: ٦٩ – كورنووشى هەڵەو هۆيەكانى).

سێيەم: لەلاى شافيعييەكان، كە مەزهەبى پەيڕەوكراوى كوردەوارى خۆمانە:

١- كورنووشى تيلاوەت سوننەتە، فەرز نييە.

٢- بۆ گوێگرو بۆ خوێنەر سوننەتە، بۆ نێرومێ، بۆ گەورەو گچكە.

٣- لەناو نوێژیشا، ئەگەر ئایەتی سەجدە خوێندرا، کوڕنووشی تیلاوەت سوننەتە، چی نوێژخوێن تەنها بێ، چی بەکۆمەڵ نوێژ بکا، تەنها لەنوێژی تەرما کوڕنووشی تیلاوە نابرێ، هەروا ئەگەر لەناو روکوعو إعتدالو سەجدەو تەحیاتا ئایەتی سەجدە بخوێنێ، نابێ سجدە ببا.

٤- کوڕنووشی تیلاوەت یەك کوڕنوووشە.

٥- ئەم چوار شتە بۆ غەیری نوێژخوێن، فەرائیزی کوڕنووشی تیلاوەتن:

آ- نێتی کوڕنووشی قورئانخوێندن بهێنێ.

ب- ئەڵڵاهوئەکبەری تەحەرووم بکا.

ج- یەك کوڕنووش ببا، وەك کوڕنووشی نوێژ.

د- سڵاودانەوە، وەك سڵاودانەوەی نوێژ، بەهەردوو لادا.

٦- واپەسەندە بەدانیشتنەوە نێت بهێنێو ئەڵڵاهوئەکبەری تەحەرووم بکا.

٧- چی سوننەتە یاواجبە، لەکوڕنووشی نوێژدا، لەکوڕنووشی تیلاوەتیشدا سوننەتە، یان واجبە، وەك ئەوە لەسەر حەوت ئێسك کوڕنووش ببا.

٨- ئەمەیش مەرجەکانیەتی، چی لەکوڕنووشی نوێژدا مەرجە، لەکوڕنووشی قورئانخوێندنیشا مەرجە، وەك: پاکیو پۆشینی شەرمگاو رووکردنە رووگەو هاتنی کاتی کوڕنووشەکە، کە ئەوەیە ئایەتی سەجدەکەی بەتەواوی خوێندبێ، نابێ یەك پیتی بمێنێ.

٩- سوننەتە لەناویا ئەم ویردە بخوێنێ: «سَجَدَ وَجْهِيَ لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ». بەڵام ئەگەر بەیەکجار (سبحان ربی الأعلی)یش ئیکتیفا بکا دەبێ.

١٠- خوێنەر لەغەیری نوێژدا کوڕنووشیش نەبا، بۆ بیسەر سونەتە کوڕنووش ببا.

١١- تەکبیراتو ئەڵڵاهوئەکبەرەکانی:

آ- لەکاتی نێت دابەستندا، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو هەردوو دەستی بەرزدەکاتەوە، وەك کاتی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژدابەستن.

ب- ئەوجا بەبێ دەست بەرزکردنەوە (الله اكبر) دەکاو دادەنەوێتەوەو تەوێڵ دەنێتە سەر جێگە نوێژەکەیو یەك کوڕنووش دەبا، کە لە روکنو مەرجو سونەندا، ڕێك وەك کوڕنووشی نوێژ وەهایە، ئەوجا لەپاش خوێندنی ویرد، بەبێ ئەوە دەستەکانی بەرز بکاتەوە، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو ڕێك وەك تەحیات دابنیشێ، ئاوا دادەنیشێو یەکسەر سڵاو دەداتەوە، لەپێشدا بەلای ڕاستدا، ئەوسا بەلای چەپدا.

١٢- کوڕنووشی تیلاوەت، ئەگەر لەنوێژدا نەبوو، بەجەماعەت ناکرێ، خوێنەرو بیسەر، هەر کەس پەیوەندی بەخۆیەوە هەیەو بەس.

١٣- مەرجی کوڕنووشی قورئانخوێندن، وەك مەرجی نوێژکردن وەهایە، کەواتە: نابێ قسە بکا، یان شت بخوا، یان ڕووی لەرووگە وەرچەرخێنێ، یان دەسنوێژی بشکێ، یان شەرمگای دەرکەوێ.

١٤- لەناو نوێژدا کوڕنووشی قورئانخوێندن ئاوایە:

آ- پاش نوێژ شوێن پێشنوێژ دەکەوێ، نابێ خۆی بەتەنها کوڕنووش ببا، بەبێ پێشنوێژ.

ب- کاتێ ئایەتەکە بەتەواوی دەخوێنێ، ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو بەبێ ئەوە دەستەکانی بەرزبکاتەوە، دادەبەزێو یەك کوڕنووشی ئاسایی دەبا، ئەوجا بەبێ دەست بەرزکردنەوە ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو هەڵدەستێتەوە سەر پێ، بەتەواوی، جا ئەگەر حەزکا، یەکسەر ئەڵڵاهوئەکبەر دەکاو دەچێ بۆ چەمینەوە، ئەگەر حەزیش بکا، قورئانی تریش دەخوێنێ، ئەوسا دەچێ بۆ

چـەمینەوە، واسـوننەتە هەنـدێ قورئـانی تـر بخوێنـێ، ئەوسـا بـچێ بـۆ چەمینەوە.

چوارەم: ئەگەر لەیەك ركاتدا، چەند ئایەتێكی سـەجدەی خوێنـد، ئـەوە هەموو جارێ سەجدە دەبات، بەوێنە: ئەگەر لەیەك ركاتدا خەتمەیـەكی كـرد، ئەوە چواردەجار سەجدە دەبات.

پێنجەم: كوڕنووشی تیلاوەت قەزا كردنەوەی نییە.

شەشەم: سەجدەكانی تیلاوەت چواردەن:

١ ، ٢- دوو سەجدە لە حەجا ٣- والنجم ٤- الانشقاق ٥- اقرأ ٦- الأعـراف ٧- الرعد ٨- النحل ٩- الإسراء ١٠- مريم ١١- الفرقان ١٢- النمل ١٣- ألم تنزيل ١٤- حم السجدة.

حەوتـەم: كوڕنووشـی سـوپاس، كـە جێگەكـەی دەرەوەی نوێـژە، لـەلای شافیعییەكان، ئاوایە:

لەنوێژدا دروست نییە، بریتیە لەیەك كوڕنووش، ڕێك وەك كوڕنووشـی تیلاوەتی دەرەوەی نوێژ وایە، لـەروكنو مـەرجو فـەرزو سـوننەتو چۆنیەتو پووچكەرەوەدا، لەوەیشدا كـە قـەزا ناكرێتـەوە هـەر ئەوەنـدە بەسـە كـە بڵـێ: (سبحان ربی الأعلی) بەڵام واباشە، كە ویردی زۆر موناسیب بخوێنێ.

هەشتەم: هۆی كوڕنووشی سوپاس، ئەم چوار شتەیە:

١- كوڕنووشی سوپاس سوننەتە، كاتێ موژدەیەكی خۆش وەردەگری، یـان هەسـت بـە پەیـدابوونی خـەڵاتێ، یـان بەخشـشێ دەكـەی، وەك منـداڵبوونو شادبوون بە پلەو پایەو گەڕانەوە لەسەفەری دووورو هاتنەوەو بینینی كەسی نادیـاری دوورە وڵاتو شـتی تـری ئـاوا، كـەدابنرێ بـەنازو خـەڵاتو بـەهرەو نیعمەتی خودا، وەك دەرچـوون لـە ئـەزموونێ، وەرگرتنـی بڕوانامـەی كۆتـایی ساڵ، بۆ قوتابیو خوێندكار، بەم جۆرە دەگوترێ (هجوم النعمة).

٢- هەروا کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، کاتێ لەچورتومێ، لەبەلایێ، لەکێشەیێ، مرۆڤ رزگاری دەبێ، وەك ئەوە لە کارەساتێ، یان لەئاگربەربوونەوەیێ، خۆی، یان کەسێکی، یان سامانێکی رزگاری دەبێ، یان لەخنکانێ رزگاری دەبێ، بەم جۆرەیش دەگوترێ (اندفاع نقمة) رزگار بوون لەبەلایێ.

٣- کاتێ دووچاری دەردێ، بەلایێ، کێشەیێ دەبینێ، ئیتر ئەو دووچارییە جەستەیی بێ، یاسامانی، یان شتی تر، وەك بینینی گولێ، یان کەسێ تەنها یەك کوڕی هەیە، لەکارەساتێکی دڵتەزێنا، دەمرێ یان دەکوژرێ، بەم جۆرەیش دەگوترێ: (رؤية مبتلى) لەکاتی وادا کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، لەسەر نیعمەتی سەلامەتیو ئاسوودەیی.

٤- کاتێ دەبینێ بەدکارێ، تاوانێ، گوناهێکی گەورە ئەنجام دەدا، وەك ئەوە بە بەرچاوی خەڵکەوە ئارەق دەخواتەوە، یان لەپارکی ئازادی دانیشتووە چەتیوێ والەباوەشیا، خوا پەنامان بدا، لەم کاتانەیشدا، کوڕنووشی سوپاس سوننەتە، کە خودا بە بەخششی خۆی لەشتی وا پیسو چەپەڵ پاراستوویەتی، چونکە قۆرتو چورتمو دووچار بوونی زیانی ئایینی، گەلێ خراپترە، لەقۆرتو زیانو ماڵوێرانی جیهانی، بەم جۆرەیش دەگوترێ (رؤية العاصی).

(**تێبینی**):

لەکاتی هۆی کوڕنووشی سوپاسدا ئەم سێ شتە سوننەتە:

١- کوڕنووشی سوپاس بەتەنیاو بەس.

٢- خێرکردن بەتەنیا، بەنیازی سوپاسی خودا، لەسەر شادبووون بەو بەهرەیە، یان رزگاربوون لەو بەلایە.

٣- دوو رکات نوێژی سوپاس، کە پێی دەگوترێ (صلاة الشکر) نوێژەکە دوو رکات زیاتریش بێ دەبێ.

٤- بەڵام لەهەمووی باشتر ئەوەیە کە لەپێشا کوڕنووشی سوپاس ئەنجام بدا، ئەنجا خێریش بکا، ئەنجا دوورکات نوێژی سوپاس بکا.

٥- پوختەی مەبەست: سوپاسی خودا لەم کاتانەدا بەم سێ شێوەیە دێتەدی، ئیتر ئەم سێ شتە بەتەنها بکرێن، یان تەنها دووانیان بکرێن، یان هەرسێکیان پێکەوە بکرێن.

نۆیەم: کوڕنووش بردن لەکاتی ڕوودانی نیشانەکانو قەومانی کارەساتی گەورەدا، وەك: خۆرگیرانو مانگگیرانو بوومەلەرزەو بای سەختو گەردەلوولو زریانو تاریکی سەختو مردنی نزیکانی بارەگای خودای پەروەردگار.

دەیەم: کەواتە جۆرەکانی کوڕنووش پێنج جۆرن:

١- کوڕنووشی ئاسایی نوێژ، هەموو ڕکاتێ دوو کوڕنووشی واتیادا، کە ئەمەیان ئاشکراو زانراوە.

٢- کوڕنووشی هەڵە، دوو کوڕنووشن، کەموکوڕی نوێژیان پێ پڕدەکرێتەوە، لەپێشەوە ڕوونکرانەوە.

٣- کوڕنووشی قورئانخوێندن، یەك کوڕنووشە. لەپێشەوە ڕوونکرانەوە.

٤- کوڕنووشی سوپاس یەك کوڕنووشە، لەپێشەوە ڕوونکرایەوە.

٥- کوڕنووشی ڕوودانی نیشانە گەورەکان کەناسراوە بە (سُجُودُ مطلق الآياتِ). {بڕوانە ژمارە: ٥٣٣ لەم کتێبە}.

بۆ دڵنیا بوون لەم بابەتە، بفەرموو بڕوانە:

١- تاجول ئوصول/لاپەڕە — ٣١٠، زنجیرە: ١٠٥، لەژمارە: ٦٣٤وەهەتا ژمارە: ٦٤٤ چاپی چوارەم.

٢- تاجول ئوصول/١، زنجیرە: ١١٠ لاپەڕە ٣١٥، ژمارە: ٦٤٥ هەتا ٦٦١ چاپی چوارەم.

٣- تاجول ئوصول/١، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٦٦٢ هەتا ٦٦٣ چاپی چوارەم.

٤- تاجول ئوصول/١، زنجيره: ١٧١، ژماره: ٩٣٤.

٥- إعانةُ الطَّالبين ج/١ ص٤٠٨ دار الفيحاء ط/١٤٢٩/١ه = ٢٠٠٨م.

٦- مغنى المحتاج المجلد الآول ص٢١٤ طبعة ١٣٧٧ — ١٩٥٨م.

٧- رياض الصالحين زنجيره: ٢١١، ژماره: ١١٥٩.

## ١٩- باسی نوێژی سوننەت
## باب: صَلَاة التَّطَوُّع

٣٧٣– عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ (رِضَى اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قَالَ لِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَلْ. فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي اَلْجَنَّةِ. فَقَالَ: أَوَغَيْرَ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: " فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ اَلسُّجُودِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم/شيحا ١٠٩٤ = مسلم ٤٨٩}:

رەبیعەی کوڕی (مالیکی) ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، بەشەو لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەستیم دەکرد، جارێکیان کەئاوی دەسنوێژو بەرماڵو سیواکو شتومەکەکەیم بۆ برد، فەرمووی پێم:

(ئەی رەبیعە! داخوازیت چییە بیکە).

گوتم: داوای ئەوەت لێ دەکەم کە لەبەهەشتا ببم بە هاوڕێتو لە خزمەتتابم، فەرمووی: خۆ داوای شتێکی تر ناکەی؟ گوتم: نەخێر، داوام هەر ئەوەیەو بەس.

فەرمووی: (کەواتە، دەی خۆتیش بەکردنی نوێژی زۆر، کەسەجدەی زۆری تیایەو سەجدە کورۆکی نوێژە، دەی تۆیش بەکردنی نوێژی زۆر، یارمەتیم بدە، هەتا نەفست بهێنینە سەر ڕێو سەرەنجام ئاواتەکەت بێتە دی!). {تاج/١، زنجيره: ٤٣، ژماره: ٣٣٤ چاپی چوارەم — م/د/ت/ن = مسلم ٤٨٩. أبوداود ١٣٢٠. نسائى رقم: ١١٣٨. أبو عوانة رقم: ١٨٦١. ترمذى. دعوات ٣٤١٦}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئیبنو باز (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕەبیعەی کوڕی مالیك، هەڵەیە، ڕاستەکەی (ڕەبیعەی کوڕی کەعبە) کەسناوی ڕەبیعەی کوڕی کەعب (ئەبو فیراس)ە، لەهۆزی ئەسلەمە، بە مەدینەیی دائەنرێ، یەکێکە لەکۆمەڵەی صوففەو لە ئەهلی الصّفّەیە، نۆکەری پێغەمبەر بووە، لەمێژەوە لەخزمەتی حەزرەتدا بووە، لەماڵەوەو لەسەفەرا، خزمەتی ئەوی بەرنەئەدا، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد، لەمەدینە دەرچوو، گواستیەوە بۆناو هەوارگەی هۆزی ئەسلەم، دەوری بەریدێ لەشاری مەدینەوە دوور بوو، لەوێ ما هەتا لەپاش کارەساتەکەی ئەلحەررە، لەمانگی قوربانا، لەساڵی (٦٣) شەستو سێی کۆچیدا، لە ئەلحەررە فەرمانی حەقی بەجێهێناوەو بەرەحمەت چوو. ڕاستتر ئەوەیە کە ڕەبیعە ناوی (ڕەبیعەی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك)ە، ئەم زاتانەیش لەزانستی فەرموودەشوناسیدا دائەنرێن بەفەقێو شاگردی ڕەبیعەو ڕەبیعە دائەنرێ بەشێخو مامۆستای ئەوان، چونکە فەرموودەکانی ڕەبیعەیان گێڕاوەتەوە: ١- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان ٢- حەنطەلەی کوڕی عەلی ٣- مەحموودی کوڕی عەصری کوڕی عەطاء ٤- ئەبو عەمری جەونیو کەسانی تریش.

٣٧٤- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {حَفِظْتُ مِنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَشْرَ رَكَعَاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ اَلظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ اَلصُّبْحِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُمَا: {وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلْجُمْعَةِ فِي بَيْتِهِ}.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٤٩٥ = ٩٣٧، ١١٦٥، ١١٧٢، ١١٨٠. پوختەی موسلیم ٤٢٤ = ٢٠٣٦، ١٦٩٥ شیحا = ٧٢٩ مسلم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی) فەرمووی: لە پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دە ڕکات نوێژی سوننەت فێربووم: دوو

ركات لەپێش نوێژی نیوەڕۆوەو دوو ركات لەپاشیەوەو دوو ركات لەپێش نوێژی شێوانەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم دوو ركاتەی لەماڵەوەی دەكرد، وە دوو ركات لەپاش نوێژی خەوتنانەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم دوو ركاتەشی لەماڵەوەی دەكرد، وە دوو ركاتیشی لەپێش نوێژی بەیانییەوە دەكرد، وەلەم كاتەدا كەپێی دەگوترێ: سەبای صالحان، كەس نەدەچوو بۆ خزمەتی، چونكە لەم دەمەدا، لەگەڵ خودای خۆی خەریك بوو!. {تاج/١، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە ٦٠٢ چاپی چوارەم – ش/د/ت/ن}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (٤٩٥)ی تجریدو (٤٢٤)ی پوختەی موسلیمدا، ئەم زیادەیەی هەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش نوێژی هەینی سوننەتی نەدەكرد، هەتا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، لەوێ لەماڵەوە دوو ركات نوێژی سوننەتی پاش هەینی دەكرد).

٣٧٥– وَلِمُسْلِمٍ: {كَانَ إِذَا طَلَعَ اَلْفَجْرُ لَا يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ}.

{پوختەی موسلیم ٣٥٨ = ١٦٧٥ مسلم/شیحا = تجریدی بوخاری/١ لاپەڕە ٣٥٦ ژمارە: ٣٥٩ = ٦١٨، ١١٧٣، ١١٨١ فتح الباری. مسلم ٧٢٣}.

حەپسەی كچی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) كە لەهەدوو جیهانا هاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرانی بێ) دەفەرموێ: كاتێ بەیانی دەداو، بانگبێژ لەبانك دەبۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنیا دوو ركات نوێژی سوننەتی سووكەڵەی دەكر، بەرلەوە كەقامەت بكرێ بۆ نوێژی بەیانی.

(ڕوونكردنەوە):

آ/ ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ:

١- كاتی كردنی ئەم سوننەتە لەپاش شەبەقدانە.

٢- لەسەرەتای كاتەوە خێری زیاترە.

٣- دوو رکاتی سووکەڵە بن‌و بەس.

٤- واسوننەتە ئەم سوننەتە نەکەوێتە نێوانی قامەت‌و دابەستنی نوێژی بەیانییەوە.

ب/ حەفصەی کچی ئیمامی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) هاوسەری پێغەمبەری خودایە، دایکی باوەڕدارانە، لەساڵی سێیەمی کۆچیدا، بەبێوەژنی لەدوا عائیشە، شووی کرد بە پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەسنی جوانی حەفصەدا، دەفەرموێ: (جوبرائیل پێی فەرمووم: حەفصە رۆژووەوانێکی باش‌و شەونوێژکەرێکی زۆر چاکە، لەدونیاداو، لەبەهەشتیشا، هاوسەری تۆیە ئەی پێغەمبەری خودا!).

حەفصە (رەزای خودای لێ بێ) هەتا مرد هەمیشە، سەرومڕ بەڕۆژوو بوو، لەژنە کۆچکارەکانە، کە لە مەککەوە لەپێناوی ئایینی ئیسلاما رەویان کردو کۆچیان کرد بۆ مەدینە، سەروەسێتی باوکی بوو، پێنج فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: (متفق علیه)یە.

حەفصە خوێنەوار بوو، قورئانخوێنێکی باش بوو. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٣٦٨٤}.

٣٧٦- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ اَلظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ اَلْغَدَاةِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٨٤ = ١١٨٢ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٣٧٣ = مسلم شیحا: ١٦٩٦}.

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەکرد نەیدەچواندن: چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا، وە دوورکاتیش لەپێش نوێژی بەیانیدا. {تاج/١، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٦٠٤}.

٣٧٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: {لَمْ يَكُنْ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى شَيْءٍ مِنْ اَلنَّوَافِلِ أَشَدَّ تَعَاهُدًا مِنْهُ عَلَى رَكْعَتَيْ اَلْفَجْرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/١/٥٨١ = ١١٦٣ فتح البـاری = شيحا ١٦٨٣ = مسلم ٧٢٤}:

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ نوێژێکی تره سوننەتی تری، وەك دوو ڕکاته سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئاوا بەباشی، سەروکاری نەدەکرد. {تاج/١، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٥٩٧}.

٣٧٨- وَلِمُسْلِمٍ: {رَكْعَتَا اَلْفَجْرِ خَيْرٌ مِنْ اَلدُّنْيَا وَمَا فِيهَا}.

{پوختەی موسليم ٣٥٩ = ١٦٨٥ شيحا ٧٢٥ مسلم}:

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (دوو ڕکاته سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی، لەهەموو موڵك و خۆشی دونیا باشترن). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٩٥ – م/ت/أحمد}.

٣٧٩- وَعَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ أُمِّ اَلْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: سَمِعْتَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَنْ صَلَّى اِثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي اَلْجَنَّةِ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ " تَطَوُّعًا".

{پوختەی موسليم/ ٣٧٠ = مسلم ٧٢٨}:

ئەمە دەقەکەیەتی لەپوختەی موسلیما:

ئوم حەبیبە (ڕەزای خودای لێ بێ) کەهاوسەری پێغەمبەرە، لەهەر دوو جیهاندا، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەربەندەیەکی موسوڵمان، ژن بێ یان پیاو، نێر بێ یان مێ، هەموو ڕۆژێ دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت بکا بۆ خودا، سەرەڕای نوێژە فەرزەکان، کە لەکاتی ئاساییدا، لەغەیری ڕۆژی هەینی، حەڤدە ڕکاتن، مسۆگەر کە خودای گەورە لەبەهەشتا کۆشکێکی بۆ دروست دەکا، ئوم حەبیبە

(رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوەتی ئەمەم لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە، لەوساکەوە هەمیشە ئەم دوانزە رکاتەیەم تەرك نەکردووەو دەیانکەم. لەنەخۆشی سەرەمەرگا، عەنبەسەی برای ئوم حەبیبە فەرمووی: منیش ئەوەتی ئەمەم لەئوم حەبیبە بیستووە قەت تەرکم نەکردوون، نوعمانی کوڕی سالمیش فەرمووی: منیش ئەوەتی ئەمەم لەعەمر بیستووە قەت تەرکم نەکردوون). لەتاجدا دەفەرموێ: تەرمەزی ئەمەشی لێ پتر کردووە: چوار رکات لەپێش نیوەڕۆداو، دوو رکات لەپاشیەوەو دوو رکات لەپاش شێوانەوەو دوو رکات لەپاش نوێژی خەوتنانەوەو دوو رکات لەپێش نوێژی بەیانییەوە. {تاج/١ لاپەڕە: ٣٠٥، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٥٩٤ + ریاض/٣، لاپەڕە: ١٩٥، زنجیرە: ١٩٥ هەتا کۆتایی}.

٣٨٠- وَلِلتِّرْمِذِيِّ نَحْوُهُ، وَزَادَ: {أَرْبَعًا قَبْلَ اَلظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ اَلْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ اَلْفَجْرِ}.

لەکۆتایی ژمارەکەی پێشیەوە واتاکراوە {بڕوانە: صحيح الجامع/٦٣٦٢}.

٣٨١- وَلِلْخَمْسَةِ عَنْهَا: {مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعٍ قَبْلَ اَلظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اَللَّهُ عَلَى اَلنَّارِ}.

{صحيح الترغيب والترهيب:٥٨٤. أبو داود رقم: ١٢٦٩. ترمذى: ٤٢٨. أحمد ٣٢٥/٦. الحاكم رقم: ١١٧٥. نسائى: ١٨١٦. بيهقى رقم: ٤٢٦٤}:

عەنبەسەی کوڕی ئەبو سوفیان فەرمووی: ئوم حەبیبەی خوشکم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ چوار رکات نوێژی سوننەت لەپێش نوێژی نیوەڕۆوەو چوار رکات لەپاشیەوە، هەمیشە بەرێكو پێکی بکاو ئاگادارییان بکاو نەیانفەوتێنێ. خودای گەورە دەیپارێزێ لەدۆزەخ). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٦٠٧ — د/ت/ن- سند صحيح}.

٣٨٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {رَحِمَ اَللَّهُ اِمْرَأً صَلَّى أَرْبَعًا قَبْلَ اَلْعَصْرِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح الترغيب والترهيب: ٥٨٨. الصحيح المسند: ٧١٤}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕەحمەتی خودا لەوکەسە بێ، کە لەپێش نوێژی عەصرەوە، چوار ڕکات نوێژی سوننەت دەکا، بەنیازی سوننەتی پێش عەصر). {تاج/١، زنجيرە: ١٠٤، ژمارە: ٦٠٨}.

دانەر دەفەرموێ: تەرمەزی بەحەسەنی داناوەو ئیبنو خوزەیمە (ڕەحمەتیان لێ بێ) بەصەحیح.

٣٨٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {صَلُّوا قَبْلَ اَلْمَغْرِبِ، صَلُّوا قَبْلَ اَلْمَغْرِبِ " ثُمَّ قَالَ فِي اَلثَّالِثَةِ: " لِمَنْ شَاءَ " كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا اَلنَّاسُ سُنَّةً} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٥٨٥ = ١١٨٢، ٧٣٦٨}:

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی ئەلموزەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار فەرمووی: (دوو ڕکات نوێژی سوننەت، لەپێش نوێژی شێوانەوە بکەن) لەسەری جاری سێیەمدا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە بۆ کەسێکە ئارەزووی کردنی ئەم نوێژە سوننەتەی هەبێ!). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە وەهای فەرموو لەجاری سێیەما، نەوەکوو مەردوم بیکەن بە دەستوورو وابزانن، کە ئەم دوو ڕکاتە لەپێش کردنی نوێژی شێوانا، هەردەبێ بکرێ.

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لە دەستەی پەیمانی خۆشنوودیی (کە ناودارە بە بەیعەتی ڕیزوان) کە پێشیان دەگوترێ:

(أصحاب الشجرة: يارانی درەخت). عەبدوڵڵا، بۆ شانازیو پیرۆزی، دەیفەرموو: بەدەستی خۆم لقو پۆپی ئەو درەختەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوور دەخستەوە، تا نەبێ بە ئازار بۆی، کە لەکاتی رێکەوتنی (صولح)ی حودەیبییەدا، پەیمانی بەیعەتول ریزوانی لەژێردا سازدا.

عەبدوڵڵا (٤٣) چلو سێ فەرموودەی هەیە، لەبوخاریدا پێنجی هەیە، کاتێ شاری (تستر) ئازادکرا، عەبدوڵڵا یەکەم کەس بوو، کە لەدەروازەکەیەوە چووە ژوورەوە، لەهەموو کەسێ زیاتر، حەسەنی بەصری فەرموودەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، یەکێ بوو لەو دەکەسە کە پێشەوا عومەر، ناردنی بۆ بەصرە، هەتا دانیشتوانی شارەزای ئایین بکەن، حەوت منداڵی هەبوو، ساڵی (٦٠) شەستی کۆچی لەبەصرە، بەمەرگی خوایی مردووە، لەسەر راسپێری خۆی ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٣٨٤- وَفِي رِوَايَةٍ لِإِبْنِ حِبَّانَ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) صَلَّى قَبْلَ اَلْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ}. {قال الألباني: هذه الرواية مُقَطَّعَةُ الإِسْنَادِ، منكرةُ المَتْنِ، تَمَامُ المِنَّةِ: ٢٤٢/١. ابن حبان/ ١٥٨٨}:

لەگێڕانەوەیەکی ئیبنو حیببانـدا: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار لەپێش کردنی نوێژی شێوانا، لەنێوانی بانگو قامەتی نوێژی شێوانا، دوورکات نوێژی سوننەتی دەکرد).

٣٨٥- وَلِمُسْلِمٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: {كُنَّا نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ غُرُوبِ اَلشَّمْسِ، فَكَانَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَرَانَا، فَلَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا}.

{پوختەی موسلیم/٢٢٢ = ١٩٣٥ شیحا = ٨٣٦}:

ئەمە دەقەکەیەتی لەپوختەی موسلیما:

موختاری کوڕی فولفول فەرمووی: سەبارەت بەکردنی نوێژی سوننەت لەپاش نوێژی عەصر، لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، کە زانیاریی ئێوە چییە لەم بارەیەوە؟

فەرمووی: ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، لەوکەسانەی دەدا، کە لەپاش نوێژی عەصر، نوێژی سوننەت دەکەن، لەسەر ئەوە لێی ئەدان، کە پێشگیریی لەنوێژکراوە لەمکاتەدا، ئەنەس فەرمووی: بەڵام ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەپاش خۆرئاوابوون، لەدوا بانگی شێوان، لەنێوانی بانگو کردنی نوێژی شێوانا، دوورکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی شێوانمان دەکرد. پێم گوت: ئایا پێغەمبەر خۆی ئەم دوو رکاتە سوننەتەی دەکرد، کەئێوە لەمکاتەدا دەتانکرد؟ ئەنەس فەرمووی: (چاوی لێمان بوو، کە دەمانکردن، بەڵام بەچاكو بەخراپ، هەقی نەبوو بەسەرمانەوە: نەدەیفەرموو بیکەن، نە دەیفەرموو: مەیکەن!).

٣٨٦- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُخَفِّفُ اَلرَّكْعَتَيْنِ اَللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ، حَتَّى إِنِّي أَقُولُ: أَقَرَأَ بِأُمِّ اَلْكِتَابِ؟} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٥٨٢ = ١١٦٥ فتح الباری = مسلم شیحا/١٦٨١/ ١٦٨٢ = مسلم/٧٢٣، ٧٢٤}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، تەنانەت لەدڵی خۆما دەمگوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحە دەکەوێ؟ {تاج/١، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٥٩٨}.

٣٨٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَرَأَ فِي رَكْعَتَيْ اَلْفَجْرِ: (قُلْ يَا أَيُّهَا اَلْكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اَللَّهُ أَحَدٌ)} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٣٦٠ = ١٦٨٧ شیحا = مسلم/٧٢٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار لەدوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لەپاش خوێندنی فاتیحا، لەرکاتی یەکەمیانا، سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ەی دەخوێندو، لە ڕکاتی دووەمیانا، سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی دەخوێند). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٥٩٩}.

٣٨٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيْ اَلْفَجْرِ اِضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ اَلْأَيْمَنِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بخاری/١١٦٠. مسلم شیحا/١٧١٤، ١٧١٥ = مسلم/٧٣٦}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر لای ڕاست بەرەو رووگە کەمێ ڕادەکشا).

٣٨٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ اَلرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ اَلصُّبْحِ ، فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى جَنْبِهِ اَلْأَيْمَنِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحیح الجامع/٦٤٢. أبو داود رقم: ١٢٦١. ترمذی رقم: ٤٢٠. أحمد ٢/٤١٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیتان کرد، لەسەر لای ڕاست بەرەو رووگە ڕاکشێن!).

٣٩٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {صَلَاةُ اَللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمْ اَلصُّبْحِ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٢٨٩ = ٤٧٢، ٤٧٣، ٩٩٠، ٩٩٣، ٩٩٥، ١١٣٧ فتح البارى. شيحا/١٧٤٥ - ١٧٤٧ = مسلم/٧٤٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەردوانگە بوو، وتاری دەدا، پیاوێ لێی پرسی: قوربان! ڕات چۆنە لەبارەی شەونوێژەوە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (واخێرترە کە شەونوێژ دوورکات دوورکات بێ، واتە: لەهەموو دوورکاتێکدا سڵاوبداتەوە، شەو نوێژخوێن کە مەترسی ئەوەی بۆ پەیدابوو، کەوا خەریکە بەیان بدا، با یەك ڕکات نوێژ بەتەنها بکا، ئیتر چەندەی شەونوێژ کردووە، ئەوتاقە ڕکاتە دەیکات بەتاك بۆی).

نافیع دەیفەرموو: ئیبنو عومەر دەیفوەرموو: یەك ڕکاتەکەی وەتر بکەن، بەدواترین نوێژی سوننەتی شەوتان، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەمە دەکرد). {تاج/١، زنجيرە: ١٨٢، ژمارە: ٩٧٩}.

٣٩١- وَلِلْخَمْسَةِ (وَصَحَّحَهُ اِبْنِ حِبَّانَ): {صَلَاةُ اَللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى"} وَقَالَ النَّسَائِيُّ: "هَذَا خَطَأٌ".

{صحيح، تمام المنتد ١/٢٣٩، ٢٤٠. أحمد رقم: ٤٧٩١. أبو داود رقم: ١٢٩٥. ابن ماجة رقم: ١٣٢٢. ترمذى رقم: ٥٩٧. نسائى في الكبرى رقم: ٤٧٢. ابن حبان رقم: ٢٤٥٣. ابن خزيمة رقم: ١٢١٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لەم گێڕانەوەدا، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (واخێرترە کە نوێژی سوننەت چی شەو نوێژبێ و چی ڕۆژنوێژ بێ، دوورکات دوورکات بێ، لەپاش هەموو دوورکاتێ سڵاو بداتەوە).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو حیببان بەم لەفظە، بە فەرموودەیەکی تەندروستی داناوە، بەڵام نەسائی دەڵێ: ئەمەی ئیبنو

حیببان دەڵێ: کە نوێژی سوننەتی ڕۆژیش هەر دوورکات دوورکات بێ، ئەم زیادەیە هەڵەیە، دوورکات، دوورکات، هەر بۆ شەو نوێژەو بەس.

(ڕوونکردنەوە):

نوێژی سوننەتی ڕەهاو شەونوێژو نوێـژی سوننەتی ڕۆژ بـەم شێوەیە دەکرێ:

١- جەماوەری زانایان ڕایان لەسـەرئەوەیە، کـە نوێـژی سـوننەت بەشـەو، دوورکات دوورکاتە، گەرچی دروستە، بەسێ ڕکات، یا بەچوار ڕکـاتیش بکـرێ، لەوەزیاتر نابێ، مەگەر وەتر، چونکە لەوەترا دروسـتە پێـنج ڕکـات بەیەکـەوە بکا، بەشێوەی گشتی شەونوێژ دوورکاتە.

٢- سوننەتی ڕۆژیش واباشە دوورکـات دوورکـات بـێ، بـەبێ کەراهـەتیش دروستە کە چوار ڕکات بێ، لەوە زیاتر نەبێ.

٣٩٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَفْضَلُ اَلصَّلَاةِ بَعْدَ اَلْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اَللَّيْلِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/ ٦١٠ = ٢٧٤٧ شیحا = مسلم/١١٦٣}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لـەپاش ڕۆژووی ڕەمـەزان، گـەورەترین ڕۆژوو، ڕۆژووی موحەڕڕەمە، کەمانگی خودایە، لـەپاش نوێـژی فـەرزیش گـەورەترین نوێژ، نوێژی شەو نوێژە!). {تاج/١/٤٧٨، ژمارە: ٩٦٨، زنجیرە: ١٨١}.

٣٩٣- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْـسٍ فَلْيَفْعَـلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَرَجَّحَ النَّسَائِيُّ وَقْفَهُ.

{صحيح أبي داود/١٢٦٠. أبو داود رقم: ١٤٢٢. نسائي رقـم: ١٧١٠. ابـن ماجة رقم: ١١٩٠. ابن حبان رقم: ٢٤٠٧. دارقطني ٢/٢٣}:

ئـەبو ئـەییوبی ئەنـصاری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (وەتـر شـتێکی هەقـە، لەسـەر هـەموو موسوڵمانێ بووە بەماف، جائەوەی کە حەزدەکا کـە پێـنج ڕکات نوێـژی وەتـر بکا بابیکا، وە ئـەوەی کەحـەزدەکا کـە سـێ ڕکـات نوێـژی وەتـر بکـا بابیکـا، وە ئەوەی کە حەزدەکا کەیەك ڕکات نوێژی وەتر بکا بابیکا).

ئیبنـو حیببـان بەصـەحیحی دائـەنێ، نەسـائی دەڵـێ: بـەهێزو سـەنگین ئەوەیـە کەمـەوقووف بـێ. لەگێڕانەوەیـەکی تاجـا دەڵـێ: (... جـا ئـەوەی کـە حەزدەکا با حەوت ڕکات وەتر بکا، وە ئەوەی کە حەزدەکا با پێنج ڕکات وەتـر بکا، وە ئەوەی کە حەزدەکا با سێ ڕکات بکا، وە ئەوەی کـە حـەزدەکا، بـا یـەك ڕکات وەتر بکا). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٦١٨}.

٣٩٤- وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَـيْسَ اَلْـوِتْرُ بِحَـتْمٍ كَهَيْئَةِ اَلْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ وَالْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ.

{صـحيح النـسائي/١٦٧٦. ترمـذی رقـم: ٤٥٣. نـسائی ٣/٢٢٩. حـاكم ١/٣٠٠، ١/٤٤٢}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بـێ) فـەرمووی: نوێـژی وەتـر پێویست نییە وەك نوێژە خوانووسە فـەرزەکان، بـەڵام سـوننەتێکی گەورەیـە، کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەفـەرمانی خـودا کردوویـەتی بەدەسـتوورێکی دامـەزراو). نەسـائیو تەرمـەزی گێڕاویانەتـەوە، تەرمـەزی بەحەسەنی دائەنێ، حاکم بەصەحیح.

٣٩٥- وَعَنْ جَابِرٍ {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـامَ فِـي شَـهْرِ رَمَضَانَ، ثُمَّ اِنْتَظَرُوهُ مِنْ اَلْقَابِلَةِ فَلَمَّا يَخرُجْ، وَقَالَ: " إِنِّي خَشِيتُ أَنْ يُكْتَبَ عَلَـيْكُمْ اَلْوِتْرُ} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{ابن حبان رقم: ٢٤٠٩}:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوێ لەمانگی رەمەزانا، هەڵسا شەونوێژی کرد بەیارانی، شەوی دوایی نوێژخوێنەکان چاوەڕوانیان کرد، کە تەشریف بهێنێ، بەجەماعەت شەونوێژیان بۆبکاتەوە، وەك شەوی پێشوو، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرنەچوو لەماڵو نەهات بۆلایان، وە فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (من بۆیە نەهاتم بۆناوتان، چونکە مەترسی ئەوەم هەبوو، کە وەتر فەرزببێ لەسەرتان!). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩٢١ = ٢٠١٢ فتح الباری + تاج/٢، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ١٣٤٨}.

٣٩٦- وَعَنْ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَللَّهَ أَمَدَّكُمْ بِصَلَاةٍ هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمُرِ اَلنَّعَمِ" قُلْنَا: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اَللَّهِ؟ قَالَ: "اَلْوِتْرُ، مَا بَيْنَ صَلَاةِ اَلْعِشَاءِ إِلَى طُلُوعِ اَلْفَجْرِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح دون قوله: هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمُرِ النَّعَمِ، الإرْواء: ٤٢٣. ترمذی رقم: ٤٥٢. أبو داود رقم: ١٤١٨. ابن ماجة رقم: ١١٦٨. حاكم المستدرك ٣٠٦/١}:

خاریجەی کوڕی حوذافە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ دەرچوو هات بۆلامان، فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر، سەرەڕای نوێژە فەرزەکان نوێژێکی تریشی پێتان بەخشیوە، ئەو نوێژە بۆ ئێوە گەلێ چاکترە لەڕانە وشتری سوور، یا مەڕەز، کە نایابترین ماڵی عەرەبانە). گوتمان: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەو نوێژە کامەیە؟ فەرمووی: (نوێژی وەترە، کەکاتی بوونی ئەم نوێژە لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانەوە دەست پێ دەکا، وە هەتا شەبەقی بەیانی کاتی دەمێنێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١١ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

خاریجەی کوڕی حوذافە، قوڕەیشییە، عەدەوییە، یەکێ بوو لەو پاڵەوانە کەم مانەندانەی کە یەکیان بەهەزار سوارە، ڕۆژی رزگاربوونی مەککە موسوڵمان بووە، بەڕێوەبەری هێزی پۆلیسی عەمری کوڕی عاص بوو، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی میصر بوو، لەمیصر قازی عەمری کوڕی عاص بوو، ئەم تەنها فەرموودەیەی هەیە، کە باسی نوێژی وەتر دەکا. ئەو شەوەی ئیمامی عەلی شەهید کرا، کابرای خاریجی خاریجەی کوشت لەو وایە کە ئەوە عەمری کوڕی عاصە، ئەمەیش لەساڵی چلی کۆچیدا بوو.

٣٩٧- وَرَوَى أَحْمَدُ: عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ نَحْوَهُ.

{راجع التخريج السَّابقَ}:

ئیمامی ئەحمەدیش لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە فەرموودەیەکی لەم شێوە دەگێڕێتەوە.

٣٩٨- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ لَمْ يُوتِرْ فَلَيْسَ مِنَّا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِسَنَد لَيِّنٍ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{ضعيف الجامع: ٦١٥٠. الصحيح المسند: ١٧٩. أبو داود رقم: ١٤١٩. حاكم رقم: ١١٤٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە فەرمووی باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی وەتر هەقە، ئەوەی کە تەرکی بکاو بەشێوەی گشتی نەیکا، ئەوە لەئێمە نییە). گەرچی ئەبو داوود بەڕشتەیەکی نەرم ئامێز دەریهێناوە، بەڵام حاکم بە تەندروستی دادەنێ.

٣٩٩- وَلَهُ شَاهِدٌ ضَعِيفٌ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عِنْدَ أَحْمَدَ.

{أحمد المسند ٣٥٧/٥، ٤٤٣/٢}:

ئەم فەرموودەی بورەیدەیە، بەهێزکەرێکی هەیە، کە دەبێ بەشایەت بۆی، کە ئەمەیە: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ وەتر نەکا لەئێمە نییە) بەڵام ئەم شاهیدەیش کە ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتەوە دیسان بێ هێزو لاوازە، چونکە یەکێ لەپیاوانی رشتەکەی بەلاواز دائەنرێ.

**(ڕوونکردنەوە):**

بورەیدەی کوڕی حوصەیب هاوەڵێکی گەورەی پێغەمبەرە، لەپێش غەزای بەدردا ئیسلام بووە، بەڵام ئامادەی ئەم غەزایە نەبووە، ئامادەی حودەیبییە بووە، لە بەیعەتولڕیزوان (پەیمانی خۆشنوودی)دا لەژێر درەختەکەدا، پەیمانی دا بە پێغەمبەر، کاتێ پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینە، کە گەیشتە غەمیم، بورەیدە، لەگەڵ هاوماڵەکانی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر، کە نزیکەی هەشتا ماڵێ دەبوون، هەموو موسوڵمان بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی بۆیانکرد، ئەوانیش لەپشتیەوە ئەو نوێژەیان بەجەماعەت کرد، بورەیدە دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا، شازدە غەزام کردووە، ماوەیێ لەمەدینە نیشتەجێ بوو، لەپاشا گواستیەوەو لە مەدینە باریکردو چوو بۆ بەصرە، لەپاشا بەدەم غەزاکردنەوە رۆیشت بۆ خۆراسان، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا لەپاشان گواستیەوە مبۆ مەرو، وەلەوێ نیشتەجێ بوو، هەتا لەسەردەمی جێنشینی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا لەوێ، لەساڵی شەستو سێی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردو بەڕەحمەت چوو، لەئیستیعابا دەفەرموێ: (بوخاری بەرشتەی خۆی، لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: باوکم لەمەرو مرد، لە ئەلحوصەین نێژرا، وە ئەو پێشەوای خەڵکی وڵاتی خۆرهەڵات دەبێو دەبێ بەنوورو رووناکیو چرا بۆیان، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرپیاوێ لەهاوەڵانی من، لەهەر وڵاتێ بمرێ، لەڕۆژی قیامەتا،

لەمەشاهیدەکانیا، وەك حەشرو پردی سیراتو میزان، دەبێ بەپێشەواو پێشەنگو نوورو رووناکی بۆیان).

٤٠٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {مَاكَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا. قَالَتْ عَائِشَةُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي".} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٧٤ = ١١٤٧، ٢٠١٣، ٣٥٦٩ فتح البارى. مسلم شيحا/١٧٢٠ = مسلم/٧٣٨}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم پرسی: لەشەوانی مانگی رەمەزانا، شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو، وەچەند رکات بوو؟ فەرمووی: بەپێی ئاگاداری من بەشێوەی گشتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەلەشەوانی مانگی رەمەزاناو، نەلەشەوانی مانگەکانی تردا، لەیازدە رکات شەونوێژ، زیاتری نەدەکرد، لەپێشا چوار رکاتی دەکرد، مەپرسە لەجوانیو رێكو پێکیو درێژییان، ئەنجا چوار رکاتی تریشی دەکرد، مەپرسە لەجوانیو درێژییان، ئەنجا سێ رکاتی تریشی دەکرد. عائیشە فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! بەرلەوە کە وەتر بکەی، جارجارە دەتبینم دەخەوی؟

فەرمووی: (ئەی عائیشە! چاوەکانم دەخەون بەلام دڵم ناخەوێ!).
{تاج/١، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ٩٨٢}.

٤٠١- وَفِي رِوَايَةٍ لَهُمَا عَنْهَا: {كَانَ يُصَلِّي مِنْ اَللَّيْلِ عَشْرَ رَكَعَاتٍ، وَيُوتِرُ بِسَجْدَةٍ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْ اَلْفَجْرِ، فَتِلْكَ ثَلَاثُ عَشْرَةَ}.

{تجریــدی بوخــاری/١، ژمــاره: ٥٦٨ = ١١٤٠ فــتح البــاری. پوختــهی موسلیم/٣٨٢ = ١٧١٧ شیحا = مسلم/١٢١١}:

عائیـشه (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) بەوەترو دوو رکاتە سوننەتەکانی بەیانییەوە، بەشەو سیازدە رکات نوێژی سوننەتی دەکرد).

٤٠٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُـصَلِّي مِـنْ اَللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِـنْ ذَلِـكَ بِخَمْـسٍ، لَـا يَجْلِـسُ فِـي شَـيْءٍ إِلَّـا فِـي آخِرِهَا.}.

{پوختەی موسلیم/٣٨٢ = ١٧١٧ شیحا = مسلم/٧٣٧}:

عائیــشەی هاوســەری پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر پێغەمبــەرو رەزای خــودا لەهــەموو هــاوەڵو هاوســەرەکانی بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەو، سیازدە رکات شـەونوێژی دەکـرد، هەشـت رکـاتی تەهـەجود بـوو، دوورکـات دوورکـات دەیکـردن، ئـەوجا پێـنج رکـات وەتـری دەکـرد، بەیـەك تـەحیات، کـە لـەئاخر رکاتـا دائەنیـشت بـۆیو ئـەوجا سلاوی دەدایەوە).

٤٠٣- وَعَنْهَا قَالَتْ: {مِنْ كُلِّ اَللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى اَلسَّحَرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِمَا.

{تجریــدی بوخــاری/١، ژمــاره: ٥١٢ = ٩٩٦ فــتح البــاری. پوختــهی موسلیم/٣٩١ = ١٧٣٣ شیحا = مسلم/٧٣٧}:

مەسـرووق (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـە عائیـشەم گـوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی وەتری کەی دەکرد؟ فـەرمووی: لـەپاش کردنـی نوێـژی خـەوتنان، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەهـەموو کـاتێکی شـەودا، وەتـری دەکـرد، هەنـدێ جـار لەسـەرەتای شـەوەوە دەیکـرد، هەنـدێ جـار لەناوەڕاسـتی شـەودا دەیکـرد، وەهەنـدێ جاریش لـەدوا

دوایی شەودا وەتری دەکرد، هەندێ جاریش لەپێش بانگی بەیانیدا دەیکرد، بەڵام لەپێش مردنیدا هەر بەرەبەیان وەتری دەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

٤٠٤– وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ اَلْعَاصِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَا عَبْدَ اَللَّهِ! لَا تَكُنْ مِثْلَ فُلَانٍ، كَانَ يَقُومُ مِنْ اَللَّيْلِ، فَتَرَكَ قِيَامَ اَللَّيْلِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٧٦ = ١١٥٢ شيحا = مسلم تخريج الشيخ خليل مأمون شيحا = مسلم/١١٥٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی عەبدوڵڵا! وەك فیسارە کەس مەبە، کە شەونوێژی دەکرد، بەڵام ئێستا وازی لێ هێناوە). {ریاض الصالحین/١، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٥٤/٢}.

٤٠٥– وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَوْتِرُوا يَا أَهْلَ اَلْقُرْآنِ، فَإِنَّ اَللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ اَلْوِتْرَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{صحيح الجامع: ٢٥٣٨. أحمد ١٤٣/١ رقم: ١٢١٣. أبو داود رقم: ١٤١٦، ١٤١٧. ترمذى رقم: ٤٥٣. طبرانى رقم: ١٠٢٦٣. بيهقى ٤٦٨/٢. حاكم رقم: ١١١٨. نسائى الكبرى رقم: ٤٤٠}:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی قورئانخوێنەکان! ئەی پەیڕەوانی قورئان! واتە: ئەی ئۆممەتی موحەممەد! نوێژی وەتر بکەن، کە نوێژێکە رکاتەکانی تاکە، لەپاش نوێژی خەوتنانەوە دەکرێ چونکە خودا خۆی تاکەو تاکی خۆش دەوێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٠}.

٤٠٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اِجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥١٣ = ٩٩٨ فتح البارى/١٧٥٢ شيحا = ٧٥١ مسلم}:

ئيبنو عومەر (رەزاى خوادايان لىٚ بىٚ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (وەتربكەن بەدواترين نوێژى شەوتان). {تاج/١، زنجيرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٠}.

٤٠٧- وَعَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالثَّلَاثَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{احمد رقم: ١٦٣٣٩. أبو داود رقم: ١٤٣٩. ترمذى رقم: ٤٧٠. نسائى رقم: ١٦٧٩. ابن حبان رقم: ٢٤٤٩}:

طەلقى كوڕى عەلى (رەزاى خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: لەپێغەمبەرم بيست، دەيفەرموو (دروودى خوداى لەسەر بێ): (لەيەك شەودا دوو وەتر نابێ). {تاج/١، زنجيرە: ١٠٦، ژمارە: ٦٢٠}.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئيمامى ئەحمەدو ئيمامى بوخارى دەفەرموون: تەلقى كوڕى عەلىو عەلى كوڕى تەلق دوو ناون بۆ يەك كەس. ژياننامەى عەلى كوڕى تەلق لەپێشەوە لە ژمارە (٢٢٠) دووسەدو بيستدا رابورد.

٢- ريشەى ئەم فەرموودەيە لە سونەنى ئەبوداوودا ئاوايە:

قەيسى كوڕى تەلق فەرمووى: كات رەمەزان بوو، باوكم طەلقى كوڕى عەلى سەردانى كردين، ئێوارەيێ لەلاى ئێمە بەربانگى كردەوە، جا ئەو شەوە ئەو نوێژى تەراويحى كرد بۆمانو ئەوجا نوێژى وەترى بەجەماعەت بۆ كردين، لەپاشا شۆڕبۆوەو رۆيشت بۆ مزگەوتەكەى خۆى لەوێيش نوێژەكانى

بەجەماعەت بۆ هاوەڵەکانی خۆی کرد، لەپاش تەراویح کەتەنیا نوێژی وەتر مابوو، پیاوێکی تری پێشخست کەپێشنوێژی وەترەکەیان بۆ بکا، بۆ پاساوی ئەمە فەرمووی: من لە مزگەوتەکەی ئەولا نوێژی وەترم کردووە، نابی وەتر بکەمەوە، تۆ بەرنوێژی نوێژی وەتری ئەمشەو بۆ کۆمەڵەکەی خۆت بکە، چونکە بۆ خۆم لەدەمی پیرۆزی پێغەمبەرم، بەگوێی خۆم بیست، دەیفەرموو: (لەیەك شەودا دوو وەتر نابیّ!).

٣- دوو گوتە هەیە سەبارەت، بەوەتر: کاتیّ نوێژی وەتر کرا، ئیتر نوێژی سوننەتی تەهە ججودو شەو نوێژ قفڵ دەبیّو دەرگای نوێژی سوننەت دائەخریّو، لەپاش وەتر کردنی نوێژی سوننەت دروست نییە، وەك بەدەق دەڵێن: (لاصَلاَةَ بَعْدَ الوَتْرِ = لەپاش کردنی نوێژی وەتر، نوێژی سوننەتی شەونوێژ ناکریّ).

ئەم ڕایە زۆر لاوازو بیّ هێزە، بەڵام هەندیّ لایەن بەپێی گوتەی (خَالِفْ تُعْرَفْ: بەپێچەوانەی دەستوور کار بکەی ناو دەرئەکەی). ئەم بۆچوونە بەرەو پیّ دەدەنو سەرلەخۆیانو لەلاوەکان دەشێوێنن.

گوتەی دووەم: کەڕای جەماوەری زانایانە، لەکۆنو نوێدا، ئەمەیە (نوێژ باشترین بابەتە، جاهەرکەسیّ ئارەزوو دەکا بانوێژێکی سوننەتی زۆر بکا، چەندە خۆی ئارەزووو دەکا، وە هەرکەسێکیش ئارەزوو دەکا باکەم بکا چەندە خۆی ئارەزوو دەکا!). لەبەر ئەوە لەپاش وەتر نوێژی سوننەت قفڵ نابیّ، وەمرۆڤ ئارەزووی خۆیەتی، چەندیّ دەتوانیّ لەپاش کردنی وەتر شەونوێژی تر بکا، وە ئەم فەرموودەی تەلقی کوڕی عەلیە، یەکێکە لەبەڵگە بەهێزەکانی گوتەی جەماوەر، کە شەونوێژ، ژمارەی تایبەتی نییە، لەپاش وەتر نوێژی سوننەتی تر چەندە دەکەی بیکە. وە ئەمە ڕای دامەزراوی مەزهەبی شافیعییە، شەونوێژ ژمارەی تایبەتی بۆ نییە، گەرچی سیازدە رکات لای کەمی

باشييەتی. وەلەم شەرحانەدا، كە لەسەر ئەم كتێبی (بلوغ المرام)ە، كراوە، كە (سبل السلام)و (فتح ذی الجلال والإكرام) دانراوی شێخ محمد بن صالح العثمين‌و (البدر التام شرح بلوغ المرام) ئەوە ڕای پەسەندە: (لەپاش وەتر چەندە نوێژی سوننەت دەكەی بیكە).

٤٠٨- وَعَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُوتِرُ بِـ "سَبِّحِ اِسْمَ رَبِّكَ اَلْأَعْلَى"، و: "قُلْ يَا أَيُّهَا اَلْكَافِرُونَ"، و: "قُلْ هُوَ اَللَّهُ أَحَدٌ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ. وَزَادَ: {وَلَا يُسَلِّمُ إِلَّا فِي آخِرِهِنَّ}.

{صحيح النسائي: ١٧٠. أبوداود رقم: ١٤٢٣. نسائي ١٧٣٠. احمد ١٢٣/٥}:

ئوبەیی كوڕی كەعب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی وەتردا، لەركاتی یەكەما سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى}ی دەخوێند، وە لەركاتی دووەمدا سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ەی دەخوێند، وە لەركاتی سێیەمدا سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی دەخوێند. {تاج/١، زنجيره: ١٠٧، ژمارە: ٦٢١ — د/ت/ن — س/ح = أبو داودو تەرمەزی‌و نەسائی، سەنەد حەسەن}. لەتاجدا دەفەرموێ: نەسائی‌و ئەبو داوود ئەمەیان پترکردووە: كە سلاویشی دەدایەوە سێجار دەیفەرموو {سُبْحَانَ المَلِكِ القُدُّوسِ: پاكی‌و بێگەردی بۆ پاشای پاكی بێ نەنگ} وە لەسەری جاری سێیەمدا دەنگی لێ هەڵ دەبڕی.

فەرموودەكەی تاج لە عائیشەوەیە، لەركاتی سێیەمدا ئاوایە: وە لەركاتی سێیەمدا سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} و سوورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ} و سوورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ}ی دەخوێند {دانەر لەژمارە (٤٠٩)دا ئاماژە بۆئەم گێڕانەوەیە دەكا}.

لەگێڕانـەوەی (بلـوغ المـرام) لەدواکەیـەوە ئاوایـە: (پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنیا بەیەك سڵاودانەوە ئـەم سێ ڕکاتـە وەتـرەی دەکـرد، یەکـەمو دووەم تـەحیاتی نەدەخوێنـد، لەسـێیەما تـەحیاتی دەخوێنـد، ئـەوجا سڵاوی بەلای ڕاستو بەلای چەپا دەدایەوە).

٤٠٩- وَلِأَبِي دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيِّ نَحْوُهُ عَـنْ عَائِـشَةَ وَفِيـهِ: {كُـلَّ سُـورَةٍ فِـي رَكْعَةٍ، وَفِي اَلْأَخِيرَةِ: "قُلْ هُوَ اَللَّهُ أَحَدٌ"، وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ}.

{صحيح ابن ماجة: ٩٦٣. أبو داود رقم: ١٤٢٤. ترمذى رقم: ٤٦٣}:

لەکۆتایی ژمارەی پێشەوە (٤٠٨) تەرجەمەکەی ڕابورد.

٤١٠- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{شيحا/١٧٦١ = مسلم/٧٥٤}:

ئەبو سەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەرلـەوە کەشـەو تـەواو ببـێو بـەیان بدا نوێژی وەتر بکەن).

٤١١- وَلِابْنِ حِبَّانَ: {مَنْ أَدْرَكَ اَلصُّبْحَ وَلَمْ يُوتِرْ فَلَا وِتْرَ لَهُ}.

{صحيح الإرْواء ٢/١٥٣ – ١٥٤. ابن حبان. رقم: ١١٨٩ – الإحسان}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کەسـێ بـەیانی لێ داو نوێـژی وەتـری نەکردبوو، ئیتر وەتری بۆ نییە).

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیە، کاتی وەتر شەوە، کەشەبەقی دا، ئیتر وەتر، نـە بەحازر، نە بەقەزا ناکرێو کاتی بەسەرچووە. {بڕوانە ژمار(٤١٢) لەدواوە.}.

٤١٢- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم): {مَـنْ نَـامَ عَـنْ اَلْوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذَا أَصْبَحَ أَوْ ذَكَرَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ.

{صحيح ابن ماجة ١١٨٨ – صحيح المسند: ٤٢٠. احمد رقم: ١١٢٨٢. أبوداود رقم: ١٤٣١. ترمذى رقم: ٤٦٥. ابن ماجة رقم: ١١٨٨. بيهقى رقم: ٤٣١٠}:

ئەبو سەعيد (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێ بەهۆی خەوەوە، وەتری نەکردو شەو بەسەرچوو، یان لەبیری نەبوو کەنوێژی وەتر بکا، هەتا کاتەکەی کەشەوە نەماو شەبەقی دا، با لەرۆژدا وەتر بکا، یان کەی یادی کەوتەوە بیکات).

(روونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیە، وەتر کەفەوتا، قەزا دەکرێتەوە:

١- هەندێ دەفەرموون، بەشەو چەندێ وەتری کردووە، لەرۆژدا قەزای دەکاتەوە، یان هەرکاتی ویستی قەزای دەکاتەوە بەئەدا چۆنی کردووەو چەندی کردووە ئاوەها بەبێ زیادو کەم.

٢- هەندێ دەفەرموون، ئەگەر بەشەو (٣) سێ رکات وەتری کردبوو، کاتێ دەیگێڕێتەوە بیکا بەچوار رکات، دوو رکات دوو رکات بیان کات، ئەگەر پێنجی کردبوو، بیکا بەشەش رکات بەسێ سلاو بیانکات. کورتو پوخت: واباشە وەتر قەزا بکرێتەوە، بەیەکێ لەم شێوەیانەی کەنووسیمانن.

٤١٣– وَعَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اَللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اَللَّيْلِ، فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اَللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٣٩٣ = ١٧٥٨}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ کە دەترسێ کەلە کۆتایی شەوەوە هەڵنەسێ بۆ شەونوێژ، با لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتر بکا، وە

هەرکەسێ کە بەتەمایە کە لە کۆتایی شەوەوە هەڵبستێ بۆ شەو نوێژ، با لە کۆتایی شەودا نوێژی وەتر بکا، چونکە نوێژی ئاخری شەو، فریشتەی رەحمەت دێنە دیاری‌و تەماشای دەکەن، ئاشکرایە کە ئەمەیان زۆر باشترە!).
{تاج/١، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٦١٤}.

٤١٤– وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا طَلَعَ اَلْفَجْرُ فَقَدْ ذَهَبَ كُلُّ صَلَاةِ اَللَّيْلِ وَالْوَتْرُ، فَأَوْتِرُوا قَبْلَ طُلُوعِ اَلْفَجْرِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{ضعيف الجامع ٥٨٤. ترمذى رقم: ٤٦٩ وصححه النووى ٣١/٤}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ شەبەقی دا، ئیتر هەرچی نوێژی شەو هەیە، کاتی بەسەر دەچێ، هەروا کاتی وەتریش بەسەر دەچێ، چونکە وەتریش هەر شەونوێژە، جا بەرلەوەی کەشەبەق بدا نوێژی وەتر بکەن، با ئەو بەهرە گەورەیەتان لەکیس نەچێ!).

٤١٥– وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي اَلضُّحَى أَرْبَعًا، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اَللَّهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٣٦٥ = ١٦٦٢ شیحا = مسلم ٧١٩}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: هەموو چێشتەنگاوێ، چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، گەلێ جاریش چەندەی خودا لەچارەی نووسیبوو، زیاتری دەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٩ لاپەرە: ٤٨٥، ژمارە: ٩٥٥}.

٤١٦– وَلَهُ عَنْهَا: {أَنَّهَا سُئِلَتْ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي اَلضُّحَى؟ قَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ}.

{شیحا/ ١٦٥٧ = مسلم/ ٧١٧}:

لەعائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) پرسیار کرا: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتنگاوی دەکرد؟ فەرمووی: نەء، ئەگەر لەماڵەوە بوایە نوێژی چێشتنگاوی نەدەکرد، مەگەر لەسەفەر بگەڕایەتەوە.

٤١٧- وَلَهُ عَنْهَا: {مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي سُبْحَةَ اَلضُّحَى قَطُّ، وَإِنِّي لَأُسَبِّحُهَا}.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٥٦٢ = ١١٢٨، ١١٧٧ فتح الباری شرح صحيح البخاری. پوختەی موسلیم ٣٦٣ = ١٦٥٩ شیحا = مسلم ٧١٨}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام دەبوو لەسەر کارێ، وەحەزیشی لەوە بوو کەبەردەوام بێ لەسەری، کەهەموو کاتێ لەکاتو ساتی خۆیدا ئەنجامی بدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا وازی لەوکارە دەهێنا، لەترسی ئەوەی کە موسوڵمانان سەری تی بکەنو تەرکی نەکەنو بەرەبەرە فەرز ببێ لەسەریان. وەهەروا عائیشە فەرمووی: بەپێی زانیاری من، من خۆم هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی چێشتەنگاو بکا، بەڵام من خۆم نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو دەکەم، چونکە هەواڵم زانیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتی. {ریاض/٣ لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ١١٤١}. {فیقهی ئاسان/١٩٠/١، زنجیرە: ١٩٠ چاپی دووەم}.

٤١٨- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {صَلَاةُ اَلْأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ اَلْفِصَالُ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{پوختەی موسلیم/ ٣٦٨ = ١٧٤٣ شیحا = ٧٤٨ مسلم}:

قاسمی شەیبانی فەرمووی: زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خودای لێ بێ) کۆمەڵێکی بینی، لەکاتی خۆرکەوتنا، چێشتەنوێژ (صلاة الضحى)یان دەکرد فەرمووی: ئەدی! ئەمانە خۆشیان باش دەزانن، کەئەم نوێژە لەکاتی تردا بکرێ باشترە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

(نوێژی تەوبەکاران، کە لەخراپە گەڕاونەتەوەو بایانداوەتەوە بەلای خودادا، کەپێی دەگوترێ: نوێژی چێشتەنوێژ، ئەوکاتە گەرمەیەتیو بەباشی دەبێ، کە خۆر ئاوا گەرم دەبێ، چەوو لم تاو دەسەنێو واگەرم دەبێ، کە سمو قاچی پارێنە وشتر داخ دەبێ). {ریاض/٣ لاپەڕە: ١١٩، زنجیرە: ٢٠٧، ژمارە: ١١٤٣ + تاج/١، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٣}.

٤١٩- وَعَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ صَلَّى اَلضُّحَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اَللَّهُ لَهُ قَصْرًا فِي اَلْجَنَّةِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَاسْتَغْرَبَهُ.

{ضعيف الجامع ٥٦٥٨. ترمذى رقم: ٤٧٣. ابن ماجة رقم: ١٣٨٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بیکا بەدەستوورو یاسا، رۆژانە دوازدە رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو، دوو رکات، دوو رکات، یان چوار رکات، چوار رکات بکا، خودا لەبەهەشتا تەلارێکی رازاوەی بۆ دروست دەکات).

تەرمەزی گێڕاویەتەوەو بەغەریبی داناوە، بەلام فەرموودەکەی ئوم حەبیبە، کەوا لەموسلیما، کە لە ژمارە (٣٧٩)ی ئەم پەڕاوەدا لەپێشەوە ڕابورد پشتگیری دەکاو بۆی دەبی بەشایەت.

ئیبنو باز (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەسەرچاوەی ئەم فەرموودەیەدا، کەسونەنی تەرمەزییە، ئەمەی پترە:

(خودا لەبەهەشتا کۆشکێکی لەزێڕ بۆ دروست دەکا).

٤٢٠- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {دَخَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَيْتِي، فَصَلَّى اَلضُّحَى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ فِي "صَحِيحِهِ".

{ابن حبان رقم: ٢٥٣١ - الأحسان}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ ماڵی من، لەوێ هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد). ئیبنو حیببان لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (٤٢٠ — ٣٧٢ = ٤٨) چل‌و هەشت فەرموودەی واتیادا. ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتووە:

١- گەورەیی‌و خێری نوێژی سوننەت.

٢- سوننەتە دامەزراوەکانی پێش‌و پاشی نوێژە فەرزەکان.

٣- سوننەتەکانی تری پێش‌و پاشەکانی نوێژە فەرزەکان.

٤- باسی گەورەیی شەونوێژ.

٥- باسی نووێژی وەتر، کاتەکەی، ژمارەی ڕکاتەکانی، قەزا ئەکرێتەوە یان قەزا ناکرێتەوە، وەتر شەونوێژ قفڵ ئەکا یانا؟ لەیەك شەودا دوو وەتر ئەبی یانا؟.

٦- باسی تەراویح‌و وەتری ڕەمەزان‌و چی سوورەتی لەوەتردا سوننەتە بخوێندرێ.

٧- نوێژی چێشتەنگاو، کاتەکەی، ژمارەکەی، خێرەکەی.

٨- بڕوانە فیقهی ئاسان/١ لاپەڕە: ١٨٨، زنجیرە: ٦٣ — سوننەتە پەیوەستەکانی نوێژە فەرزەکان + زنجیرە: ٦٤ لاپەڕە: ١٩٠. شەونوێژ، نوێژی چێشتەنگاو نوێژی تەراویح.

٩- ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٩٧ هەتا زنجیرە: ٢٠٣، ژمارە: ١١٢٧/٢ + زنجیرە: ٢٠٤ هەتا ٢٠٩.

## ٢٠- باسی نوێژی بەکۆمەڵو بەرنوێژیی
## باب: صَلاةُ الجَمَاعَةِ والإِمَامَةَ

٤٢١- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {صَلَاةُ اَلْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ اَلْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٦٨ = شیحا ١٤٧٥ = مسلم ٦٥٠}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی بەکۆمەڵ بەبیستو حەوت پلە گەورەترە لەنوێژێ کەسێ کەهەر بەتەنها خۆی نوێژ بکا!). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٧٤٤}.

٤٢٢- وَلَهُمَا عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: {بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا}.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٣٦٨ = ٦٤٥، ٦٤٩ فتح الباری. ١٤٧٣، ١٤٧٤ شیحا = مسلم ٦٤٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی جەماعەت بە بیستو پێنج بەش گەورەترە لەنوێژی کەسێ کە بەجەماعەت نەیکاو، هەر بەتەنها خۆی نوێژەکەی بکا). {ریاض/٣، زنجیرە: ١٩١، ژمارە: ١٠٦٤}.

٤٢٣- وَكَذَا لِلْبُخَارِيِّ: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَقَالَ: "دَرَجَةً"

{بوخاری: ٦٤٦}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی بەکۆمەڵ بە بیستو پێنج پلە خێری زۆرترە لەنوێژی کەسێ کە بەجەماعەت نەیکاو بەتەنها نوێژ بکات).

٤٢٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْتَطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ اَلنَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفُ إِلَى رِجَالٍ لَا يَشْهَدُونَ اَلصَّلَاةَ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ اَلْعِشَاءَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدی بوخاری/١، ژماره: ٣٦٧ = ٦٤٤، ٦٥٧، ٢٤٢٠ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٣٢٥ = ١٤٨٠ شیحا = ٦٥١ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرەنجی دا کەوا چەند کەسێ لەچەند نوێژێکا، بۆ ماوەیەك دیار نین و نایەن بۆ جەماعەت، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتووڕەیی فەرمووی: (بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، نیازم هەبوو کە گاڵ بدەم گزرەدارێکی زۆر کۆبرکرێتەوە، کاتێکیش بانگ بوو، بەپیاوێ بڵێم کەبانگ بدا بۆ نوێژو بڵێم کەلەجیاتی خۆم بەرنوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا، وەخۆشم بڕۆم بۆ سەر ئەو پیاوانە کەلە نوێژی بەکۆمەڵ دوادەکەون، وەفەرمان بدەم کە بەباوشەدار ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنن، سوێندم بەو کەسەی کەگیانی منی والەدەستا: ئەوانە ئەگەر گرتکێکی چەوریان لەمزگەوت گومان ببردایە دەهاتن بۆنوێژی خەوتنان بۆ مزگەوت، هەتا بە بیانووی نوێژەکەوە گرتکە گۆشتەکە بخۆن!).

هەروا ئەگەر دوو سەنجووقیان لەمزگەوت شك ببردایە کە سەنجوقێنیان پێ دەکرێ، دەهاتن بۆ نوێژکردن بۆ مزگەوت بەو بیانووەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ٧٤٩ چاپی چوارەم. هەندێ (میرمات)یان بەگۆشتی نێوانی دوو پەراسوو لێك داوەتەوە - وەرگێڕ}.

٤٢٥- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَثْقَلُ اَلصَّلَاةِ عَلَى اَلْمُنَافِقِينَ: صَلَاةُ اَلْعِشَاءِ، وَصَلَاةُ اَلْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

{تجريدى بوخارى = مختصر صحيح البخارى = پوختەی بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم ژمارە: ٣٧٣ = ٦٥٧ فتح. پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٢٥ = ١٤٨٠ شيحا. مسلم ٦٥١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (گرنگترین‌و قورسترین نویٚژ لەسەر شانی ناپاکان (منافقين) نویٚژی خەوتنان‌و نویٚژی بەیانیانە خۆزگە دەیانزانی کە ئەم دوو نویٚژە چی خیٚرو خۆشییەکیان واتیادا، ئەوحەلە ئەگەر بە گاگۆلکەیش بووایە دەهاتن بۆیان. بەڕاستی خەریکبووم کەفەرمان بدەم کەقامەتی نویٚژ بکریٚ‌و بەپیاویٚ بلیٚم کە بەرنویٚژیەکە بکا بۆ خەلەکەکە، وەخۆشم چەند پیاویٚ بە باوەشە دارەوە لەگەلٚ خۆم ببەم‌و بڕۆم بۆ گیانی ئەو پیاوانەی کەنایەن بۆ نویٚژی جەماعەت، وەمالەکانیان بەئاگر بەسەردا بسووتیٚنم). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ٧٤٣. چاپی چوارەم}.

٤٢٦- وَعَنْهُ قَالَ: {أَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى اَلْمَسْجِدِ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ، فَقَالَ: "هَلْ تَسْمَعُ اَلنِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ؟" قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَأَجِبْ"} رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم ژمارە: ٣٢١ = ١٤٨٤ شيحا = ٦٥٣ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیاویٚکی کویٚر هاتە خزمەتی پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! چاو ساغم نییە، کەدەستم ڕابکیٚشیٚ بۆ مزگەوت، ئایا دەبیٚ کە لەمالەوەم نویٚژەکانم بکەم؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێشەوە ڕێگەی پێدا، کەلەماڵەوە نوێژەکانی بکا، بەڵام لەپاشا کەپیاوە نابیناکە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردەوەو پێی فەرمووی: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ گوێت لێیەتی یانا؟).

گوتی: بەڵێ گوێم لێیەتی، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (دە وەرە بەدەنگی بانگەکەوە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ٧٥١ چاپی چوارەم}.

٤٢٧- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ سَمِعَ اَلنِّدَاءَ فَلَمْ يَأْتِ فَلَا صَلَاةَ لَهُ إِلَّا مِنْ عُذْرٍ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ، وَإِسْنَادُهُ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، لَكِنْ رَجَّحَ بَعْضُهُمْ وَقْفَه.

{صحيح الجامع ٦٣٠٠. ابن ماجة رقم: ٧٩٣. دار قطني ٤٢٠/١. ابن حبان رقم: ٢٠٦٤. حاكم رقم: ٨٩٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ گوێی لەبانگ بێو مەهانەی ڕەوای نەبێو نەیێ بۆ جەماعەت، ئەگەر بەتەنها خۆی نوێژیش بکا، نوێژەکەی پووچەڵە!). ئیبنو ماجەو دارە قوطنیو ئیبنو حیببانو حاکم گێڕاویانەتەوە، ڕشتەکەی بەپێی مەرجی موسلیمە، بەڵام هەندێ لەم زاتانەی گێڕاویانەتەوە دەڵێن: لایەنی مەوقووفی بەهێزترە، هەتا لایەنی مەرفووعی.

٤٢٨- وَعَنْ يَزِيدَ بْنِ اَلْأَسْوَدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَاةَ اَلصُّبْحِ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا هُوَ بِرَجُلَيْنِ لَمْ يُصَلِّيَا، فَدَعَا بِهِمَا، فَجِيءَ بِهِمَا تَرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا، فَقَالَ لَهُمَا: "مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟" قَالَا: قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا. قَالَ: "فَلَا تَفْعَلَا، إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي

رِحَالِكُمْ، ثُمَّ أَدْرَكْتُمْ اَلْإِمَامَ وَلَمْ يُصَلِّ، فَصَلِّيَا مَعَهُ، فَإِنَّهَا لَكُمْ نَافِلَةٌ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَالثَّلَاثَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الإرواءِ: ٣١٥/٢ – الصحيح المسند ١٢٠٠. أحمد ١٦١/٤ رقم: ١٧٥٠٩. أبوداود رقم: ٥٧٥. ترمذى رقم: ٢١٩. نسائى رقم: ٨٥٨. بيهقى رقم: ٣٤٥٦. دار قطنى ٤١٣/١. ئيبنو حببان رقم: ١٥٦٤ حاكم رقم: ٨٩٢}:

**یەزیدی کوڕی ئەسوەد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی لاوی جەهێڵ بووم، جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بەیانیم بەجەماعەت کرد، کەنوێژەکەی تەواو کرد، سەیری کرد کەوا دوو پیاو لەگۆشەیەکی مزگەوتەکەدا دانیشتوون و لەگەڵ ئێمە نوێژەکەیان نەکرد، جا ناردی بەدوایانا، کە هێنایانن، لەترسانا لاتەڕیزەیان دەلەرزی، فەرمووی پێیان (لەبەر چی لەگەڵ ئێمە جەماعەتەکەتان نەکرد؟).**

**گوتیان: لەجێگەی خۆمان نوێژمان کردووە. فەرمووی: (شتی وا مەکەن، ئەگەر لەشوێنی خۆتان نوێژتان کردبوو، وە لەپاشا فریای پێشنوێژیش کەوتن کەهێشتا نوێژی نەکردبوو، دیسان لەگەڵ ئەویشا نوێژەکەتان بەجەماعەت بکەنەوە، چونکە ئەمە دەبێ بەنوێژی سوننەت بۆتان!). {تاج/١، زنجیرە: ١٣٧، ژمارە: ٨١٣ چاپی چوارەم}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- ئەم جەماعەتە لەمزگەوتی خیف بووە، لەکاتی حەجی ماڵ ئاوایدا لەمەزهەبی شافیعیدا: یەك جار نوێژ دووبارە دەکرێتەوە، سوننەتە بەجەماعەت دووبارەی بکاتەوە. (مغنی المحتاج/١ ص٢٢٣ مبحث الإعادة).**

**٢- یەزیدی کوڕی ئەسوەد (ڕەزای خودای لێ بێ) خەڵکی طائیفە، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەحەجی ماڵ ئاوایدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووە، ئەوکاتە گەنج بووە. (سەبارەت بەدووبارە کردنەوەی جەماعەت بڕوانە: ژمارە: ٤٣٢).**

٤٢٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّمَا جُعِلَ اَلْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَلَا تُكَبِّرُوا حَتَّى يُكَبِّرَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَلَا تَرْكَعُوا حَتَّى يَرْكَعَ، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اَللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اَللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ اَلْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَلَا تَسْجُدُوا حَتَّى يَسْجُدَ، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعِينَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَهَذَا لَفْظُهُ.

{صحيح أبي داود: ٥٦٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێشنوێژ بۆ ئەوە كراوە بەپێشنوێژ تاپەیڕەوی بكرێو ببێ بەسەرمەشقو چاوی لێ بكرێ، جا كەئەو ئەللاهوئەكبەری كرد ئێوەیش ئەللاهوئەكبەر بكەن، وەهەتا ئەو نەڵێ ئەللاهوئەكبەر، ئێوە مەڵێن ئەللاهوئەكبەر، كە ئەو چوو بۆ چەمینەوە (روكوع) ئێوەیش بچن بۆ چەمینەوە، وەهەتا ئەو نەچەمێتەوە ئێوەیش مەچەمێنەوە، كە ئەو گوتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدُ) ئێوەش بڵێن: (أَللّٰهُمَّ رَبَّنَالَكَ الحَمْدُ) كە ئەو كوڕنووشی برد ئێوەیش كوڕنووش بەرن، وەهەتا ئەو كوڕنووش نەبا ئێوەیش كوڕنووش مەبەن، كە ئەو بەڕاوەستانەوە نوێژی كرد، ئێوەیش بەڕاوەستانەوە نوێژ بكەن، كە ئەو بەدانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەیش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بكەن). {تاج/١، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٧٧٧ چاپی چوارەم}.

{بنەما (ئەصڵ = ڕیشە)ی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریو موسلیمدا هەیە، لەپوختەی بوخاریدا بەرگی/١، ژمارە: ٣٨٧ = ٦٨٨، ٦٨٩، ١١١٣، ١٢٣٦، فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٧٦ = شیحا ٩٢٠ = مسلم ٤١١}.

(ڕوونكردنەوە):

١- بەپێی ئەم فەرموودەیەو، چەند فەرموودەیەكی تری ساغ، كۆمەڵێ بڕیاری فیقهی دەردەكەون، وەك: پەیڕەوەیی پاشنوێژ بۆ پێشنوێژ، لە تەكبیرو هەڵسانو وەستانو دانیشتنو چەمینەوەو كوڕنووشا، هەروا لەسلاو دانەوەدا، بەڵام لەم دوو شتەدا، ئەگەر پاشنوێژ لەپێشنوێژ پێش بكەوێ، نوێژەكەی پووچو بەتاڵە، لەئەڵلاهوئەكبەری نوێژ دابەستنداو، لەسلاودانەوەدا، لەوانی تردا ئەگەر پێشی بكەوێ كاری نابەجای كردووە، بەڵام نوێژەكەی دروستە.

٢- دواكاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە سەر ئەوە: ئەگەر پێشنوێژ بەدانیشتنەوە نوێژی كرد، پاشنوێژ بەپێوە، واتە: بەڕاوەستانەوە، نوێژ بكا، جەماوەری زانایان دەفەرموون: لەنوێژی فەرزا، چی بۆ پێشنوێژ، چی بۆ پاشنوێژ، چی بەتەنیا، چی لەجەماعەتا، بۆ كەسێ بتوانێ بەپێوە نوێژ بكا، دروست نییە كەلەكاتی قیامو ڕاوەستانا بەدانیشتنەوە نوێژ بكا.

بەڵام بۆ نوێژی سوننەت نوێژخوێن ئاغای خۆیەتی، چۆن حەز دەكا، بۆی هەیە ئاوا نوێژ بكا.

كۆمەڵێ لە زانا دەفەرموون: (توانا ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەت بكا، نیوەی خێری ڕاوەستانی بۆ هەیە!).

٣- مامۆستا مەلا مەجیدی مزگەوتی سەلاحەدین، لەسلێمانی، ڕەچاو دەكا، لەجەماعەتا، هەنێ لەپاشنوێژەكانی، پەلەپەل دەكەنو لەهەندێ شتدا پێش ئەو دەكەون. ئەویش كە سلاو دەداتەوە، ڕوویان تێ دەكاو پێیان دەڵێ:

(براینە! ئەو پەلەپەلەتان لەچییە، بۆ وا دەكەن، سلاودانەوەكە بەدەست منە، هەزار پەلەپەل بكەن سوودی نیە بۆتان چونكە هەتا من سلاو نەدەمەوە ئێوە بۆتان نییە سلاو بدەنەوە، دەی منیش هیچ پەلەم نییە!).

٤٣٠- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَأَى فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا. فَقَالَ: "تَقَدَّمُوا فَائْتَمُّوا بِي، وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{شيحا/ ٩٨١ = مسلم/ ٤٣٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای کرد هەندێ کەس لەیارانی لەریزدا چوونەتە دواوە، فەرمووی: (وەرنە پێشەوەو ئێوە پەیڕوی من بکەن، وە با ئەوانەیشی لەپشتی ئێوەوەن پەیڕەوی ئێوە بکەن‌و بەهۆی جموجووڵی ئێوەوە پەیڕەوی من بکەن، کۆمەڵێ دەیکەن بەپیشەو هەر دوا دەکەون، هەتا خوداش لە پلەو پایەو پاداشی باشدا دەیانخاتە دواوە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٧٩١}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەسی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە بووە، کەپیاوچاکان‌و هاوەڵە ناسراوەکانی لەڕیزەکانی پێشەوە بن، ئەنجا کوڕوکاڵ‌و منالکارەکان‌و ئەوجا ژنان {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٧٨٩و ٧٩٠}.

٢- هەرکاتێ پاشنوێژ چاوی لەبەرنوێژەکەیەوە نەبوو، یاگوێی لەدەنگی نەبوو، چاو لەڕیزی پێش خۆی دەکاو نوێژەکەی تەواو دەکا،وەك ئێستا لەزۆربەی شارو مزگەوتە گەورەکان، زۆرینەی نوێژخوێنەکان نەچاویان لەمەلایەو نەدەنگی دەبیستن، بەلام بەهۆی ریزی پێش خۆیانەوە، ئاگایان لەحالی مەلاکەیانە کە بەرنوێژییان بۆ دەکا.

٤٣١- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {إِحْتَجَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حُجْرَةً بِخَصَفَةٍ، فَصَلَّى فِيهَا، فَتَتَبَّعَ إِلَيْهِ رِجَالٌ، وَجَاءُوا يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ...} اَلْحَدِيثَ، وَفِيهِ: {أَفْضَلُ صَلَاةِ اَلْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا اَلْمَكْتُوبَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = پوختەى/١، ژمارە: ٤٠١ = ٧٣١، ٦١١٣، ٧٢٩٠ فتح البارى. پوختەى موسليم ٣٧٤ = ١٨٢٢ شيحا = ٧٨١ مسلم }:

**دەقەكەى لەپوختەى موسليما (رەحمەتى خوداى لێ بێ) ئاوايە:**

**زەيدى كوڕى ثابيت (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەڕەمەزانا، لەناو مزگەوتدا، بەحەسیر كۆختێ دروست دەكا، جا چەندشەوێ، لەماڵ دەردەچوو، دەڕۆيشت لەناو ئەو كوختەدا شەونوێژى دەكرد، جا كۆمەڵێ لەياران، لەپشتيەوە، لەناو ئەو كوختەدا، چەند شەوێ بەجەماعەت، واتە: بەكۆمەڵى، نوێژى تەراويحى لەپشتەوە دەكەن، جا بەڕۆژ هاوەڵان ئەم هەواڵەيان بڵاوكردەوە، جاكۆمەڵێ زۆر شەوێ لەمزگەوت ئامادە دەبن، بەڵام پێغەمەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەم حاڵەيان دەزانێ، كەچى وازدێنێو دەرناچێ بۆلايان، ئەوانيش بۆئەوەى كە پێغەمەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ئاگادار بكەنەوە، هەتا تەشريف بهێنێ، كە تەراويحەكەيان بۆبكا، دەنگ هەڵدەبڕنو سوبحانەڵڵا دەكەنو زيخو چەو دەگرنە ماڵەكەى پێغەمەر، كەلەسەرماڵى مزگەوت بوو، تاتەشريف بهێنێو تەراويحيان بۆبكا، لەئەنجاما پێغەمەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەتووڕەيى هات بۆلايانو فەرمووى پێيان: (حاڵى بووم لە مەبەستو داواكەتان، كەزۆر مەبەستتانە، كەوەك شەوانى پێشوو نوێژى تەراويح بەكۆمەڵ بكەين، من ئەمەم لەيادە، بەڵام بۆيە نەهاتم چونكە دەترسم كەئێوە سەرى تێبكەنو بەجەخت بيگرنو بەرەبەرە فەرزببێ لەسەرتان).**

**ئەوجا فەرمووى: (دەى لەماڵەوەتان، لەجێگەو ڕێگەى ماڵەوەتان، شەو نوێژو نوێژى سوننەت بكەن، چونكە نوێژى فەرزى لێ دەرچێ، خێرترين نوێژى مرۆڤ ئەو نوێژەيەتى كە لەماڵى خۆيدا دەيكا). {تاج/١، لاپەڕە: ٥٠٧ ج/١ = ژمارە: ٩٩٨، زنجيرە: ١٨٦ چاپى چوارەم} + {تاج/١، زنجيرە: ١٨٦، ژمارە: ٩٩٩، ١٠٠٠، ١٠٠١ چاپى چوارەم}.**

(ڕوونکردنەوە):

١- نوێـژی سـوننەت بـۆ پیـاوو بـۆ ژن، لەماڵـەوە خێرتـرە، جگـە لـەو نوێژانەی کە بەکۆمەڵ دەکرێن، وەك نوێـژی هـەردووو جـەژن و نوێژەبارانـەو نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران و تەراویح.

٢- کورت و پوخت:

(نوێـژە سـوننەتەکان لەمزگـەوت بکـرێن مـسۆگەر تـرن، ئەگـەر تەرسـی ئەوەی هەبوو، کە لەماڵەوە، لەبەر بێ جێگـەیی و بـێ ڕێگـەیی و میـوان و شـتی تـری وابـۆی نـەکرێ، یـان مـەلای مزگـەوت بـێ، لەبردنـەوەی سـوننەتەکان بـۆ ماڵەوە، ئاژاوەیێ، گومانی بەد، دروست ببێ، وەك ئەوە نوێژخوێنەکان بەهەڵە لەحاڵەکە حاڵی ببن و بڵێن: کە مەلا ئەم نوێژە سوننەتانە نـەکا، ئـیتر مـن بـۆ بیکــەم، بەهــەرحاڵ کردنـــی ئــەم ســوننەتانە، لەمزگــەوت وەك ئێــستا لەکوردستانی خۆمان باوە، هیچ ناباشییەکی تیادا نییە، چونکە مەبەسـت لـەم جۆرە فەرموودەیە ڕوونکردنەوەی شێوەی باشـترە، نـەوەك بـاری ناباشـی، خـۆ ئەگەر کەسێ بڵێ: ئـەم جـۆرە سـوننەتانە یـا دەبـێ لەماڵـەوە بکـرێن، یادەبـێ نەکرێن، ئەوە بوختانە بەدەم یاسانامەی خوداوە!).

٣- هەنــدێ نوێــژی ســوننەتی تــر هــەن، بەکۆمــەڵیش نــاکرێن، بــەڵام ســـوننەتە لەمزگـــەوت بکـــرێن، وەك نوێـــژی ســـڵاوی مزگـــەوت و هاتنـــەوە لەســەفەرێ و نوێـژی تـەواف و نوێـژی زەواڵ، تـەراویح ئەگـەر بەتـەنها دەکـرا، لەماڵەوە خێر ترە، بەڵام ئەگەر بەکۆمـەڵی دەکـرا، لەمزگـەوت خێرتـرە، وەك سڵاوی دەسنوێژ، کەلەدوا دەسنوێژەکە یەکسەر سوننەتە ئەنجام بدرێ.

٤- هۆی ئەوەی هەندێ نوێژی سوننەت لەماڵەوە بکرێن خێـر تـرن، ئـەم جۆرە شتانەیە:

یەکەم: نهێنی ترەو دوورە لەڕیابازی، کـە پاداشـتەکەی پـووچ دەکاتـەوە، بگرە لەباتی پاداشی باش پێشی گوناهبار دەبێ.

دووەم: ماڵەکە پیرۆزو فەڕدار دەکا، میهرەبانیو ڕەحمەتی بەسەردا دەباریو فریشتە هاموشۆی ئەو ماڵە دەکەنو شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە.

سێیەم: وەکی تریش نوێژی ماڵەوە دەبێ بەسەر مەشق بۆ کەسانێ کە کەمتر هاموشۆی مزگەوت دەکەن، وەك: ژنو منداڵو کۆیلەو نەخۆشو ڕەنجبەرو ئەمانە.

٤٣٢- وَعَنْ جَابِرٍ قَالَ: {صَلَّى مُعَاذٌ بِأَصْحَابِهِ اَلْعِشَاءَ، فَطَوَّلَ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَتُرِيدُ أَنْ تَكُونَ يَا مُعَاذُ فَتَّانًا؟ إِذَا أَمَمْتَ اَلنَّاسَ فَاقْرَأْ: بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَ (سَبِّحْ اِسْمَ رَبِّكَ اَلْأَعْلَى)، وَ (اِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ)، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى"} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٩٣ = ٧٠١، ٧١١، ٧٠٥، ٧٠٠، ٦١٠٧ فتح الباری شرح صحیح البخاری. پوختەی موسلیم ٢٨٩ = شیحا ١٠٤٠ = مسلم ٤٦٥}:

دەقی پوختەی موسلیم ژمارە: (٢٨٩ = شیحا ١٠٤٠) ئاوایە:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: موعازی کوڕی جەبەل، دەستووری وابوو، نوێژی خەوتنانی بەکۆمەڵی، لەپشت پێغەمبەرەوە دەکرد، ئەوجا دەچوو بۆ لای هۆزەکەی بەرنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆ ئەوان دەکرد، جا شەوێ لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی خەوتنانی بەجەماعەت کرد، ئەوجا ڕۆیشت بۆناو خزمەکانی، لەوێ بەرنوێژی نوێژی خەوتنانی بۆ کردن، لەپاش سوورەتی فاتیحە درێژی کردەوە، دەستی کرد بەخوێندنی سوورەتی بەقەرە، جا پیاوێ نوێژەکەی خۆی بڕیو سلاوی دایەوەو ڕۆیشت لەولاوە بەتەنها خۆی نوێژی خۆی کردو ڕۆیشتەوە.

هاوڕێکانی پێیان گوت: بۆ وات کرد، دیارە ناپاك (منافق) بوویت؟ گوتی: نەبەخوا، شتی وا نییە، بەخودا دەچم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سکالای ئەم بارودۆخەی لەخزمەتدا دەکەم، جا چوو بۆ

خزمەتیو عەرزی کرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! ئێمە ئاوکێشین، رۆژ تا ئێوارێ بەوشتر ئاو دەکێشینو شەکەتو ماندووین، موعازیش لەخزمەتی تۆدا نوێژی خەوتنانی بەکۆمەڵی کردبوو، ئەوجا هات بۆ لای ئێمەو پێشنوێژیی نوێژی خەوتنانی بۆمان کردو بەسوورەتی بەقەرە دەستی پێ کردو تەواو درێژی کردەوەو ئێمەیش ئەوە حاڵمانە کە عەرزم کردیت؟

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەقی دا بەپیاوەکەو بۆ پشتگیری ئەوە روویکردە موعازو پێی فەرموو:

(ئەی موعاز! بەکاری وا، خەڵك لەجەماعەت مەتەکێنەوە! کاتێ بەرنوێژی بۆ مەردووم دەکەی، سوورەتێ لەم سوورەتانە بخوێنە: سوورەتی {وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا} یا سوورەتی {وَالضُّحَى} بخوێنە، یا سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} یا سوورەتی {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ} یا سوورەتی {وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى} بخوێنە، یا سوورەتی تری لەم بابەتانە). {بڕوانە: تجرید/١، ژمارە: ٣٩٥ + تاج/١، ژمارە: ١٢٧}.

٤٣٣- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) فِي قِصَّةِ صَلَاةِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) بِالنَّاسِ، وَهُوَ مَرِيضٌ - قَالَتْ: {فَجَاءَ حَتَّى جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ جَالِسًا وَأَبُو بَكْرٍ قَائِمًا، يَقْتَدِي أَبُو بَكْرٍ بِصَلَاةِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) وَيَقْتَدِي اَلنَّاسُ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٨٥ = ٦٨٤، ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٠ فتح الباری + تجرید/١، ژمارە: ٣٨٦ = ٦٨٧، ١٩٨ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٣١٩ = شیحا ٩٣٥ = ٤١٨ + پوختەی موسلیم ٣٣٥ = ٩٥٣ شیحا}:

ئەم فەرموودەیە لەبوخاریو موسلیمدا گێڕانەوەی زۆری جیاجیای هەیە، لەهەموویان کۆگیرو بەکەڵکتر، ئەم گێڕانەوەی پوختەی موسلیمە، ژمارە: (٣١٩ = شیحا ٩٣٥).

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی دایکە عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزیمکرد: نافەرمووی کەباسی نەخۆشییەکەی سەرەمەرگی پێغەمبەرم بۆ بکەی؟ فەرمووی: بەڵێ باشە، بەچەند ڕۆژێ لەپێش مەرگی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نەخۆشینەکەی قورس بوو، جارێ موسوڵمانان لەمزگەوت کۆبووبوونەوە، بۆ جەماعەتی نوێژی خەوتنان، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان:

(ئەرێ موسوڵمانەکان نوێژیان کرد؟ گوتمان: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەڕوانی تۆ دەکەن، کە بەرنوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرمووی: لەسوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما، لەحەوت کوندە، کە دەمبێنەکەیان نەکرابێتەوە).

عائیشە فەرمووی: ئێمەیش وامانکرد، کەخۆی شۆرد، ئەزنەکی دا کەهەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو بوورایەوە، کەهۆشی هاتەوە فەرموویەوە: (ئەرێ مەردومەکە، نوێژەکەیان کرد؟).

عەرزیمانکردەوە: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە، کەنوێژەکەیان بۆ بکەی، فەرموویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما).

عائیشە فەرمووی: جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، دیسان کەخۆی شۆردو غوسڵی سوننەتی بوورانەوەی کرد، دیسان ئەزنەکی دایەوە، ویستی کەهەڵسێ، بەڵام نەیتوانیو دیسانەوە بوورایەوە، لەپاش کەمێ کە هۆشی هاتەوە، هەم دیسان فەرموویەوە (ئەرێ خەڵکەکە نوێژەکەیان کرد؟) عەرزیمانکرد: نەء، ئەی پێغەمبەری خودا! چاوەنواڕی تۆیانە، کەخۆت بەرنوێژییەکەیان بۆ بکەی. فەرمووویەوە: (لەسوێنەیەکا ئاو بکەن بەسەرما).

جا لەناو سوێنەکەدا دانیشت، هەمدیسانەوە کەخۆی شۆرد، ئەزنەکی دایەوە، کە هەڵسێو بچێ بۆ مزگەوت، پێشنوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا، بەڵام

نــەيتتوانی هەمــديس بوورايــەوە، لەپاشــتر كەهۆشــی هاتــەوە، ديــسان فەرموويەوە: (ئەرێ مەردووم نوێژەكەيان كـرد يانـا؟) عـەرزيمانكرد: نـەخێر هێشتا نوێژيان نەكردووە، لەمزگەوت كۆبوونەتـەوە، هـەر چاوەنوارِی تۆيانـە، كەتەشريفت بچێ، بەرنوێژييەكەی خەوتنانيان بۆ بكەی.

عائيــشە فــەرمووی: ئــەنجا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فروستادەيەكی نارد بۆلای ئـەبوبكر، كەپێـشنوێژی بـۆ موسـوڵمانان بكـا، كاتـێ فروســتادەكەی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فەرمانەكــەی پێغەمبەری بە ئەبوبكر ڕاگەياند، ئەبوبكر پياوێكی دڵ نەرم بوو، لەبەر ئەوە بـە عومـەری كـورِی خـەتتابی فـەرموو: ئـەی عومـەر! تـۆ جەماعەتەكـە بـۆ موسـوڵمانەكان بكـە، عومـەريش پێـی فـەرموو: تـۆ شـايانتری بـۆ ئەمـە، جـا ئەبوبكر ئەوچەند رۆژە كە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەخۆش بوو، وە بەرەبەرە نەخۆشـييەكەی گـرانتر ئـەبوو، جەماعـەتی بـۆ موسـوڵمانان دەكرد، هەتا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەمێ لەشی سووك بوو، ڕۆيشت بۆ مزگەوت، دوو پيـاو چووبوونە ژێـر هـەردوو بـاڵی، يـەكێكيان عەباسی مامەی بوو، بەلارەلارەوە برديان، دەڵێی ئێستايش هەروا لەبەرچـاوم، كــە چــۆن چــۆنی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) لەبــەر ئــازاری نەخۆشييەكەی هـەردوو پێـی بەسـەر زەوييەكـەدا بەخـشكە، بـەكێش دەكـرد، كاتی نوێژی نيوەڕۆ بوو، ئەبوبكر خـەريكبوو پێـشنوێژيی بـۆ نوێژخوێنـەكان دەكــرد، كاتــێ ئــەبوبكر لــەناو نوێژەكــەدا هەســتی بەمــە كــردو بينــی كــەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشريفی هێنا، ويـستی جێگەكـەی بـۆ چۆڵ بكاو خـۆی بـچێتە دواوە، بـەڵام حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئاماژەی بۆيكرد: كە وەزع لەخۆت تێك مەدەو خەريكی كاری خۆت بە).

وە بـەدوو پياوەكـەی كـە لـەژێر باڵەكانيـدا بـوون فـەرمووو: (لەتەنيـشی ئەبوبەكرەوە، لەلای چەپيەوە دامنيشێنن).

ئەوانیش بردیان ڕێك لەئاستی ئەبوبکر، لەلای چەپیەوە دایان نیشاند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و ڕۆح‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنی کارانی ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) دانیشت‌و دەستی کرد بەنوێژخوێندن، ئیتر ئەبوبکر (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ نوێژی خۆی پەیڕەوی پێغەمبەری دەکرد، کاتێ پێغەمبەر دەچەمییەوە ئەبوبکریش لەدوایەوە دەچەمیەوە، هەروا ئیعتیدال‌و کوڕنووش‌و تەحیات‌و سلاو، خەڵکەکەی تریش پەیڕەوی ئەبوبکریان دەکرد، ئەبوبکر چی دەکرد، ئەوانیش دوابەدوای ئەبوبکر ئەوەیان دەکرد، ئەبوبکرو خەڵکەکە بەپێوە نوێژیان دەکرد، پێغەمبەریش بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد.

عوبەیدوڵلا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی عەباس، پێیم گوت: ئەگەر ئارەزوو دەکەی ئەو فەرموودەیەت بۆ دەوردەکەمەوە، کەعائیشە فەرمووی پێم، سەبارەت بەنەخۆشییەکەی سەرەمەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). فەرمووی: ئادەی فەرموو، منیش فەرموودەکەی عائیشەم لەنووکەوە بۆی دەورکردەوە، هیچی لێ ڕەت نەکردەوە، بەلام فەرمووی: ئایا عائیشە ناوی پیاوەکەی تری پێ گوتیت، کە لەگەل عەباسا چووبوونە ژێر هەردوو باڵی پێغەمبەر؟ گوتم: نەء، فەرمووی: ئەوەی تریان عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ). {بڕوانە: تجریدی بوخاری ژمارە: ٣٨٤و ٣٨٣و ٣٧٧ + تاج/١، لاپەڕە ٤٠٦ چاپی یەکەم = ژمارە: ٨١٤، ٨١٥، ٨١٦ زنجیرە: ١٣٨ چاپی چوارەم}.

٤٣٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمْ اَلنَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمْ اَلصَّغِيرَ وَالْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا اَلْحَاجَةِ، فَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٧٨ = ٩٠، ٧٠٢، ٧٠٤، ٦١١، ٧١٥٩ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٣١٨ = ١٠٤٤ شیحا = مسلم ٤٦٦}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! من لەبەر فیسارەکەس لەجەماعەتی نوێژی بەیانی، دوادەکەوم، چونکە ئەوەنـدەی درێـژ دەکاتـەوە بۆمـان، بـەهۆی قورئانخوێنـدنی زۆرەوە، منـیش زەبوونم، توانای ئەوەم نییە!

ئەبو مەسعوود فەرمووی: هـەرگیز لـەکاتی ئامۆژگاریـدا، وەك ئـەو ڕۆژە ئـاوا پێغەمبـەرم بـەتووڕەیی نـەبینیوە، ئینجـا فـەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (ئـەی موسـوڵمانینە! هەنـدێ لـەئێوە مـەردوم دەڕەوێننـەوەو بـە نوێژی دوورو درێژ خەڵك لەمزگەوتو نوێـژی جەماعـەت دەتەکێننـەوە، جا هەرکامێکتان پێشنوێژیی هەرنوێژێ دەکا بۆ موسوڵمانان، با نوێژێکی کورتو پوختو ڕێکوپێکیان بۆ بکا، چونکە ئەو خەڵکەی کـە وان لەپـشتیەوە هەیانـە لازەبوونە، هەیانە پیرو ئیختیارە، هەیانە زەبوونە، هەیانە ئـیشو کـاری تـری هەیەو پەلەیەتی، بەڵام هەرکەسێکتان بەتەنها خۆی نوێژی دەکرد، با چەندێ ئارەزوو دەکا، با ئەوەنـدە درێـژی بکاتـەوە). {تـاج/١، زنجیرە: ١٢٧، ژمـارە: ٧٦٣ چاپی چوارەم}.

٤٣٥- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: قَالَ أَبِي: {جِئْتُكُمْ مِنْ عِنْدِ اَلنَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حَقًّـا. قَـالَ: "فَـإِذَا حَـضَرَتْ اَلـصَّلَاةُ فَلْيُـؤَذِّنْ أَحَـدُكُمْ، وَلْيَـؤُمَّكُمْ أَكْثَرُكُمْ قُرْآنًا"، قَالَ: فَنَظَرُوا فَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ أَكْثَرَ قُرْآنًا مِنِّـي، فَقَـدَّمُونِي، وَأَنَـا اِبْـنُ سِتِّ أَوْ سَبْعِ سِنِينَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيّ.

{پوختەی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٨٨ = ٤٣٠٢ فتح البـاری. أبـوداود ٥٨٧. نسائی ٢/٨٠}:

دەقەکەی لەپوختەی بوخاریدا:

عەمری کوڕی سەلیمە (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: ئێمە لەهەوارگەیێ بووین، ناوی (ماء) بوو، سەرەڕێگەی خێڵ و کۆچەرییەکان بوو، لەوێ هەوارمان دەگرت، ناوبەناو کاروانێ دەهاتن و هاموشۆیان دەکرد، ئێمەیش پرسیارمان لێ دەکردن: ئەوە چیە ئەو خەڵکە هەر باسی ئەم پیاوە دەکەن؟ ئەوانیش دەیانگوت: ئەم پیاوە کەناوی موحەممەدە، بەقسەی خۆی دەڵێ: فروستادەی خودایە، خودا سرووشی بۆ دەنێرێ، فریشتە بەفەرمانی خودا نیگای خوایی، بۆ دەهێنێ، گەڵێ جار ئەو کۆچەریانە گەڵێ لەو ئایەتانەیان لەبەر بوو، دەیانخوێندەوەو دەیانگوت: موحەممەد دەڵێ: ئەم ئایەتانەم بەوەحی لەخوداوە بۆ هاتووە، منیش لەبەرم دەکردن، هەستم دەکرد، وەکوو لەخوداوە، لەدڵما کۆبکرێنەوەو بێنە بەرم وەهابوو، جا لەسەر ئەم شێوەیە، لەدەمی ئەو خەڵکەوە قورئانێکی زۆرم لەبەر کرد، زۆرینەی هۆزە گەورەکانی عەرەب چاوەڕوانی ئەوە بوون، ئەگەر موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بتوانێ مەککە ئازاد بکا، ئەوا ئەوانیش خواه ناخواه، ئیسلام بوونی خۆیان ئاشکرا دەکەن، دەیانگوت: واز لەموحەممەد بهێنن، هەتا بزانین لەگەڵ هۆزەکەی خۆیدا، کە قورەیش و خەڵکی مەککەن چی بەچی دەکا، ئەگەر سەرکەوت بەسەریانا، ئەوا ڕاستە کەهەق پێغەمبەری خودایە.

جا کاتێ ڕووداوی ئازادکردنی مەککە ڕوویداو، خەڵکی مەککە هەموو ئیسلام بوون، هۆزەکانی تری دەوروبەری مەککەیش، هەریەکەیان لەلای خۆیانەوە زووبەزوو ئیسلام بوون، وەباوکیشم بەزوویی شاندی هۆزەکەی خۆی برد بۆ خزمەتی پێغەمبەرو خۆی و هۆزەکەی ئیسلام بوون، جا کاتێ هاتنەوە باوکم فەرمووی: سوێندم بەخودا، لەخزمەتی پێغەمبەری خوداوە گەڕاومەتەوە بۆلاتان، ئەوپیاوە بەڕاستی فروستادەو نێردراوی خودایە، باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێمان: (کاتی ئەو نوێژە فیسارە کاتە، وە کاتی ئەو نوێژی تریان ئەوکاتەی ترە، وەهەروا هەتا

کاتی هەموو نوێژەکانی بۆ دیاری کردین) ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێکیش نوێژ بوو، بەوێنە نوێژی نیوەڕۆ، یاعەصر بوو، با یەکێکتان بانگتان بۆ بدا، وەکامیشتان زیاتر قورئانی لەبەر بوو، با ئەوە پێشنوێژیتان بۆ بکات).

جا کە هۆزەکەی ئێمە سەرەنجیان داو تەماشایان کرد، کەسیان بەقەد من، قورئانی لەبەر نەبوو، بەهۆی ئەو قورئانەوە کە لەوەپێش لەکاروانەکان وەرم دەگرت‌و لەبەرم دەکرد.

ئیتر منیان کرد بە پێشنوێژی خۆیان‌و پێش خۆیانیان خستم‌و منیش بەرنوێژیم بۆ دەکردن، وە ئەوکاتە شەش ساڵان یان حەوت ساڵان بووم، وەباڵاپۆشێکم لەبەردا بوو، کەدەچوومە کوڕنووش‌و سوژدەم دەبرد، کوڵ دەبۆوەو هەڵ دەچوو، وە دەهاتەوە یەك، ژنێ لەخێڵەکەمان گوتی: ئەمە چۆن حاڵێکە، ئەم منالە کە بەرنوێژیمان بۆ دەکا، لەسوژدەدا شەرمگای دەردەکەوێ، کەواتە چارێکی ئەم حاڵە بکەن‌و بەپارچەیێ پۆشاك گەلۆگونی داپۆشن ئەوانیش پارچەیێ قوماشیان کڕی‌و کراسێکی ئاودامانیان بۆ دروست کردم، وەك دیشداشە، وەشەرمگامی شاردەوە، قەت وەك بەو کراسە شادمان بوون، بەهیچی تر ئاوا کەیفخۆش نەبووم!). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ٧٧١}.

(ڕوونکردنەوە):

عەمری کوڕی سەلیمەی کوڕی قەیس، کەخۆی‌و باوکی لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، لەسەر ڕای بەهێز، بەمنداڵی بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتووە وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ عەمر مەلای هۆزەکەی خۆیان بووە، بەمناڵی بەرنوێژیی کردووە بۆیان، باوکیشی لەپاش ئازادکردنی مەککە، بەزوویی لەگەڵ شاندێ لەهۆزەکەی دەچن بۆلای پێغەمبەرو هەموو موسوڵمان دەبن، عەمر لەبەصرە نیشتەجێ بووە. ئەم زاتانە فەقێ‌و شاگردی ئەو بوون‌و فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە:

ئەبوقەلابەو عاصیمی ئحوەلو ئەییوبی سەختیانیو کەسانی تریش.

٤٣٦- وَعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَؤُمُّ اَلْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اَللَّهِ تعالى، فَإِنْ كَانُوا فِي اَلْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي اَلسُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي اَلْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا -وَفِي رِوَايَةٍ: سِنًّا- وَلَا يَؤُمَّنَّ اَلرَّجُلُ اَلرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ، وَلَا يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ"} . رَوَاهُ مُسْلِم.

{مسلم شيحا ١٥٣٠ = ٣١٦ پوختەی موسلیم = ٦٧٣ مسلم}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کێ قورئانی زیاتر لەبەر بوو، بائەوە پێشنوێژیی بۆ کۆمەڵەکە بکا، جا ئەگەر وەك یەك قورئانیان لەبەر بوو، با کامەیان باشتر شارەزایی سوننەتی پێغەمبەر بوو، ئەوەیان بەرنوێژیان بۆ بکا، جا ئەگەر لەمەیشا وەك یەك بوون، با کامەیان لەپێشتردا کۆچی کردووە، لەولاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ئەوەیان بەرنوێژیان بۆ بکا، جا ئەگەر لەوەیشا چوون یەك بوون باکامەیان لەپێشتردا ئیسلام بووە، ئەوەیان پێشنوێژیان بۆ بکا، وەهەموو کەسێ لەقەڵەمڕەوی خۆیدا دەبێ خۆی بەرنوێژی بکا، نابێ کەسی تر بەرنوێژی لەقەڵەمڕەوی کەسێکی تر بکا، مەگەر لەسەر رەزای خۆی، لەماڵەوەیش لەسەر جێگەو تەختی دانیشتنی تایبەتی یەکتری، دامەنیشن، مەگەربە رەزامەندیی خاوەنەکەی!). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٧٥٩ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەئەصڵەکەدا (ئیبنو مەسعوود) نووسراوە، ئەوە هەڵەیە، راستەکەی (ئەبو مەسعوودی ئەنصارییە).

٢- لەگێڕانەوەیەکا: لەجیاتی (کامەیان لەپێشتردا ئیسلام بووە) ئاوایە: (با کامەیان بەتەمەنتر بوون ئەوەیان بەرنوێژییان بۆ بکا).

٤٣٧– وَلِابْنِ مَاجَهْ: مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ: {وَلَا تَؤُمَّنَّ اِمْرَأَةٌ رَجُلًا، وَلَا أَعْرَابِيٌّ مُهَاجِرًا، وَلَا فَاجِرٌ مُؤْمِنًا}. وَإِسْنَادُهُ وَاهٍ.

{ضعيف الإِرْوَاءِ: ٥٢٤. ابن ماجة/١٠٨١}:

جابیری کوڕی عەبدوللا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نابێ ژن بەرنوێژیی بکا بۆ پیاو، وەنابێ ئەعرابیش بەرنوێژیی بۆ مهاجر بکا، وەنابێ بەدکار بەرنوێژیی بۆ موسوڵمانی خواناس بکا).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: رشتەی ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازو پەڕپووتە.

(روونکردنەوە):

١- بەرنوێژیی کردنی ژن بۆ ژنان سوننەتەو هەرگیز ناباشیی تیادا نییە، بەڵام بەرنوێژیی ژن بۆ پیاو، با ژنو مێردیش بن، یا لەناو خۆیانا خۆیی بنو دەسنوێژیان لەیەکتری نەشکێ، وەك خوشكو برا، یا مامو برازا، یا خاڵو خوشکەزا، جەماوەری زانایان دەفەرموون: بەشێوەی گشتی بەرنوێژیی ژن بۆ پیاو دروست نییەو نوێژەکە دانامەزرێ. بەڵام هەندێ زانا، وەك موزەنیو ئەبو ثەور دەڵێن: دروستە ژن بەرنوێژیی بۆ پیاوان بکا، بێگانەبن یاخۆیی بن، جیاوازی نییەو هەر دروستە.

٢- بەدکار نوێژ بۆ پیاو باشبکا، ئەمەیان دروستە، گەرچی زۆریش باش نییە، بەتایبەتی ئەگەر ئاژاوەی لێ بکەوێتەوە ئەوە ناچارییەو نوێژکردن لەپشتی موسوڵمانی بەدکارەوە دروستە بۆ مرانـدنی ئاژاوەکە، هەر لەم روانگەیەوە بووە، کە زۆر لە صەحابەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژیان لەپشتی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانەوە دەکرد، تا دەرگای ئاژاوە دابخەنو دووبەرەکی لەناو موسوڵمانانا دروست نەبێ، وەك ئیبنو عومەر

(ڕەزای خـــوادای لێ بـــێ) نوێـــژی لـــەدوای خوێنرێـــژێکی بـــەدکاری وەك حەجاجەوە دەکرد!

لەزۆر لەمەلاو فەقێکانی خۆمم بیستووە کە هەندێ مـەلا، چوون بـۆ حەج و عەمرە، لەمەککەو مەدینە نوێژیان لەپشتی ئیمامولحەرەمەینەکانـەوە نـەکردووە، گوایـە بـەخێرێ ئـەم صـوفییەو إمـام الحرمەینـەکان سـەلەفین!! پەکوو لەهەڵەی وا.

٤٣٨- وَعَـنْ أَنَـسٍ، عَـنْ اَلنَّبِـيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) قَـالَ: {رُصُّـوا صُفُوفَكُمْ، وَقَارِبُوا بَيْنَهَا، وَحَاذُوا بِالْأَعْنَاقِ}. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَالنَّـسَائِيُّ، وَصَـحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٣٤٥٥، الصحيح المسند: ٥٥، أبو داود رقـم: ٦٦٧. نـسائى رقم: ٨١٥. ابن حبان/٦٣٣٩}:

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (ڕیزەکانتـان ڕێـك خـەن و پـاڵ بـدەن بەیەکـەوەو نێـوانی ڕیزەکانتـان لەیەکـەوە نزیـك بکەنـەوەو شـان و ملتـان لەئاستی یەکتری بگـرن، دەسا بەوکەسـە کـە گیانی منـی والەدەسا، کـە دیـارە خودای گەورەیە، شەیاتینی دەبینم خۆیان دەکەن بەناو کەلەبەرو بۆشایی ناو ڕیزەکانـا، دەڵێـی کارژۆڵـەو بەرخۆڵـەی ڕەشـکەڵەن!). {تـاج/١، زنجـیرە: ١٢٤، ژمارە: ٧٩٩ — د/ن — س صالح}.

٤٣٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {خَيْرُ صُفُوفِ اَلرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْـرُ صُـفُوفِ اَلنِّـسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا} رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم/٢٦٩ = ٩٨٤ شیحا = مسلم/٤٤٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (باشـترینی ڕێـزی پیـاوان لەجەماعـەتا، ڕیـزی

یەکەمیانە، کە یەکەم ریزی پشتی پێشنوێژە، خراپترینیشیان دواریزیانە، باشترینی ریزی ژنانیش دواریزیانە، خراپترین ریزیشیان یەکەم ریزیانە).
{تاج/١/٣٩٤، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٧٨٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ریزی پیاوان هەمووکاتێ، هەتا لەپێشنوێژەوە نزیکتربێ، خێری زیاترە، وە هەتا لەدواوەبێ خێری کەمترە.

٢- بەڵام ریزی ژنان ئەگەر لەگەڵ جەماعەتی پیاوانابێ ئەوە بڕیارەکەی ئەوەیە کە لەفەرموودەکەدا باسکراوە، بەڵام ئەگەر هەر ژنان خۆیان بوون، ئەوە باشترین ریزیان ریزی پێشەوەیانەو ناباشترینیشیان ریزی دواوەیانە: {شرح صحیح مسلم للنووی/٢، ص٣٨٠ شرح حدیث رقم: ٩٨٤ = ٢٦٩ پوختەی موسلیم}.

ئێستا لەزۆر شوێن جێگەی پیاوان جیایەو، جێگەی ژنان جیایە، وەبەهیچ جۆرێ ژن‌و پیاو لەکاتی جەماعەتدا، تێکەڵی یەکتری نابن‌و بێ ئاگان لەحاڵی یەکتری، گەرچی هەردوولایان لەپشت یەك مەلاوە جومعە یا جەماعەت دەکەن، لەکاتی وادا خێری ریزی پێشەوەی ژنان زیاترە لەخێری ریزی دواوەیان.

٣- مەبەست لە (خێر)و (شەڕ) لەم جۆرە شوێنانەدا، زۆری پاداش‌و کەمی پاداشە، دەنا مەبەست (شەڕ)ی بەرامبەر (خێر) نییە!!

٤- باشتر گوتە، ئەوەیە کە ریزی یەکەمی جەماعەت، کەخێری زۆرترە، ئەو ریزەیە کە یەکسەر والەپشت مامۆستای مەلاوە، با بەهۆی پایەو کۆڵەکەو شتی تری وایشەوە، ریزەکە لەیەك پچڕابێ، یا ئەوەی کە تیادا دەوەستێ درەنگیش هاتبێ.

٤٤٠- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِرَأْسِي مِنْ وَرَائِي، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٩٦ = ١١٧، ١٣٨، ١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٩٢، ٤٥٦٩، ١١٩٨، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٤٥٧٢، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٧٤٥٢، ٦٣١٦، فتح البتاری شرح صحيح البخاری. پوختەی موسليم/٣٧٩ = ١٧٨٥ هەتا ١٧٩١ شيحا = مسلم/٧٦٣}:

دەقەكەی لە پوختەی موسليما ئاوايە:

ئيبنو عەبباس، كەهەق ئامۆزای پێغەمبەرە، كوڕی عەبباسی مامەيەتی، فەرمووی: شەوێ لەماڵی مەيموونەی پوورم بووم كە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەكانی بێ) كە مەيموونەی پوورم خوشكی دايكم بوو. {بڕوانە ژمارە: ٢٣ لەپێشەوە رابورد}.

جا لەدەوری نيوەشەودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو هەڵساو خەبەری بۆوە، ڕۆيشت دەستی بەئاو گەياند، ئەوجا دەموچاوو هەردوو دەستی خۆی شۆردو خەوتەوە، پاش ماوەيێ هەڵسا، چوو بۆلای كوندەكەو دەمبێنەكەی كردەوەو دەسنوێژێكی مامناوەندی گرت، گەرچی ئاوی زۆری بەكار نەهێنا، بەلام دەسنوێژێكی تەواوی گرت، ئەوجا هەڵسا دەستی كرد بەشەونوێژ، منيش هەڵسام بەدرۆ خۆم وەك كەسێ تازە لەخەو هەڵسا بێ، خۆم كشو بادا، نەبادا پێغەمبەر وابزانێ كە بەخەبەر بوومو ئاگام لەو بووە، كەچی كردووە، منيش دەسنوێژم گرت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی كرد بەشەونوێژ، منيش چووم لەلای چەپيەوە ڕاوەستامو نوێژم بەجەماعەت لەپشتيەوە دابەست، جا خۆشەويست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ڕاستی نايە سەر سەرمو گوێی ڕاستی گرتمو بردمی بۆلای

ڕاستی خۆی، وەبەسیازدە ڕکات شەونوێژ کۆتایی بەشەونوێژی ئەو شەوە هێنا، ئەوجا ڕاکشایەوەو خەوتەوە، تەنانەت دەستی کرد بە پرخەپرخ، دەستووری وابوو کە دەخەوت پرخەی لیوە دەهات، جا بیلال هات ئاگاداری کردەوە کەوا کاتی نوێژی بەیانییە، تەشریفی هەڵسا نوێژی کرد، دەسنوێژی تازە نەکردەوە، ئەمەیش بەشێکە لەنزاو پاڕانەوەوی ئەو شەوەی: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَخَلْفِي نُورًا، وَعَظِّمْ لِي نُورًا». {بڕوانە: تجرید/١، ژمارە: ١١٢ + ژمارە: ١٣٨ + تاج/١، ژمارە: ٩٨٧، زنجیرە: ١٨٤}.

٤٤١- وَعَنْ أَنَسٍ قَالَ: {صَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقُمْتُ وَيَتِيمٌ خَلْفَهُ، وَأُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٤٢ = ٣٨٠، ٧٢٧، ٨٦٠، ٨٧١، ٨٧٤، ١١٦٤. فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٣٣ = ١٤٩٧ مسلم شیحا = مسلم ٦٥٨}:

ئەمە دەقەکەیەتی لە پوختەی موسلیما (ژمارە: ٢٣٣).

ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو طەلحە، فەرمووی: مامەم ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مولەیکەی نەنکم نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەرو بانگی کرد، کەتەشریفی هاتو نانی خوارد، ئەوجا فەرمووی: (ئادەی هەستن با دوو ڕکات نوێژی سوننەتتان لەماڵەکەتانا، بۆ پیرۆزی بەجەماعەت بۆ بکەم).

ئەنەس فەرمووی: حەسیرێکمان هەبوو، لەبەر ڕاخستنی زۆر کۆن بوو بوو، ڕەنگی ڕەشبۆر بوو بوو، لەپووشی خورما بوو، منیش چووم ئەو پارچە حەسیرەم ماڵیو ئاوم لێ پرژاند، هەتا کەمێ نەرم بێ، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەردەممانەوە لەسەر حەسیرەکە ڕاوەستاو،

نوێژی دابەست، منو ضەمیرەی کوڕی ئەبو ضەمیرەیش کە ئەوکاتە هەتیو بوو، لەپشتیەوە نوێژمان بەجەماعەت دابەستو بووین، بەڕیزێ.

پیرەژنەکەی نەنکیشم لەپشت ئێمەوە بەتەنیا وەستاو بووبەڕیزێو نوێژی بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە دابەست، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر خاتری ئێمە، بۆ پیرۆزی، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بە جەماعەت بۆ کردین، ئەوجا لەپاش تەواوکردنی نوێژەکە تەشریفی گەڕایەوە بۆماڵەوەی. {تاج/١، لاپەڕە ٣٨٩ چاپی یەکەم، ژمارە: ٧٧٥ زنجیرە: ١٢٩ چاپی چوارەم} + {تاج/١، ژمارە: ٧٧٣، زنجیرە: ١٢٩}.

(ڕوونکردنەوە):

لەم فەرموودەیەدا ئەم بەهرانە هەیە:

١- جەماعەت لەنوێژی سوننەتا دروستە.

٢- لەماڵیشا جەماعەت دروستە، مەرج نییە جەماعەت لەمزگەوتا بێ.

٣- جێگە نوێژ بماڵرێو ئامادە بکرێو پاك ڕابگیرێ.

٤- بەدوو کەس ریزێ دروست دەبێ.

٥- دروستە منداڵ لەریزی پیاوانا ڕاوەستێ.

٦- بەپیاوێكو منداڵێ ڕیز دروست دەبێ.

٧- کەسێ بەتەنیا خۆی ڕاوەستێ لەناو نوێژدا دەبێ.

٨- نوێژی منداڵی فامیدەی نابالّق دادەمەزرێ هەروا دەسنوێژی.

٩- نوێژ لەسەر حەسیر دروستە.

١٠- نوێژی سوننەت لەماڵی خاوەن دەعوەتا نوێژ بکرێ بۆ پیرۆزی.

(تێبینی)

عەبدوڵلا کوڕی طەلحەو ئەنەسی کوڕی مالیك برای دایکین.

٤٤٢- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ اِنْتَهَى إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَهُوَ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَى اَلصَّفِّ، فَقَالَ لَهُ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وسلّم): {زَادَكَ اَللّٰهُ حِرْصًا وَلَا تَعُدْ}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَزَادَ أَبُو دَاوُدَ فِيهِ: {فَرَكَعَ دُونَ اَلصَّفِّ، ثُمَّ مَشَى إِلَى اَلصَّفِّ}.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٤٢٥ = ٧٨٣}:

ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ مزگەوت بۆ جەماعەت کە گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد، لەناو چەمینەوە (روکووع)دا بوو، منیش بەرلەوەی بگەیەمە ناو ڕیزەکە، بەڕێوە چەمیمەوەو روکووعم بردو لەسەر ئەو شێوەیە ڕۆیشتم هەتا خۆم گەیاندە ڕیزەکە، دوایی لەپاش تەواوبوونی نوێژەکە، ئەمەم عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) (خودا شێرەترت بکا لەسەر کردنی خێر، بەڵام جارێ تر وامەکەرەوە، هەتا نەگەیتە ریز چەمینەوە ئەنجام مەدە).

٤٤٣- وَعَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ اَلْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) {رَأَى رَجُلًا يُصَلِّي خَلْفَ اَلصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ اَلصَّلَاةَ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، الإرواء:٥٤١. أبوداود رقم: ٦٨٢. ترمذی رقم: ٢٣٠. أحمد ٢٢٨/٤}:

وابیصەی کوڕی مەعبەد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی بینی بەتەنها لەپشت ریزی جەماعەتەکەوە نوێژی دەکرد، کە جەماعەتەکە تەواو بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کرد، کەنوێژەکەی دووبارە بکاتەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ٨٠٤}.

(ڕوونکردنەوە):

وابیصەی کوڕی مەعبەدی جوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) ناسراوە بە ئەبو سالم، یا بە ئەبو

قيرصاد، لەهۆزی بەنی ئەسەدە، ساڵی نۆی کۆچی، دە کەس بوون لەخێڵی بەنی ئەسەد، وەفدێ بوون هاتن بۆ خزمەتی حەزرەت لەمەدینە، هەردەیان ئیسلام بوون‌و قەبوڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان کردو ئەوەی شایانی کات‌و شوێن‌و حاڵ بێ، لەبارەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، فێربوون‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابیصەی کرد بەنوێنەری خۆی‌و ناردیەوە بۆ وڵاتی خۆی کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنێ.

وابیصە باری کرد بۆ کووفە، لەوێ نیشتەجێ بوو، دوایی گواستیەوە بۆ (الرقّة)لەوێ ما هەتا مەرگ بوو بەمیوانی.

٤٤٤- وَلَهُ عَنْ طَلْقٍ بن علي (رضى الله عنه) {لاَ صَلَاةَ لِمُنْفَرِدٍ خَلْفَ اَلصَّفِّ} وَزَادَ اَلطَّبَرَانِيُّ مِنْ حَدِيثِ وَابِصَةَ: {أَلَا دَخَلْتَ مَعَهُمْ أَوْ اِجْتَرَرْتَ رَجُلًا؟}.

{ضعيف الجامع: ٢٢٦١. ابن حبان ٢٢٠٢. احمد. طبرانى فى الكبير (١٤٥/٢٢ - ٣٩٤/١٤٦)}:

ئیبنو حیببان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە لە (طەلقی کوڕی عەلی؟)یەوە، دەفەرموێ: چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر بۆ مەدینە، نوێژمان بەجەماعەت لەپشتیەوە دەکرد، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی بۆمان دەکرد، کە نوێژەکەی تەواو کرد، ڕوانی واپیاوێ بەتاقی تەنها خۆی لەپشت ڕیزەکەوە نوێژ دەکا، جا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدیاری وەستا، تا پیاوەکە نوێژەکەی تەواو کرد، ئەوجا پێی فەرموو: (نوێژەکەت سەرلەنوێ بکەرەوە، چونکە کەسێ بەتەنها نوێژ بکا، لەپشت ڕیزی جەماعەتەوە ئەگەر مەهانەیەکی ڕەوای نەبێ، نوێژەکەی ناتەواوە، وەك نەبێ وایە!).

طەبەرانی ئەمەی لەم فەرموودەیە پتر کردووە:

وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپیاوەکەشی فەرموو، کە بەتەنها لەپشت ڕیزەکەوە جەماعەتی دەکرد: (ئەدی دەبوو یان بچوویتایە ناو

ریزی نوێژکارەکانـەوە، یـان بەهێواشـی پیاوێکیانـت ڕابکێشایەتە دواوە بۆلای خۆتو لەگەڵ ئەودا ریزێکتان دروست بکردایە!).

(ڕوونکردنەوە):

١- ڕاڤـەکاران دەفورمــوون: ئەمــەی کــە مامۆســتای گــەورەو ســەروەر مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: (طەلقی کوڕی عەلی) ئەمە هەڵەی قەڵەمە، دەنا فەرموودەکە لە (عەلی کوڕی شەیبان)ەوەیە.

٢- زۆر لەزاناکان دەفەرموون: بەتایبەتی زانایانی مەزهەبی کوردەواری خۆمـان کـە مەزهـەبی پێـشەوا شـافیعییە (رەزاو رەحمـەتی خـودای گـەورەو سەروەر لەهەموویان بێ) دەفەرموێ: نوێـژی تـەنیایی دوای ریـزی جەماعـەت دادەمــەزرێ، بــەڵام کــاری وا زۆر نابــاشو ناپەســەندە، وا باشــە مــرۆڤ بــەبێ مەهانەی رەوا کاری وا نابەجا نەکا.

٣- عــەلی کــوڕی شــەیبان (رەزای خــودای لێ بــێ) یــەکێ بــوو لەدەســتەی نوێنەرەکانی بەنی حەنیفـە، کەچوونە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەســەر بــێ) ئیــسلام بــوونو پــەیمانیان بەســت لەگــەڵ پێغەمبــەر، چــەند فــەرموودەیێ لــە پێغەمبــەرەوە دەگێڕێتــەوە. بــەنو حەنیفــە هۆزەکــەی موسەیلەمەی کەزابن.

٤٤٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {إِذَا سَمِعْتُمْ اَلْإِقَامَـةَ فَامْـشُوا إِلَـى اَلـصَّلَاةِ، وَعَلَـيْكُمْ اَلـسَّكِينَةُ وَالْوَقَـارُ، وَلَـا تُسْرِعُوا، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{بوخاری ٦٣٦. پوختەی موسلیم ٢٤٤ = شـیحا ١٣٦٢، ١٣٥٨ – ١٣٦٣ = مسلم ٦٠٢ + تجریدی بوخاری/١، لاپـەڕە ٣٦٠ چـاپی یەکـەم، ژمـارە: ٣٦٦ = ٦٣٥ فتح الباری}:

لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی بۆ دەکردین، لەوکاتەدا گوێی لێ بوو، کەوا چەند پیاوێ کردوویانە بەگاڵە گاڵو غەڵبە غەڵبو زرمەزرم، جا کەنوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئەوە چیتان بوو، بۆ واتان دەکرد؟ گوتیان: پەلەی نوێژمان بوو، کە بگەین بە جەماعەتەکەدا، فەرمووی: (شتی وا مەکەن، بەڵکوو کەدێن بۆ نوێژ لەسەرەخۆو هێدیی‌و شێنەیی بن، ئیتر چەندە فریای کەوتن بەجەماعەت لەگەڵ مەلاکەدا بیکەن، وە ئەوەیشی پیادا نەگەیشتن، خۆتان بەتەنها تەواوی بکەن). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ٧٥٥ — ش/د- هەتا ئێرە گێڕانەوەکەی پوختەی بوخاری‌و پوختەی موسلیمە، ئەمەیش وەرگەڕاوی ژمارە: ١٣٥٨ مسلم/شیحایە، کەدانەر حافیظی عەسقەلانی لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ دەکا}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێ، بەڕاکردن مەچن بۆی، بەڵکوو بەشێنەیی‌و سەلاری بڕۆن بۆی، جا هەرچی فریاکەوتن ئەوا بەجەماعەت لەگەڵ مامۆستای پێشنوێژدا بیکەن‌و، ئەوەیشی کەپیایا نەگەیشتن خۆتان بیکەن).

٤٤٦ – وَعَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {صَلَاةُ اَلرَّجُلِ مَعَ اَلرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلَاتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلَاتُهُ مَعَ اَلرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلَاتِهِ مَعَ اَلرَّجُلِ، وَمَا كَانَ أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اَللَّهِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع ٢٢٤٢. أبوداود رقم: ٥٥٤. نسائى ٢/١٠٤، إبن حبان ٢٠٥٦}:

ئوبەیی کوڕی کەعب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوێژی دوو پیاو بەکۆمەڵی، خێری

زۆر تـره، لەنوێـژی یـەك پیـاو کەبەتـەنها هـەرخۆی بـێ، نوێـژی سـێ پیـاو بەجەماعەت خێری زۆرتره لەنوێژی دووپیاو بەجەماعـەت، ئـیتر هـەروا بـەم پێو دانه نوێژی جەماعەت هـەتا ژمـارەی جەماعـەتکاران زۆرتـر بـن، خێـری زۆرترەو خۆشەویستتره لەلای خودای گەورەو سەروەر). {تـاج/١، زنجیره: ١٢٢، ژماره: ٧٤٧}.

**(ڕوونكردنەوە):**

ئوبـەیی کـوڕی کـەعب ئەنـصارییه، واتـە: کۆچـەری نییـە، کەسـناوی ئەبولونزیرە، نازنـاوی (سَيِّدُ القُـرَّاء = ئاغـای قورئانخوێنـەکان) بـوو، ئامـادەی عەقەبەی دووەم بـوو، هـەروا ئامـادەی غـەزای بـەدرو هـەموو غـەزاکانی تـری پێغەمبەر بووە، پیاوێکی چوارشانەی ریـش سـپی بـوو، ریـشی بۆیـە نـەدەکرد، واقیدی دەفـەرموێ: یەکـەم نووسـەری پێغەمبـەر بـوو، لـەڕووداوە گەورەکانـدا ئیمامی عومەر ڕاوێژی پێ دەکـرد، لەبـەر ئـەوە کـە لـە پێغەمبـەری بیـستبوو کەهـەموو دەردو نەخۆشـیو ئـازارێ، بـا زۆر کـەمیش بـێ، وەك تێهەڵچەقینی دڕکـێ، دەبـێ بـە پۆشـەرو کـەفارەتی گونـاه، لەبەرئـەوەی کـە ئەمـەی لـە پێغەمبەر بیـستبوو، داوای لـەخودا کـرد، کـە هـەتا دەمـرێ، نـچەتایەکی وا لـە لەشیا بێ، کەڕێگـەی حـەجو عـەمرەو غـەزاو خـەباتو نوێـژی جەماعـەتی لێ نەگرێ، وەنزاکەی گیرابوو بوو وەهەتا مرد نچەتایەکی وەهـای لـە لەشـدا بـوو، هەرکەسێ دەستی لەدەستی دەدا، هەستی بەگەرمی تایەکەی دەکرد، یەکێ بوو لەشـەرعزانەکانی هـاوەڵان، ڕاجیـایی زۆر هەیـە لەسـەر مێـژووی مردنـی، ئیـستیعاب دەفـەرموێ: زۆرینـەی مێژووناسـان دەفـەرموون لەسـەردەمی جێنشینی عومەردا مردووە، عەسقەلانی لە ئیصابەدا دەفەرموێ: ئەبو نەعیم ئەوە بەڕاست دەزانێ، کە لەسـاڵی (٣٠) سـیی کۆچـیدا، لەسـەردەمی جێنـشینی عوسمانـدا مـردووە، (ڕەزاو ڕوحمەتی خودای لێ بێ).

٤٤٧- وَعَنْ أُمِّ وَرَقَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَهَا أَنْ تَؤُمَّ أَهْلَ دَارِهَا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{حسن، الإرواء/٤٩٣. أبوداود/٥٩١، ٥٩٢. ابن خوزقيمة/١٦٧٦. حاكم ١/٣٢٠}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی خەللاد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڵێ جار دەچوو بۆ سەردانو دیدەنی ئوم وەرەقە، کەهەموو قورئانی لەبەر بوو، دەچوو بۆ ماڵەوەی لەگەڵ چەند کەسێ لەهاوەڵانی، ئوم وەرەقە داوای لە پێغەمبەر کرد کەبانگدەرێکی بۆ دابنێ، ئەویش بانگدەرێکی بۆ دانا، وەفەرمانیشی پێ کرد کە ئوم وەرەقە خۆی پێشنوێژی بکا بۆ دانیشتوانی ناو ماڵەکەی، عەبدوڕەحمان دەیگوت من خۆم ئەو بانگدەرەم دیبوو، پیرەمێردێکی ئیختیار بوو). {تاج/١، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ٧٧٠}.

(ڕوونکردنەوە):

ئوم وەرەقە ژنێکی ئەنصاری بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەر بوو، لەغەزای بەدرا داوای لە پێغەمبەر کرد، کە لەگەڵیانا بچێ بۆ ئەو غەزایە، سابەڵکوو خودا خەلاتی شەهیدبوونی پێ ببەخشێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووو: لەماڵەوە ئارام بگرە، ئومێدە کەخودا لەماڵی خۆتا، شەهیدیت بەنصیب بکا). ئەنجا لەپاش ژیانێکی پڕ لەخێرو چاکە شەهیدیی پێ بەخشی.

خزمەتکارێكو کارەکەرێکی هەبوو، کۆیلەی بوون، ڕاسپێری کرد کەلەپاش مەرگی خۆی، هەردووکیان ئازاد بن، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عومەری کوڕی خەطابدا، شەوێ بەهەردووکیان بەپارچەیێ قەیفە خەفەی دەکەنو دەیخنکێنن، بەئومێدی ئەوەی کەئیتر ئازاد ببنو لەکۆیلەیی ڕزگاریان ببێ، بەڵام کاتێ هەست دەکەن پیلانەکەیان سەرکەوتوو نییەو تاوانەکەیان

ئاشكرا دەبێ هەڵدێنو خۆیان دەشارنەوە. حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەرێ ئەمشەو گوێم لەدەنگی قورئانخوێندنی پورە ئوم وەرەقە نەبوو، ئادەی بابچین بزانین خێرە، کەدەچن، کارەساتەکە دەبینن. جا عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشە ڕاستو دروستە، ڕاستی دەفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ جار کە دەیویست بچێ بۆ سەردانی ئوم وەرەقە بەئێمەی دەفەرموو: (هەڵسن بابچین بۆ سەرداوی ژنە شەهیدەکە). بەهۆی ئەم موژدەیەی پێغەمبەرەوە ئوم وەرەقە ناوی دەکرابوو بە (الشهیدة).

جا عومەر لەمزگەوت چووە سەر دوانگەو هەواڵەکەی ڕاگەیاندو فەرمانی دەرکرد، کەبگیرێن، وەدۆزرانەوەو گیرانو دادگایی کرانو پێیان لەتاوانەکەیان نا، ئیتر ئەوانیش لەتۆڵەی ئوم وەرەقەدا لەدار درانو بەقەنارەدا هەڵواسران.

ئەم ژنو پیاوە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە هەتا ئەوکاتە یەکەم کەس بوون، کە لەمەدینەی نازدارو پیرۆز لەسێدارە بدرێن! (هەزار هەزار رەزاو رەحمەتی خودا لە عومەرو ئوم وەرەقە بێ).

٤٤٨- وَعَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِسْتَخْلَفَ اِبْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ، يَؤُمُّ اَلنَّاسَ، وَهُوَ أَعْمَى} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُد.

{حسن صحيح، سنن أبي داود/٥٩٥. أحمد ١٣٢/٣، ١٩٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆ غەزا، چەند جارێ لەکاتی چوون بۆغەزادا، ئیبنو ئوممی مەکتوومی دەکرد بەجێنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، هەتا خۆی لەو غەزایە دەگەڕایەوە، ئیبنو ئوممی مەکتووم ناوی عەبدوڵڵا بوو، پیاوێکی کوێر بوو، وە لەو ماوەیەدا هەتا پێغەمبەر لەغەزاکە

دەگەڕایەوە ئەو بەرنوێژیی بۆ خەڵك دەكرد. {تاج/١، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ٧٧٠}.

٤٤٩- وَنَحْوُهُ لِابْنِ حِبَّانَ: عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا).

{إبن حبان رقم: ٢١٣٣}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار لەكاتی دەرچوون لەمەدینەدا، عەبدوڵلای كوڕی مەكتوومی كرد بەجێگەنشینی خۆی، لەكاروباری نوێژو شتی تریشدا).

٤٥٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {صَلُّوا عَلَى مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَصَلُّوا خَلْفَ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{دارقطنی ٢/٥٦. ضعيف الجامع ٣٤٨٣}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی كەخۆی بە موسوڵمان بزانێ، بانوێژو ئەركە ئایینیەكانیش بەجێ نەهێنێو گوناهیشی زۆربێ، بەمەرجێ لەژیانیدا خۆی بە موسوڵمان بزانیو بەزمان بڵێ: «لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَمُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ» كاتێ دەمرێ، ئێوە نوێژی مردوو لەسەر تەرمەكەی بكەن، وەهەروەها ئەگەر پێشنوێژیشی كرد، جەماعەتی لەپشتەوە بكەن).

(ڕوونكردنەوە):

١- هەركەسێ خۆی بە موسوڵمان بزانێ، وە جاڕی بێ باوەڕی نەدا، ئەگەر بۆ یەكجاریش بووە، بەزمان بڵێ (آشْهَدُ آنْ لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَأشهد أَنَّ محمداً رَسُولُ اللّهِ) وەبەدڵ باوەڕی بەم وشەی شایەتمانە هەبێ، وەنیشانەی نیفاقو كوفری بەئاشكرا پێوە نەبێ، ئەوە موسوڵمانەو هەموو بڕیارێ، كە موسوڵمان بگرێتەوە ئەویش دەگرێتەوە، هەتا لەژیاندا بێ، ژنی لێ مارە

دەكـرێ، تـەڵاقی دادەمـەزرێ، نوێـژی لەپـشتەوە دەكـرێ، كـاتێكیش دەمـرێ، نوێـژی مـردووی لەسـەر دەكـرێ، لەگۆڕسـتانی موسـوڵمانان دەنێـژرێ، خێـرو حەسـەناتی بـۆدەكرێ، كفـن دەكـرێ، تەنانـەت دروسـتە كـەسوكاری حـەجو عـەمرەو قوربـانیو وەقـفو خێـری بـۆ بكـەنو مزگـەوتی بـەناوەوە بكـەن. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٠٩، لاپەڕە: ٢٩}.

٤٥١- وَعَنْ عَلِيّ بن ابی طالب (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ اَلـصَّلَاةَ وَالْإِمَـامُ عَلَـى حَـالٍ، فَلْيَـصْنَعْ كَمَـا يَـصْنَعُ اَلْإِمَامُ}. رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{صحيح الجامع/٢٦١. ترمذی رقم: ٥٩١}:

عەلی كوڕی ئـەبو طالیـب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (كاتـێ پاشـنوێژی لێپـیش كـەوتوو، لەپشت مەلاوە نێتی نوێژی جەماعەت دەهێنـێ، لەوكاتەدا مەلاكە چی دەكا، با ئەویش ئەوەبكا).

(ڕوونكـردنەوە):

١- كەسـی دواكـەوتوو لەجەماعـەت، لەسـەرەتاوە، ڕووەو ڕووگـە بـەپێوە، بەنیازی نێتهێنان ئەڵلاهوئەكبەری نوێژ دابەستن دەكاو ئەوجا پەیوەندی بـە مامۆستای پێشنوێژەوە دەكا، ئـەو چـی بكـا ئـەویش ئـەوەدەكا، بەوێنـە ئەگـەر مەلا لەكوڕنووشا بوو ئەویش بچێ بۆ كوڕنووش، وەچەندە لەگەڵ جەماعەتدا فریاكەوت ئەوەباشە، وە ئەوەی كە فریانەكەوت خۆی تەواوی دەكات.

٢- ئەم باسە (٤٥١ — ٤٢٠ = ٣١) سیو یەك فەرموودەی واتیادا.

٣- نوێژی جەماعەت زۆر خێرە.

٤- تەركی جەماعەت بەبێ مەهانەی ڕەوا زۆر زۆر خراپە.

٥- سوننەتە یەك جار نوێژ بەجەماعەت دووبارەوە بكرێتەوە.

٦- پەیڕەویو دواكەوتنی پێشنوێژ پێویستەو فەرزە.

٧- چوون بۆ مزگەوتو بۆ نوێژی جەماعەت، دەبێ بەشێنەیی بێ.

٨- پیاوچاکان شایانترن بەریزی پشتی مەلاوە.

٩- نوێژی تەراویح سوننەتە بەجەماعەت لەمزگەوت بکرێ گەرچی دروستە بەتەنهایش بکرێو لەجێگەی تریش بکرێ.

١٠- نوێژی کورتو پوختو سووکەڵە بۆ جەماعەت سوننەترە لەنوێژی دوورو درێژ کە خەڵك لەجەماعەت برەوێنێتەوە.

١١- منداڵی فامیدەی پاكو پوخت دروستە پێشنوێژی بکا.

١٢- کێ لەپێشترە بۆ پێشنوێژیکردن (بڕوانە: ژمارە: ٤٣٦).

١٣- مەرجی پێشنوێژ (بڕوانە: ژمارە: ٤٣٧).

١٤- ڕێکخستنی ریز سوننەتە، هەروەك سوننەتە پاڵ بدەن بەیەکەوەو بۆشایی لەنێوانا نەمێنێ.

١٥- گەورەیی ریزی یەکەم بۆ پیاوانو بۆ ژنان.

١٦- نوێژی سوننەت بەجەماعەت دەکرێ.

١٧- ژمارەی نوێژخوێنانی جەماعەت هەتا زیاتربێ، خێریشی زیاترە، مەگەر لەچەند حاڵەتێکانەبێ، وەك ئەوە مەلاکە بەدکاربێ، یا ئەگەر ئەو نوێژخوێنە لەگەڵ جەماعەتە گەورەکەدا نوێژ بکا، کۆمەڵێ تر جەماعەتیان بۆ نەکرێو مەلایان دەست نەکەوێ کە نوێژیان بۆبکا.

١٨- بەرنوێژیی نابینا دروستە، هەروا هی کۆیلە.

١٩- دروستە نوێژی تەرم لەسەر هەموو موسوڵمانێ بکرێ، بازۆر بەدکاریش بێ، هەروەك دروستە نوێژ لەپشتی پێشنوێژی بەدکارەوە بکرێ.

## ٢١- باسی نوێژی ڕێبوارو نەخۆش
## باب: صلاة المُسَافِرِ وَالْمَرِيضِ

٤٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {أَوَّلُ مَا فُرِضَتْ اَلصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ اَلسَّفَرِ وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ اَلْحَضَرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٢٢ = ٣٥٠، ١٠٩٠، ٣٩٣٥ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٢٠٢ = ١٥٧٠}:

**عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەرەتاوەن یەکەمجار، کە خودای گەورەو سەروەر نوێژی لەسەر موسوڵمانان داناو فەرزیکرد، دوورکات دوورکات فەرزی کرد، ئیتر نوێژخوێن نیشتەجێ بوایە، گشت نوێژێ، دوورکاتی دەکرد، جا نوێژی سەفەر وەك خۆی بەدوو رکاتی مایەوەو، لەسەر شێوەی یەکەمجاری چەسپاو دامەزرا، بەڵام نوێژی نیشتەجێ (مقیم) لێی زیادکرا.**

**لەپوختەی موسلیما ئەمەی پترە:**

**ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەعوروەم گوت، کە خوشکەزای عائیشە بوو: ئەوە هۆی چییە کەعائیشەی پوورت لەسەفەردا، نوێژە چوارینەکان، کورت ناکاتەوە بەڵکوو بەتەواوی بەچوار رکات دەیانکات؟**

**عوروە فەرمووی: (دیارە ئەویش وەك ئیمامی عوسمان شتەکەی تەئویل کردووە، کە لەسەفەریشا دروستە نوێژ کورت نەکرێتەوەو، ڕێبواریش وەك نیشتەجێ، نوێژە چوارینەکانی بەچوار رکات بکات، هەروەك دروستە کورتیان بکاتەوەو بەدوو رکات بیانکات).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی (ئەبوبەکر: موحەممەدی کوڕی موسلیم)ە، نازناوی — واتە: لەقەبی — زوهرییە، ناسراوە لەناو فەرموودەشوناسەکاندا بە ئیبنو شەهاب، لەپەیڕەوانە، کە مەشهورن**

بەتابیعین، لەپەیڕەوە بچکۆلەکانە، لە پەنجا - هەتا - پەنجاو شەشی کۆچی لەدایك بووە، لەپیاوانی شەش پەڕاوەکەیە، واتە: لەریجالی کوتوبی سیتتەیە، کە بوخاریو موسلیمو ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەن، فەرموودەی لەئیبنو عومەرو ئەنەسو هاوەڵانی ترەوە وەرگرتووە، ئیبنو عومەری بینیوەو بەخزمەتی گەیشتووە، وە فەرموودەی لەویشەوە گێڕاوەتەوە. هەندێ دەفەرموون: تەنیا دوو فەرموودەی لەئیبنو عومەرەوە وەرگرتووە، کەخۆی لێی بیستبێ، زوهری فەقیەو شەرعزانێکی گەورە بووە، یەکێ لەفەقێو شاگردەکانی زوهری، پێشەوای دادپەروەرو خواناس: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە، کەپێشەوایەکی گەورەی دادپەروەری ناسراوە، کەپێش ئەوەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بکرێ بەجێگەنشینی موسوڵمانان، ئەوەندە موسوڵمانێکی ڕێکوپێك بوو، ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك جەماعەتی لەپشتیەوە دەکرد، پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ دەمرێ، هەندێ پارچە نینۆكو مووی پێغەمبەری هەبوو، ڕایسپارد کەلەناو کفنەکەیدا دایبنێنو لەگەڵیدا بۆ پیرۆزی بینێژن.

ئیمامی زوهری هەروەك شێخو مامۆستای زۆری هەبووە، کەشەرعو فەرموودەو زانستی ئیسلامی لێیان وەرگرتووە، فەقێو شاگردی زۆریشی هەبووە، کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوەو قەڵای ئایینی ئیسلامیان پێ قایمتر کردووەنو خەرمانی یاسانامەی ئیسلامیان پێ دەوڵەمەندو دارا بوون.

نزیکەی دوو هەزار فەرموودەی هەیە، کەلە هەموو بابەتە ئیسلامییەکان دەدوێن، وەك نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، هەواڵەکانی پێغەمبەرو هاوەڵانی، نزیکەی نیوەیان موسنەدن.

لەیث دەفەرموێ: زوهری فەرمووی: (هەرچیم لەبەر کردبێ لەبیرم نەچۆتەوە!).

زوهری (رەحمەتی لێ بێو خودا لەخاكو پای ئەم پیاوچاكانەدا حەشرو نەشرمان بكات) پیاوێكی زۆر بەخشندە بوو، دەڵێن: ساڵی پەنجای كۆچی لەدایك بووە، وە لە رەمەزانی ساڵی سەدوبیستو پێنجی كۆچیدا مردووەو مەرگ بووە بەمیوانی (رەحمەتی خودای لێ بێ).

٤٥٣- وَلِلْبُخَارِيِّ: {ثُمَّ هَاجَرَ، فَفُرِضَتْ أَرْبَعًا، وَأُقِرَّتْ صَلَاةُ اَلسَّفَرِ عَلَى اَلْأَوَّلِ}.

{بوخاری/٣٩٣٥}:

بوخاری ئەمەی لەم فەرموودەیەی عائیشە پتر كردووە:

(ئەمە لە مەككە وابوو، بەڵام كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كۆچی كرد بۆ مەدینە، ئەو نوێژانەی كە ئێستا بەچوار ركات ئەكرێن، كەنوێژی نیوەڕۆو عەصرو خەوتنانن، لەدوو ركاتەوە كران بەچوار ركات، بۆ نیشتەجێ، بەڵام لەكاتی رێبواریو سەفەردا، لەسەر باری پێشوویان مانەوە هەربە دووركات دەكران).

٤٥٤- وَزَادَ أَحْمَدُ: {إِلَّا اَلْمَغْرِبَ فَإِنَّهَا وِتْرُ اَلنَّهَارِ، وَإِلَّا اَلصُّبْحَ، فَإِنَّهَا تَطُولُ فِيهَا اَلْقِرَاءَةُ}.

{المسند ٦/٤١}:

پێشەوا ئەحمەد لە (المسند)دا، ئەم فەرموودەیە لەعائیشەوە بەم زیادەیەوە دەگێڕێتەوە، یەكەمجار، كە خودای گەورەو سەروەر نوێژی لەسەر موسوڵمانان داناو فەرزیكرد لەسەریان، دووركات دووركات فەرزی كرد، ئیتر نوێژخوێن نیشتەجێ بوایە، یان رێبوار بوایە، گشت نوێژێ، نوێژخوێن دووركاتی دەكرد، جگە لەنوێژی شێوان كە ئەو هەر لەسەرتاوە بەسێ ركات فەرزكراو نەلێی زیادكراو نەلێی كەم كرایەوە، نە لەسەفەرو نەلەماڵەوە، چونكە نوێژی شێوان نوێژی تاكی رۆژە، وەبێجگە لەنوێژی بەیانیش كە ئەویش هەر لەسەرتاوە بەدووركات فەرزكرا لەسەر موسوڵمانان، بۆ

نیشتەجێو بۆ ڕێبوار هەر دوو ڕکاتە، چونکە لەسەرەتاوە ئەوە لەم نوێژەدا ڕەچاوکراوە: کە گرنگ ئەوەیە قورئانی زۆری تیادا بخوێندرێ! هەتا کۆتایی فەرموودەکە، کە لەژمارە (٤٥٢و ٤٥٣)دا، رابورد).

٤٥٥- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَقْصُرُ فِي اَلسَّفَرِ وَيُتِمُّ، وَيَصُومُ وَيُفْطِرُ}. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَرُوَاتُهُ ثِقَاتٌ. إِلَّا أَنَّهُ مَعْلُولٌ وَالْمَحْفُوظُ عَنْ عَائِشَةَ مِنْ فِعْلِهَا، وَقَالَتْ: {إِنَّهُ لَا يَشُقُّ عَلَيَّ} أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ.

{صحيح، السلسلة الضعيفة والموضوعة: ١٥٦/٩. دارقطني ١٨٩/٤٤/٢. بيهقي ١٤١/٣}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا بوو: گەلێ جار لەسەفەردا، لەکاتی ڕێبواریدا، نوێژی نیوەڕۆو عەصرو خەوتنانی کورت دەکردەوەو بە دوورکات دەیکردن، گەلێ جاریش وەك کاتێ لەماڵەوە بێو لەسەفەر نەبێ بەتەواوی بەچوار ڕکات دەیکردن، هەروەها وا دەبوو لەسەفەرەدا، لەمانگی ڕەمەزانا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرۆژوو دەبوو، جاری وایش دەبوو کە دەیبینی هاوڕێکانی، بەرۆژووەکە سەخڵەت دەبن، ڕۆژووەکەی دەشکاند).

دانەر حافظی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: دارە قوگنی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، بگێڕوە (ڕاوی)یەکانی هەموو جێگەی متمانەی زانایانی فەرموودەشوناسین، بەڵام ئەم فەرموودەیە بێ مولامەت نییەو زەدەدارو دەرداوییە.

هەروا عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەوەی کە لەناو زانایانی فەرموودەدا زانراوەو لەبەرکراوە ئەمەیە: (کە عائیشە خۆی وایدەکرد، نەوەك پێغەمبەر وایکردووە). وەلە پاساوی ئەوەدا، کە عائیشە لەسەفەردا، نوێژی بەتەواوی

دەکردو گەڵێ جار بەڕۆژووش دەبوو، دەیفەرموو: (چونکە شتی وام بەلاوە قورسو گران نییە).

٤٥٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رضی تعالی عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِنَّ اَللّٰهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع/١٨٨٦. ابن حِبّان/٣٥٦٨. أحمد/٢/١٠٨، رقم: ٥٨٦٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودا پێی خۆشە کە مۆڵەتەکانی جێبەجێ بکرێن، خودا مۆڵەتی داوە بە بەندەکانی خۆی کە لەسەفەردا نوێژ کورت بکەنەوە، یا کۆبکەنەوە، کەواتە خودا ئەوەی پێ خۆشە کە لەسەفەردا، نوێژ کورت بکرێتەوە، یان کۆبکرێتەوە، هەروەك چۆن پێی ناخۆشە کە ئەوەی خودا بەتاوانی داناوەو بەگوناهی داناوە، بەندە ئەنجامی بدات).

{صحيح الجامع/١٨٨٦} لەگێڕانەوەیەکا ئاوایە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چۆن خودای گەورە پێی خۆشە کە بڕیارەکانی لەکاتی بێمۆڵەتیدا جێبەجێ بکرێن، ئاوەهایش بەهەمان شێوە، پێی خۆشە کە ئەو بڕیارانەی، لەکاتی مۆڵەتدا، کار بە مۆڵەتەکانیان بکرێ!).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست ئەوەیە: وەك چۆن خودا پێی خۆشە کە نیشتەجێ کەهیچ مەهانەو مۆڵەتێکی نەبێ، کە هەر پێنج نوێژەکان بەتەواوی بکا، وە هەرنوێژەی لەکاتو ساتی خۆیدا بکا، کە بەم جۆرە بڕیارە سەبارەت بەنوێژ دەگوترێ عەزیمە، واتە: نەگۆڕی بێمۆڵەت، ئاوەهایش بەهەمان شێوە پێی خۆشە، کە نوێژە فەرزەکان لەکاتی مۆڵەتدا، بەپێی مۆڵەتەکە ئەنجام بدرێن، وەك لەسەفەردا، نوێژی چوار ڕکاتی وەك نیوەڕۆو عەصر بەدوو ڕکات بکرێن،

چونکە ئەوە مۆڵەتی خودایە، یا لەکاتی سەفەر یا باران، یا نەخۆشی، نوێژی نیوەڕۆو عەصر کۆبکرێنەوە، هەروا نوێژی شێوان‌و خەوتنان.

٤٥٧- وَعَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلَاثَةِ أَمْيَالٍ أَوْ فَرَاسِخَ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{موسلیم شیحا/١٥٨١ = مسلم/٦٩١}:

یەحیای کوڕی یەزیدی ئەلهونائی (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: لەبارەی کورتکردنەوەی نوێژە چوار رکاتیەکانەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، ئەگەر ماوەی سێ میل، یا فەرمووی: ماوەی سێ فرسەق، رێگەی بکردایە، نوێژی کورتەوە دەکردو نوێژی چوار رکاتی بەدوو رکات دەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٩٤}.

٤٥٨- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) قَالَ: {خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مِنْ اَلْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى اَلْمَدِينَةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٤٥ = ١٠٨١، ٤٢٩٧ فتح مالباری. پوختەی موسلیم/٤٣٦ = ١٥٨٤ شیحا = مسلم/٦٩٣}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی مالآواییدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەوە دەرچووین بۆ مەککە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر دوورکات دوورکات نوێژە چوار رکاتییەکانی دەکرد بۆمان، بەکۆمەڵی، واتە: بەجەماعەت، هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە. یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق فەرمووی: گوتم بە ئەنەس: لە مەککەو دەوروبەری چەندێ مانەوە؟ فەرمووی: دەشەو لەوێ ماینەوە. {تاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٩٠ چاپی چوارەم}.

٤٥٩- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {أَقَامَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ} وَفِي لَفْظٍ: {بِمَكَّةَ تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَفِي رِوَايَةٍ لِأَبِي دَاوُدَ: {سَبْعَ عَشْرَةَ} وَفِي أُخْرَى: {خَمْسَ عَشْرَةَ}.

{پوختەی بوخاری/٥٤٤ = ١٠٨٠، ٤٢٩٨، ٤٢٩٩ فتح الباری}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئاززادکردنی شاری مەککە، پێغەمبەرو سوپاکەی نۆزدە شەو لەمەککە مانەوە، لەو ماوەیەدا نوێژی کورت دەکردەوە بۆمان، واتە: نوێژە چوارینەکانی دەکرد بەدوو رکات).

ئەم فەرموودەیە لەتاجدا ئاوایە، دەیکەین بە روونکردنەوە بۆ گفتەو گێڕانەوەکانی ئێرە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەشاری مەککەی گرتو رزگاری کرد، لەدەستی هاوەڵپەیداکاران، نۆزدە شەو لەوێ مایەوە، لەوماوەیەدا نوێژی کورت دەکردەوە، واتە: نوێژە چوارینەکانی بەدوو رکات دەکرد، جا لەبەرئەمە، ئێمەیش هەرکاتێ بچین بۆ سەفەرو بۆ رێبواریی، هەتا نۆزدە شەو لەشوێنێ دەمێنینەوە هەرهەقمان هەیە کە نوێژ کورت بکەینەوە، بەڵام ئەگەر لەشوێنێ لەمەزیاتر ماینەوە، ئیتر نوێژ کورت ناکەینەوەو بەڵکوو نوێژی تەواو دەکەین {ب/د/ت/١، = بوخاریو ئەبو داوودو تەرمەزی} گفتەی تەرمەزی ئاوایە: جا ئێمەیش هەتا نۆزدە شەو دوورکات نوێژە چوارینەکان دەکەین، بەڵام ئەگەر لەشوێنێ نۆزدە شەو زیاتر ماینەوە ئەوجا چوار رکات نوێژی تەواو دەکەین). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٩١}.

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا: (حەڤدە شەو ماینەوە) لەگێڕانەوەیەکی تری ئەبو داووددا، هەر لەئیبنو عەباسەوە: (پازدە شەو لەمەککە ماینەوە).

٤٦٠- وَلَهُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: {ثَمَانِيَ عَشْرَةَ}.

{ضعيف الجامع/٦٣٨٠}:

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەبو داووددا، لەعیمرانی کوڕی حوصەینەوە: (هەژدە شەو لەمەککە ماینەوە).

٤٦١- وَلَهُ عَنْ جَابِرٍ: {أَقَامَ بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْمًا يَقْصُرُ اَلصَّلَاةَ} وَرُوَاتُهُ ثِقَاتٌ، إِلَّا أَنَّهُ اُخْتُلِفَ فِي وَصْلِه.

{صحيح، الإرواء/٥٧٤. أبو داود رقم: ١٢٣٥}:

لەفەرموودەیەکی تری ئەبو داووددا، جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی غەزای تەبووکدا، بیست ڕۆژ لەتەبووك مایەوە، لەو ماوەیەدا نوێژە چوارینەکانی کورت دەکردەوە بەدوو رکات دەیکردن).

حافیظی عەسقەلانی دانەری ئەم پەڕاوی (بلوغ المرام)ە، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

(بگێڕەوە (راوی)یەکانی ئەم فەرموودەیە هەموویان جێگەی متمانەن و کەسانی متمانەدارو باوەڕپێکراون، لەلای زانایانی فەرموودە، بەڵام ڕاجیایی هەیە لەوەدا، کە ئەم ئەثەرە موسنەدی موتتەصیلە هەتا سەرجابیر، یا مونقەطیعە.

٤٦٢- وَعَنْ أَنَسٍ: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا اِرْتَحَلَ فِي سَفَرٍ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ اَلشَّمْسُ أَخَّرَ اَلظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ اَلْعَصْرِ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا، فَإِنْ زَاغَتْ اَلشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ صَلَّى اَلظُّهْرَ، ثُمَّ رَكِبَ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةِ اَلْحَاكِمِ فِي "اَلْأَرْبَعِينَ" بِإِسْنَادِ اَلصَّحِيحِ: {صَلَّى اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، ثُمَّ رَكِبَ} وَلِأَبِي نُعَيْمٍ فِي "مُسْتَخْرَجِ مُسْلِمٍ": {كَانَ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ، فَزَالَتْ اَلشَّمْسُ صَلَّى اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ اِرْتَحَلَ} .

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٥٥ = ١١٠٧ فتح الباری. پوختەی موسلیم/٤٣٨ = ١٦٢٥ = مسلم/٧٠٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەهابوو، کاتێ دەچوو بۆ سەفەرێ، ئەگەر بەرلەوە کەخۆر لەناوەڕاستی ئاسمان بەدیمەن لابداو نوێژی نیوەڕۆ ببێ، بکەوتایەتەڕێ، ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست، تاکاتی عەصر، ئەوجا دادەبەزیو هەردووکیانی پێکەوە بەجەمعە تەئخیر (بەکۆکردنەوەی دواخراو) دەکرد، بەلاّم ئەگەر پێش ئەوە کە بکەوێتەڕێ، خۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لای بدایە، واتە: نوێژی نیوەڕۆ ببوایە، ئەوا نوێژی نیوەڕۆی لەکاتی خۆیدا بەتەنها دەکرد، ئەوجا سواردەبوو، وە دەکەوتەڕێ، وە نوێژی عەصری ئەو ڕۆژەیشی بەتەنها لەکاتی خۆیدا دەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ٨٩٥ چاپی چوارەم}.

بەلاّم لەگێڕانەوەیەکا، کە حاکم بەئیسنادێکی صەحیح دەیگێڕێتەوە لەکتێبی (الأربعین)دا ئاوایە: (بەلاّم ئەگەر پێش ئەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکەوتایەتەڕێ، نوێژی نیوەڕۆ ببوایە، ئەوا نوێژی نیوەڕۆو عەصری پێکەوە دەکرد، بەکۆکردنەوەی پێشخراو، ئەوسا دەکەوتەڕێو دەڕۆیشت بۆ سەفەرەکەی).

هەروا لەگێڕانەوەیەکی تردا، کە ئەبو نەعیم لە (مستخرج أبو نعیم عَلى صحيح مسلم)دا، دەیگێڕێتەوە، وەك ئەم گێڕانەوەی حاکم وایە: کە دەفەرموێ: (کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ سەفەر، ئەگەر نوێژی نیوەڕۆ ببوایە، ئەوا بەکۆبوونەوەی پێشخراو نوێژی نیوەڕۆو عەصری پێکەوە دەکرد، ئەوجا دەڕۆیی بۆ سەفەرەکەی).

٤٦٣- وَعَنْ مُعَاذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ يُصَلِّي اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ .

{١٦٢٩ شيحا = مسلم/٧٠٦}:

موعـاذى كـوڕى جەبـەل (ڕەزاى خـوداى لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: لەخزمـەتى پێغەمبـەردا (دروودى خـوداى لەسـەر بـىٚ) دەرچـووين بـۆ غـەزاى تـەبووك، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسـەر بىٚ) لەوماوەيـەدا دەسـتوورى وابـوو: گـەلىٚ جـار نيـوەڕۆو عەصـرى پـێش دەخـستو لـەكاتى نيـوەڕۆدا دەيكـردن، گـەلىٚ جـاريش نيـوەڕۆى دوا دەخـستو لـەكاتى عەصـردا كـۆى دەكردنـەوە پێكـەوە دەيكـردن، وەنوێـژى شـێوانو خـەوتنانيش بەهـەمان شـێوە: گـەلىٚ جارپێـشى دەخستنو لەكاتى شـێوانا بەكۆكردنـەوەى پێـشخراو دەيكـردنو گـەلىٚ جـاريش پاشى دەخستنو لەكاتى خەوتنانا بەكۆكردنەوەى دواخراو دەيكردن). {تاج/١، زنجيره: ١٥٦، ژماره: ٨٩٦ چاپى چوارەم}.

(ڕوونكردنەوە):

١- تەبووك جێگەيەكە، لە ئوردون، ئێستا بووە بـە شـارێكى گـەورە، پـڕە لەباخو ڕەزو بێستانو چێنگە، نزيكەى (٦٧٠) شەش سەدو حەفتا كيلۆمـەترىٚ لەشارى مەدينەوە دوورە.

٤٦٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): {لَا تَقْصُرُوا اَلصَّلَاةَ فِي أَقَلَّ مِنْ أَرْبَعَةِ بُـرُدٍ" مِـنْ مَكَّـةَ إِلَـى عُـسْفَانَ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ مَوْقُوفٌ، كَذَا أَخْرَجَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ. {دارقطنى ١/٣٨٧}:

ئيبنو عەبباس (ڕەزاى خودايـان لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) فەرمووى: لەسەفەرێكا كە لەچوار بەريـد كـەمتربىٚ، نوێـژ كورت مەكەنەوە، كەچوار بەريـد لەمەككەوە بـۆ عوسـفانە، كـە عوسـفان دوو قۆناغ لەمەككەوە دوورە).

دانەر دەفـەرموىٚ: دارەقـوطنى بەڕشـتەيەكى لاواز دەيگێڕێتـەوە، ڕاسـت ئەوەيە كە مەوقووفە، ئيبنو خوزەيمە بەمەوقووفى دەريهێناوە، لەسەر ئيبنـو عەبباس.

(روونكردنەوە):

بەریدێ دوازدە میلە، میلێ هەزارو شەش سەد مەترە كەواتە: {٤×١٢×١٦٠٠ = ٧٦٨٠٠} دەكاتە نزیكەی حەفتاو حەوت كیلۆمەتر. بەڵام لەكتێبە فیقهەكانا، دایاننـاوە بە نزیكەی (٨٢) هەشتاو دوو كیلۆمەتر. {بڕوانە: بڕگەی (١١) لەپوختەی ئەم باسەدا}.

٤٦٥- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {خَيْرُ أُمَّتِي اَلَّذِينَ إِذَا أَسَاءُوا اِسْتَغْفَرُوا، وَإِذَا سَافَرُوا قَصَرُوا وَأَفْطَرُوا} أَخْرَجَهُ اَلطَّبَرَانِيُّ فِي "اَلْأَوْسَطِ" بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ. وَهُوَ فِي مُرْسَلِ سَعِيدِ بْنِ اَلْمُسَيَّبِ عِنْدَ اَلْبَيْهَقِيِّ مُخْتَصَرٌ.

{ضعيف الجامع/٢٩٠١}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترینی گەلی من، ئەوانەیانن كاتێ خراپەیێ دەكەن، بەردەوام نابن لەسەری‌و تەوبەی لێ دەكەن‌و داوای لێبووردن‌و لێخۆشبوون لە خودای گەورە دەكەن، وەكاتێ دەچن بۆ سەفەر، لەماوەی ئەو سەفەرەدا هەم نوێژ كورت دەكەنەوەو هەم ڕۆژوو دەشكێنن).

طەبەرانی لە (الأوسط)دا بەڕشتەیەكی لاواز گێڕاویەتەوە (٣٣٤/٦). الأوسط (٦٥٥٨). بەیهەقیش لەمەراسیلی سەعیدی كوڕی موسەییەبدا بەكورتی دەیگێڕێتەوە.

٤٦٦- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَتْ بِي بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: "صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ"} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بڕوانە: ژمارە: ٣٤٧ لەپێشەوە رابورد}.

٤٦٧- وَعَنْ جَابِرٍ قَالَ: {عَادَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَرِيضًا، فَرَآهُ يُصَلِّي عَلَى وِسَادَةٍ، فَرَمَى بِهَا، وَقَالَ: "صَلِّ عَلَى اَلْأَرْضِ إِنْ اِسْتَطَعْتَ، وَإِلَّا فَأَوْمِ إِيمَاءً، وَاجْعَلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ"} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَصَحَّحَ أَبُو حَاتِمٍ وَقْفَهُ.

{بڕوانە: ژمارە: ٣٤٨ لەپێشەوە ڕابورد}.

٤٦٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {رَأَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي مُتَرَبِّعًا} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ. وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{بڕوانە: ژمارە: ٣٢١ لەپێشەوە ڕابورد}.

## ( پوختەی باسی/٢١ )

١- لەسەفەردا دروستە نوێژە چوار ڕکاتیەکان بەدوو ڕکات بکرێن، کە بەم کردارە دەگوترێ: قەصری نوێژ، واتە نوێژ کورت کردنەوە.

٢- ئەو نوێژانەی کە لەسەفەردا کورت دەکرێنەوە، تەنیا نیوەڕۆو عەصرو خەوتنانن‌و بەس، نوێژی بەیانی‌و شێوان کورت ناکرێنەوە.

٣- دروستە کە نوێژی نیوەڕۆو عەصر، لەسەریەکێ لەم دوو شێوەیە، کۆبکرێنەوە:

آ- کاتێ نوێژی نیوەڕۆ بوو، لەکاتی سەفەردا، یا لەکاتی باراندا، یا لەکاتی نەخۆشیدا، نوێژی عەصر پێش بخات‌و لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا بیکا، لەپێشدا نیازی کۆکردنەوەی هەبێ‌و نوێژی نیوەڕۆ بەئاسایی بەچوار ڕکات بکات‌و سڵاوبداتەوەو بەبێ بوارەو ناوبڕ هەڵسێ نوێژی عەصر دابەستێ‌و بەچوار ڕکات بیکات‌و سڵاو بداتەوە، بەمە دەگوترێ کۆکردنەوەی پێشخراو.

ب- تەنیا لەکاتی سەفەرو لەکاتی نەخۆشیدا، دروستە کە نوێژی نیوەڕۆ دوابخرێ، وە لەکاتی نوێژی عەصردا، لەگەڵ عەصردا بکرێ، وە وەك

كۆكردنـــەوەی پێـــشخراو، لەپێـــشا نوێـــژی نیـــوەڕۆ تـــەواوبكا، ئـــەوجا بـــەبێ دواخستن‌و بوار نوێژی عەصر بكا.

٤- دروستە كە نوێژی شێوان‌و خەوتنانیش، لەكاتی سەفەر، یـا بـاران، یـا نەخۆشی پێش بخرێن یا دوابخرێن، وە لەسەر شێوەی نوێژی نیـوەڕۆو عەصـر بكرێن، بە جەمعە تەقدیم، یا بەجەمعە تەئخیر بكرێن!

٥- بۆ رێبـوار، بەتـەنیا نوێـژبكا، یـا بەكۆمـەڵی، بـۆی هەیـە وەك جـەمع دەكا قەصریش بكا، كە بەم كردارە دەگوترێ قەصرو جەمع.

٦- لەكاتی بارانـدا، قەصـر دروسـت نییـە، ئـەم دوو مەرجـەیش بەمـەرج گیراون:

آ- نوێژەكە بەجەماعەت بێ، نوێژكاری تەنیا بۆی نییە جەمع بكات.

ب- دەبـێ بەجەمعـە تەقـدیم بـێ، بـەهۆی بارانـــەوە جەمعـە تـەئخیر دروست نییە.

٧- نەخۆش بەتەنهابێ، یا لەگەڵ كۆمەڵدا، مافی هەیە كە ئەو نوێژانـەی باسكران، لەسەر یەكێ لەو دوو شێوەیە كۆبكاتەوە، بەڵام بۆی نییە كە قەصـر بكا، مەگەر لەسەفەردا بێت!

ئەمە پوختەیەكی كورت‌و پـوختی باسـی قەصـرو جەمعـە لەمەزهـەبی ئیمامی شافیعیدا (رەحمەتی خودای لێ بێ).

٨- بۆ باسی كورتكردنـەوەی نوێـژ بڕوانـە: فیقهـی ئاسـان بـەرگی یەكـەم زنجیرە: ٧٢، لاپەڕە: ٢٣٢ چاپی ئێران.

٩- بۆ باسی كۆكردنەوەی دوو نوێژ بڕوانە: فیقهی ئاسان بەرگی یەكـەم، زنجیرە: ٧٥.

١٠- كـار بەمۆڵـەت، وەك كورتكردنـەوەو كۆكردنـەوەی نوێـژ، بـەهۆی رێبواری‌و شتی تری واوە، خێری تەواوی هەیە، ئەگەر زیـاتری نـەبێ، چونكە

مۆڵەت خەڵاتی خودایە، واباش‌و جوانە کە رەت نەکرێتـەوە. {تـاج/١، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٨٨٩}.

١١- لەفیقهی ئاساندا دەفەرموێ: (سەفەری درێژ کە دروستە نوێـژی تیـا کورت بکرێتەوە، یا نوێژی تیا کۆبکرێتەوە، یا دروستە رۆژووی رەمـەزانی تیـا بـشکێنرێ، دوو رۆژە رێگەیــە، کــە دەکاتــە نزیکــەی (٨٤) هەشــتاو چــوار کیلۆمەتر. {بڕوانە: بەرگی/١، لاپەڕە: ٢٢٤، ژمارە: ٧٣}.

١٢- **کورت‌و پوخت:**

آ- رێبـوار ئەگـەر نیـازی مانـەوەی نـەبوو لەشـوێنێ، هـەتا سـەفەرەکەی تـەواو دەبـێ، مـافی کورتکردنـەوەو کۆکردنـەوەی نوێـژی هەیـە، بـا ساڵێ، یـا زیاتریشی پێ بچێ، وەك یەکێ لەدەریاوە بە پاپۆڕ بڕوا بۆ وڵاتی دوور.

بـ- ئەگـەر لەشـوێنێ مایـەوە هـەتا نـۆزدە رۆژ بـۆی هەیـە نوێـژ، کۆ یـا کورت بکاتەوە، یا کۆشی بکاتەوەو کورتیشی بکاتەوە.

١٣- ئـەم باسـی ژمـارە (٢١) بیـستو یەکـە بریتییـە لـە (٤٦٨ — ٤٥١ = ١٧) حەڤدە فەرموودە.

## ٢٢- باسی نوێژی هەینی
## بابُ: صَلاَةِ الجُمُعَةِ

{بڕوانــە: تــاج/١، زنجـیرە: ١٢٩ هـەتا زنجـیرە: ١٥١ لـەژمارە: ٨١٩ وە هـەتا ژمارە: ٨٨٣} + {فیقهی ئاسان بەرگی یەکەم لەزنجیرە: ٧٧ وە هەتا زنجیرە: ٨٨، لەلاپەڕە: ٢٤٤ وە هەتا لاپەڕە: ٢٥٧ چاپی تەهران (نشر إحسان)}.

٤٦٩ – عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ) {أَنَّهُمَـا سَـمِعَا رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ –عَلَى أَعْوَادِ مِنْبرِهِ– "لَيَنْتَهِـيَنَّ أَقْـوَامٌ عَـنْ وَدْعِهِمُ اَلْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اَللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُـمَّ لَيَكُـونُنَّ مِـنَ اَلْغَـافِلِينَ}. رَوَاهُ

{پوختەی موسلیم/٤٢٦ = ١٩٩٩ شیحا = مسلم/٨٦٥}:

حەکەمی کوڕی میناء (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) بۆیانگێڕامەوە، فەرموویان: گوێمان لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چڵەدارەکانی دوانگەکەی خۆی دەیفەرموو: (ئەو کەسانەی کە نوێژی هەینی ناکەن، یان دەبێ واز لەم کارە ناپەسەندەیان بهێنن، یاخود خودا دڵیان مۆر دەکا، ئەنجا بەرە بەرە بێ ئاگاو نابەڵەد دەبن لەدین و لە ئایین و لەڕێ و بەرنامەی ڕەهبەر دوور دەکەونەوە، وە بەرە بەرەو وردە وردە ئەم کارەیان سەردەکێشێ بۆ بێباوەڕی و بێ ئایینی. خودا پەنامان بدا). {تاج/١، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ٨٢٢، لاپەڕە: ٤٠٠ چاپی چوارەم}

٤٧٠- وَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ اَلْأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ اَلْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَنْصَرِفُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ بِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: {كُنَّا نَجْمَعُ مَعَهُ إِذَا زَالَتِ اَلشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ، نَتَتَبَّعُ اَلْفَيْءَ}.

{بوخاری/٤١٦٨. پوختەی موسلیم/٤٠٧ = ١٩٨٩ شیحا = ٨١٦}:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخزمەتی پێغەمبەردا، نوێژی هەینیمان لەپشتیەوە بەکۆمەڵی دەکرد، کە دەگەڕاینەوە بۆماڵەوە هێشتا دیوارەکان ئەوەندە سێبەریان نەبوو، کە لەسێبەری دیوارەکانەوە بڕۆین!).
ئەمە گفتەی بوخارییە، لەپوختەی موسلیمیشدا، ژمارە: ٤٠٧ ئاوایە:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستوورمان وابوو، ئەوکاتە نوێژی هەینیمان دەکرد، کەخۆر بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا، کاتێ لەپاش تەواوبوونی نوێژی هەینی دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بەحاڵ سێبەر

هەبوو، بەزۆر خۆمان تێ دەترنجاند، سێبەرەکە ئەوەندە نەبوو، کە بەئاسایی پیادا بڕۆین). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ٨٤٢}.

(ڕوونکردنەوە):

١- کاتی نوێژی هەینی ڕێك کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، کاتێ نوێژی نیوەڕۆ دەبێ، نوێژی هەینیش دەبێ، وەهەتا نوێژی نیوەڕۆیش بمێنێ، نوێژی هەینیش دەمێنێ.

٢- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی تەواوی: سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعە، ئامادەی غەزای حودەیبییە بووە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودیی بووە، کەناوداره بە (بیعَة الرِّضوَان) کە لەحودەیبییە کرا، حەفتاو حەوت فەرموودەی هەیە، شازدەیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، (٢١) بیستو یەکیان وان لەبوخاریدا، بیستو پێنجیان وان لە موسلیمدا، سەرجەمی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا دەکاتە: (١٦+٥+٩ = ٣٠) سیی فەرموودە.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، پیاوێکی ئازای تیرئەندازی تیژڕەو بوو، لەڕاکردندا وڵاخی بەرزەی بەجێ دەهێشت، پیاوێکی بەهرەمەندی خێرکەر بوو، کۆمەڵەی فەرموودە زانەگەورەکان، کەناودارن بە (الجماعة) فەرموودەکانی سەلەمەیان گێڕاوەتەوە، وەك: شافیعیو پێشەوا ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائیو بەیهەقیو دارە قوطنیو ئیبنو ماجەو ...تاد. لەڕۆژی پەیمانی خۆشنووديدا، سێجار پەیمان لەگەڵ پێغەمبەردا دەبەستێ: لەسەرەتای خەڵکەوەو لەناوەڕاستەوەو لەدوا دوایانەوە، دەڵێن: گورگ قسەی لەگەڵدا کردووە، سەلەمە دەفەرموێ:

(لەپێش ئیسلامبوونمدا، جارێ گورگێ ئاسکێکی ڕفاند، منیش نیشتمە سەریو ئاسکەکەم لێی سەندەوە، گورگەکە: پێی گوتم: خانە خراپ! چیتە بەسەرمنەوە، ڕزقم دەبڕی، خۆ ئەمە ماڵی تۆ نییە، ڕزقو ڕۆژییەکە، خودا

رەخساندوویەتی بۆمن، کەچی تۆ لێم دەسەنیتەوە، منیش گوتم: ئەی بەندەکانی خودا! بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە، خۆ ئەوەتە گورگ قسە دەکا!!

کەچی گورگەکە گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا، وا لەناو ئەو بنکە دارخورمایانەدا، بانگتان دەکا بۆسەر دینی هەق و خواپەرستی راست و دروست، کەچی ئێوە هێشتا هەردەست لەبتپەرستی هەڵناگرن!!

ئیتر منیش رێك چووم موسوڵمان بووم).

کوڕەکەی سەلەمە دەیفەرموو: سەلەمەی باوکم قەت درۆی نەکردووە، سەلەمە خۆی دەیفەرموو: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی حەوت غەزابووم، لەحەوت غەزای تریشدا بەشداریکردووە. سەلەمە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لەمەدینە، لەساڵی حەفتاو چواری کۆچیدا بەمردنی خودا مردووە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ). {تجریدی بوخاری/١، لاپەڕە:١١٣ چاپی یەکەم ژمارە: ٩٠ = ١٠٩ فتح الباری + عینی/٢، لاپەڕە: ١٥٣ + پوختەی موسلیم ژمارە: ١١٧٦ = ٤٦٥٤ مسلم/شیحا + ژمارە: ١١٨٨ + ژمارە: ١١٩١ + ژمارە: ١١٤٤، ١١٤٥}.

٤٧١- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {مَا كُنَّا نَقِيلُ وَلَا نَتَغَدَّى إِلَّا بَعْدَ اَلْجُمُعَةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بوخاری/٩٣٩. شیحا/١٩٨٨}:

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا نوێژی هەینیمان نەکردایە، نە سەرخەوی پێش نیوەڕۆمان دەکردو نەنانی بەرچاییمان دەخوارد).

(روونکردنەوە):

١- نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە کە نوێژی هەینی لەسەرەتای کاتەوە بکرێ خێرترە،

مالیكو ئەبو حەنیفەو شافیعیو جەماوەری زاناكان، لە هاوەڵانو پەیڕەوانو زانایانی پاش ئەوانیش دەفەرموون: سەرەتای كاتی نوێژی هەینی پاش لادانی خۆرە بەدیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان، كە لەزاراوی شەرعدا بەمە دەگوترێ (لەپاش زەوال) وەئەم فەرموودەی سەهلە ئاوا تەئویل دەكەن: كەتەنیا لەرۆژی هەینیدا ئەم دووشتە دوادەخەن بۆ پاش نوێژی هەینی. قسەی نەوەوی تەواو.

٢- سەهل خۆیو سەعدی باوكی لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، سەهل لەگەورە پیاوانی هاوەڵانە، لەپێشا ناوی (حەزەن) بووە، واتە: هەڵەتی سەخت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش ئیسلام بوون ناوەكەی گۆڕیو ناوی نا (سەهل) واتە: خۆشو ئاسانو دەشت.

سەهل ئەنصارییە، سەدو سیو هەشت فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە (٣٩) سیو نۆ فەرموودەی لەصەحیحی بوخاریدا هەیە، یان (٤١) چلو یەك فەرموودە، زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، لەنەوەدو یەكی كۆچیدا لەمەدینە بەمەرگی خودا مردووە، كاتێ پێغەمبەر مردووە، پازدە ساڵ بووە، ئیمامی زوهری فەقێی بووە، یەكێ بووە لەو هاورێ نازدارانەی پێغەمبەر، كە حەججاجی ئەقەفی گەڕی پێ دەكردنو ئازاری دەدان. {بڕوانە: پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/١٩٢/١، ژمارە: ١٧٤ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٥٩}.

٣- سەعدی كوڕی مالیكی كوڕی خالید، باوكی سەهلی كوڕی سەعدی ئەلساعیدییە، خۆی ئامادەكرد كە لەخزمەتی پێغەمبەردا بچێ بۆ غەزای بەدر، لەرێ نەخۆش دەكەوێو دەمرێ، راسپێرینامەكەی لەپاشكۆی كۆپانی ولاخەكەی دەنووسێ، رادەسپێرێ: كە ولاخەكەی بەكۆپانەكەیەوە بۆ پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتالانی بەدر پشكی بۆی داناو، راشیگەیاند كە پاداشی تەواوی

هاوبەشکەرانی غەزای بەدری بۆ هەیە لەلای خودا، دیارە کە ئەو پشکەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داینا بۆ سەعد، درا بە کەلەپووربەرەکانی.

٤٧٢- وَعَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ اَلشَّامِ، فَانْفَتَلَ اَلنَّاسُ إِلَيْهَا، حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{تجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ٤٦٨ = ژمارە: ٤٩٤ = ٩٣٦، ٢٠٥٨، ٢٠٦٤، ٤٨٩٩ فتح الباری شرح صحیح البخاری. پوختەی موسلیم/٤٢١ = ١٩٩٤ شیحا = مسلم/٨٦٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی هەینیدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، خەریکبوو وتاری نوێژی هەینی دەخوێندەوە، لەوکاتەدا لەشامەوە، کاروانێ هات، دەهۆڵو زوڕنا لەپێشیەوە بوو، هەتا مەردووم بزانێ کەوا کاروانەکە گەیشتەجێ، ئیتر خەڵکەکە وتارەکەیان بەجێهێشتو لەمزگەوت دەرچوونو دەرپەڕین بۆلای کاروانەکە، بۆ شت کڕینو سەوداو مامەڵەکردن، تەنها دوازدە کەس لەخزمەتی پێغەمبەردا مانەوە، جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا – الجمعة/١١}.

واتە: ئەوانەی کە لەدەوری تۆ بوون، کاتێ چاویان بە بازرگانیو سەودداو مامەڵەو ئەوکارە بێهودەیە کەوت، کەبریتی بوو لەو دەهۆڵو زوڕنایە کە لەکاتی واداو لەزۆر کاتی تریشدا، ئادەمیزاد خەریك دەکاو، لەبەندەیی کردنی ساخ بۆ خودای مەزن، دووری دەخاتەوە، ئەوانە لەم کاتەدا دەووری تۆیان چۆڵ کردو بڵاوەیان لێ کردو چوون بۆ لای ئەو بەزمو ڕەزمە).

{بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٤١٦٨}.

٤٧٣- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ اَلْجُمُعَةِ وَغَيْرِهَا فَلْيُضِفْ إِلَيْهَا أُخْرَى، وَقَدْ تَمَّتْ صَلَاتُهُ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ، لَكِنْ قَوَّى أَبُو حَاتِمٍ إِرْسَالَهُ.

{صحيح الجامع: ٥٩٩}:

**ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ فریای یەك ڕکات کەوت لەهەر نوێژێ، ئەوە فریای ئەو نوێژە بەتەواوی کەوتووە، ئیتر جیاوازی نییە لەمەدا لەنێوانی نوێژی هەینیو نوێژی تردا، بەمەرجێ نوێژەکە چەند ڕکاتی مابوو، بیانکاو بیانخاتە سەر ئەو تاقە ڕکاتە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٢و ٨٥٣}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: نەسائیو ئیبنو ماجەو دارە قوطنی گێڕاویانەتەوە، ئەمە گفتەی دارە قوطنییە، ڕشتەکەی تەندروستە، بەڵام ئەبوحاتەم ئەوە بەهێز دەکا کەمورسەل بێ.**

**٢- گەرچی لەڕاڤەنامەکانا، ڕەخنەی زۆر لەدەقو ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لەبنەڕەتدا گیراوە، بەڵام مەبەست لێی ئەوەیە کە لە ژمارە: (١٧٣)دا، لەپێشەوە ڕابورد، تکایە سەرەنجی ئەوێ بدەرەوە.**

٤٧٤- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ قَائِمًا، فَمَنْ أَنْبَأَكَ. أَنَّهُ كَانَ يَخْطُبُ جَالِسًا، فَقَدْ كَذَبَ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی مسلم ٤١٦ = ١٩٩٣ شیحا = ٨٦٢}:

**جابیری کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ وتاری نوێژی هەینی دەدا،**

بەپێوە وتاری دەدا، ئەوجا کەمێ دادەنیشت، ئەوجا هەڵدەسایەوە سەرپێ‌و وتاری دووەمیشی بەپێوە دەدا، جا ئەوەی هەواڵ بدا بەتۆ کە گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی هەینی بەدانیشتنەوە داوە، ئەوە درۆ دەکات، سوێندم بەخودا زیاتر لەدوو هەزار نوێژم بەجەماعەت لەپشت پێغەمبەرەوە کردووە، شتی وام نەدیوە کە پێغەمبەر بەدانیشتنەوە وتاری دابێ!).

٤٧٥- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا خَطَبَ، احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ، وَيَقُولُ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ اَلْحَدِيثِ كِتَابُ اَللَّهِ، وَخَيْرَ اَلْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ اَلْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ كَانَتْ خُطْبَةُ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ: {يَحْمَدُ اَللَّهَ وَيُثْنِي عَلَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ عَلَى إِثْرِ ذَلِكَ، وَقَدْ عَلَا صَوْتُهُ}. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {مَنْ يَهْدِهِ اَللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ}. وَلِلنَّسَائِيِّ: {وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي اَلنَّارِ}.

{پوختەی موسلیم ٤١٠ = شیحا ٢٠٠٢}:

جابیری کوڕەی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ وتاری دەدا، چاوی سوور هەڵدەگەڕا دەنگی بەرز دەکردەوە، تەواو تووڕە بوو، بەشێوەیەکی وا دەتگوت ترسێنەر (مونذیر)ی سوپایەو سوپا دەترسێنێ لە دوژمن‌و دەڵێ: وا سوپای دوژمن سەرلەبەیانی، یاسەر لەئێوارێ بەم زوانە، دەدا بەسەرتانا).

جاروبار لەهەندێ وتاردا، پەنجەی شایەتومان‌و پەنجەی ناوەڕاستی خۆی جووت دەکردو دەیفەرموو: (من‌و قیامەت ئاوا بەیەکەوە هاتووین، جیاوازیی نێوانی درێژی‌و کورتی ئەم دوو پەنجەیە چەندە لەیەکتری،

جیاوازیی بەرودوایی نێوانی هاتنی منو نێوانی هاتنی قیامەتیش ئەوەندەیە!).

ئەوجا دەیفەرموو: (لەپاش ئەمە بزانن کەباشترین فەرمایشت، نامەی خودایە، کە قورئانی پیرۆزە، وەباشترین ڕێبازو بەرنامە، بەرنامەو ڕێبازگەی موحەممەدە، وەخراپترین کاروبارو فەرمانیش لەئاییندا، ئەو کاروبارانەن کەنوێباوو تازە قەڵاو داتاشراون، وەهەموو کارێکی ناشایستەیش سەرگەردانیو گومڕاییە).

لەپاشا دەیفەرموو: (من بۆ هەموو موسوڵمانێ لەخودی خۆی لەپێشترم بۆی! چونکە دەیخەمە سەر ڕێگەی ڕزگاریی ئێجگاریی، بەڵام ئەوەی کەبمرێو داراییو سامانی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوەماڵو سامانەکەی بۆ کەسوکارەکەیەتی، وەڵێ ئەوەی کەبمرێو قەرزار بێ، یاخود خێزانێکی بێ داڵدەی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوە قەرزەکەی ڕووبەڕووی من دەبێتەوەو خۆم دەیبژێرمەوە بۆی، ئەگەر ماڵی لەپاش بەجی نەمابوو، وەهەروەها سەرپەرشتیو سەرەوکاریی خێزانەکەیشی لەسەر منە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٧} .

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٢٠٠٣ مسلم/شیحا) جابیر دەفەرموێ: وتاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هی نوێژی هەینی، لەپێشا سوپاسو ستایشی خودای دەکرد، ئەوجا دەنگی هەڵدەبڕیو دەیفەرموو: (لەپاش ئەمە بزانن کەباشترین... تادوایی فەرموودەکە).

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٢٠٠٤ مسلم/شیحا)دا، دەفەرموێ: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە وتاری بۆ جەماوەر دەدا، سوپاسو ستایشی خودای گەورەی لەسەرەتاوە دەکردن بەشێوەیێ وا کە ئەو سوپاسو ستایشە شایستەی زاتی خواوەندی مەزن بێ، ئەوجا دەیفەرموو: «أَمَّا بَعْدُ مَنْ

يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَخَيْرُ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ». هەتا کۆتایی فەرموودەکە، کە لەژمارە (٤٧٥)دا رابورد. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٠٩ = ٢٠٠٥ شیحا + تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٨}.

لەگێڕانەوەیەکی پێشەوا نەسائیدا لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە، دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕاستترین فەرمایشت فەرمایشتی خودای گەورەیە، کە قورئانی پیرۆزە، وەجوانترین هیدایەتو ڕێنموونیش هیدایەتو ڕێنمایی موحەممەدە، کە بەندەو پێغەمبەری خودایە، وەخراپترین کاروباریش ئەو کاروبارانەیە، کە لەئاییندا تازە هەڵانو لەسەردەمی مندا نەبوونو لەپاش من زانایانی ئیسلام رەزایان لەسەریان نەبووە، وەهەموو تازەهەڵایەکی وایش کارێ ناشایستەیە، وەهەموو شتێکی ناشایستەش سەرگەردانیو گومڕاییە، دیارە کە هەموو گومڕایەکیش، ئەنجامی ناو ئاگری دۆزەخە. خوا پەنامان بدا). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٤ چاپی چوارەم}.

٤٧٦- وَعَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {إِنَّ طُولَ صَلَاةِ اَلرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٤١١ = ٢٠٠٦ شیحا = مسلم ٨٦٩}:

ئەبو وائیل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ عەمماری کوڕی یاسیر (رەزای خودایان لێ بێ) وتارێکی کورتو پوختو ڕەوانو دلگیری خوێندەوە بۆمان، جاکە لەدوانگەکە دابەزی، گوتمان: ئەی ئەبو یەقظان! ئەی باوکی یەقزان! بەڕاستی وتارەکەت دلگیرو ڕێكوپێكو قەدبڕ بوو، هەروا پڕ واتاو پڕمەعنا بوو، خۆزگایە کەمێ درێژت دەکردەوەو تۆزێ زیاتر درێژەت پێ دەدا!!

فەرمووی: بۆیە وەهام کرد چونکە بۆخۆم ژنەوتوومە لە خۆشەویست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ) (نوێژی درێژ، کە قورئانی زۆری تیادا بخوێندرێ‌و وتاری کورت‌و پوختی پیاو، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو وتاربێژە پیاوێکی زاناو داناو شارەزایە لەشەرعا، کەواتە: درێژە بەنوێژ بدەن‌و وتار کورت بکەنەوە، بشزانن کە هەندێ پەخشان‌و قسەی نەستەق‌و وتاری ڕەوان، وەك جادوو وان، کار لەدڵ‌و مێشك‌و هەستی ئادەمیزاد دەکەن‌و کاری جوانی لاجوانتر دەکەن!). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٦}.

(ڕوونکردنەوە):

عەمماری کوڕی یاسیر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی‌و لە دایکی بێ) ناوی دایکی سومەییەیە، خۆی‌و باوکی‌و دایکی هەرسێکیان هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەم بنەماڵەیە ئەشکەنجەی زۆریان چەشتووە لەپێناوی ئیسلامدا، هەرسێکیان لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانن، عەممار کۆچی کرد بۆ وڵاتی حەبەشە، یەکێکە لەو موسوڵمانانە، کە بەرەو دوو ڕووگە (قیبلە) نوێژی کردووە، کۆچی کردووە بۆ مەدینە، ئامادەی هەموو نەبەردو شەڕگەو غەزەواتەکان بووە، لەغەزای بەدردا دلێرییەکی بەرچاوی نواند، هەروا لەنەبەردی یەمامەدا کە لە دژی موسەیلەمەی کەززاب بوو، لەم نەبەردەدا گوێی پەڕی. لەبوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، دایکی عەممار ئەبو جەهلی نەعلەتی، نێزەیەکی ماڵی بەشەرمیداو لەپێناوی ئیسلامدا شەهیدی کرد.

واقیدی دەفەرموێ: لەسەر فەرمایشتی ئیستیعابی ئیبنی عەبدولبەرر: (عەممار پیاوێکی باڵابەرزی چاونەخشینی ناوشان پان بوو). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەسنی عەمماردا دەفەرموێ: (بەهەشت تامەزرۆی دیداری عەلی‌و عەممارو سەلمان‌و بیلالە). تەمەنی حەزرەتی عەممار لە نەوەد زیاتر بوو، لەشەڕگەی سەفیندا شەهید بوو، کە ئەم جەنگە

گەورەیە لەنێوانی پێشەوا عەلی‌و موعاوییەدا، لەساڵی (٣٧) سیی‌و حەوتی کۆچیدا قەوما.

گەڵێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای خێزانی یاسیری باوکی عەممارەوە رەت دەبوو، کەخۆی‌و سومەییەی هاوسەری‌و عەمماری کوڕی بوون، وە ئەشکەنجە دەدران لەسەر ئیسلام، دڵی دەدانەوەو موژدەی بەهەشتی پێیان دەداو دەیفەرموو: (خۆگر بن، ئەی خانەوادەی یاسیر! موژدەتان لێ بێ، کە لەبەهەشتا بەیەکتری شاد دەبنەوە!).

٤٧٧- وَعَنْ أُمِّ هِشَامٍ بِنْتِ حَارِثَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {مَا أَخَذْتُ: "ق وَالْقُرْآنِ اَلْمَجِيدِ"، إِلَّا عَنْ لِسَانِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْرَؤُهَا كُلَّ جُمُعَةٍ عَلَى اَلْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ اَلنَّاسَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٤١٣ = ٢٠١٢ شیحا = مسلم ٨٧٣}:

ئوم هیشامی کچی حاریثەی کوڕی نوعمان (رەزای خودای لێ بێ) بۆ چەسپانی زرنگی‌و نزیکی خۆی لەماڵی پێغەمبەرەوە، فەرمووی: بۆ ماوەی نزیکەی دوو ساڵ، سەرتەندووری ماڵی ئێمەو سەرتەندووری ماڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەك بوو، سوورەتی {ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ - ق/١}م لەدەمی پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر کردووە، چونکە هەموو رۆژی هەینییەك لەسەر دوانگە، لەوتاری نوێژی هەینیدا دەیخوێندەوە، لەوکاتەدا کەوتاری دەدا بۆ جەماوەرەکە. {تاج/١، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ٨٤٩}.

(روونکردنەوە):

ئوم هیشام ئەنصارییە، لەکۆمەڵەی بەیعەتولرِیضوانە، هاوسەری عمماری کوڕی حیحاب بوو، بۆ ماوەی ساڵێ زیاتر دراوسێی پێغەمبەر بووە، وەك لە فەرموودەکەوە دەردەکەوێ.

٤٧٨- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ تَكَلَّمَ يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَهُوَ كَمَثَلِ اَلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا، وَاَلَّذِي يَقُولُ لَهُ: أَنْصِتْ، لَيْسَتْ لَهُ جُمُعَةٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، بِإِسْنَادٍ لَا بَأْسَ بِهِ. وَهُوَ يُفَسِّرُ. حَدِيثَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" مَرْفُوعًا.

{ضعيف الترغيب والترهيب: ٤٤٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەڕۆژی هەینیدا، لەو کاتەدا، کەپێشنوێژ وتاری هەینی دەدا، قسە بکا، ئەوە ڕێك وەك کەرێ وایە، کەباری کتێب بێ، چۆن ئەو کەرە، لە هەلگرتنی ئەو کتێبانەدا، بێجگە لەئەرك‌و ماندوویی، هیچی تری پی نابڕێ، ئەویش ئاوا، لەئامادەبوونی ئەو وتارو نوێژە، جگە لەئەرکی هاتن‌و چوون هیچی تری بۆ نامێنێتەوە، تەنانەت قسەکردن لەوکاتەدا ئەوەندە خراپە، ئەگەر کەسێ بەکەسێکی تر بڵێ، کە لەکاتی وتاری هەینیدا قسە دەکا، ئەگەر پێی بڵێ: وسبە، قسە مەکە، ئەوە خۆیشی قسەی کردووەو خێری ئەو جومعەیەی بۆ دانانرێ).

دانەر حافیظی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیمامی ئەحمەد بەڕشتەیەکی نیمچە باش گێڕاویەتەوە، ئەم فەرموودەیە ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەم فەرموودە مەرفووعەی صەحیحەین کە دەفەرمووێ:

٤٧٩- {إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ وَالْإِمَامِ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ}.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٤٩٢ = ٩٣٤ فتح الباری = پوختەی موسلیم ٤١٩ = ١٩٦٢ شیحا = مسلم ٨٥١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژی هەینی لەوکاتەدا کە پێشنوێژ

وتـار دەخوێنێتـەوە، ئەگـەر بەهاونـشینی خـۆت لـەریزی نوێژەكـەدا بلێیـت: وسبە، بێ دەنگ بە، ئەوە خۆشت وەك ئەو قسەی نابـەجات كـردووە، كەشتی واو قسەی بێهـوودە لـەكاتی وادا، پاداشـی نوێژەكـە پـووچ دەكاتـەوە). {تـاج/١، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ٨٦٨}.

٤٨٠- وَعَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: {دَخَلَ رَجُلٌ يَوْمَ اَلْجُمُعَـةِ، وَالنَّبِـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) يَخْطُـبُ. فَقَـالَ: "صَـلَّيْتَ؟" قَـالَ: لَـا. قَـالَ: "قُـمْ فَـصَلِّ رَكْعَتَيْنِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری = پوختـەی بوخـاری/١، ژمـارە: ٤٩٠ = ٩٣٠، ٩٣١، ١١٦٦ فتح الباری شرح صحيح البخاري. پوختەی موسلیم ٤١٨ = ٢٠٢٠ شیحا = ٨٧٥ مسلم}:

جـابیری كـوڕی عەبـدوڵڵا (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: رۆژێكـی هـەینی لەوكاتـەدا كـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وتـاری دەدا، سولەیكی غەطەفانی هاتو، بەرلەوە كەنوێژی سلاوی مزگـەوت بكـا دانیـشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی سولەیك! ئایـا دوو ركاتـە سـوننەتەكەت كـرد؟) فـەرمووی: نەخـەیر، ئـەی پیغەمبـەری خـودا! فەرمووی: (دە هەڵسە دووركات نوێژی سـوننەتی مزگـەوت بكـە). سـولەیكیش هەڵسایەوە دووركـات نوێـژی كـردو فەرمانەكـەی پێغەمبـەری بـەجی هێنـا). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ٨٦٦}.

٤٨١- وَعَنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ" (رضـي الله عنهمـا) {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ، وَالْمُنَافِقِينَ} رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم ٤٠٣ = ٢٠٢٨ شیحا = مسلم ٨٧٩}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوكی بێ) فەرمووی: زۆرینـەی كات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێـژی بـەیانی رۆژی هەینیـدا، لـەركاتی یەكـەما، لـەپاش خوێنـدنی سـوورەتی فاتیحـە، سـوورەتی (الم تَنْزِيـلُ

السَّجْدَة)ی دەخوێند، وە لەرکاتی دووەمدا، سوورەتی {هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ}ی دەخوێند، هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆرجاران، لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، لەرکاتی یەکەمی نوێژی هەینیدا، سوورەتی جومعەی دەخوێند، وە لەرکاتی دووەمیدا سوورەتی مونافیقینی دەخوێند). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

٤٨٢- وَلَهُ: عَنِ اَلنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ: {كَانَ يَقْرَأُ فِي اَلْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ: بِـ "سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ اَلْأَعْلَى"، وَ "هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ اَلْغَاشِيَةِ"}.

{پوختەی موسلیم ٤٢٢ = مسلم/شیحا ٢٠٢٥ = مسلم/٨٧٨}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی هەردوو جەژنەکانو، لەنوێژی هەینیدا، سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} و سوورەتی {وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ}ی دەخوێند، فەرمووی: ئەگەر جەژنیش رێکەوتی رۆژی هەینی بکردایە، ئەوە لەهەردوو نوێژەکاندا، هەر ئەم دوو سوورەتەی دەخوێند). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٥}.

(روونکردنەوە):

نوعمانی کوڕی بەشیر خۆیو باوکیو دایکی لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، ئەنصارییە، لەهۆزی خەزرەجە، واتە: خەزرەجییە ئەوسی نییە، چونکە زوربەی ئەنصارەکان لەم دوو هۆزە بوون، لەهۆزی خەزرەجو لەهۆزی ئەوس.

دایکی نوعمان ناوی عەمرە، خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەیە، واتە: نوعمان خوشکەزای عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەیە، کە یەکێ بوو لە فەرمانـدە ناودارەکانی ئیسلام، نوعمان یەکەم منداڵی ئەنصارە، کە لەپاش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە لەدایك بووە، سەدو چواردە فەرموودەی هەیە،

لەدەستەو كۆمەڵەی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر بوو، سەركاری ئیبنو زوبەیر بوو لەسەر شاری حیمص، لەو ماوەدا كە خەڵكی حیمص هەڵگەڕانەوە ئەو هەڵهات، بەڵام لەرۆژەكەی واسیطدا كوژراو شەهید بوو، لەساڵی شەستو پێنجی كۆچیدا بوو، تەمەنی دەوری شەستو سێ ساڵ بوو (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

٤٨٣- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّى النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْعِيدَ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: "مَنْ شَاءَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُصَلِّ"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ خُزَيْمَةَ.

{صحيح، سُنَنُ أبي داود/١٠٧٠. أحمد رقم: ١٩٥٣٣. أبو داود/١٠٧٠. ابن ماجة/١٣١٠. نسائي ١٩٤/٣ وفي الكبرى/١٨٠٦. ابن خزيمة/١٤٦٤}:

زەیدی كوڕی ئەرقەم (رەزای خودا لەخۆی و لەباوكی بێ) فەرمووی: رۆژێكی هەینی، رێكەوتی رۆژی جەژنی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرلەبەیانی نوێژی جەژنی لەكاتی خۆیدا بۆكردین، ئەوجا سەبارەت بەكردنی نوێژی هەینی ئەو رۆژە داینا بەمۆڵەتو فەرمووی: (ئارەزووی خۆتانە، ئەگەر حەزدەكەن نوێژی هەینیش لەكاتی خۆیدا، لەنیوەڕۆدا بكەن، ئەگەر مەیلیش دەكەن نوێژی هەینی مەكەن، بەڵام دەبێ نوێژی نیوەڕۆ بكەن!).

لەگێڕانەوەیەكی ئەبو داووددا لە ئەبو هورەیرەوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەم رۆژەتانا دوو جەژن كۆبوونەتەوە، جا هەركەسێ ئارەزووی هەیە، ئەواكردنی ئەم نوێژی جەژنە بەكۆمەڵی، برێتی كردنی نوێژی هەینیش دەكەوێ بۆی، بەڵام ئێمە نوێژی هەینیش دەكەین).

(ڕوونكردنەوە):

١- مەزهەبی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: ئەگەر ڕۆژی جەژن ڕێكەوتی ڕۆژی هەینی كرد، ئەوە پێویستە لەسەر هەموو كەسێ كە نوێژی هەینی لەسەربێ، نوێژی هەینی بكا، ئەگەر نەیكا تەركی واجیبی كردووە. زۆرینەی شەرعزانەكان ئەم ڕایەی شافیعی پەسەند دەكەن.

٢- هەندێ دەڵێن: ئەگەر كەسێ نوێژی جەژنی كرد، مۆڵەتی هەیە كە نوێژی هەینی ئەو ڕۆژە نەكا، بەڵام دەبێ نوێژی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بكات.

٤٨٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا} رَوَاهُ مُسْلِم.

{پوختەی موسلیم/٤٢٣ = ٢٠٣٤ شیحا = مسلم/٨٨١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ سوننەتی پاش كردنی نوێژی هەینی دەكەن، چوار ركات بكەن، ئیتر بەدوو سڵاوبێ، یا بەیەك سڵاو دەبێ). لەگێڕانەوەیەكدا: سوهەیل فەرمووی: ئەگەر لەبەرشتێ پەلەت بوو، ئەوا لەمزگەوت دوو ركاتیان بكەو، لەماڵەوەیشەوە، كە گەڕایتەوە بۆ ماڵەوە دووركات بكە). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٨٥٦ چاپی چوارەم}.

٤٨٥- وَعَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ قَالَ لَهُ: {إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ، حَتَّى تُكَلِّمَ أَوْ تَخْرُجَ، فَإِنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَمَرَنَا بِذَلِكَ: أَنْ لَا نُوصِلَ صَلَاةً بِصَلَاةٍ حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٢٥ = شیحا ٢٠٣٩ = مسلم/٨٨٣}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیەیە لە پوختەی موسلیما:

عومەری كوڕی عەطاء فەرمووی: نافیعی كوڕی جوبەیر منی نارد بۆلای سائیبی كوڕی یەزید، كە خوشكەزای نەمیربوو، كە لەزمانی نافیعەوە لە سائیب بپرسم: سەبارەت بەشتێ كە موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیان، لەنوێژدا

له سائیبی بینیوەو لەبارەی ئەو شتەوە، موعاوییە ئامۆژگارییەکی سائیبی کردووە، ئەم رووداوە چییەو چۆنە؟

عومەر فەرمووی: کە لەم بارەیەوە لە سائیبم پرسی، سائیب فەرمووی: بەڵێ باشە، رۆژێ لەگەڵ موعاوییەدا، کاتێ کە جێگەنشین بوو، لەنوێژگا تایبەتییەکەی خۆیدا، کە لەناو مزگەوتا بوو کە پێیان دەگوت (مَقْصورةُ الأُمَرَاء: هۆدەی تایبەتی فەرمانڕەواکان) نوێژی هەینیمان کرد، کاتێ پێشنوێژ سلاوی نوێژی هەینی دایەوە، ئێمەیش سلاومان دایەوە، من هەڵسام لەشوێنەکەی خۆما، هەر لەناو مەقصوورەکەدا، سوننەتی پاش نوێژی هەینیم کرد، جاکاتێ موعاوییە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ناردی بەشوێنما، کەچووم فەرمووی: جارێ تر شتی وا مەکە، کە سوننەت بەبێ ناوبڕ، بلکێنی بەنوێژی فەرزەوە، کاتێ نوێژی هەینی دەکەی، نوێژی تری پێوەمەلکێنە، هەتا قسەیێ دەکەی، یا شوێن نوێژەکە بەجێ دەهێڵی). چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کردووە بەوە: کە نوێژی سوننەت نەنووسێنین بەنوێژی فەرزەوە، هەتا لەو بەینەدا، قسەیێ دەکەین یاجێ دەگۆڕین!).

(ڕوونکردنەوە):

بەم شتانەی خوارەوە ناوبڕ دروست دەبێ:

١- بەقسەکردن، هەرجۆرە قسەیێ بێ دەبێ.

٢- بەجێگۆڕکێ، با لەناو مزگەوتیشا بێ.

٣- بەخوێندنی ویردو قورئانو شتی تری وا.

٤- بەچوونەوە بۆ ماڵەوە.

٤٨٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنِ اغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ، حَتَّى

يَفْرُغَ اَلْإِمَامُ مِنْ خُطْبَتِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَعَهُ: غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ اَلْأُخْرَى، وَفَضْلُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٢٠ = شیحا/١٩٨٤ = مسلم/٨٥٧}:

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەڕۆژی هەینیدا خۆی بشۆرێ، ئەوجا بچێ بۆ نوێژی هەینی، لەوێ ئەوەندەی کەخودا لەچارەی نووسیوە، نوێژی سوننەت بکا، وەك نوێژی سلاّوی دەسنوێژو سلاّوی مزگەوتو سوننەتی چێشتەنگاو ئەگەر لەوەپێش نەیکردبوو، وە نوێژی سوننەتی ئاسایی، جاکاتێ پێشنوێژ دەست دەکا بەوتار خوێندن ئەو بەخامۆشیو بەدڵ گوێ بگرێ لەوتارەکەی هەتا تەواوی دەکا، ئەوجا نوێژی هەینی بەکۆمەڵی لەپشتیەوە بکا، هەرکەسێ لەرۆژی هەینیدا ئەمەبکا، خودا لەگوناهی نێوانی ئەم هەینییەیو هەینییەکەی تری خۆش دەبێ، لەگەڵ گوناهی سێ رۆژی تریدا!!).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٤٣ و ١٤٤ بەتەواوی لەبارەی خۆشۆردنی رۆژی هەینییەوە.**

**٢- ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

**٣- بەپێی برگەی (ئەوەندەی کەخودا لەچارەی نووسیوە، نوێژی سوننەت بکا). نوێژی سوننەتی رووت (واتە: نەوافیلی موطلەق) بێ سنوورەو ژمارەی دیاریکراوی بۆ دانەنراوە، موسوڵمان بەشەوو بەڕۆژ چەندە ئارەزوو دەکا، بانوێژی سوننەت بکا، بەمەرجێ لەکاتی ناباشو لەشوێنی ناباشو لەبارودۆخی ناباشدا نەبێ.**

**٤- خۆشۆردن بۆ نوێژی هەینی سوننەتە.**

٥- دووركاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی هەینی بەر ئەم فەرموودەیە دەکەوێ، چونکە لەپێش وتاردا دەکرێ. ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەمینهاجا بەدەق دەفەرموێ: {وَبَعْدَ الجمعةِ أَرْبَعٌ وَقَبْلَهَا مَاقَبْلَ الظُّهْرِ} خەتیبیش لەموغنی موحتاجا ئاوا شەرحی ئەم دەقە دەکا: لەپاش نوێژی هەینی چوار رکات نوێژ سوننەتە، دوانیان موئەککەدو دامەزراون، دوانیشیان غەیرە موئەککەدن، وەلەپێش نوێژی هەینیشەوە، وەك نیوەرۆ، چوار رکات نوێژی سوننەت هەیە، کەدوو دوو دەکرێن، دوانیان موئەککەدنو دوانیان غەیرە موئەککەدن.

جێگەی داخە کەئەمڕۆ لایەنەکان، بەبێ جیاوازی لەنێوانی عەلمانیو ناعەلمانییاندا، هەموویان بازرگانی بەدوو بەرەکیو بەتێکدانی یەك ریزی کوردەوە دەکەن، ئەمە دروشمی عەلمانییەکانە بەبێ کەمو زیاد:

گوێ مەدە بەهیچ بژی وەك کەرگەل

نەشەرمێ لەخوا، نەترسێ لەگەڵ

لایەنە ناعەلمانییەکانیش ئەمە دروشمیانە:

(خَالِفْ تُعْرَفْ) کە ئەم دروشمە لەم رووداوەدا رەنگ دەداتەوە: دەڵێن عەوامێکی شیعە لەئاخونێکی خۆیان دەپرسێ: ئایا لەنوێژدا چاو بکەمەوە، یاچاو بنووقێنم، ئەویش پێی دەڵێ: تەماشای سوننی بکە، ئەگەر ئەو لەنوێژا چاو دەکاتەوە، تۆ لەنوێژا بەپێچەوانەی ئەوەوە چاو بنووقێنە، خۆ ئەگەر ئەو لەنوێژا چاوی نووقان تۆ چاوت بکەرەوە!

ئێستایش تۆ بۆئەوەی کەبیسەلمێنی کەتۆ بێ مەزهەبی، دەبێ ئەگەر شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) گوتی: نوێژی نیوەرۆ چوار رکاتە، تۆ دەبێ بڵێی دوو رکاتە! وە هەروەها، دەنا تۆ مەلای کتێبی، ئێستایش باوی مەلای سەر کتێب نەماوە، باوی مەلای کۆمپیتەرە، خوا پەنامان بدا لەم سەرگەردانییە. ئامین.

٤٨٧- وَعَنْهُ" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ: {فِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اَللَّهَ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {وَهِيَ سَاعَةٌ خَفِيفَةٌ}.

{تجريدى بوخارى/١، لاپەڕە: ٤٦٨، ژمارە: ٤٩٣ = ٩٣٥، ٥٢٩٤، ٦٤٠٠ فتح البارى = شەرحى صحيحى بوخارى. پوختەى موسليم ژمارە: ٤٠١ = ١٩٦٧ شيحا = مسلم/٨٥٢}:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر كە كەسناو (كونيە)ى ئەبولقاسمە (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (لەڕۆژى هەينيدا، كاژێرێكى تايبەتى واتيادا، كەپێى دەگوترێ ماوەى نزا گيرابوونى رۆژى هەينى، هەر بەندەيەكى موسوڵمان، نێربێ، يامێ، لەوكاتەدا راوەستابێ نوێژبكا، ياخود بەكوڵو بەدڵ لەخودا بپاڕێتەوە، ئيتر لەودەمەدا، داواى هەرشتێ لەخێرى دينو دونيا، لە خوداى گەورە بكا، خودا بۆ دڵى ناكاو ئەوشتەى پێ دەدا).

فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەدەستى ئاماژەى كرد كەئەو ماوەيەى نزاگيرابوونە گەلێ كەمە، هەتا خەڵك مشوورى بخۆنو خۆيانى بۆ ئامادەبكەنو لەكيسى خۆيانى نەدەن). {تاج/١، زنجيرە: ١٥٠، ژمارە: ٨٧٦، ٨٧٩، ٨١٩، ٩٦٧}.

لەگێڕانەوەى ژمارە (١٩٧٠)ى صەحيحى موسليمدا، تەرقيمو تەحقيقو تەخريجى (شێخ خەليل مەئموون شيحا)دا، دەڵێ: (وَهِيَ سَاعَةٌ خَفِيفَةٌ). واتە: ئەوكاتى نزاگيرابوونەى رۆژى هەينييە دەمێكى سووكەڵەى كەمە.

٤٨٨- وَعَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ اَلْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى اَلصَّلَاةُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ، وَرَجَّحَ اَلدَّارَقُطْنِيُّ أَنَّهُ مِنْ قَوْلِ أَبِي بُرْدَةَ.

{پوختەى موسليم ٤٠٢ = ١٩٧٢ شيحا}:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، لێی پرسیم: ئایا سەبارەت بەکاژێرە تایبەتییەکەی ڕۆژی هەینی، کە پاڕانەوەو نزای باشی تیادا گیرادەبێ، شتێکت لەباوکت نەبیستووە لەم بارەیەوە، کە ئەویش لە پێغەمبەری بیستبێ؟

فەرمووی: گوتم: ئەرێ، لەباوکمم بیست دەیفەرموو: (لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (ئەو کاژێرە لەو حەلەوەیە کە پێشنوێژ (وتارخوێن = خطیب) لەسەر دوانگە (مینبەر) دادەنیشێ، هەتا نوێژی هەینی تەواو دەبێ).
{تاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ٨٧٦}.

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە پێشەوا موسلیم گێڕاویەتەوە، بەڵام دارە قوطنی ئەوە بەسەنگین تر دەزانێ، کە ئەم فەرموودەیە مەوقووف بێ لەسەر ئەبو بوردە.

ئیمامی نەوەوی، لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا، لەشەرحی صەحیحی موسلیمدا: ئەم فەرمایشتەی دارە قوطنی بەم شێوەیەی خوارەوە بەرپەرچ دەداتەوە، وە ئەوە بەدروست دادەنێ، کە ئەم فەرموودەیە مەرفووعە نەوەك مەوقووف، نەوەوی دەڵێ:

ئەم بەسەرگرتنەوەو پیاداچوونەوەو استدراکەی دارە قوطنییە، بۆ ئەم فەرموودەیەیە، لەسەر ئەم بنەماو ڕێسا ناسراوەیە کە هەر حەدیسێ بەدوو شێوە ریوایەت کرابوو، وەك مەوقووفیو مەرفووعی، یا مورسەلیو موتتەصیلی، وە نەدەزانرا، کام لایان بەهێزترە، بڕیاری بێ هێزەکەیان دەدرێ، کە مەوقووف بێ، یا مورسەل بێ، ئەم بنەماو ڕێسایە زۆرینەی فەرموودە شوناسەکان پەیڕەوی لێ دەکەن، ئەوجا نەوەوی دەفەرموێ: بەڵام ئەم بۆچوونو رایە یاساو ڕێسایەکی لاوازی نامەقبووڵە، دروست ڕێبازی زانایانی ئوصولو گەورە زانایانی فەرموودە شوناسەکانە، وەك بوخاریو موسلیم، کە

لـەبارودۆخی وادا بڕیـاری مـەرفووعی دەدرێ، هـەروا بڕیـاری موتتەصـیلی دەدرێ.

٤٨٩، ٤٩٠- وَفِي حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ سَلَامٍ عِنْدَ ابْنِ مَاجَهْ. وَجَابِرٍ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ: {أَنَّهَا مَا بَيْنَ صَلَاةِ اَلْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ اَلشَّمْسِ}. وَقَدْ اِخْتُلِفَ فِيهَا عَلَى أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ قَوْلًا، أَمْلَيْتُهَا فِي "شَرْحِ اَلْبُخَارِيِّ".

{صحيح، سنن أبي داود: ١٠٤٨، الصحيح المسند/٢٣٨، ابـن ماجـة/١١٣٩. نسائى ٣/٩٩}:

ئیبنو ماجە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لـە عەبـدوڵڵای کوڕی سـەلامەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەگێڕێتـەوە، هـەروا ئـەبو داوودو نەسـائی (ڕەحمـەتی خودایــان لێ بــێ) لــەجابیری کــوڕی عەبــدوڵڵاوە (ڕەزای خودایــان لێ بــێ) دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوکاژێرە تایبەتـە کـەکاتی گیرابـوون‌و قوبوڵبـوونی نـزاو پاڕانەوەیـە، لـەپاش نوێـژی عەصرەوەیە هەتا خۆرئاوا دەبێ!). {بڕوانـە: تـاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمـارە: ٨٧٩ بـۆ فەرموودەکـەی عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەلام + ژمـارە: ٨٧٨ بـۆ فەرموودەکـەی جابیر}.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕاوبۆچوونی جیاجیـای زۆر هەیـە، سـەبارەت بـەدیاریکردنی کـاتی ئـەم دەمـی نزاگیرابوونـە، لەچل گوتـە تێپـەڕ دەکـەن، مـن لەفـەتحولباری شـەرحی صـەحیحی بوخاریـدا ڕوونم کردوونەتەوە، بڕوانە (ژمارە/٩٣٥ – باب السَّاعة التي في يوم الجمعة).

(ڕوونکردنەوە):

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لەرەگـەزی جوولەکەیـە، یەکێکە لە هاوەڵـە مەزنـەکانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کاتـێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی لە مەککەوە کۆچی کـرد بـۆ مەدینــەی نــازدار، عەبــدوڵڵا ئیــسلام بــوو (بــۆ چیرۆکی موسـوڵمان بـوونی

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی چوارەم، ژمارە: ١٣٣٧ = فەتحولباری شەرحی صحیحی بوخاری، ژمارە: ٣٣٢٩).

لەپێشا عەبدوڵڵا زانایەکی گەورەی جوولەکە بوو، لەنەوەی پێغەمبەر یووسفی کوڕی پێغەمبەر یەعقوبە (دروودی خودایان لێ بێ)، کاتێ موسوڵمان بوو ناوی حوصەین بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا: (عەبدوڵڵا).

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام یەکێکە لەدە هاوەڵە موژدەی بەهەشت پێ دراوەکان، کە ناسراون بە (عەشەرەی موبەششەرە = دەیەی موژدەپێدراو).

دوو کوڕی خۆی کە ناویان یوسف‌و موحەممەد بوو، فەرموودەکانی ئەویان دەگێڕایەوە، دوو فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەسەر فەرمایشتی موقەددیمەی فەتحولباری.

عەبدوڵڵا ئامۆژگاری ئیمامی عەلی کرد: کە دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بەجێ نەهێڵێ‌و مەڵبەندی جێنشینی نەگوێزێتەوە بۆ عێراق، وە عەرزی عەلی کرد: (ئەم مینبەرە بەجێ بهێڵی، جارێکی تر نایبینیتەوە!) وە خۆشی وابوو، کە عەلی مەدینەی بەجێ هێشت هەتا شەهیدبوو نەگەڕایەوە بۆی.

بەکۆی ددەنگ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خودای لێ بێ) لەساڵی (٤٣) چل‌و سێی کۆچیدا، لەشاری مەدینە، بەمەرگی خودا مردووەو کۆچی دوایی کردووە).

کۆمەڵێ فەرموودە لەمەدحی عەبدوڵڵادا هەیە، زۆریان لەتاجول ئوصولدا هەیە، بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٦١، لەژمارە: ٣٥١٦ وە هەتا ژمارە: ٣٥٢٠. چاپی چوارەم).

٤٩١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ فَصَاعِدًا جُمُعَةً} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيفٌ جِدّاً، الإِرْواء/٦٠٣. دارقطني ٢/٣}:

جابيری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ) فەرمووی: دەستووری نەتەوەی ئیسلام، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ئاوایە: هەر کۆمەڵە موسوڵمانیٚ، لەشوێنیٚ نیشتەجیٚ بن، وەك شارو گوند، ژمارەیان بگاتە چل کەس، یا لەچل کەس زیاتر بن، نوێژی هەینی فەرزە لەسەریان کەبیکەن).

دارە قوطنی بەڕشتەیەکی لاواز گێڕاویەتەوە.

٤٩٢- وَعَنْ سَمُرَةَ بنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَسْتَغْفِرُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ كُلَّ جُمُعَةٍ}. رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ بِإِسْنَادٍ لَيِّنٍ.

{ضَعَّفَهُ الهَيْثَمِيُّ في المجمع/٣١٦١}:

سەمووڕەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) وەهابوو، هەموو ڕۆژی هەینییەك لەوتاری نوێژی هەینیدا، داوای لێخۆشبوونی لەخودا دەکرد بۆ موسوڵمانان، بۆ پیاوو بۆ ژنیان).

بەززار (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) بەڕشتەیە نیمچە لاواز گێڕاویەتەوە.

٤٩٣- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ فِي اَلْخُطْبَةِ يَقْرَأُ آيَاتٍ مِنَ اَلْقُرْآنِ، وَيُذَكِّرُ اَلنَّاسَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. وَأَصْلُهُ فِي مُسْلِمٍ.

{شيحا/١٩٩٢ = مسلم/٨٦٢، أبو داود/١٠٩٤}:

جابیری کوڕی سەمووڕە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) وەهابوو، لەناو وتاری ڕۆژی هەینیدا، چەند ئایەتیٚ لە قورئانی دەخوێند، وە ئامۆژگاری خێری نوێژخوێنەکانی دەکرد).

ريشەو سەرچاوەی ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیمدا وا لەژمارە (١٩٩٢) شیحادا، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

{كَانَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خُطْبَتَانِ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا، يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُ النَّاسَ}.

واتــە: جـابیری کـوڕی سـەموورە، فـەرمووی: {پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپێش نوێژی هەینیدا دوو وتاری دەدا، کەمێ لەنێوانیاندا دادەنیشت، قورئانی تیادەخوێندن ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد}. {بڕوانە: ژمارە: ٤٧٤ لەپێشەوە رابورد}.

٤٩٤- وَعَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلَّا أَرْبَعَةً: مَمْلُوكٌ، وَامْرَأَةٌ، وَصَبِيٌّ، وَمَرِيضٌ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَقَالَ: لَمْ يَسْمَعْ طَارِقٌ مِنَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم).

{صحيح الجامع/٣١١١}:

طاریقی کوڕی شیهاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ (درودی خـودای لەسـەر بـێ): نوێـژی هـەینی فـەرزی تـەواوە لەسـەر هـەموو موسـوڵمانێ، کـە بەکۆمـەڵی بیکـا، ئـەم چـوار تاقمـەی لێ دەرچـێ: بەنـدەی زەڕخرِیدە (کۆیلە)و ژنو منداڵو نەخۆش). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٠، ژمارە: ٨٢٧}.

(ڕوونکردنەوە):

١- طاریقی کوڕی شەهاب لەسەردەمی نەفامیدا ژیاوە، پێغەمبەری دیـوە، بەڵام گێڕانەوەی لێیەوە ئەنجام نەداوە، لەسەردەمی ئەبوبەکرو عومەردا (٣٤) سییو چوار غەزایکردووە، ساڵی (٨٢) هەشتاو دووی کۆچی مردووە.

٢- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبو داوود گێڕاویەتەوە، وە دەفـەرموێ: طـاریق بیـستنی لەپێغەمبـەرەوە نییـە، وە ئـەم فەرموودەیـە

حـاكميش دەيگێڕێتـەوە لـە طـاريقی كـوڕی شـەهابەوە لەئـەبو مووسـای ئەشعەرييەوە.

٤٩٥- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَيْسَ عَلَى مُسَافِرٍ جُمُعَةٌ} رَوَاهُ اَلطَّبَرَانِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{صحيح الجامع/٥٤٠٥. طبراني/ في الأوسط رقم: ٨١٨}:

ئيبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەويـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕێبوار نوێژی هەينی لەسەرنييە).

٤٩٦- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{صحيح، سنن الترمذي/٥٠٩}:

عەبـدوڵڵای كـوڕی مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: كاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەردەكەوتە سـەر مينبـەر، ئێمـە ڕوومان تێدەكردو ئەويش ڕووی دەكردە ئێمـە). {تـاج/١، زنجيرە: ١٤٩، ژمـارە: ٨٧٣}.

٤٩٧- وَلَهُ شَاهِدٌ مِنْ حَدِيثِ الْبَرَاءِ عِنْدَ اِبْنِ خُزَيْمَةَ.

{البيهقي ١٩٨/٣ من طريق ابن خزيمة}:

ئەم فەرموودەی ژمارە (٤٩٦)ە لەڕێگەی هاوەڵێكی تريشەوە دەرهێنـراوە، كەبۆی دەبێ بەشايەتو بەهێزكار.

٤٩٨- وَعَنِ اَلْحَكَمِ بْنِ حَزْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {شَهِدْنَا الْجُمُعَةَ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى عَصًا أَوْ قَوْسٍ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{حسن، سنن أبي داود: ١٠٩٦}:

حەكەمی كوڕی حەزنی كولەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی نوێژی هەينی بووين، كاتـێ

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە بۆ وتار خوێندنەوە، خۆیدا بەسەر داردەست (عەسایە)کا، یاخۆی بەکەوانێ گرت، ئەنجا سوپاسی خودای کردو بەچەند وشەیەکی سووکەڵەی پوختی پیرۆز وەسپی خودای دایەوەو سوپاسێکی جوانی ئەو زاتەیکرد، ئەوجا فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! بێگومان کەئێوە لەتواناتانا نییە، کە هەموو ئەو فەرمانو ئەرکانەی کەدراوە بەسەرتانا، هەموویان بکەن، بگرە لە تواناشتاندا نییەو بۆشتان ناکرێ، بەڵام چەندەتان لێ هەڵ دەستێو بەئاسایی بۆتان دەکرێ، لەکردنی درێغی مەکەنو لەسەرئەوە موژدەبێ لێتان). {تاج/١، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ٨٦٠}.

(روونکردنەوە):

بەڵگەیە لەسەرئەوە کە:

١- کە وتاربێژ لەکاتی وتارەکەدا، داردەستێ، یا شمشێرێ بگرێ بەدەستیەوە. ئەمە جاران وابوو، زۆرینەی وتار بێژەکان شمشێرێکی دارینیان دەگرت بەدەستەوە.

٢- حەکیمی کوڕی حەزنی کولەفی (رەزای خودای لێ بێ) لەرۆژی ئازادکردنی مەککەدا خۆیو باوکیو دایکی ئیسلام بوونو لە نەبەردەکەی رۆژی یەمامەدا خۆیو باوکی کوژرانو شەهید بوون، برای باوکی موسەییەبی کوڕی حەزنە.

٣- ئەم کۆمەڵە بڕیارانە سەبارەت بەرۆژی هەینیو نوێژی هەینی چەسپاوو سەلماون:

آ- نوێژی هەینی فەرزە لەسەر پیاو، بۆ ژن بەمەرجی خۆی سوننەتێکی گەورەیە، هەروا بۆ منداڵو کۆیلەو نەخۆش ئەگەر بتوانێ.

ب- کاتی نوێژی هەینی کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، گوتەی بەهێز ئەم گوتەیەیە.

ج- وتـاری هـەینی دوو وتـارن، دەبـێ لەسـەرپێ بـدرێن، لـە نێوانیانـدا، وتاربێژ کەمێ دانیشێ.

د- هەرکەسـێ فریـای یـەك ركـات بکـەوێ لەنوێـژی هـەینی لەگـەڵ مامۆستای مەلادا، ئەوە فریای هەینی کەوتووە، کە مامۆستا سلاّوی دایەوە، ئەو هەڵسێ رکاتێ تر بکاو سلاّو بداتەوەو تەواو.

هـ- هەندێ ویردو گوتەی تایبەت کە لەوتارەکەدا واباشە بخوێنرێن.

و- بێـدەنگیو خامۆشـیو گـوێگرتن لـەوتاری هـەینی زۆر گرنگـە، قسەکردن لەوکاتەدا زۆر نابەجێو ناباشە.

ز- کەسێ لەکاتی وتاردا بچێ، با دوورکات سوننەتی دیاری مزگەوت بکا.

ح- لـەپاش نوێـژی هـەینی چـووار رکـات نوێـژی سـوننەت بـەدوو سلاّودانەوە سوننەتن.

ط- واباشـە نـاوبڕێ بخرێتـە نێوانی نوێـژی فـەرزو نوێـژی سـوننەتەوە، وەك قسەکردنو ویرد خوێندنو جێگەگۆڕین.

ی- خۆشۆردنو خۆگۆڕینو جلی جوان لەبەرکردنو خۆ بۆن خۆشکردن بۆ نوێژی هەینی سوننەتن.

ك- لـەرۆژی هەینیـدا، دەمێکـی کـەم هەیـە، هـەر نـزاو پاڕانەوەیـەکی تیابکرێ، خوا قەبووڵی دەکا، هەوڵدان بۆ ئەوە کارێ زۆر نایابو پەسەندە.

ل- لەلای مەزهەبی شافیعی دەبێ ژمارەی پیاوانی نوێژی هەینی، لەچل پیاو کەمتر نەبن، رەسیدەو هۆشیارو نیشتەجێ بن.

م- رێبـوار نوێـژی هـەینی لەسـەرنییە، بـەلاّم سـوننەتە کـەبیکا ئەگـەر بۆیکرا.

٤- ژمـارەی فـەرموودەکانی باسـی هـەینی بـرێتین لـە: (٤٩٨ — ٤٦٨ = ٣٠) سیی فەرموودە.

**(تەواوکەری)**

زۆر سـەڵاواتدان لەدیـداری پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لەشەوو رۆژی هەینیدا زۆر سوننەتە. لەفەرموودەیەکی صەحیحا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەشەوو رۆژی هەینیدا زۆر سەڵاوات لەسەرمن بدەن). {تاج/١، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ٨٨١}.

لەفەرموودەیەکی تردا، کە شافیعیو بەیهەقی دەیگێڕنەوە: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەبەهەشتا ئەو کەسەتان زۆرتر نزیکە لەمنەوە، کەزۆرتر صەڵاوات لەسەرمن دەدا، کەوابوو لەشەوو رۆژی هەینیدا زۆر صەڵاوات لەسەرمن بدەن، کەناودارن بەشەوە پرشنگدارەکەو رۆژە درەخشانەکە). {تاج/١، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ٨٨٢ و ٨٨٣} + {فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٨٧}.

## ٢٣- باسی نوێژی ترس
## بَابُ: صَلَاةِ الخَوْفِ

{بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٥٢و زنجیرە: ١٥٣و ١٥٤} + {فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ١٠٠، لاپەڕە: ٢٧٩ چاپی تاران} + {تجریدی بوخاری/١، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٤٩٦}.

٤٩٩- عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، {عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ ذَاتِ اَلرِّقَاعِ صَلَاةَ اَلْخَوْفِ: أَنَّ طَائِفَةً مِنْ أَصْحَابِهِ صَلَّتْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ اَلْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ اِنْصَرَفُوا فَصَفُّوا وِجَاهَ اَلْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ اَلطَّائِفَةُ اَلْأُخْرَى، فَصَلَّى بِهِمْ اَلرَّكْعَةَ اَلَّتِي بَقِيَتْ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ. وَوَقَعَ فِي "اَلْمَعْرِفَةِ" لِابْنِ مَنْدَهْ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ أَبِيهِ.

{تجريدى بوخارى/٤، ژمـاره: ١٥٥٤ = ٤١٢٥، ٤١٢٦، ٤١٢٧، ٤١٣٠، ٤١٣٧ فتح البارى. مسلم/شيحا ١٩٤٥ = مسلم/٨٤٢}:

صالحى كوڕى خەووات (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) فـەرمووى: لەكەسـێكم بيستووە، كە ئەو كەسە لەڕۆژى غـەزاى زاتولريقاعـدا، بەجەماعـەت، لەپـشتى پێغەمبەرەوە نوێژى كاتى ترسى دوژمنى كردووە، فەرمووى:

(موســولْمانەكان بــوون بــودوو دەســتەوە، دەســتەيەكيان لەپــشتى پێغەمبـەرەوە ريزبـوونو، دەسـتەكەى تريـشيتان بەرابـەر دوژمـن بەچـەكەوە ڕاوەستاون، جا پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) ڕكاتێكى تـەواو كـرد بـەو تاقمـەى كـە لەگەڵيـدا بـوون، ئەوسـا خـۆى بـەپێوە ڕێـك ڕاوەسـتا، هـەتا ئەوانـەى كـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ركـاتى يەكـەميان كردبـوو، ڕكـاتێكى تريـان كـردو نوێـژى خۆيـان بـۆ خۆيـان تـەواو كـرد، ڕۆيـشتن ڕووبـەڕووى دوژمـن ڕاوەستان، ئەوجا ئەو دەستەكەى تر هاتن، كە هەتا ئێستا ڕووبـەڕووى دوژمـن ڕاوەستابوون، ئەوجا پێغەمبەر خۆى لەدوو ڕكاتەكـەى خـۆى ڕكـاتێكى مـابوو، ئـەو ڕكاتەيـشى كـرد لەگـەل ئـەوانا، واتـە: لـەڕكاتى دووەميـدا، پێـشنوێژى بـۆ دەسـتەى دووەم كـرد ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) لەسـەر شـێوەى تـەحيات ڕێـك دانيـشت، هـەتا تاقمـەى دووەم هەسـتان سـەرو ركـاتى تريـان كـرد بۆخۆيـان، ئـەوجا تـەحياتيان خوێنـدو پێغەمبـەر سلاوى پێيـان دايـەوە، واتـە: خـۆى سلاو نوێـژى دايـەوەو ئـەوانيش لـەدوا ئـەوەوە سلاوى نوێژيان دايەوە). {تاج/١، زنجيرە: ١٥٣، ژمارە: ٨٨٥}.

دانـەر مامۆسـتاى عەسـقەلانى (ڕەحمـەتى خـوداى لێ بـێ) دەفـەرموێ: لەپەڕاوى (المعرفة)دا، كەهى فەرمووودەزانى گەورە ئيبنو مەندەيە، كە يەكێكە لەپێـشەواياني زانـستى فـەرموودە، نـاوى ئـەو پيـاوە ديـارى كـراوە، كـە لـەم گێڕانەوەى ئێرەدا نادیارە، كە ئەو پياوە كەخۆى لـەڕۆژى غـەزاى زاتولريقاعـا

نوێژی ترسی لەپشتی پێغەمبەرەوە کردووە، کە ئەو پیاوە خەوواتی باوکی صاڵح بووە.

٥٠٠- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: {غَزَوْتُ مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا اَلْعَدُوَّ، فَصَافَفْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُصَلِّي بِنَا، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ، وَأَقْبَلَتْ طَائِفَةٌ عَلَى اَلْعَدُوِّ، وَرَكَعَ بِمَنْ مَعَهُ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا مَكَانَ اَلطَّائِفَةِ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ فَجَاءُوا، فَرَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ، فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ اَلْبُخَارِيِّ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٩٦ = ٩٤٢، ٩٤٣، ٤١٣٢، ٤١٣٣، ٤٥٣٥ مسلم/شیحا ٥٩٠٩ = مسلم ٨٣٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوددا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد ڕۆیشتین بۆ غەزا، ڕۆیشتین هەتا بەرەنگاری دوژمن بووینەوە، کە ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە، ریزمان بەست بۆیان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستا لەسەر ئەم شێوەیە، لەو غەزایەدا کەغەزای زاتولریقاع بوو، نوێژی ترسی کرد بۆمان: موسوڵمانەکان بوون بەدوو تاقم: تاقمەیەکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژیان دابەست، ئەو تاقمەکەی تریشیان بەچەکەوە بەرامبەری دوژمن ڕاوەستان، پاس‌و ئێشکی ئەوانیان دەگرت، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕکاتێکی بەو تاقمەیە تەواو کرد، کە لەسەرەتاوە لەگەڵیدا نوێژیان دابەست، بەم ڕەنگە لەگەڵ پێغەمبەردا، فاتیحایان خوێندو چەمینەوەی رکاتی یەکەمیان تەواو کردو دوو کوڕنووشیان برد، ئەوجا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاستبوونەوە سەرپێ، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بەخوێندنی قورئانی ناو نوێژ، ئەوانیش هەڵسانەوەو بەبێ

ئەوەی کەسلاو بدەنەوە ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئەو تاقمەکەی تر کە هەتا ئەو دەمە ئێشکیان دەگرت، وە لەشوێنی ئەوان بوون بەپاسەوانی سوپاکە، ئینجا دەستەکەی تر هاتن و لەپشتی پێغەمبەرەوە ڕیزبوون و نوێژیان لەپشت پێغەمبەرەوە دابەست و، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕکاتێکی بەوانیش تەواو کرد، بەم ڕەنگە ئەوانیش فاتیحەو سوورەتیان خوێندو لەگەڵ پێغەمبەردا چەمینەوەیان ئەنجام داو، دوو کوڕنووشیان لەگەڵیدا بردو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشت بۆ تەحیات خوێندن و تەحیاتی خوێندو سلاوی دایەوە، ئەوجا هەریەکێ لەو دووو تاقمەیە هەڵسانەوە، هەر کەسەی سەرو ڕکاتی تری بەتەنیا بۆ خۆی کردو سلاوی دایەوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست لەنوێژی ترس نوێژێکی تایبەتی نییە، کە لەکاتی ترسدا فەرزبێ، یان سوننەت بێ کەبکرێ، بەڵکوو مەبەست کردنی پێنج نوێژە فەرزەککانە، کە لەکاتی شەڕوشۆڕدا، لەسەریەکێ لەو چەند شێوانەی کە لە سوونەتدا تۆمارکراون دەکرێن. ئیبنو حەزم دەفەرموێ: (لەگێڕانەوەی ساغدا، چواردە شێوەی نوێژی ترس تۆمار کراون، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەغەزاکانیدا کردوویانی). هەندێکی تر دەفەرموون: (حەڤدە شێوە چەسپاوەو سەلماوە).

٢- ئەم نوێژەی کەلەم غەزایەدا لەسەر ئەم شێوەیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجەماعەت کردی، بۆ هاوڕێیانی، کەئیبنو عومەر لەو غەزایەدا بووەو خۆی هاوبەشی لەونوێژەدا کردووە، هەندێ فەرموویانە: نوێژی عەصر بووە، هەندێکی تر فەرموویانە: نوێژی نیوەڕۆ بووە.

٣- نوێژی ترس ئەگەر بەکۆمەڵی، واتە: بەجەماعەت، بکرێ، بەسێ کەس کەمتر ناکرێ، چونکە سێ کەسەکە، یەکێکیان دەبێ بەپێشنوێژ، یەکێکی

تریـان لەگـەڵ ئـەودا رکـاتی یەکـەم تـەواو دەکـا، سـێیەمیان لەوکاتـەدا ئێـشك دەگرێو پاسەوانی پێشنوێژو تاقە پاشنوێژەکەیەتی.

٥٠١- وَعَنْ جَابِرٍ قَالَ: {شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) صَلَاةَ اَلْخَوْفِ، فَصَفَّنَا صَفَّيْنِ: صَـفٌّ خَلْـفَ رَسُـولِ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) وَالْعَدُوُّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ اَلْقِبْلَةِ، فَكَبَّرَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَكَبَّرْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ رَكَعَ وَرَكَعْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مِـنَ اَلرُّكُـوعِ وَرَفَعْنَـا جَمِيعًـا، ثُـمَّ اِنْحَـدَرَ بِالـسُّجُودِ وَالصَّفُّ اَلَّذِي يَلِيهِ، وَقَامَ اَلصَّفُّ اَلْمُؤَخَّرُ فِي نَحْرِ اَلْعَدُوِّ، فَلَمَّا قَضَى اَلـسُّجُودَ، قَـامَ اَلصَّفُّ اَلَّذِي يَلِيهِ...} فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ. وَفِي رِوَايَةٍ: {ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَـهُ اَلـصَّفُّ اَلْأَوَّلُ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ اَلـصَّفُّ اَلثَّـانِي، ثُـمَّ تَـأَخَّرَ اَلـصَّفُّ اَلْـأَوَّلِ وَتَقَـدَّمَ اَلـصَّفُّ اَلثَّانِي...} فَذَكَرَ مِثْلَهُ. وَفِي آخِرِهِ: {ثُمَّ سَلَّمَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَسَـلَّمْنَا جَمِيعًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{شیحا ١٩٤٢ = مسلم ٨٤٠}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی) فـەرمووی: لەغەزایەکا لەخزمەتی پێغەمبەردا، ئامادەی نوێژی ترس بـووم، کـە حـەزرەت کـردی بۆمـان، بـووین بـەدوو ریـزەوە، لەسـەر ئـەم شـێوەیە: دوژمـن لـەڕووی رووگەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) روویکردە رووگە، ریـزێ لەئێمە لەپشت پێغەمبەرەوە ریز بوونو وەك پێغەمبەر روویان کردە رووگـە، ریزەکەی تریش لەپشتی ریزی یەکەمەوە ریزبوونو روویانکردە رووگە، دیارە کەلەم کاتەدا، دوشمن لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی رووگەدا بوون، جا پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەگوتنی ئەڵلاهوئەکبـەری تەحـەرروم

بەرنوێـژیی دابەسـت بۆمـان، ئێمـەیش هـەمووومان، هـەردوو ریزەکـە، لـەدوا ئـەوەوە، یەکسـەر بـەگوتنی ئەڵڵاهوئەکبـەر، نوێـژی بەکۆمـەڵمان لەپـشتیەوە دابەسـت، لـەپاش قورئانخوێنـدن، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) چـەمینەوەی رکـاتی یەکـەمی ئەنجامـدا، ئێمـەیش هـەردوو ریزەکە لەگەڵیـدا، چەمینەوە (روکوع)مان ئەنجامدا، ئـەوجا پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەری لەچـەمینەوە بـەرزەوەکرد، ئێمـەش گـشتمان هـەردوو ریزەکـە سـەرمان لەچـەمینەوە بـەرزکردەوە، بـەڵام کاتـێ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) شۆڕبۆوە بۆ کوڕنووش بردنو کوڕنووشی برد، بەس ریـزی یەکـەم لەگەڵیدا کڕنووشیان برد، لەمکاتەدا ریزەکەی دواوە روو بەڕووی دوشمـن ڕەق راوەستان هەتا ئەوان دوو کوڕنووشەکەی رکـاتی یەکـەمیان تـەواوکرد، ئـەوجا ریزی یەکەمو ریزی دووەم جێ گۆڕکێیـان کـردو ریـزی دواوە چوونە پێشەوە بـۆ جێگـەی ریـزی یەکـەمو ریـزی پێـشەوە چـوونە دواوە بـۆ جێگـەی ریـزی دووەم... هەتا کۆتایی فەرموودەکە).

گێڕانەوەی دووەم کەدانەر ئامـاژەی بۆدەکـا، فـەرموودەی ژمـارە: (٤٤٤)ی پوختـەی موسـلیمە، لەصـەحیحی موسـلیمدا، تـەرقیمی مامۆسـتا خـەلیل مەئموون شیحادا ژمارەکەی (١٩٤٣)یە، کەمێ درێژە، ئەمە دەقەکەیەتی:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەخزمەت پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد، رۆیشتین بۆ غەزای هۆزێ لەهۆزەکانی جوهەینە، کە ئەوغەزایە غەزای زاتوریقاع بوو، بوو بەشـەڕێکی قورسمـان، جـا کاتـێ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) بەرنوێـــژیی نوێـــژی نیـــوەڕۆی کردبۆمـــان، هاوبەشـــپەیداکارەکان (واتـــە: موشریکەکان) گوتیان: ئەگەر ئەمجارە ئـاوا بـێ ئاگـا بـوون لەچـەكو تفاقیـان، یەك هەڵمەتیان دەبەینە سەر، لە رەگو ریـشە دەریـان ددەهێـنینو بنـەبڕیان دەکەین!

جا جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم هەواڵەی راگەیاند بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەیش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆمان باسکرد.

جابیر فەرمووی: هەروا هاوبەشپەیداکارەکان گوتبوویان: (ئەمانەی کەوان لەگەڵ موحەممەددا، ئەم نوێژەی کەوا دێت، کە نوێژی ئەم عەصرەیانە، لەماڵو منالّیان خۆشتر دەوێ، کەواتە: فرسەتە، هەلەو رەخساوە، با لەوکاتەدا پەلاماریان بدەینو قەلاچۆیان بکەین. کاتێ نوێژی عەصر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردینی بەدوو ریز، لەکاتی نوێژەکەدا، هاوبەشپەیداکارەکانی دوشمنمان، لەڕووی رووگەوە بوون، لەبەینی ئێمەو رووگەدا بوون، فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەگوتنی ئەڵلاهوئەکبەری نوێژ دابەستن، بەرنوێژیی بۆمان دابەست، ئێمەیش هەمووومان هەردوو ریزەکە لەدوائەو یەکسەر، بەگوتنی ئەڵلاهوئەکبەر، نوێژی بەکۆمەڵمان لەپشتیەوە دابەست، جا لەپاش قورئانخوێندن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەمینەوەی رکاتی یەکەمی ئەنجامدا، ئێمەیش هەردوو ریزەکە لەگەڵیدا چەمینەوەمان ئەنجامدا ئەوجا سەری لەچەمینەوە بەرزکردەوە، ئێمەیش هەردوو ریزەکە لەگەڵیدا سەرمان لەچەمینەوە بەرزکردەوە. بەڵام کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانەویو کوڕنووشی برد، ریزی یەکەم کە لەپشتیەوە بوون لەگەڵیدا، کوڕنووشیان بردو بەس.

جگا کاتێ کە پێغەمبەرو ئەو ریزەی کە لەگەڵیدا دوو کوڕنووشیان بردو هەڵسانەوە سەرپێ، ریزی دووەم دانەوین: دوو کوڕنووشیان برد، ئەوجا ئەوانیش هەڵسانەوە سەرپێ، ئەنجا جێ گۆڕکێیان کردو، ریزی یەکەم چوونە دواوەو ریزی دووەم هاتنە پێشەوەو لەجێگەی ریزی یەکەم راوەستانو ئەوان بوون بەریزی یەکەم، جا لەپاش خوێندنی قورئانی وەستانی دووەم،

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەللاهوئەکبەری کردو چوو بۆ چەمینەوەی دووەم، ئێمەیش هەردوو ریزەکە لەگەڵیدا چەمینەوەی دووەممان ئەنجامدا، ئەوجا لەگەڵیدا هەڵساینەوە سەرپێ، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانەوییەوە بۆ کوڕنووشەکانی رکاتی دووەمو دوو کوڕنووشی برد، ئەو ریزەی کە لەپێشەوە بوون، کە لەسەرەتای نوێژەکەوە ریزی دووەم بوونو ئێستا بوو بوون بەریزی یەکەم، ئەوانیش لەگەڵ پێغەمبەردا دوو کوڕنووشیان برد، ریزی دووەمیش کە لەسەرەتاوە ریزی یەکەم بوون، ئەوان بەپێوە راوەستان، هەتا پێغەمبەرو ریزەکەی کە لەپشتیەوە بوون، دوو کوڕنووشەکانیان تەواوکردو دانیشتن، ئەوسا ئەوانیش دانەوینو سەرو دوو کوڕنووشیان بردو هەموو دانیشتنو ئەوجا هەموومان بەدانیشتنەوە تەحیاتمان خوێندو ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوی دایەوە، ئێمەیش سڵاومان دایەوە).

٥٠٢- وَلِأَبِي دَاوُدَ: عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ مِثْلُهُ، وَزَادَ: {أَنَّهَا كَانَتْ بِعُسْفَانَ}.

{صحيح، سنن النسائی/١٥٤٩، الصحيح المسند/١٢٤٣}:

ئەبو داوود (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەئەبو عەییاشی زورەقییەوە (رەزای خودای لێ بێ) لەوێنەی ئەم فەرموودەیەوە ددەگێڕێتەوە، وە ئەمەی پترە: (کە ئەم نوێژە لە عوسفان بووە، کە جێگەیەکی دوو قۆناخ لەمەککەوە دوورە).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو عەییاشی زورەقی (رەزای خودای لێ بێ) ناوی زەیدی کوڕی صامیتە، ئەنصارییە، هاوەڵی پێغەمبەرە، ئیبنو سەعد دەڵێ: ئامادەی غەزای ئوحودو غەزاکانی پاش ئوحود بووە، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە ژیاوە، لەساڵی چلی، یا پەنجای کۆچیدا مردووە.

٥٠٣- وَلِلنَّسَائِيِّ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى بِطَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى بِآخَرِينَ أَيْضًا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ}.

{شيحا/١٩٤٧. صحيح، سنن النسائى/١٥٥٢}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، لەغەزایەكا نوێژی ترسی بۆمان كرد، كردینی بەدوو تاقمەوە، لەپێشا دووركات نوێژی كرد بە یەكێكیان‌و سڵاوی پێیان دایەوە، لەوكاتەدا تاقمەكەی تر، بەچەكەوە بەرەو دوژمن راوەستابوون، بوو بوون بەپاسەوان، ئەوجا دوو ركات نوێژی بەتاقمەكەی تریش كردو سڵاوی بەوانیش دایەوە، لەمكاتەدا ئەو تاقمە بوون بە پاسەوان كە یەكەمجار پێغەمبەر نوێژی پێیانكرد).

(ڕوونكردنەوە):

ئەمەیش جۆرێكی ترە لەشێوەكانی نوێژی ترس، ئەم زانیاریانە سەبارەت بەم نوێژە دیاریكراون:

١- ئەم نوێژە لە بەطنی نەخلە بووە.

٢- لەم شێوەیەدا پێغەمبەر كە بەرنوێژی بۆیان كردووە یەكەم جار نوێژی فەرزی خۆی كردووە هی ئەوكاتە، وە دەستەی یەكەمیش نوێژە فەرزەكەی خۆیان لەپشتیەوە كردووە.

٣- لەجاری دووەما پێغەمبەر كە بەرنوێژیی بۆ دەستەی دووەم كردووە، خۆی نوێژی سوننەتی كردووە، ئەوان لەپشتیەوە نوێژی فەرزیان كردووە.

٥٠٤- وَمِثْلُهُ لِأَبِي دَاوُدَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ.

{ئەبو داوود لە سونەندا، ژمارە: ١٢٤٨، نسائى ١٧٨/٣}:

ئەمە دەقەكەیەتی لەتاجول ئوصولدا، بەرگی/١، زنجیرە: ١٥٣، ژمارە: ٨٨٦ چاپی چوارەم:

ئەبوبەكرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی ترسدا، نوێژی نیوەڕۆی لەسەر ئەم شێوەیە بۆكردین: هێندێكمانی لەپشتی خۆیەوە ریزكردو بازێكیشمانی رووبەڕووی دوشمن ریزكرد. ئینجا دوو ركات نوێژی بەجەماعەت كرد بەوانەی كە لەپشتیەوە بوونو سەلامی پێ دانەوەو ئەمانە چوون لەشوێنی هاوڕێكانیان رووبەڕووی دوشمن راوەستان، ئینجا ئەوانیش هاتنو لەپشتی پێغەمبەرەوە دەستیان كرد بەنوێژكردنو دوو ركات نوێژی بەمانیش كردو سڵاوی پێ دانەوە، جا نوێژەكەی پێغەمبەر بوو بەچوار ركات، هاوڕێكانیشی یەكی دوو ركاتیان كرد).

٥٠٥- وَعَنْ حُذَيْفَةَ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى صَلَاةَ اَلْخَوْفِ بِهَؤُلَاءِ رَكْعَةً، وَبِهَؤُلَاءِ رَكْعَةً، وَلَمْ يَقْضُوا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{احمد/٢٣٦٥٧. صحيح، سنن أبي دداود: ١٢٤٦. نسائى ١٦٧/٣ وفي الكبرى/١٩٣٠، ابن حبان: ١٤٥٢}:

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم شێوەیە نوێژی ترسی بەهاوەڵانی كرد: كردنی بەدوو بەشەوە، بەبەشێكیان یەك ركاتی پێ كردنو سڵاویان دایەوە، ئەوجا بەشەكەی تریش هاتن بەوانیش یەك ركاتی كردو ئەوجا خۆی سڵاوی دایەوەو تاقمەی دووەمیش لەدوا ئەو سڵاویان دایەوە، وە لەوەدوا نوێژەكەیان نەگێڕایەوە).

٥٠٦- وَمِثْلُهُ عِنْدَ ابْنِ خُزَيْمَةَ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

{ابن خزيمة رقم: ١٣٤١}:

ئیبنـو خوزەیمـە، کـە یەکێکـە لەپێـشەوایانی زانـستی فـەرمووده (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودا لەهـەموویان بـێ) وێنـەی ئـەم نوێـژی ترسـەی وا لـەژمارە (٥٠٥)دا، لەئیبنو عەبباسەوه دەگێڕێتەوه.

٥٠٧- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {صَلَاةُ اَلْخَوْفِ رَكْعَةٌ عَلَى أَيِّ وَجْهٍ كَانَ} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{مسلم/شيحا ١٥٧٣. أخرجه البزار كما في مجمع زالزوائد ٢/١٩٦}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (نوێـژی کـاتی تـرس یـەك ڕکاتـە، لەهـەموو بارودۆخێکا هەریەك ڕکاتەو بەس).

ئەم فەرموودەیە لە موسلیمدا ئاوایە:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: خـودای گـەورەو سـەروەر، لەسـەر زبـانی پێغەمبـەری ئێـوە کـە موحەممـەدە (دروودی خـودای لەسەر بێ) ئەم شێوەیە نوێژەی فەرزکردووە لەسەرتان:

١- ئەگەر لەماڵەوەبوونو لەسـەفەردا نـەبوون، نوێـژە چوار ڕکاتییـەکان بەچوار ڕکات بکەن.

٢- ئەگەر لەسەفەردا بوون نوێژە چوار ڕکاتییەکان بەدوو ڕکـات بکـەنو شێوانو بەیانیش وەك خۆیان بکەن.

٣- ئەگـەر لـەکاتی ترسـدا بـوو، نوێـژی فـەرز هـەر نوێـژێ بـێ، چـی بـۆ پێشنوێژ، چی بۆ پاشنوێژ یەك ڕکاتە.

٥٠٨- وَعَنْهُ مَرْفُوعًا: {لَيْسَ فِي صَلَاةِ اَلْخَوْفِ سَـهْوٌ} أَخْرَجَـهُ اَلـدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف الجامع/٤٩١١}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەنوێژی ترسـدا، هەڵەکردن حـسێبی بۆناکرێ، لەبەرئەوە ئەگەر هەڵەیش بکرێ، کورنووشی هەڵەی بۆنابرێ!).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسی نوێژی ترسە برێتییـە لـە (٥٠٨ — ٤٩٨ = ١٠). دە فـەرموودە، کەپێنج شێوەیان لەشێوەکانی نوێژی تـرس دیاریکردووە، کـە کـۆی شـێوەکانی نوێژی ترس دەکەنە (١٧) حەڤدە شێوە.

٢- نوێژی ترس بەتەنها ناکرێ، دەبێ بەجەماعـەت بکـرێ، ژمارەیـان لـە (٣) سێ کەس کەمتر نەبێ، یەکێ پێشنوێژ، یەکێ پاشنوێژ، یەکێ پاسەوان.

## ٢٤- نوێژی دوو جەژنەکان
## بابُ صَلاَةِ العِيدَيْنِ

{تاج/١، زنجیرە: ١٥٨ هـەتا زنجـیرە: ١٦٣ لـەژمارە: ٨٩٨ هـەتا ژمـارە: ٩١٧ + فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٨٩ هەتا زنجیرە: ٩٥ + تجریـدی بوخـاری/١، زنجـیرە: ١٩ لەژمارە: ٤٩٨ وە هەتا ژمارە: ٥٠٩}.

٥٠٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {الْفِطْرُ يَوْمَ يُفْطِرُ اَلنَّاسُ، وَالْأَضْحَى يَوْمَ يُضَحِّي اَلنَّاسُ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيحُ الجَامِعِ: ٤٢٨٧}:

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (جـەژنی ڕۆژوو شـکاندن، کـەپێی دەگـوترێ جـەژنی ڕەمەزان، ئەو ڕۆژەیە کەجەماوەری موسـوڵمانان بەجـەژنی دادەنـێن‌و ڕۆژووی تیادا دەشکێنن، وەجەژنی قوربـانیش ئـەو ڕۆژەیـە کەجـەماوەری موسـوڵمانان بەجەژنی دائەنێن‌و قوربانی تیادا سەردەبڕن!).

٥١٠- وَعَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ مِنَ اَلصَّحَابَةِ، {أَنَّ رَكْبًا جَاءُوا، فَشَهِدُوا أَنَّهُمْ رَأَوُا الْهِلَالَ بِالْأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يُفْطِرُوا، وَإِذَا أَصْبَحُوا يَغْدُوا إِلَى مُصَلَّاهُمْ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ -وَهَذَا لَفْظُهُ- وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ.

{أحمد ٥/٥٧. سنن أبی داود: ١١٥٧}:

ئـەبو عومـەیری کـوڕی ئەنـەس فـەرمووی: مامـەکانم کـە لـەهاوەڵانی پێغەمبەر بـوون (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو رەحمـەتی خـودا لەگشت هاوەڵو شوێنکەوتووانی بێت) فەرموویان: کاروانێ هاتنە خزمەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شایەتییاندا، کـە دوێنـێ ئێـوارێ مانگمـان دیـوە، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی بـە موسـوڵمانان دا کـە رۆژوو بشکێنن‌و بۆسبەینێ بەیانی لەماڵ دەرچن‌و بچن بـۆ نوێژگاکـەیان، کـە لە دەرەوەی شاری مەدینە بوو، تالەوێ نوێژی جەژنیان بۆ بکات، وە ئەوانیش وایانکردو هەردوو فەرمانەکەی پێغەمبەریان بـەجێ هێنـا). {تـاج/١، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ٩١٢ چاپی چوارەم}.

٥١١- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَا يَغْدُو يَوْمَ اَلْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَفِي رِوَايَةٍ مُعَلَّقَةٍ -وَوَصَلَهَا أَحْمَدُ-: وَيَأْكُلُهُنَّ أَفْرَادًا.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٩٩ = ٩٥٣ فتح االباری. أحمد ١٢٢٩٣}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لـەرۆژی جـەژنی رەمەزانا، دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەهـا بـوو: هـەتا چەند دەنکێ خورمای تاکی نەخواردایە، نەدەچوو بۆ نوێژی جەژن). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٠}.

٥١٢- وَعَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: {كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَا يَخْرُجُ يَوْمَ اَلْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلَا يَطْعَمُ يَوْمَ اَلْأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٤٨٤٥. احمد ٢٣٣٧. ترمذى: ٥٤٢}:

**عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەی کوڕی حوصەیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بورەیدەی باوکم فەرمووی: لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا نانی نەخواردایە، نەدەڕۆیشت بۆ نوێژی جەژن، لەڕۆژی جەژنی قوربانیشا هەتا نوێژی جەژنی نەکردایە نانی بەیانی نەدەخوارد). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٠ چاپی چوارەم}.**

٥١٣- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: {أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ اَلْعَوَاتِقَ، وَالْحُيَّضَ فِي الْعِيدَيْنِ" يَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ اَلْمُسْلِمِينَ، وَيَعْتَزِلُ اَلْحُيَّضُ اَلْمُصَلَّى} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢١١ = ٣٢٤، ٣٥١، ٩٧١، ٩٧٤، ٩٨٠، ٩٨١، ١٦٥٢ فتح الباری. پوختەی موسلیم ٤٣١ = ٢٠٥٣ شیحا = مسلم ٨٩٠}:

**ئوم عەطییە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمانکرد، کە گەورە کچو ژنی بێوەژنو کەیبانۆی ناوماڵ لەگەڵ خۆمان ببەین بۆ ئەو دەشتە، بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژی جەژن، بەڵام ژنە بێنوێژەکان نوێژەکە ناکەن، تەنیا ئامادەی کۆڕی پڕ فەڕو نزای خێری کۆمەڵی موسوڵمانان دەبن.**

**گوتم: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەگەر واڕێکەوت یەکێکمان چارشێوی نەبوو، ئایا بەبێ چارشێویش هەربێت بۆ نوێژگاکە بۆ دەرەوەی شار؟ فەرمووی: (با لە دەستە خوشکێکی موسوڵمانی خۆی چارشێوێ بخوازێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٣}.**

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەستی سەرەکی بەندەی هەژار، لەم وەرگەڕانە تێگەیشتنی تەواوە، لەگیانی فەرموودەکە، لەبەرئەوە گەلێ جار خۆم نابەستمەوە بەدەقی فەرموودەکەی ناو کتێبەکەوە، بەڵکوو دەقێکی تری فەرموودەکە، کەڕۆشنترو بەسوودترو بەهێزتر بێ ئەوە روونووس‌و راگوێز دەکەم، وەك لەم شوێنەدا، چوار دەقی ئەم فەرموودەیەم لەبەر دەستدایە: تاجول ئوصول‌و تجریدی بوخاری‌و پوختەی موسلیم‌و بولوغولمەران، من لێرەدا، پوختەی موسلیمەکەم هەڵبژارد، چونکە گیانی مەبەستەکە بەجوانی دەدا بەدەستەوە. بەڵام دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەوەی ڕەچاوکردووە، کەبەپێی توانا بەکورتی‌و پوختی، ئەو ڕستەو بڕگەو گێڕانەوەو دەق‌و بەشانە لە فەرموودەکە پیادە بکا، کە دەبن بە بەڵگە بۆ بڕیارە شەرعییەکان. لەم لایەنەوە هەموو ماموستاو خوێنەران‌و بەهرەمەندان، دڵنیا دەکەمەوە، کە بەندە بەهیچ جۆرێ لەناوەڕۆك‌و واتای سەرەکی دەقەکان دوورناکەومەوە، بەڵکوو لەخودای گەورە داوا دەکەم کە ئەم وەرگەڕانە ببێ بەباشترین هۆکارو یاریدەدەر بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم پەڕاوە.

٢- ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم بابەتانە:

آ- ژنی بێنوێژ، یان زەیستان، یامرۆڤی لەشگران، دروستە کە هەموو پەرستن‌و یادێکی خودا بکا، بەمەرجێ بە دەقێکی رۆشن قەدەغە نەکرابێ، وەك نوێژو رۆژوو قورئانخوێندن نادروست‌و قەدەغەیە بۆ ژنی بێنوێژ، یان بۆ زەیستان، وە لەسەر ئەم پەرستش‌و یادو ویردو ذیکرە لەسەر ئەو حاڵە پاداشی باش وەردەگرێ.

ب- ئەم جۆرە کەسانە مافی ئەوەیان هەیە کەئامادەی کۆڕی دەورو دەرس‌و زانست‌و هەموو جۆرە کۆڕێکی ڕەوای تر ببن، بەمەرجێ لەناو مزگەوتا نەبێ، هەروا بۆی هەیە گوێ لەخوێندنی قورئان‌و گوتن‌و

دەورکردنەوەی حەدیثو فەرموودەی پێغەمبەر بگرێ، یابیخوێنێ، یادەوری بکاتەوە.

٥١٤- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ: (رضى الله عنه){كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ: يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ اَلْخُطْبَةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٠٤ = ٩٦٢ فتح البارى. پوختەی موسليم ٤٢٨ = ٢٠٤١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبکرو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) هەرکەسەیان لەسەردەمی خۆیدا، نوێژی هەردوو جەژنەکەیان دەکرد ئەوجا وتاریان دەخوێندەوە.

٥١٥- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى يَوْمَ اَلْعِيدِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا} أَخْرَجَهُ اَلسَّبْعَةُ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٨٣ = ٩٨، ٨٦٣، ٩٦٢، ٩٦٤، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ٤٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨١، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥ فتح البارى. پوختەی موسليم ٤٣٠ = ٢٠٥٤ شيحا = مسلم ٨٨٤. أحمد: ٢٥٣٣. ترمذى: ٥٣٧. نسائى ١٩٣/٣ وفى الكبرى (٤٩٧ ١٨٠٥)}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ نوێژی جەژنی قوربان، یاجەژنی رەمەزان، لەشار دەرچووبۆ نوێژگاکە، کە لەدەرەوەی شاری مەدینە بوو، نزیکەی هەزار گەزێ لەدەرگای مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە دووربوو، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، جا لەوێ، لەنوێژگاکە دووركات نوێژی جەژنی بەکۆمەڵی بۆ نوێژخوێنەکان کرد، نە لەپێشیەوە نوێژی سوننەتی کرد، نە لەپاشیەوە نوێژی سوننەتی کرد، واتە: نوێژی جەژن سوننەتی پاشو پێشی نییە. لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆ ناو ژنەکان، بیلالی لەگەڵ خۆیدا برد،

فەرمانی پێیانکرد کەخێر بکەن، ئیتر ژنەکان دەستیانکرد بەشت بەخشین، هەیان بوو ئەڵقەزێڕەکەی، یازیوەکەی خۆی دادەکەندو هەڵی دەدایە ناو کۆشی بیلالەوە، هەیان بوو گەردانەکەی هەڵ دەدا، ئیتر هەروا، هەرکەسەیان بەپێی حاڵ دەستیان کرد بەخێرو شت بەخشین بۆ ڕەزای خودا). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩٠٧}.

٥١٦- وَعَنْهُ: (رضى الله عنه) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَّى اَلْعِيدَ بِلَا أَذَانٍ، وَلَا إِقَامَةٍ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{صحيح، سنن أبي داود ١١٤٧ تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٠٣ = ٩٥٩، ٩٦٠ فتح البارى. شيحا ٢٠٤٥ = مسلم ٨٨٥}:

جابیری کوڕی سەمووره (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەك جارو دووجار، بەڵکوو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەکانم لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ بانگو قامەت کردووە). {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩٠٥}.

لەپوختەی بوخاریدا ئاوایە:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباسو جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرموویان: نە لەرۆژی جەژنی ڕەمەزانو نە لەرۆژی جەژنی قوربانا، بۆ نوێژی جەژن بانگ نەدەدرا.

لەموسلیمدا (شیحا ٢٠٤٥) ئاوایە:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی جەژن لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی نوێژی جەژن بووم، لەپێشا دەستی کرد بەنوێژی جەژنو تەواوی کردو ئەوجا وتاری دا، نەبانگ درا نەقامەت کرا... تاکۆتایی فەرموودەکە...

٥١٧- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: (رضى الله عنه) {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) لَا يُصَلِّي قَبْلَ اَلْعِيدِ شَيْئًا، فَإِذَا رَجَعَ إِلَى مَنْزِلِهِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{حسن، صحيح الجامع ٤٨٥٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەها بوو، ئەوەی کەپێی بگوترێ نوێژی سوننەت، لەپێش نوێژی جەژنەوە نەی دەکرد، بەڵام کاتێ دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، لەوێ دوورکات نوێژی سوننەتی دەکرد).

(ڕوونکردنەوە):

زاناکان بەپێی گێڕانەوەو بەڵگەکان دەفەرموون:

١- نوێژی هەردوو جەژن، سوننەتی پێشینەو پاشینەیان نییە، ئەمە بەهێزترین گوتەیە لەم بابەتەدا.

٢- هەندێ دەفەرموون: سوننەتی پێشینەیان نییە کە لەنوێژگاکە بکرێ، بەڵام نوێژخوێن کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، سوننەتە دوورکات سوننەتی پاشینەی جەژن بکات.

٣- ئەم فەرموودەیە، دوو گوتە هەیە لەبارەیەوە:

یەکەم: لەپاش نوێژی جەژن، کاتێ نوێژخوێن دەگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی لەوێ دوورکات سوننەتی پاشینەی جەژن بکات، ئەم ڕایە زۆر بەهێز نییە.

دووەم: دەفەرموون: ئەوەی کەلەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: کە پێغەمبەر لەپاش کردنی نوێژی جەژن کاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، دوورکات نوێژی سوننەتی کرد، ئەو دوورکاتە سوننەتی چێشتنگاوبووە، نەوەك سوننەتی پاش جەژن.

٥١٨- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَخْرُجُ يَوْمَ اَلْفِطْرِ وَالْأَضْحَى إِلَى اَلْمُصَلَّى، وَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ اَلصَّلَاةُ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ فَيَقُومُ مُقَابِلَ اَلنَّاسِ -وَالنَّاسُ عَلَى صُفُوفِهِمْ- فَيَعِظُهُمْ وَيَأْمُرُهُمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٠٢ = ٩٥٦ فتح الباری شەرحی صحیح البخاری. شیحا ٢٠٥٠ مسلم ٨٨٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەها بوو: لەرۆژی جەژنی ڕەمەزانو، لەرۆژی جەژنی قوربانـدا، بۆ نوێـژی جەژن دەڕۆیشت بۆ نوێژگاکە، کەجێگەیێ بوو، لەناو شاری مەدینەدا، لەدەرگای مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە، هەزار گەزێ دوور بوو، یەکەم شت کەدەستی پێی دەکرد نوێـژی جەژن بوو، کـە لەنوێژەکـە دەبـۆوە، هەڵدەستایە سەرپێو رووی دەکـردە خەڵکەکـە، خەڵکەکەیش هەرکەسەیان لەجێگەی خۆیانـدا، لـەناو ریزەکانیانـدا، بەرامبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دادەنیشتن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری نوێژی جەژنی دەخوێند: ئامۆژگاری دەکردن پەندی دادەدان، ڕاسپێری خێری دەکـردن، فەرمانی پێیـان دەکـرد بەچاکە، نـەهی لێ دەکـردن لەخراپـە، لەسـەردەمی پێغەمبـەردا لەنوێژگاکـە دوانگـە (مینبـەر) نەبوو... تادوایی فەرموودەکە).

٥١٩- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {اَلتَّكْبِيرُ فِي اَلْفِطْرِ سَبْعٌ فِي اَلْأُولَى وَخَمْسٌ فِي اَلْآخِرَةِ، وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ. وَنَقَلَ اَلتِّرْمِذِيُّ عَنِ اَلْبُخَارِيِّ تَصْحِيحَهُ.

{حسن، صحيح الجامع: ٣٠١٧ أبوداود رقم: ١١٥١}: لە تاجا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) هەمیشە لەرکاتی یەکەمی نوێـژی جەژنی ڕەمەزانو نوێـژی جەژنی قوربانـا، حەوت ئەڵلاهوئەکبەری دەکـرد، لەرکاتی دووەمیانا پێنج

ئەڵڵاهوئەکبـــەری دەکـــرد). {تـــاج/١، زنجـــیرە: ١٦٠ ژمـــارە: ٩٠٩ – ئەبوداوود/ئەحمەد/تەرمەزی – سند حسن} گفتەی تیرمیـزی ئاوایـە: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرکاتی یەکەمی هـەردوو جەژنـەکانا، لـەپێش قورئانخوێندنـدا، حـەوت جـار ئەڵڵاهوئەکبـەری دەکـرد، وە لـەرکاتی دووەمیانا لەپێش قورئانخوێندندا پێنج جار ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد).

لێرەیشدا ئاوایە:

عەمری کوڕی شوعەیبی کوڕی مەحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عـەمری کـوڕی عـاص (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: بـاوکم شـوعەیب فـەرمووی: بـاپیرەم عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمر فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لـەرکاتی یەکـەمی نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزانا، لەپێشا حەوت ئەڵڵاهوئەکبەر دەکرێ، ئەوجا فاتیحەو سوورەتێ تـر لەپاشـیان دەخوێنـدرێن، وە لـەرکاتی دووەمـی نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزانا پێـنج ئەڵڵاهوئەکبـەر دەکـرێ، ئـەوجا سـوورەتی فاتیحـەو سـوورەتێ لەپاشـیان دەخوێندرێن).

(ڕوونکردنەوە):

١- عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمری کـوڕی عـاص (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی) یەکێکـە لەهاوەڵـە ناودارەکـانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دوازدە سـاڵ لـەباوکی خـۆی منـاڵتر بـووە، خوێنـەوار بـوو، بەفـەرمانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرموودەو گوتـەکانی پێغەمبـەری دەنووسییەوە بۆ خۆیو لەبەری دەکردن. {تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٢٠}.

زانایەکی پایەبەرز بوو، زۆر زاناو بلیمەت بوو، زۆر بـەدین بـوو، حـەوت سەد فەرموودەی هەیە کە لەپەڕاوە بایەخدارەکانی فەرموودەدا تۆمار کراون، لەبوخاریـدا (٢٥) فـەرموودەی هەیـە، لەموسـلیمدا (٣٧) سـیو حـەوت فەرموودەی هەیە، حەڤدەیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: (متفق علیه)ین،

کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، واتە: لەبوخاریو موسلیمدا، یەکسانە بە (١٧ + ٨ + ٢٠ = ٤٥ = ١٧ پەسەندی هەردوولا (٨) لەئەفرادی بوخاریو (٢٠) لەئەفرادی موسلیم، دەکاتە (٤٥) فەرموودە لە صەحیحەیندا}.

عەبدوڵڵا رۆژنا رۆژێ بەڕۆژوو بوو، وە شەو نوێژێکی زۆری دەکرد هەتا مرد، لەمانگی قوربانی ساڵی (٦٥) شەستو پێنجی کۆچیدا، لەمەککە، یا لەطائیف، یا لەمیصر، لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە: {بڕوانە: تەجرید/١، ژمارە: ٥٦٤ + بەرگی/٢، ژمارە: ٩١٢ + تاج/٣، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٣٤١٩}.

٢- دانەر: پێشەوا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێشەوا تەرمەزی لەپێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) ڕاگوێز دەکا، کە بوخاری ئەم فەرموودەیەی بەصەحیح (تەندروست) داناوە.

٣- ڕستەی (وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ) ئەگەر ڕاناوی (أبيه) و (جَدِّهِ) بوو عەمر بچێتەوە، ئەوە واتاکەی ئاوایە:

عەمر دەفەرموێ: باوکم شوعەیب فەرمووی: باپیرەم موحەممەد فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ...تادوایی، لەم بارەدا فەرموودەکە مورسەلی تابیعییە، چونکە موحەممەد فریای سەردەمی پێغەمبەر نەکەوتووە. بەڵام ذەهەبی دەفەرموێ: شوعەیب فەرموودەی لەباپیرەی خۆی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە بیستووە، وە ڕاناوەکە لێرەدا بۆ باپیرەی شوعەیب دەچێتەوە، لەم بارەدا فەرموودەکە مسندی متصلی مرفوعەو صەحیحە.

٥٢٠- وَعَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ (رضى الله عنه) قَالَ: {كَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْرَأُ فِي اَلْأَضْحَى وَالْفِطْرِ بِـ (ق)، وَ (اقْتَرَبَتْ)}. أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٢٩ = ٢٠٥٦ شيحا = مسلم/٨٩١}:

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەبو واقیدی لەیثی فەرمووی: عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەمنی پرسی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کام سوورەتانەی، لەنوێژی جەژنی قوربانو، لەنوێژی جەژنی ڕەمەزانا دەخوێند؟!

ئەبو واقید فەرمووی: عەرزیمکرد: لەرکاتی یەکەمیانا، سوورەتی {ق وَالْقُـرْآنِ الْمَجِيـدِ}ی دەخوێند، وە لەرکاتی دووەمیاندا سوورەتی {اقْتَرَبَـتِ الـسَّاعَةُ وَانـشَقَّ الْقَمَـرُ}ی دەخوێند. {تاج/١، زنجیرە: ١٦٠، ژمارە: ٩١٠} + {مسلم/شيحا ٢٠٥٧}.

٥٢١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا كَانَ يَوْمُ اَلْعِيدِ خَالَفَ اَلطَّرِيقَ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاري بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: ٥٠٨ = ٩٨٦ فتح الباري شەرحی صەحیحی بوخاری}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: لەڕۆژی جەژنا، عادەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: کە دەردەچوو بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژی جەژن، لە ڕێگەیەکەوە دەڕۆیی، کاتێ دەگەڕایەوە لەڕێگەیەکی ترەوە دەگەڕایەوە! {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٨٩٩}.

٥٢٢- وَلِأَبِي دَاوُدَ: عَنِ ابْنِ عُمَرَ، نَحْوُهُ.

{أبو داود/١١٥٦}:

{بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٨٩٩، کەواتاکەی لەژمارە: (٥٢١)دا، لەپێشەوە کرا}.

٥٢٣- وَعَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: {قَدِمَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) اَلْمَدِينَةَ، وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَـا. فَقَـالَ: "قَـدْ أَبْـدَلَكُمُ اَللَّـهُ بِهِمَـا خَيْـرًا مِنْهُمَا: يَوْمَ اَلْأَضْحَى، وَيَوْمَ اَلْفِطْرِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ.

{صحيح، سنن أبي داود/١١٣٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـات بـۆ مەدینـە، خـەڵکی مەدینـە دوو ڕۆژیـان هـەبوو، یـاریو وازیو گەمـەیان تیـادا دەکـردن، فـەرمووی (دروودی خـودای لەسەر بێ): ئەم دوو ڕۆژە چین؟ گوتیان: جاران لەسەردەمی نەزانیو نـەفامی پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا گەمەو یاریمان تیادا دەکردن. فەرمووی: (خودا لـەجیاتی ئـەو دوو ڕۆژە، چـەند ڕۆژێکـی چاکتری پـێ بەخـشیوون، کـە ڕۆژانـی جـەژنی قوربـانو جـەژنی ڕەمەزانـە!). {تـاج/١، زنجـیرە: ١٦٣، ژمـارە: ٩١٧}.

٥٢٤- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مِنَ اَلسُّنَّةِ أَنْ يَخْرُجَ إِلَـى اَلْعِيـدِ مَاشِيًا} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَحَسَّنَهُ.

{حسن، الإرواء: ٦٣٦. ترمذي/٥٣٠. ابن ماجة/١٢٩٦}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بـێ) فـەرمووی: واسـوننەتە کە بەپێ، بە پیادەیی بچیت بۆ نوێژی جـەژن، وەلـەپێش دەرچوونیـشدا شـتێ بخۆیت). {ترمذی/سند حسن – تـاج/١، زنجـیرە: ١٥٩، ژمـارە: ٨٩٨ ج/٤ = چـاپی چوارەم}.

٥٢٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّهُمْ أَصَابَهُمْ مَطَرٌ فِي يَوْمِ عِيدٍ. فَصَلَّى بِهِمْ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَلَاةَ اَلْعِيدِ فِـي اَلْمَـسْجِدِ} رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ لَيِّنٍ.

{ضعيف، سنن أبي داود: ١١٦٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەرۆژی جەژنا، باران بوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەژنی لەناو مزگەوتا بۆکردین). {تاج/١، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٠٢}.

ئەبو دداوود بەرِشتەیەکی نیمچە لاواز گێراویەتەوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە برێتییە لە (٥٢٥ — ٥٠٨ = ١٧) حەقدە فەرموودە.

٢- سوننەتە لەپێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان شتێ بخۆی واباشە چەند دەنکێ خورمای تاك بێ.

٣- لەجەژن‌و بۆنە گشتییە ئایینی‌و کۆمەڵایەتییە رێزدارەکانا واباشە ژنانیش بچن، ئەگەر لەبەر مەهانەی رەوا، هاوبەشی نوێژەکەش نەکەن، با هاوبەشی خۆشی‌و نزای باش بکەن.

٤- نوێژی جەژن دەبێ لەپێش وتارەکانیاندا بێ.

٥- نوێژی جەژن، سوننەتی پێشینەو پاشینەی نییە، بەبێ بانگ‌و قامەت دەکرێ.

٦- ژمارەی ئەڵلاهوئەکبەرەکانی سەرەتای رکاتی یەکەم‌و دووەم: بڕوانە: (ژمارە: ٥١٩).

٧- سوورەتی (ق)و سوورەتی (اقتربت) لەنوێژی جەژنی قوربان‌و جەژنی رەمەزانا، لەلایەن پێشنوێژەوە بەدەنگی بەرز دەخوێنرێن، لەپاش فاتیحە.

٨- رێگە گۆڕکێ سوننەتە، کاتی چوون بۆ نوێژی جەژن.

٩- یاری‌و دەربڕینی خۆشی لەڕۆژانی جەژنا پەسەندن، ناپەسەندنین.

١٠- سوننەتە بەپێ بچیت بۆ نوێژی جەژن، نەوەك بەسواری.

١١- ئەگەر باران، یا مەهانەی باش‌و رەوا هەبوو، ئەوا نوێژی جەژن لەمزگەوت دەکرێ.

١٢- ئێستا بەشێوەی گشتی، بەتایبەتی لەشارەکانا، وا باوو دامەزراوە، کە نوێـژی جەژنـەکان، بەجەماعـەت لەمزگـەوت دەکـرێ، گەرچـی هەنـدێ کـەس لەماڵەوە بەتەنیا، یا بەکۆمەڵی دەیکەن.

١٣- بەپێی مەزهـەبی شـافیعی، ئەصـڵی سوننەتەکە بـەدوو رکـات نوێـژ، بەنیازی نوێژی جەژن، وەك نوێژی بەیانی، ئەصـڵی سـوننەتەکە بـە ئەوەنـدە جێبـــەجێ دەکـــرێ، بابەکۆمـــەڵیش نـــەبێو لەمزگـــەوتیش نـــەبێ، وە لەهەرکوێیەك نوێژی لێ بکرێ دەبێ.

## ٢٥- باسی نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران
## بابُ صلاةِ والكُسُوفِ

{بڕوانـە: تـاج/١، زنجـیرە: ١٦٤ هـەتا زنجـیرە: ١٧٢ لـەژمارە: ٩١٨ وە هـەتا ژمارە: ٩٣٤ + پوختەی موسلیم زنجیرە: ٣٣٧، ژمـارە: ٤٤٥ + تجریـدی بوخـاری = پوختـەی بوخـاری بـەکوردی/١، زنجیرە: ٢٢، لـەژمارە: ٥٢٩ هـەتا ژمـارە: ٥٣٧ = ژمـارە: ١٠٦٥ فـتح البـاری + فیقهـی ئاسـان/١، زنجـیرە: ٩٦، لاپـەڕە: ٢٦٦ هـەتا لاپەڕە: ٢٧٠ وەهەتا زنجیرە: ٩٨}.

٥٢٦- عَنِ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِنْكَسَفَتِ اَلشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ اَلنَّاسُ: اِنْكَسَفَتِ اَلشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "إِنَّ اَلشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اَللَّهِ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا، فَادْعُوا اَللَّهَ وَصَلُّوا، حَتَّى تَنْكَشِفَ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـــدی بوخـــاری/١، ژمـــارە: ٥٣٠ = ١٠٤٣، ١٠٦٠، ١١٩٩. شیحا/٢١١٩ = مسلم/٩١٥}:

**موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو ڕۆژەی کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مرد، خۆرگیرا، خەڵك گوتیان: ئەوە لەبەر مردنی ئیبراهیم خۆرگیراوە!!**

**پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، کە بەڵگەیەکی روونو ئاشکران لەسەر یەکتایی خودا، ناوبەناو خودا، ئەم نیشانانەیان پیشان دەدا، هەتا بترسنو یادی گەورەییو دەسەڵاتی خودا بکەنەوە، جا نە لەبەر مردنی کەسو نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر دیتانن کەوا گیراون ئەوا لەخودا بپاڕێنەوەو دوعاو نزابکەن تابەربىن).**

**لەتاجا ئەم پترییەی هەیە: لەگێڕانەوەیەکدا: خەڵکی سەردەمی نەزانی دەیانگوت گوایە خۆرو مانگ لەبەر مردنی گەورە پیاوێ لەگەورەپیاوانی سەر رووی زەوی دەگیرێن! بەڵام ئەم قسەیە ڕاست نییە، چونکە ئەم دووانە نە لەبەر مردنی کەسو نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، بەڵکوو ئەمانیش دوو دروستکراون لەدروستکراوانی خودا، خودایش هەرچی حەزدەکا دەیکا، لەمەخلوقاتی خۆی، جا هەر کامێکیان گیران ئێوە نوێژ بکەن هەتا بەردەبێ. {تاج/١، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ٩١٨}. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ٤٤٥ = ٢٠٨٦ شیحا}.**

٥٢٧- وَلِلْبُخَارِيِّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {فَصَلُّوا وَادْعُوا حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ}.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٢٩ = ١٠٤٠، ١٠٥٧، ٣٢٠٤ فتح الباری}:

**ئەمە دەقەکەیەتی لە تجریدی بوخاریدا:**

**ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا خۆرگیرا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵستا بەپەلە چوو بۆ مزگەوت، لەپەلە پەلیدا،**

لەشپۆشـەکەی بـەکێش دەکـرد، ئێمـەیش لەخزمەتیـدا چـووین، جـا لـەناو مزگەوتەکـەدا دوورکـات نوێـژی خـۆرگیرانی بـۆ کـردین، تاخۆرەکـە بـەربوو، ئەوجا وتارێکی دا، بۆ مەردومەکەو سوپاس‌و ستایشی خودای کردو فەرمووی:

(لەڕاستیدا ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن لەنیشانە گەورەکانی خودا، نەلەبەر مردنی کەس‌و نەلەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، کاتێ دەبینن کەوا خـۆرگیراوە، یامـانگ گـیراوە نوێژبکـەن‌و لـەخودا بپاڕێنـەوەو نزابکـەن، تاخۆرەکـە، یـان مانگەکـە بـەردەبێ‌و خەمەکـەتان دەڕەوێتـەوەو ترسـەکەتان دەنیـشێتەوە). لەگێڕانەوەیـەکا، لـە ئەبوبـەکرەوە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووشـی: (بـەڵام خـودای گـەورە، بـەهۆی ئـەم دوو دیـاردەوە، بەندەکانی خۆی وریا دەکاتەوە هەتا لەقارو سەرپێچی لەفەرمانی بترسن).

٥٢٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) جَهَرَ فِي صَـلَاةِ اَلْكُـسُوفِ بِقِرَاءَتِـهِ، فَـصَلَّى أَرْبَـعَ رَكَعَـاتٍ فِـي رَكْعَتَـيْنِ، وَأَرْبَـعَ سَجَدَاتٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: فَبَعَثَ مُنَادِيًا يُنَادِي: اَلصَّلَاةُ جَامِعَةٌ.

{تجریـدی بوخـاری/١، ژمـارە: ٥٣٧ = ١٠٦٥. شـیحا ٢٠٩٠ + ٢٠٨٩ شیحا}:

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەنوێـژی خۆرگیرانـا، بـەدەنگی بـەرز قورئانەکـەی خوێنـد، چـوار چـەمینەوە (ڕوکـووع)ی لـەدوورکاتا ئەنجامـدا، بـەڵام لەهـەردوو ڕکاتەکـەدا، چـوار کوڕنووشـی بـرد، هـەر ڕکاتـەی دوو کوڕنـووش. {تـاج/١، زنجـیرە: ١٦٧، ژمـارە: ٩٢٤}. لەگێڕانـەوەی ژمـارە: (٢٠٨٩ شـیحا)دا، فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازکەرێکی نارد بانگەوازی هەڵدا: (اَلـصَّلَاةُ جَامِعَةٌ). ئەم گێڕانەوەیە لە تجریدی بوخاریدا (بەرگی/١، ژمارە: ٥٣٢) ئاوایە:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کەخۆرگیرا، بانگەواز هەڵدرا: (إِنَّ الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ) وا نوێژی خۆرگیران دەکرێ، بەکۆمەڵی، بەجەماعەت، زووکەن ئەم هەلە لەدەست خۆتان مەدەن!).

(ڕوونکردنەوە):

بۆ چۆنێتی نوێژی خۆرگیران‌و چۆنێتی چوار چەمینەوەکە بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٤٥ = شیحا ٢٠٨٦).

٥٢٩- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {اِنْخَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَصَلَّى، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، نَحْوًا مِنْ قِرَاءَةِ سُورَةِ اَلْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهُوَ دُونَ اَلْقِيَامِ اَلْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ اَلرُّكُوعِ اَلْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلاً، وَهُوَ دُونَ اَلْقِيَامِ اَلْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ اَلرُّكُوعِ اَلْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهُوَ دُونَ اَلْقِيَامِ اَلْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، وَهُوَ دُونَ اَلرُّكُوعِ اَلْأَوَّلِ، ثم رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ اَلشَّمْسُ. فَخَطَبَ اَلنَّاسَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {صَلَّى حِينَ كَسَفَتِ اَلشَّمْسُ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ}.

{تجریدی بوخاری بەرگی/١، ژمارە: ٥٣٤ = ١٠٥٢ فتح الباری. مسلم/شیحا ٢١٠٦ = مسلم ٩٠٧ + شیحا ٢١٠٨ = مسلم ٩٠٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەعەبباسی باوکی بێ) فەرموویی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆرگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خۆرگیرانی کرد، وە لەنوێژەکەدا گەلێ بەپێوە ڕاوەستاو، ماوەیەکی دوورو درێژ لەناو نوێژەکەدا، بەڕاوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، بگرە لەڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەمدا، بەقەد

سوورەتی بەقەرەی خوێند ئەوجا چەمینەوەی یەکەمی رکاتی یەکەمی بردو چووبۆ روکووع، وەلەناویدا، یادێکی زۆری خودای گەورەی کرد، ئەوجا سەری لەچەمینەوە هەڵبڕیو رێك ڕاوەستایەوەو دیسان قورئانێکی زۆری دوورو درێژی لەڕاوەستانی دووەمی ڕکاتی یەکەما خوێند، بەڵام کەمتر لە قورئانخوێندنی ڕاوەستانی یەکەمی ڕکاتی یەکەم، ئەوجا دیسان چەمییەوەو لەناو ئەم چەمینەوەیشدا، کەچەمینەوەی دووەمی رکاتی یەکەم بوو، تەسبیحاتو ویردێکی زۆری خوێند، بەڵام لەویردو تەسبیحاتی ناو چەمینەوەی یەکەمی ڕکاتی یەکەم کەمتر، ئەوجا سەری هەڵبڕیو پشتی بەرزکردەوەو فەرمووی: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ...» ئینجا دوو کوڕنووشی دوورو درێژی برد، ئیتر رکاتی یەکەم تەواو، ئەوجا هەڵسایەوە سەرپێو رکاتی دووەمیشی لەسەر هەمان شێوەی رکاتی یەکەم تەواو کرد، بەدوو وەستانو بەدوو چەمینەوەو بەدوو کوڕنووش، لەڕاوەستانەکانیدا قورئانی زۆری خوێند، لەناو چەمینەوەکانیدا ویردی زۆری خوێند، ئەوجا لەنوێژ بۆوەو خۆریش بەربووبوو، جا لەپاش تەواو بوونی نوێژەکە، وتارێکی دا بۆ خەڵکەکە... تاد).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژە بۆ ئەم گێڕانەوەیش دەکا، کە ئەمە دەقەکەیەتی (موسلیم شیحا ژمارە: ٢١٠٨و ٢١٠٩):

لە ژمارە: (٢١٠٨)دا، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەخۆرگیرانەکەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خۆرگیرانی بۆ موسوڵمانەکان کرد، هەشت چەمینەوەی تیادا ئەنجامدا، وە چوار کوڕنووش، لەسەر ئەم شێوەیە، لەرکاتی یەکەما چوار چەمینەوەو دوو کوڕنووش، لەرکاتی دووەمیشدا چوار چەمینەوەو دوو کوڕنووش).

لە ژمارە: (٢١٠٩ شیحا)دا، دەڵێ:

ئیبنو عەبباس فەرمووی: لەرۆژی خۆرگیرانەکەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم شێوەیە نوێژی خۆرگیرانی بۆ هاوەڵانی کرد: لەسەرەتاوە قورئانی خوێند، ئەوجا چەمیەوە، دیسان قورئانی خوێندو ئەوجا چەمیەوە، دیسان قورئانی خوێندو ئەوجا چەمیەوە، دیسان قورئانی خوێندو ئەوجا چەمیەوە، ئەوجا دوو کوڕنووشی برد، ئیتر رکاتی یەکەم تەواو، لەرکاتی دووەمیشا هەروا: چوار وەستانو چوار چەمینەوەو دوو کوڕنووشی ئەنجامدا، کە ئەمە گشتی دەکاتە هەشت چەمینەوەو چوار کوڕنووش، لەدوو ڕکاتا، هەر رکاتەی چوار چەمینەوەو دوو کوڕنووش).

٥٣٠- {وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) مِثْلُ ذَلِكَ}:

لەموسلیمدا، لەکۆتایی ژمارە (٢١٠٨ شیحا)وە، فەرموودەکە لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، ئەوجا لەکۆتایەوە دەفەرموێ: (عەلی کوڕی ئەبو طالیبیش هەمان فەرموودە دەگێڕێتەوە).

٥٣١- وَلَهُ: عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ بِأَرْبَعِ سَجَدَاتٍ}.

{شيحا ٢٠٩٩ = مسلم ٩٠٤}:

موسلیم لە فەرموودەیەکی درێژدا، کە ژمارەکەی لە تەرقیمو ژمارە دانانی شێخ خەلیل مەئموون شیحادا (٢٠٩٩)یە دەگێڕێتەوە، لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە، دەفەرموێ: لەڕۆژی خۆرگیرانەکەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خۆرگیرانی بەکۆمەڵی، بە جەماعەت کرد، بۆ موسوڵمانان، شەش روکوعو چوار سوژدەی تیادابرد، بەدوو رکات کردی، هەر رکاتەی سێ قورئانخوێندنو سێ چەمینەوەو دوو کوڕنووشی تیادا ئەنجامدا).

٥٣٢- وَلِأَبِي دَاوُدَ: عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: {صَلَّى، فَرَكَعَ خَمْسَ رَكَعَاتٍ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَفَعَلَ فِي اَلثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ}.

{ضعيف، سنن أبي داود: ١١٨٢}:

ئـەبو داوود (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) بەڕشـتەی خـۆی هـەتا سـەر ئوبەییی کوڕی کەعب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، ئوبەیی دەفـەرموێ: لەخۆرگیرانەکەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات نوێژی سوننەتی خۆرگیرانی بەکۆمەڵی بۆ موسوڵمانان کرد، لەرکاتی یەکەما پێنج چەمینەوەو دوو کوڕنووشی ئەنجامدا، هەروا مانەندی ئەوە لەرکاتی دووەما، لەویشا پێنج ڕوکووعو دوو سوژدەی ئەنجامدا).

٥٣٣- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {مَا هَبَّتْ رِيحٌ قَطُّ إِلَّا جَثَا اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَقَالَ: "اَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا رَحْمَةً، وَلَا تَجْعَلَهَا عَذَابًا"} رَوَاهُ اَلشَّافِعِيُّ وَالطَّبَرَانِيُّ. وَعَنْهُ: {أَنَّهُ صَلَّى فِي زَلْزَلَةٍ سِتَّ رَكَعَاتٍ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَقَالَ: هَكَذَا صَلَاةُ اَلْآيَاتِ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ. وَذَكَرَ اَلشَّافِعِيُّ عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) مِثْلَهُ دُونَ آخِرِهِ.

{ضعيف جداً، المشكاة: ٣٤٣/١}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لە عەبباسی باوکی) فەرمووی: هەموو جارێ کەبا هەڵی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر هەردوو چۆکی دادەنیشتو دەیفەرموو: ("اَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا رَحْمَةً، وَلَا تَجْعَلَهَا عَذَابًا") ئەی خودایە! بە میهرەبانی خۆت، ئەم بایەمان بۆبکە بەمایەی سۆزو میهرەبانی خۆتو مەیکە بەهۆی سزای خۆت). شافیعیو طەبەرانی گێڕاویانەتەوە (ضعيف جداً، المشكاة: ٣٤٣/١).

دیسان دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەیهەقی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕشتەی خۆی دەگێڕێتەوە: کە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە بوومەلەرزەیەکا، دوو ڕکات نوێژی نیشانەی کرد، کەپێی دەگوترێ (صَلاَةُ الآيَاتِ) لەهەر ڕکاتێکا سێ چەمینەوەو دوو کوڕنووشی ئەنجامدا، کەکۆی چەمینەوەکان لەهەردوو ڕکاتەکەدا، دەکاتە شەش

چەمینەوە، وەکۆی کورنووشەکانیش لەهەردوو رکاتەکەدا دەکاتە چوار کورنووش. ئەوجا ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نوێژی نیشانە گەورە سروشتییەکان، کەناو بەناو روودەدەن، کەپێی دەگوترێ صەلاتی ئایات ئاوایە، بەم شێوەیە، بەدوو رکاتو شەش چەمینەوەو چوار کورنووش دەکرێ!} . {بەیهەقی ٣/٣٤٣، ژمارە: ٤٩٢٩. بەیهەقی دەڵێ: فەرموودەیەکی صەحیحە لەئیبنو عەبباسەوە} .

دیسان دانەر پێشەوا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: شافیعیش مانەندی ئەم نوێژی نیشانەیە لەسەر ئەم شێوەیە، لەپێشەوا عەلی کوری ئەبو طالیبەوە باس دەکا، کە لە بوومەلەرزەکەی بەصرەدا، عەلی دوو رکات نوێژی سوننەتی ئایاتی بە شەش چەمینەوەو چوار کورنووش ئەنجامداوە، لەهەر رکاتێکا سێ چەمینەوەو دوو کورنووش، کە سەرجەمیان دەکاتە شەش چەمینەوەو چوار کورنووش، بەڵام ئەوەی تیادا نییە، کە عەلی بڵێ: نوێژی نیشانەکان ئاوایە).

(روونکردنەوە):

پوختەی بڕیارەکانی باسی نوێژی سوننەتی خۆرگیرانو مانگ گیران:

١- کۆی فەرموودەکانی نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران یەکسانە بە (٥٣٣ — ٥٢٥ = ٨) هەشت فەرموودە.

٢- شێوەی یەکەمی چۆنێتی کردنی نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران، ئەوەیە کە بەدوو رکات بکرێ، لەهەموو رکاتێکا دوو چەمینەوەی تیابێ، لەگەڵ دوو کورنووشا، لەهەموو رکاتێکا، سوورەتی فاتیحەو سوورەتی پاش فاتیحە، دووجار دەخوێنرێ، جارێ لەڕاوەستانی یەکەمداو جارێ لەڕاوەستانی دووەمدا، مەزهەبی شافعی ئەم شێوەیەی هەڵبژاردووە.

٣- بۆ کەسێ بیەوێ ئەصڵی سوننەتەکە بەیەکێ لەم دوو بۆنەیەوە، جێبەجێ بکا، دەتوانی دوو رکات نوێژی سوننەتی ئاسایی، وەك سوننەتی

دیاری مزگەوت، بەنیازی خۆرگیران، یا مانگ گیران بکا، بەپێی بۆنەکە، ئیتر بەتەنیا خۆی بیکا، یا بەکۆمەڵی بیکەن دەبێ، ئەمەڕای حەنەفییەکانە.

٤- بەشێوەی گشتی نوێژی خۆرگیران، یا مانگ گیران سوننەتە، فەرز نییە، بەتەنیا دەکرێو بەکۆمەڵیش دەکرێ.

٥- دووركات نوێژی سوننەتی ئایات لەکاتی ڕوودانی کارەساتی سروشتیدا سوننەتە، وەك لەپاش ڕوودانی زەمینلەرزەو، لەپاش مردنی زانایەکی گەورەو، لەکاتی گەردەلوولو زریانو شتی تری وادا. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٥٢٥ هەتا ژمارە: ٥٢٧ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٤٥٠ + تاج/١، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ٩٣٤، لاپەڕە: ٤٥٧ چاپی چوارەم}.

## ٢٦- نوێژە بارانە
## بابُ صَلاَةِ الإِسْتِسْقَاءِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٧١ — ٢٧٨، زنجیرە: ٩٩ + تاج/١، لاپەڕە: ٤٥٧ — ٤٦٧ لەزنجیرە: ١٧٣ وە هەتا زنجیرە: ١٧٧ لەژمارە: ٩٣٥ وە هەتا ژمارە: ٩٤٨ + تجریدی بوخاری/١، لاپەڕە: ٤٩١، زنجیرە: ٢١، لەژمارە: ٥١٦ وە هەتا ژمارە: ٥٢٨ + پوختەی موسلیم زنجیرە: ٣٣٨، ژمارە: ٤٤٧ - ٤٥٠}.

٥٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {خَرَجَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مُتَوَاضِعًا، مُتَبَذِّلًا، مُتَخَشِّعًا، مُتَرَسِّلًا، مُتَضَرِّعًا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَمَا يُصَلِّي فِي اَلْعِيدِ، لَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَأَبُو عَوَانَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{ترمذی رقم: ٥٥٨. أبو داود: رقم: ١١١٥. ابن ماجة رقم: ١٢٦٦. نسائی ١٥٦/٣. دارقطنی ٦٨/٢. حاكم ٤٧٤/١. بیهقی ٣٤٤/٣. وابن حبان رقم: ٢٨٦٢}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیسحاق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: وەلیدی کوڕی عوتبە، لەوکاتەدا کە فەرمانڕەوای سەر شاری مەدینە بوو، ناردمی بۆلای ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) هەتا لەبارەی چۆنێتیی نوێژە بارانەی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی بپرسم، کە لێم پرسی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەرپووتیو بە کزۆڵەییو بە ملکەچیو بەشێنەییو بەکوڕووزانەوە، لەشار دەرچوو، لەڕێ هەر دەپاڕایەوەو دەلالایەوە، هەتا گەیشتە نوێژگاکە، کە لەدەرەوەی شاربوو، جا لەوێ سەرکەوتە سەر دوانگەکەو رۆیشتە سەر مینبەرەکە، بەلام ئەو وتارەی کە ئەوداى، وەك ئەم وتارانەی کەئێوە دەیاندەن، بەبۆنەی نوێژە بارانەوە وانەبوو، بەڵکوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر دووعاو نزای دەکردو دەلالایەوەو دەپاڕایەوەو ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، تا لەدواییدا دوورکات نوێژی سوننەتی نوێژە بارانەی بەجەماعەت بۆ ئامادەبوان کرد، لەچەشنی نوێژی جەژنی، کە لەجەژنانا دەیکرد بۆ موسوڵمانان.

٥٣٥- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: {شَكَا اَلنَّاسُ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قُحُوطَ الْمَطَرِ، فَأَمَرَ بِمِنْبَرٍ، فَوُضِعَ لَهُ فِي اَلْمُصَلَّى، وَوَعَدَ اَلنَّاسَ يَوْمًا يَخْرُجُونَ فِيهِ، فَخَرَجَ حِينَ بَدَا حَاجِبُ اَلشَّمْسِ، فَقَعَدَ عَلَى اَلْمِنْبَرِ، فَكَبَّرَ وَحَمِدَ اَللَّهَ، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّكُمْ شَكَوْتُمْ جَدَبَ دِيَارِكُمْ، وَقَدْ أَمَرَكُمْ اَللَّهُ أَنْ تَدْعُوَهُ، وَوَعَدَكُمْ أَنْ يَسْتَجِيبَ لَكُمْ، ثُمَّ قَالَ: اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ اَلْعَالَمِينَ، اَلرَّحْمَنِ اَلرَّحِيمِ، مَالِكِ يَوْمِ اَلدِّينِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اَللَّهُمَّ أَنْتَ اَللَّهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ اَلْغَنِيُّ وَنَحْنُ اَلْفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ قُوَّةً وَبَلَاغًا إِلَى حِينٍ" ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمْ يَزَلْ حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبِطَيْهِ، ثُمَّ حَوَّلَ إِلَى اَلنَّاسِ ظَهْرَهُ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى اَلنَّاسِ وَنَزَلَ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَأَنْشَأَ اَللَّهُ سَحَابَةً، فَرَعَدَتْ، وَبَرَقَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَقَالَ: "غَرِيبٌ، وَإِسْنَادُهُ جَيِّدٌ".

{حَسَنٌ، سُنَنُ أَبِي دَاوُدَ: ١١٧٣}:

دایکــه عائیــشەی هاوســەری پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر پێغەمبــەرو رەزاو رزەحمــەتی خــودا لەهــەموو هــاوەڵو پــەیڕەوان و شــوێنکەوتوانی بــێ، هــەتا رۆژی قیامــەت) فــەرمووی: موســوڵمانان لــەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سکاڵایان لەدەستی بێ بارانی کرد، حــەزرەتیش (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فــەرمانی کــرد دوانگەیــەکیان لەنوێژگاکە لەدەشتەکە بۆ دانا، بەڵێنیشی دا بە خەڵکەکەو رۆژێکی دیاری کرد بۆیان، کە لەو رۆژو کاتەدا هەموو دەربچن بۆ ئەوێ‌و لەوێ ئامادەبن. عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جا لەگەڵ گزنگی خۆردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشار دەرچوو، وەڕۆیشت لەنوێژگاکە، لەسەر دوانگەکە دانیشت‌و دەستی کرد بە ئەڵلاهوئەکبەر کردن‌و سوپاسی خودای گەورەو سەروەری کردو ئینجا فەرمووی: (ئێوە دادو هاوارتانە لەدەستی قات‌و قڕیی وڵاتەکەتان‌و، لەدەستی بێبارانی‌و هەڵبواردنی پەڵەو بارینی باران لەکات‌و ساتی خۆی، وە خودای گەورەو سەروەریش فەرمانی بەئێوە کردووە کەلێی بپاڕێنەوەو بەڵێنیشی پێتان داوە کە لێتان گیرابکاو بێت بەدەنگتانەوە.

ئەنجا فەرمووی: سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، خودایەکی بەخشندەو میهرەبانە، خاوەنی رۆژی تۆڵەو سزادانە، بێجگە لەیەزدانی پاك خودای تر نییە، خودایەکی وەهایە، کە ئەوەی بیەوێ بیکا دەیکا، خۆی باڵادەستە، باڵا دەستی نییە، ئەی خودایە! هەر خۆت خودای بەهەقیت‌و بێجگە لەتۆ خودای بەهەقی تر نییە، تۆ دەوڵەمەندو داراو بێ نیازیت، وە ئێمە سەرجەم هەژارو نەدارین‌و هەمیشە چاومان لەرێزەی خوانی تۆیە، خودایە! بارانمان بۆ ببارێنەو بارانمان فریاخەو بیکە بەمایەی هێزو دەستمایەی ماوەی ژیانمان!

ئـەنجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەدەم دووعـاو نـزاو پاڕانەوەوە، بەرە بەرە هەردەستەکانی بەرزدەکردەوە، هـەتا سـپیدەی هـەردوو بنباخـەڵی دەرکـەوت، ئـەنجا پـشتی کـردە خەڵکەکـەو ئـەو بەرماڵـەی دابـووی بەشانیا ئـاوەژووی کـردو ئـەنجا راسـتو چەپیـشی کـرد، لەپاشـا رووی کـردەوە خەڵکەکەو لەدوانگەکە دابـەزیو دوو رکـات نوێـژی بەجەماعـەت بۆیـان کـرد، ئیتر خودا گورج پەڵەیێ هەوری پێکهێناو هەورەکە دەستی کـرد بەگرمانـدنو تریشقەو بروسکەدان، وە بەفەرمانی خودا باران باری!

هێـــشتا پێغەمبـــەر (دروودی خـــودای لەســـەر بـــێ) نەگەیـــشتبووە مزگەوتەکەی خۆی کە لافاو هەڵسا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەرنجیدا کـەوا خەڵکەکـە بەپەلـە پـڕووزە خۆیـان دەکـەن بـەکونی ژووردا و لەتاو بارانەکە هەڕادەکەن، لەبەرئەوە پێکەنی، بەڕادەیەکی وا کـە کاکیلـەکانی دەرکـەوتن. جـا فـەرمووی: (شـایەتی دەدەم کـەخودا تـەوانای هـەموو شـتێکی هەیە، وەمنیش بەندەو پێغەمبەری خودام). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٦، ژمـارە: ٩٤١ – ئـەبو داوود/ ئیبنـو حـەببان/ حـاکم/ حـاکم ئـەم حەدیـسەی بەصـەحیح داناوە}.

٥٣٦– وَقِصَّةُ اَلتَّحْوِيلِ فِي "اَلصَّحِيحِ" مِنْ: حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْـدٍ، وَفِيـهِ: {فَتَوَجَّهَ إِلَى اَلْقِبْلَةِ، يَدْعُو، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ}.

{تجریـدی بوخـاری/١، ژمـارە: ٥١٦ = ١٠٠٥، ١٠١١، ١٠١٢، ١٠١٣، ١٠٢٤، ١٠٢٥، ١٠٢٦، ١٠٢٧، ١٠٢٨، ٦٣٤٣ فـــتح البـــاری. پوختـــەی موسلیم/٤٤٧ = ٢٠٦٩، ٢٠٧٠ شیحا}:

ئەمە ئەو فەرموودەیە کە دانـەر لـەم فەرموودەیـەدا ئامـاژەی بـۆ دەکـا، لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

عەبـدوڵڵای کـوڕی زەیـدی ئەنـصاری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچـوو بـۆ نوێژگاکـە،

بۆ نوێژە بارانە، بۆ خۆم دیتم لەکاتی وتار خوێندنەکەیدا، کە دەستی کرد بە پاڕانەوەو نزاکردن، پشتی کردە خەڵکەکەو رووی کردە رووگەو دەستی کرد بە پاڕانەوەو نزاکردن، لەپاشا پۆشاکەکەی هەڵسووڕاند، واتە: راستو چەپی کرد، ئەوجا دوو رکات نوێژی نوێژە بارانەی بە کۆمەڵی، واتە: بەجەماعەت بۆمانکرد، فاتیحەو قورئانی دوا فاتیحای بەدەنگی بەرز لەناویانا خوێند، وەك نوێژی جەهری). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٣، ژمارە: ٩٣٧}. {ژیاننامەی عەبدوڵلا والەپاش ژمارە: (٥٣٧)وە}.

٥٣٧- وَلِلدَّارَقُطْنِيِّ مِنْ مُرْسَلِ أَبِي جَعْفَرٍ اَلْبَاقِرِ: وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ" لِيَتَحَوَّلَ اَلْقَحْطُ.

{دار قطنی ٢/٦٦، حاکم ١/٤٧٣}:

دارە قوطنی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە فەرموودەیەکی مورسەلی جەعفەری باقیردا (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، کە ئیمامی ئەبو جەعفەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە لەشپۆشەکەی خۆی راستو چەپکرد، هەتا ئاماژەبێ بۆئەوە: خوا یاربێ ئاوا حاڵو بارودۆخ لەناخۆشییەوە دەگۆڕێ بۆ خۆشیو لەگرانییەوە بۆ هەرزانیو لەتووڕە بوونەوە بۆ لێڕازیبوون. {فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٧٥ چاپی ئێران}.

(روونکردنەوە):

١- ئەبو جەعفەری ئەلباقیر، ناوی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیبە، فەرموودەی لەباوکیو لەجابیری کوڕی عەبدوڵلا بیستووە، کەواتە: ئەبو جەعفەر خۆی تابیعییە، جەعفەری کوڕیو کەسانی تریش فەرموودەیان لەو وەرگرتووە، لەساڵی (٥٦)ی پەنجاو شەشی کۆچیدا لەدایك بووە، بۆیە پێی دەگوترێ (الباقِر) واتە: گوشادو بەرفرەوان، چونکە خاوەنی زانستێکی زۆری فرەوان بووە، ساڵی (١١٧)ەی

کۆچی مردووە، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا مردووە، لەگۆڕستانی بەقیع نێژراوە، لەو گۆشەیەدا نێژراوە، کەباوکیو مامەی باوکی حەسەنی کوڕی عەلی تیادا مێژراون.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی مازنی ئەنصارییە، ئوحودییە، بەڵام بەدری نییە، واتە: ئامادەی غەزای ئوحود بووە، بەڵام بەشداری لەغەزای بەدردا نەکردووە، ئەم عەبدوڵڵایە جیایە لەو عەبدوڵڵای کوڕی زەیدە، کەچۆنێتی بانگدانی بەخەوبینی، کەلەپێشەوە لەم کتێبەدا، لە ژمارە: (١٩٠)دا، ژیاننامەکەی رابورد.

عەبدوڵڵا خۆیو باوکیو دایکی (رەزای خودا لەهەرسێکیان بێ) هاوەڵی پێغەمبەر بوون، واتە: صەحابەی بوونو بەخزمەتی گەیشتوونو ئیمانیان پێ هێناوەو لەسەر ئەو ئیمانو ئیسلامەتییە بەردەوام بوون، هەتا مردوون.

عەبدوڵڵا (٤٨) چلو هەشت فەرموودەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوو پیرن، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم، ئەو هەشت فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، هەر کەسەیان بەڕشتەو گفتەو دەقی خۆی، گەرچی مەبەستو ئەنجام لە فەرموودەکە یەك شتەو لەبنەڕەتدا لەیەکەوە نزیکن.

عەبدوڵڵا بەشداری لەکوشتنی موسەیلەمەی کەززابا کردووە، ئەم زاتانە فەقێو شاگردی بوون، بۆ گێڕانەوەی فەرموودەکانی: عەببادی کوڕی تەمیم کەبرازای بووە، لەگەڵ یەحیای کوڕی عەمارەو کەسانی تریش، لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا، لەمانگی قوربانـدا، لەشەڕەکەی رۆژی حەررەدا، کە لە (٦٣) شەستو سێی کۆچیدا بوو شەهید کرا. (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ)

٥٣٨- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ اَلْمَسْجِدَ يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَائِمٌ يَخْطُبُ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، هَلَكَتِ اَلْأَمْوَالُ،

وَانْقَطَعَتِ اَلسُّبُلُ، فَادْعُ اَللَّهَ (عَزَّ وَجَلَّ) يُغِيثُنَا، فَرَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "اَللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اَللَّهُمَّ أَغِثْنَا..."} فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ، وَفِيهِ اَلدُّعَاءُ بِإِمْسَاكِهَا مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٢١ = ١٠١٣ فتح البارى. مسلم شيحا ٢٠٧٥ = مسلم ٨٩٧}:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکی مەدینە تووشی قاتو قڕی بوون، ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەریك بوو وتاری دەدا، لەوکاتەدا پیاوێ، لەعەرەبە سارانشینەکان هەڵساو گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! لەبەر بێ بارانی، ماڵاتو ئاژەڵ قڕبوونو ماڵو منداڵ برسی بوونو ڕێگەوبان بڕا، چونکە وڵاخی سواری نەماوە، دەی بفەرموو لەخودا بپاڕێرەوە بۆمان کەباراانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: (ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە! ئەی خودایە! بارانمان فریاخە!).

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەوکەسەی کەگیانی منی وا لەدەستیدا، ئاسمان وەك مینا ساف بوو، یەك پەڵە هەوری پێوە نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دانە نەواند، هەتا لەبەرەکەتی دوعاکەی ئەوەوە، بایێ هەڵی کردو پارچە هەوری وەك کێوی پێکهێنا، بەرەبەرە هەورەکە یەکی گرتو توند بوو، ئیتر باران وەك پلووسك دایکردو ئاسمان دەتگوت کوندەی پڕ لەئاوی سەرەوژێرەوە کراوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوانگە نەهاتە خوارەوە، هەتا دای کردە باران، سەربانی مزگەوتەکە دڵۆپەی کرد، باراناوەکە دڵۆپ دڵۆپ بەسەر ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەردا دەهاتە خوارەوە، ئیتر ئەو حەفتەیە سەراسەر هەتا ڕۆژی هەینی دوایی، سەرومڕ بارانمان بۆ باری.

جا لەهەینی دواییدا، هەر ئەو پیاوەی پێشوو یاپیاوێکی تر، لەکاتی وتاری هەینیدا، هاتو بەپێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا ڕاوەستاو عەرزیکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! خانوو ڕووخاو ڕێگەوبان بڕاو ماڵو سامانو ماڵات، لەلافاوا خنکان، ئەوەندە بارانی زۆر باری، بفەرموو لەخودا بپاڕێرەوە کەئیتر ئەم بارانە بگرێتەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەردەخەنەیێ گرتیو هەردوو دەستەکانی بەرزەوە کردو فەرمووی:

«اللّٰهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلاَ عَلَيْنَا». خودایە! بەدەوروبەرمانا ببارێنە، نەوەك بەسەرمانا.

ئەنەس فەرمووی: ئیتر سەرەنجم دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی پیرۆزی بۆ هەرلایێ ئاماژەی دەکرد، هەورەکە لەوێ دەڕەوییەوە، سەرەنجام هەورەکە لەسەر ئاستی شاری مەدینە ڕەوییەوەو وەك بازنە، وەك کلاوڕۆژنەی لێ هات، شیوی قەناتیش کە یەکێکە لەشیوەکانی شاری مەدینە، یەك مانگی ڕەبەق لافاوی نەنیشتەوە، لەهەرلایەکی ولاتیشەوە کەسێ دەهات بۆ مەدینە، هەواڵو باسی ئەوبارانە زۆرەی دەگێڕایەوە.

ئەمە پوختەی گێڕانەوەکانی ئەم فەرموودەیە کەدانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی پێ دەکا، لەبوخاریو موسلیمدا. {تاج/١، زنجیرە: ١٧٥، ژمارە: ٩٤٢ چاپی چوارەم}.

٥٣٩- وَعَنْ أَنَسٍ" {أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) كَانَ إِذَا قَحِطُوا يَسْتَسْقِي بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ اَلْمُطَّلِبِ. وَقَالَ: اَللّٰهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَسْقِي إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، فَيُسْقَوْنَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٥٢٠ = ١٠١٠، ٣٧١}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران کەتووشی بێ بارانی دەبوون، عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەخودا داوای بارانی

دەکرد، کە لەبەر خاتری عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب بارانیان بۆ ببارێنیو دەیگوت: خودایە! ئێمە لەمەوپێش لەکاتی پێویستی باراندا، کاتێ کە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیاندا بوو، ئەوزاتە، واتە: پێغەمبەر خۆیمان دەکرد بەدەستگیرو تکاکار لەلای تۆ، وەبەخاتری ئەو لەتۆ دەپاڕاینەوە، تۆیش خاتری ئەوت دەگرتو، دەهاتیت بەهاوارمانەوەو، بارانت بۆ دەبارانین، ئێستایش بیکە بەخاتری عەبباسی مامەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بارانمان بۆ بڕەخسێنە!).

ئەنەس فەرمووی: ئیتر بارانیان بۆ دەباری. {تاج/١، زنجیرە: ١٧٨، ژمارە: ٩٤٩}.

٥٤٠- وَعَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: {أَصَابَنَا -وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ- (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَطَرٌ قَالَ: فَحَسَرَ ثَوْبَهُ، حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ اَلْمَطَرِ، وَقَالَ: "إِنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{٢٠٨٠ شيحا = مسلم ٨٩٨}:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) باران باری، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جلەکانی خۆی هەڵماڵیو سەری خۆی قوت کردو قۆڵو لاقی خۆی رووت کردو خۆی دایە بەربارانەکە، ئێمەیش گوتمان: ئەی پیغەمبەری خودا! بۆ وا دەکەی؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (چونکە ئەم بارانە تازە لەلای پەروەردگاری گەورەوە هاتووە، لەبەر ئەوە موفەڕکە). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٧، ژمارە: ٩٤٨}.

٥٤١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا):أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا رَأَى اَلْمَطَرَ قَالَ: {اَللَّهُمَّ صَيِّبًا نَافِعًا} أَخْرَجَاهُ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٥٢٤ = ١٠٣٢ فتح البارى. لَمْ يُوَافِقْهُ مُسْلِمٌ عَلَى تَخْرِيجِهِ، وَإِنْ كَانَ أَصْلُهُ فِيهِ، فتح البارى/٢/٦١٠ – خاتمة}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبارانی دەدی، دەیفەرموو: (اَللّهُمَّ صيّباً نَافِعاً. ئەی خودایە! بیگێڕی بەبارانێکی لێزمەی خورزمو سوودمەند). {تاج/١، زنجیرە: ١٧٦، ژمارە: ٩٤٣ چاپی چوارەم}.

٥٤٢- وَعَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دَعَا فِي اَلِاسْتِسْقَاءِ: {اَللَّهُمَّ جَلِّلْنَا سَحَابًا، كَثِيفًا، قَصِيفًا، دَلُوقًا، ضَحُوكًا، تُمْطِرُنَا مِنْهُ رَذَاذًا، قِطْقِطًا، سَجْلًا، يَا ذَا اَلْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ} رَوَاهُ أَبُو عَوَانَةَ فِي "صَحِيحِهِ".

{أبو عوانة/ ١/١٢٩}:

سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر لەداوای بارانا، ئاوا نزای کرد، فەرمووی: {اَللَّهُمَّ جَلِّلْنَا سَحَابًا، كَثِيفًا، قَصِيفًا، دَلُوقًا، ضَحُوكًا، تُمْطِرُنَا مِنْهُ رَذَاذًا، قِطْقِطًا، سَجْلًا، يَا ذَا اَلْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ} واتە:

ئەی خودایە! هەورێ بێ ئیقلیمگیر بێ، چڕوپڕ بێ، بیکا بەگرمەگرمو تەریشقە تریشقو شریخە شریخ، بەخوڕو گوڕ بێ، دەم بەپێکەنینی بروسکەو چەخماخە بێ، بەبارانەکەی ئاوپەرژینمان بکە، وردە وردە بباری، ئەوجا ببێ بەلێزمەیەکی بەخوڕ، وەك كوندەی سەرەولێژ دابارێ!) ئەبو عەوانە لەصەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە.

٥٤٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {خَرَجَ سُلَيْمَانُ عَلَيْهِ اَلسَّلَامُ يَسْتَسْقِي، فَرَأَى نَمْلَةً مُسْتَلْقِيَةً عَلَى ظَهْرِهَا رَافِعَةً قَوَائِمَهَا إِلَى اَلسَّمَاءِ تَقُولُ: اَللَّهُمَّ إِنَّا خَلْقٌ مِنْ خَلْقِكَ، لَيْسَ بِنَا غِنًى عَنْ سُقْيَاكَ، فَقَالَ: ارْجِعُوا لَقَدْ سُقِيتُمْ بِدَعْوَةِ غَيْرِكُمْ} رَوَاهُ أَحْمَدُ وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{ضعيف، الإرْواء/٦٧٠. حاكم رقم: ١٢١٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سولەیمان پێغەمبەر (سلاوی لەسەر) لەشار

دەرچوو بۆ نزای داوای باران، لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسوڵمانانی سەردەمی خۆی، تەماشای کرد مێروولەیێ لەسەر پشت ڕاکشاوە، قاچەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردۆتەوەو لەخودا دەپاڕێتەوەو داوای باران لەخودا دەکاو دەڵێ: ئەی خودایە! ئێمە جۆرێکین لەدروستکراوانی خۆت، بێ نیازنین لەبارینی بارانو ئاتاجی بارانی رەحمەتی تۆین!).

سولەیمان بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: (بگەڕێنەوە بۆ شار، پێویست بەنزای ئێوە ناکا، بەهۆی نزای ئەو مێروولەیەوە خودا بارانی رەحمەتتان فریادەخات!).

٥٤٤- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اسْتَسْقَى فَأَشَارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلَى اَلسَّمَاءِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم شيحا ٢٠٧٢ = مسلم ٨٩٦}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنزاوپاڕانەوەی داوای باران، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە، پشتی دەستەکانی دەکردە ئاسمانو بەری دەستەکانی دەکردە زەوی).

(ڕوونکردنەوە):

١- لەم باسەدا (٥٤٤ — ٥٣٣ = ١١) یازدە فەرموودە هەیە.

٢- دەرچوون بۆ نوێژە بارانە واسوننەتو باشە کەبەکزیو پەرپووتیو داماوی لەشار دەرچن بۆ نوێژگاکە، وە بەردەوام سەرگەرمی پاڕانەوەو یادی خودابن.

٣- لەپێش نوێژەکەوە ئەوەندەی دەتوانرێ نزاوپاڕانەوەو سوپاسی خودا بکەن، ئەوسا دوو رکات نوێژ ڕێك وەك نوێژی جەژن بەجەماعەت بکەن، مەلاکە بەدەنگی بەرز فاتیحەو سوورەتی پاشی بخوێنێ، لەهەردوو رکاتەکەدا. جاکاتێ لەنوێژ بوونەوە، پێشنوێژ دوو وتاریان بۆ بخوێنێتەوە.

٤- كاتی نوێژە بارانە كاتی نوێژی جەژنە، هەندێ دەفەرموون: كاتی تایبەتی بۆ نییە.

## ٢٧- باسی جلوبەرگ
## بَابُ اللِبَاسِ

بڕوانە: تاجول ئوصول بەرگی/٣، لاپەڕە/٢٤٤ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٢ هەتا زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٣٤.

٥٤٥- عَنْ أَبِي عَامِرٍ اَلْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ اَلْحِرَ وَالْحَرِيرَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{تجريدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٤٢ = ٥٥٩٠ فەتحولباری}:

دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو عامیری ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (كۆمەڵانێ لەگەڵ موسوڵمانی من پەیدا دەبن، داوێن پیسی بەحەڵاڵ ددەزانن، وەهەروەها ئاوریشم بۆ پیاو بەحەڵاڵ دەزانن، وەئارەق و مەی و بادەو نەی و سازو سەمتوورو تفاقی بەزم و ڕەزم بەحەڵاڵ دەزانن، هۆزگەلێكیش لەپاڵ كێوێكا هەڵ دەدەن و دادەبەزن و باروبنەی لێ دەخەن و دەچنە هەوار، شوانەكەیان ئێواران ڕانەكەیان دەباتەوە بۆیان، لەپاش لەوەڕانی ڕۆژ، بۆ دۆشین و حەوانەوەو شتی تری وا، كاتێ هەژارێ دێت بۆلایان، داوای یارمەتیەكیان لێی دەكات بۆ پێویستی خۆی، بەشی نادەن و بەبڕوبیانووی ئاوا، كەپێی بڵێن: سبەینێ وەرەوە بۆلامان، دەستیان پێوە دەنێن. جا لەبەر ئەم جۆرە تاوانە ناشیرینانەیان، شەوێ خودا تۆڵەو سزای سەختیان بۆ دەنێرێ و كێوەكە تەبگ دەكا بەسەریانداو هەموو خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەبن بەژێر هەرەسی

کێوەکەوە، وە ئەوانەیشیان کەنەبوون بەژێر رمانی کێوەکەوە، خودا بیـچمیان دەگۆڕێو دەیانکات بەمەیموونو بەراز، هەتا رۆژی قیامەت ئـەم جـۆرە سـزایە لەناو ئەم گەلی ئیسلامەدا هەر دەمێنێ، ناوبەناو، بۆ پەندو ئامۆژگاری، لێیـان رۆدەچـن بـەناو نـاخی زەویـداو، لێیـان دەبـێ بـەژێر هـەرەسو رووخانـەوەو، لێیـان دەبـێ بەمـەیموونو بـەراز). {تـاج/٣، زنجـیرە: ٢٦، ژمـارە: ٢٧٥٢ چـاپی چوارەم}:

(روونکردنەوە):

ئـەبو عـامیری ئەشـعەری هـاوڕێی پێغەمبـەرە، دەڵـێن: نـاوی عوبەیـدی کوڕی وەهبە، لەشام نیشتەجی بوو، لەبنەڕەتدا، سەر بەهۆزەکانی یەمەن بوو، لەسەردەمی عەبدولەلیکی کوڕی مەروانا، فەرمانی هەقی بەجێ هێناو مـەرگ بوو بـەمیوانی، دیـارە کەئـەبو عـامیری مـامی ئـەبو مووسـای ئەشـعەری نییـە، چونکە ئەو لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەغەزای حونەیدا شەهید بووە، دروودی خـودای گـەورەو سـەروەر لەسـەر پێغەمبـەر بـێو رەزاو رەحمـەتی خـودایش لەسەر گشت یارویاوەرو هاوەڵو پەیڕوانی بێت هەتا رۆژی دوایی. ئامین.

٥٤٦- وَعَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنـهُ) قَـالَ: {نَهَـى اَلنَّبِـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) أَنْ نَشْرَبَ فِي آنِيَةِ اَلذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَأَنْ نَأْكُـلَ فِيهَـا، وَعَـنْ لُـبْسِ اَلْحَرِيـرِ وَالدِّيبَاجِ، وَأَنْ نَجْلِسَ عَلَيْهِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختـەی بوخـاری/٥، ژمـارە: ١٨٩٧ = ٥٨٣٧ فـتح البـاری + تجریـد/٥، ژمارە: ١٨١٣ = ٥٤٢٦، ٥٦٣٢، ٥٦٣٣، ٥٨٣١، ٥٨٣٧ فتح البـاری. أخرجـة مسلم فی اللباس والزینة باب تحریم إستعمال إناءِ الذَّهَبِ رقم: ٢٠٦٧}:

لە تاجول ئوصولا ئاوایە: (ریاض/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٧٧٧، ٧٧٨)

حوذەیفەی کوڕی یەمان (رەزای خودای لێ بێ) لەمەدائین بوو، کەئێـستا پێی دەگوترێ تاقی کیسرا، یا سەلمان پاك، چونکە ئارامگای سـەلمانی فارسـی وا لەوێ، هەروا گۆڕی حـوذەیفـەیش وا لـەوێ، خـوذەیفـە لـەوێ سەرۆکشار بـوو،

داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، ئاغا دێیەك لەحاجەتی زیودا ئاوی بۆ هێنا، حوذەیفە ئاوەکەی لێ وەرگرت‌و حاجەتەکەی تێ گرت‌و فەرمووی: من بۆیە ئەم حاجەتەم تێی گرت، چونکە من لەمەوپێش یەك دووجار پێیم گوتووە، ئیتر وانەکاو لەحاجەتی زیویندا شت بۆ من نەهێنێ، کەچی ئەو هەروا دەکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕو زیوو ئاوریشم‌و دێباج، ئەمانە لەجیهانا بۆ ئەوانن‌و لەبەهەشتا بۆ ئێوەن ئەی گەلی موسوڵمان!).

لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ نەداوین، کە لەحاجەتی زێڕو زیودا شت بخۆین‌و شت بخۆینەوە، یا ئاوریشم‌و دێباج لەبەر بکەین، یا لەسەریان دابنیشین).

لەگێڕانەوەیەکی تری تاجول ئوصولدا دەفەرموێ:

(هەرکەسێ لەحاجەتی زێڕدا، یان لەحاجەتی زیودا شت بخوا، یان شت بخواتەوە، ئەوە قلێپە قلێپ ئاگری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناو سکی خۆیەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٣ + ریاضی صالحین/٢، لاپەڕە ٢٩٣، ژمارە: ٨٠٨} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٦ + تجرید/٥، ژمارە: ١٨٥٤}.

٥٤٧- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ لُبْسِ اَلْحَرِيرِ إِلَّا مَوْضِعَ إِصْبَعَيْنِ، أَوْ ثَلَاثٍ، أَوْ أَرْبَعٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٩٥ = ٥٨٢٩ فتح الباری. پوختەی موسلیم ژمارە: ١٣٣٩ = ٥٣٨٤ شیحا = مسلم ٢٠٦٣}:

سوومەیدی کوڕی غەفلە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە جابییە، کە گوندێکە لەگوندەکانی ناوچەی دیمەشق، عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لە سەفەرەکەی شامیدا، لەو گوندە وتارێکی دا، فەرمووی:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی نەداوە کەئاوریشم لەبەر بکرێ، مەگەر بۆ نەخش، ئەویش بەقەد جێگەی دوو سێ پەنجە، یان سێ چوار پەنجە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٦، ٢٧٦٥، ٢٧٦٧}.

٥٤٨- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَخَّصَ لِعَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصِ اَلْحَرِيرِ، فِي سَفَرٍ، مِنْ حَكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٩٩ = ٢٩١٩، ٢٩٢٠، ٢٩٢١، ٢٩٢٢، ٥٨٣٩ فتح الباری. پوختەی موسلیم ١٣٤١ = ٥٣٩٦، ٥٤٠٠ صەحیحی موسلیم تەرقیمی/مامۆستا/خەلیل مەئموون شیحا = مسلم ٢٠٧٦}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام، لەغەزایەکا، لەدەستی ئەسپێ سکالآیان لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەویش ڕێگەی پێیاندا، کە کراسی ئاوریشم لەبەر بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٩، ٢٧٧٠ چاپی چوارەم}.

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٥٣٩٦ شیحا)دا، ئاوایە:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی بە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام دا، کەجلی ئاوریشم لەبەر بکەن، چونکە ئالۆش و خورووکەیێ لە لەشیانا هەبوو).

(ڕوونکردنەوە):

زاناکان لەڕاڤەنامە (شەرحە)کاندا، دەفەرموون: لەبەر مەهانەی ڕەوا ڕێگە بەپیاوی موسوڵمان دەدرێ، کەجل و بەرگی ئاوریشم لەبەر بکا، وەك خورووکەو ئالۆش، وەك ئەوە لەکاتی نوێژدا جلی تری دەست نەکەوێ، کە

شەرەمگای پێ داپۆشێ، بێجگە لەئاوریشم. کورتو پوخت: (مۆڵەت دەدرێ بەپۆشینی ئاوریشم بەهەموو جۆرەکانیەوە، بۆ نەخۆشیو شتی وا).

٥٤٩- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَسَانِي اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَخَرَجْتُ فِيهَا، فَرَأَيْتُ اَلْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١١٠ = ٢٦١٤، ٥٣٦٦، ٥٨٤٠ فتح الباری. پوختەی موسلیم ١٣٤٣ = ٥٣٨٩ شیحا = مسلم ٢٠٧١}:

ئەمە لەدواوە چەند نموونەیەکە لەگێڕانەوەکانی ئەم فەرموودەیە:

١- لەتاجول ئوصولدا دەفەرموێ: هەروا لە تجریدی بوخاریدا:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەسێ بەرگی بەدیاری داپێم، ئاوریشمی پەتی بوو، منیش لەبەرم کرد، کەچی تەماشام کرد، کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم کارەی من توڕە بووە، وە فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆمن بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە هەتا حۆت لەبەری بکەی، بۆیە بۆتم ناردووە کە لەتلەتی بکەی بۆ لەچكو سەرپۆش بۆ ژنەکان).

عەلی فەرمووی: منیش وامکرد. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٧٧٧ چاپی چوارەم}.

٢- لەپوختەی موسلیما (١٣٤٣) دەفەرموێ:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئۆکەیدیری پادشای دوومەتولجەندەل، پارچەیێ جلی ئاوریشمینی، بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەخشی بەمن، وە فەرمووی پێم: (دابەشی بکە لەبەینی فاطیمەکاندا، کەبیکەن بەلەچك بۆخۆیان).

واتـه: لـەنێوانی فاطیمـەی کـچی پێغەمبـەر، کەهاوسـەری عـەلی بـوو، وە فاطیمەی کچی ئەسەد، کەدایکی عەلی بوو، وە فاطیمەی کچی حەمزەی مامەی عەلیو پێغەمبەر.

٥٥٠- وَعَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {أُحِلَّ اَلذَّهَبُ وَالْحَرِيرُ لِإِنَـاثِ أُمَّتِـي، وَحُـرِّمَ عَلَـى ذُكُـورِهِمْ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح الجامع: ٢٠٩. أحمد ٣٩٤/٤. ترمذي: ١٧٢. نسائي ١٦١/٨}:

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (زێـڕو ئاوریـشم بـۆ مێینـەی گـەلی ئیسلامی من ڕەواو دروستن، کـە لەبـەریان بکـەنو بیانکـەن بـەجلو پۆشـاكو خشڵو خۆیانیان پێـوە بڕازێننـەوە، بـەڵام ئـەم دوو شـتە کـەزێڕو ئاوریـشمن، بەبێ مەهانەی ڕەوا، پۆشینو لەبـەرکردنو بـەکارهێنانیان بـۆ نێرینـەی گـەلی موسوڵمانی من نادروستنو نـاڕەواو قەدەغـەن!). {تـاج/٣، زنجیره: ٣٠، ژمـارە: ٢٧٧٦، ٢٧٧٧}.

٥٥١- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِنَّ اَللَّهَ يُحِبُّ إِذَا أَنْعَمَ عَلَى عَبْده أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَيْهِ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ.

{صحيح الجامع: ١٧١١. بيهقي في شعب الإيمان رقم: ٨٠٧٥}:

عیمرانی کوڕی حوصـەین (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ خـودای گـەورە نـازو بـەهرەیێ دەدا بە بەندەیەکی خۆی، حەزدەکا کەنیشانەی ئەو نازو نیعمەتو بەهرەیەی بەو بەندەی خۆیەوە دیار بێ!). {تاج/٣، زنجیره: ٢٧، ژمـارە: ٢٨٣٠ +ریـاض/٢، زنجیره: ١٢١، ژمارە: ٨٠٣}.

(ڕوونكردنەوە):

١- كاتێ خودا دارایی‌و ماڵ‌و سامان دەدا بەكەسێ با ڕەزیل‌و دەستقووچاو نەبێ، سەخی‌و بەخشندە بێ، هەم خۆی‌و خێزانی لێی بخۆن‌و لێی بپۆشن‌و لێی خەرج بكەن‌و شتی باش بخۆن‌و شتی باش لەبەر بكەن‌و لەخانووی باشدا دابنیشن‌و بەپێی باوی جوانی ناو كۆمەڵگا ڕابوێرن‌و بەرگێ نەكەنە بەر، كەشایستەی شانی هاوشانی خۆیان نەبێ، كارێ وا بكەن، كەببێ بە بەڵگە لەسەر سوپاسی خودای گەورەو سەروەر لەسەر ئەو نازو نیعمەتە، ببێ بە بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوە كە سەرسواڵكەرو ڕەزیل نین‌و بووەو داراو دەوڵەمەندن، هەتا نەداراو ئاتاجەكانیش ڕوویان بێ، كە بۆ یارمەتی‌و شتی وا ڕوویان تێ بكەن.

٢- بەپێی توانایش دەستكراوە بن‌و لەونازو بەهرەو نیعمەتی خوایە خزم‌وكەس‌و كارو بەندەباشەكانی خودا بەسەر بكەنەوەو یارمەتی شایانیان بدەن‌و بەشداری لە ئاوەدانكردنەوەی گەڕەك‌و شارو وڵاتی خۆیانا بكەن، بەكردنەوەی مزگەوت‌و پردو قوتابخانەو خەستەخانەو شتی تری لەم بابەتە.

**٥٥٢**- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ لُبْسِ الْقَسِيِّ وَالْمُعَصْفَرِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/١٣٤٤ = ٥٤٠٤ شیحا = مسلم/٢٠٧٨}:

لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عەلی كوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری كردووە لەم شتانە:

١- لەپۆشینی جل‌وبەرگی ئاورێشم، كە لەگوندی قەسسی میصری دەهێنرێ.

٢- وەلە جل‌وبەرگی بە عەصفەران ڕەنگكراو.

٣- وەلە ئەنگوستیلەی زێڕ لەدەستکردن بۆ پیاوان.

٤- وەلە خوێندنی قورئان لەناو چەمینەوەو کوڕنووشی ناو نوێژدا، واتە: لەناو روکوعو سوژدەدا). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٠٠}.

(ڕوونکردنەوە):

عەصفەران گیایەکی رەنگ زەردە، جیایە لەزافەران، جلوبەرگی پێ زەرد دەکرێ، کەوڵیشی پێ خۆشە دەکرێ، وەك جەوتو مازوو.

٥٥٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: {رَأَى عَلَيَّ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقَالَ: "أُمُّكَ أَمَرَتْكَ بِهَذَا؟"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/١٣٤٥ = ٥٤٠٣ شیحا = مسلم/٢٠٧٧}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لەخۆی و باوکی) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو جلکی عەصفەراناوی لەبەرما بینی، فەرمووی: (ئایا دایکت پێی گوتویت کە ئەمە لەبەربکەی؟ چونکە ئەمە جلی ژنانە؟).

گوتم: ئەی بۆچی نەیشۆرم؟ فەرمووی: (نەء، بەڵکوو بیانسووتێنە!). {تاج/٣/٢٦١، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٠١}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (٥٤٠١ شیحا)دا ئاوایە: فەرمووی: (ئەمە جل و بەرگی ناموسوڵمانە لەبەری مەکە).

٥٥٤- وَعَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّهَا أَخْرَجَتْ جُبَّةَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَكْفُوفَةَ اَلْجَيْبِ وَالْكُمَّيْنِ وَالْفَرْجَيْنِ، بِالدِّيبَاجِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. وَأَصْلُهُ فِي "مُسْلِمٍ"، وَزَادَ: {كَانَتْ عِنْدَ عَائِشَةَ حَتَّى قُبِضَتْ، فَقَبَضْتُهَا، وَكَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَلْبَسُهَا، فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضَى نَسْتَشْفِي بِهَا}. وَزَادَ اَلْبُخَارِيُّ فِي "اَلْأَدَبِ اَلْمُفْرَدِ". {وَكَانَ يَلْبَسُهَا لِلْوَفْدِ وَالْجُمُعَةِ}.

{أبــو داود رقــم: ٤٠٥٤. شــيحا/٥٣٧٦ = پوختــەی موســليم/١٣٤٢ = مسلم/٢٠٦٩. حسن، الأدب المفرد للبخاری}:

عەبدوڵڵای کوڕی کیسان کە کۆیلەی ئازادکراوی ئەسمای کچی ئەبوبەکر بوو (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) کە خاڵی منداڵەکانی عەطای کوڕی ئەبو ڕەباحە، فەرمووی: ئەسماء ناردمی بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) کە بەناوی ئەوەوە پێی بڵێم: بەمن گەیشتۆتەوە کەتۆ ئەی عەبدوڵڵا ئەم سێ شتە بەحەرامو نادروست دەزانی:

١- نەخشی ناو تەختی جلوبەرگ، ئەگەر ئەو نەخشە لەئاورێشم بێ.

٢- پۆپەشمینی ئەرخەوانی سەر نەرمەزین!

٣- گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەجەب هەمووی بەتەواوی.

جا عەبدوڵڵا لەوەڵامی ئەسمادا، فەرمووی پێم: لەبابەت گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەجەبەوە کە گشتی بگری، من شتی وام نەگوتووە، کەئەوە نادروست بێ، چۆن من شتی وا دەڵێم: چونکە من خۆم ساڵ دوازدە مانگە، جەژنەکانی لێ دەرچێ، بەڕۆژوو دەبم. بابەتی ئەوەیش کەباست کرد، سەبارەت بەنەخشی جلو بەرگ، کە لەئاورێشم بێ، بۆیە من خۆمی لێ دەپارێزم، چونکە من لە عومەری کوڕی خەطابم بیست دەیفەرموو: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (کەسێ ئاورێشم لەبەردەکا، کەبەشی بەرەحمەتی خوداوە نەبێ!).

جا لەم ڕوانگەیەوە، مەترسی ئەوەم هەیە کە نەخشی ئاورێشم بەر ئەم هەڕەشەیە بکەوێ، دەنا من نەخشی ئاسایی تر بەخراپ نازانم، سەبارەت بەبابەتی پۆپەشمینی ئەرخەوانی سەر نەرمەزینیش، ئەوەتا هینەکەی سەر زینەکەی خۆم ڕەنگەکەی ئەرخەوانیو پەمەییە، بەڵام ئاورێشم نییە، جاکاتێ ئەم وەڵامانەم بردەوە بۆ خاتوو ئەسماء، فەرمووی: (ئادەی کەنیشکە! جبەکەی پێغەمبەر خۆیم بۆبهێنە).

جـا كەنيـشكەكە، جبەيـەكى هێنـا، لـە قوماشـێكى ئەسـتوور بـوو، وەك طەيلەسان، كە ناسراوە بەكيسراوى، كە نيسبەتە بۆلاى كيسراى پادشاى ئێران، يەخەكەى‌و هەردوو سەردەستەكەى‌و هەردوو چمكەكەى، بـە ئۆيـەو قـەيتانى ئاورێـشمين، نەخـشابوون‌و، قـەيتانى دێباجيـان تـێ گيرابـوو. ئـەسماء (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ئەم جبەيەى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) هەتا عائيشەى خوشكم مـابوو، كـە هاوسـەرى پێغەمبـەر بـوو، لـەلاى ئـەوبوو، كەئـەو مـرد، مـن وەريـم گـرت، وە ئـەم جبەيـە جـاران پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) لەبـەرى دەكـرد، بۆيـە ئێمـە دەيـشۆرين بـۆ نـەخۆش‌و ئاوەكەى بۆ مووفەرِك، بـەنيازى شـيفاو چاكبوونەوە دەدەيـن بـە نەخۆشـەكە كەبيخواتـەوە، يـالێى دەپـرژێنين). {تـاج/٣، زنجـيرە: ٢٩، ژمـارە: ٢٧٦٧ چـاپى چوارەم} .

لێرەدا ئەمەى زياترە، كە دەفەرموێ: بوخارى لەكتێبى (الأَدَبُ المفـرد)دا، كە يەكێكە لەپەڕاوە ناودارەكـانى پێشەوا بوخـارى، كـە جيايـە لـە(صـەحيحى بوخـارى) ئـەم فەرموودەيـەى گێڕاوەتـەوەو ئەمـەى دواوەى لێ پـتر كـردووە: جاران پێغەمبەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) لـەكاتى پێشوازى لـە نوێنـەرو لەرۆژى هەينيدا، بۆ وتاردان ئەم جبەيەى لەبەردەكرد).

(ڕوونكردنەوە):

پوختەى بڕيارەكانى نامەى جل‌و بەرگ

١- ئەم باسە (٥٥٤ – ٥٤٣ = ١١) برێتييە لەيازدە فەرموودە.

٢- زێـڕو ئاورێـشم، مەگـەر لەبـەر مەهانـەى رەوا، دەنـا بـۆ نێرينـەى، موسوڵمان بەكارهێنانيان نادروستە.

٣- بـۆ ژن‌و بـۆ پيـاو، خـواردن‌و خواردنـەوە، لـەدەفرى زێـڕو زيـودا نادروستە.

٤- بۆ نەخش‌و شتى وا بەكارهێنانى ئاورێشم بۆ پياويش دروستە.

٥- كاتێ خودا ماڵی ڕەحمەتی دا بەکەسێ، یا بەهرەیەکی بەخشی بەکەسێ، با ڕەزیلیو چرووکی نەکاو، نیشانەی ئەو نازو نیعمەتەی پێوە دیاربێ، بەمەرجێ پێی بایی نەبێو پێی بوغرا نەبێ.

٦- لەبۆنەو کاتە تایبەتو ڕۆژانی جەژنو شاییو خۆشیدا، واباشە موسوڵمان جلی جوانو باش لەبەربکاو سەرسواڵکەرو ڕەشوو ڕووتو پڕپووت نەبێ.

٧- بڕوانە (فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٨٢، زنجیرە: ١٠١).

٨- بڕوانە (ریاض الصالحین/٢، لەزنجیرە: ١١٧ەوە هەتا زنجیرە: ١٢٦، لەژمارە: ٧٧٩ هەتا ژمارە: ٨١٣).

## پێڕستی سەرەباسەکان